٦٠
سالی یانزەهەم
پایزی
٢٠٠٩

# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز:
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر:
ڕەووف بێگەرد

سکرتێری نووسین:
شوان ئەحمەد

دەستەی نووسین
ڕێبین هەردی

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری
تاڤگە فائق

هەڵەچنی چاپ:
ساکار رەووف

بەرگ :
نەرمین مستەفا

-سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و رەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

-داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێر، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

-ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداری دەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێرەوبکەن.

-باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێردا.

-ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و رۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

-بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

-پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

# ناوەڕۆکی:
## سەردەم - ژمارە ٦٠

### فیکر و فەلسەفە



### گفتوگۆ



### ئەدەب

## وێستگەکانی سەردەم




**ناونیشان:**

سلێمانی - شەقامی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩

**نرخی (١٢٥٠) دینار**

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

Tel _ Fax: 00447543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی
ژمارە (615/ 14665 و 616/ 14665) تاران

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

# چ کەسێك ڕۆشنگەرە؟

ری پۆرتەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

قۆناغێـــک لەمێژووی ئەوروپادا هەبووە کە مێژوونوســـان بەگشـــتی، تێورە باوەکانی سەردەمی خۆیان بەگەڕانەوە بۆ «رۆحی زەمەن» ڕوندەکردەوە. «رۆحی زەمـــەن» چەمکێکە ئیلهامی لە تیورەی هیگڵـــەوە لەبارەی قۆناغە یەک لەدوای یەکەکانی دیالەکتیکی بەدیهاتنی هوشیاری لەمێژوودا وەرگرتووە. لێرەوە دەگوترا خەسڵەتە تایبەتیەکانی سەردەمی رۆشنگەری، دەربڕی رۆحیەتی «عەقڵانیانە» یان «تاکگەریانە»ی باڵادەســـت بەسەر ئەم ســـەردەمەدا بووە. ئەمڕۆ ئەمجۆرە رونکردنەوانە بە تاوتۆلۆجی Tautology دادەنرێت.

هەنوکە پێناچێت دروشـــمبازی مێژوونوسانی مارکســـی، هێندە قانعپێکەر بێت کە هەوڵدەدەن بۆ رونکردنەوەی تیورەکانی بیریارانی رۆشـــنگەری هەمویان بەناوی تەفسیری وەک: کۆمەڵگا هیچ نیە جگە لە کۆی بەشە پێکهێنەرەکانی، یـــان ئەخلاق هیچ نیە جگـــە لە ئەژمارکردنی ماتماتیکانـــەی رادەی چەندایەتی شـــادیو ئازار، لەژێر ناوی «ئایدۆلۆژی بۆرژوازیدا» کۆبکەنەوە. مارکســـیەکان بەشێوەیەکی کلاسیکی سەدەی هەژدەی زایینی وەک قۆناغی کۆتایی گواستنەوە لە فیودالیزمەوە بۆ ســـەرمایەداری دەستنیشـــان دەکەن. قۆناغێک کە شۆڕشی بۆرژوازی (شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا) بە لوتکەی دادەنرێت. بەپێی تێگەیشتنی مارکسیانە، رۆشـــنگەری مانیفێســـتی خەباتی «بۆرژوازیە» دژی فیودالیزمی «ئەرستۆکراتی».

کێشەی ئەم شکڵبەندیانە ئەوەیە هەندێک پرس کەمو هەندێکی دیشیان زۆر روندەکەنەوە . ئەم شکڵبەندیانە رونی ناکەنەوە بۆچی کەسێکی وەک رۆسۆ کوڕی سەعات سازێک، لە چینی ناوەڕاست کە لە شارێکی تەواو بۆرژوازی وەک جنێڤو لە فەزایەکی کەمتازۆر بێ کەموکوڕدا گەورە بوو، تیورەی تاکباوەڕی لیبراڵی (ئایدۆلۆژیای بۆرژوازی) بە بێبایەخ دەزانی . ئەم تیورەیە لە سەردەمی رۆشنگەریدا وەک فەیلەسوفانی میرابۆ مارکیو بارۆن دهلباخ کە خودی نازناوەکانیان جێگەیان لەناو ئەرستۆکراتەکاندا دەردەخات، داڕێژرا بوو. شکڵبەندی مارکسیانەش ڕوونی ناکاتەوە، بۆچی کۆمەڵگای بازرگانانی فەڕەنسا لە بەرامبەر بە «ئایدۆلۆژیای بۆرژوازییانەی» رۆشنگەریدا، تەواو بێهودە بوو، لە خوارەوە زیاتر ئەم مەسەلەیە شیدەکەمەوە .

زۆرێک لە مێژوونووسانی بەرجەستەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا، کە ئەم رێگەچارە درۆزنانەیان ئەوەندە بە رۆشنگەرانە نەدەزانی کە مژدەی زۆریان دەداو کەمیان جێبەجێ دەکرد، گشتگۆیی بێمانایان لەبارەی چینەکانو هوشیاری چینایەتیەوە دەخستە لاوەو لە بەرامبەردا کەوتنە لێکۆڵینەوەی ورد لەبارەی بونیادی دەرونی تیورەکانو پەیوەندییە دەرونیەکانی ناویانەوە . ئارەزوی سەرەکیان بەپلەی یەکەم ئەوە نەبوو فەیلەسوفانی رۆشنگەری چ کەسانێک بوون یان چیان کرد، بەڵکو ئەو تیورانە بوون ئەوان پێشکەشیان کردبوو، ئەوەش کە ئەم تیورانە چ کاریگەریەکیان لەسەر یەک داناوە . لێرەوە ئەو مەسەلەیەی رەچاویان دەکرد وتوێژو ململانێی لەفزی بیریارانی رۆشنگەری نەبوو، بەڵکو زەمینەی مادی بیروڕاکانیانو پەیوەندی دوو لایەنی ئەم بیروڕایانە بە جیهانی فکریانو بنەما میتافیزیکیو فەلسەفی (زۆرجار بەیاننەکراو) بوو کە ئەم بیروڕایانە لەسەر بناغەیان دامەزراون. ئەرنست کاسیرەر کە یەکێکە لە پێشڕەوانی ئەم رێبازە، لە بەرهەمەکەی خۆیدا «فەلسەفەی رۆشنگەری» دەریدەخات چۆن ئەزمونگەری کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەم، دژی عەقڵگەری کلاسیکی فەلسەفە شۆڕشیان کرد. روداوی ئەزمونگەری کە لۆک لە لوتکەکەیدا راوەستابوو، بەهۆی کۆندیاک، هلۆتێۆسو ئەوانی دیەوە درێژەی پێدراو دواجار بە گومانکاریەکی ئاڵۆز (کە هیوم بەر لەهەر کەس باسی کرد) کۆتایی پێهات، گومانکاریەک کە کانت هەموو لێهاتوویی فەلسەفەکەی خۆی بۆ چارەسەری کێشەکانی تەرخانکرد.

کێشەی مێژوونوسانی وەک کاسیرەر ئەوەیە بەبێ هیچ دڵەڕاوکێیەک بیروڕاکان لە زەمینەی مادیان جیادەکەنەوەو هەڵیدەسەنگێنن. لەناو ئەمجۆرە رێبازەدا، خەڵکی زیندوو تا ئاستی تێزە قوتابخانەیەکان دادەبەزێنرێن. تەنانەت فەیلەسوفانی ماتریالیستی ئەم قۆناغەش ئەمجۆرە هەڵسوکەوتەیان رەتدەکردەوە، ئەم ئارەزووە لەوانیشدا هەیە کە دیدی ڕابردوخوازانە و هەڵسەنگاندنی نامێژوویی خۆیان بۆئەوەی چ کەسانێک لەم بوارەدا خاوەن گرنگی «واقعی» بوون، گشتگیر بکەن (مەبەستی ئەوان لە گرنگی واقعی بەگشتی ئەوەیە کە چ کەسانێک بۆ چارەسەری پرسە فەلسەفیەکان بەرهەمیان پێشکەش کردووە کە شایەنی نەمری بێت) . کتێبەکەی کاسیرەر لەمڕووەوە جێی سەرنجە، چونکە تەنانەت ناوی کەسانی بەنفوزی وەک ئادام سمیس یا جرمی بنتهامی نەهێناوە .

بەپێچەوانەوە پترگی لە بەرهەمەمەکەی خۆیدا، تەفسیرێکی بۆ رۆشنگەریو دڵەراوکێیەکی زۆرتری بۆ تاوتوێکردنی فەیلەسوفانی ئەم سەردەمە هەیە بەناوی مرۆڤە واقعیەکانو خاوەن راکانی ئەهلی کردار، نە قسەکەرانی ئەم یان ئەو تێزی فەلسەفیو سیاسی، خەڵکانێک کە بیروڕاو وتوێژە

فەلسەفیەکانیان، سەرچاوەی لە ژیانیان وەک رۆشنبیرانێکی خەباتکارو بە شەخسیەتو سروشتی خۆیانەوە وەردەگرت. گی لایەنگری ئاراستەیەکە کە ناوی دەنێت «مێژووی کۆمەڵایەتی بیروڕاکان». لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وەک پێشتر بینیمان، گی سەرنجی خۆی لەسەر ئەوەی خۆی ناویناوە «گروپێکی بچوک» یان «گروپێکی هیومانیست» (لە هەمویان زیاتر لەسەر ڤۆڵتیرو دیدرۆو رۆسۆ) چڕ دەکاتەوە. ئەم هەڵوێستە بەو دەرئەنجامە دەگات کە فەیلەسوفانی فەڕەنسی یان فەڕەنسی زمان بەرجەستەترین یان رەنگە بە ناهەق، گرنگترین جێگە لە بیرکردنەوەی رۆشنگەری داگیربکەن (فەسڵی شەشەم باسی ئەو تێڕوانینە دەکەین کە فەیلەسوفانی فەڕەنسی بەشایەنی ئەم جێگەیە نازانێت). کتێبەکەی گی سەرەڕای ئامانجەکەی، بناغەی هەندێک پێشداوەری وەک «پیاوانی مەزن» بیریارانی مەزن، بەرهەمی مەزنی پتەوتر کردووە.

بەم دواییانە هەندێک لە مێژوونوسان هەوڵیانداوە پرۆژەی «مێژووی کۆمەڵایەتی بیروڕاکان»، لەسەرو ئاسۆی روانینی خودی گیەوە پەرە پێبدەن. ئەوان سەرنجی خۆیان لەسەر کاریگەری دولایەنەی پڕ بەرهەمو جوڵاوی روداوە فکریەکانی گروپە بەربڵاوەکانی رۆشنگەری لەسەر یەکتر و هەڵکشانو داکشانی ئەم روداوە فکریانە چڕ دەکردەوە. ئەوان بەتایبەتی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە رۆشنگەری نەک کاری گروپێکی بچوک لە دێوەکانی فەلسەفە، بەڵکو بەرهەمی هەوڵێکی دەستەجەمعی بووە. ئەوان جەختیان لەسەر گرنگی پەیوەندی دەرونی و نزیکی هەلومەرجە مادیەکانو شێوازی ژیانی خەڵکی لەگەڵ بیرکردنەوەکانیاندا دەکرد. ئەم شێوازە تازەیە سەرنجی لە بناغەی مادی هوشیاری دەدا. مارکسیزم پێشەنگی شێوازێکی لەمچەشنەیە، بەڵام ئەم شێوازە بەپێچەوانەی مارکسیزمەوە شکڵبەندی روکەشیانەی (وەک ئەوەی رۆشنگەری خەباتی کۆمەڵگای بۆرژوازی لە دۆخی پەرەسەندایە بۆ رزگاربوون لە کۆتوبەندەکانی سیستەمی فیودالی) دوبارە ناکاتەوە، بەڵکو چالاکانە لە گروپبەندیو بەشێوەیەکی تایبەت لە قەیرانە ناوچەییەکان دەکۆڵێتەوە.

پڕ بەرهەمترین دەستکەوتی تازەی «مێژووی کۆمەڵایەتی: رۆشنگەری، هێنانەئارای ئەو مەسەلەیە بوو کە نابێت سەرەتای رۆشنگەری بەکاتی دەرکەوتنی «بەرهەمە گەورەکان» لەدەیەی ١٧٤٠و ١٧٣٠ —واتە کاتی بڵاوبونەوەی «نامە ئێرانیەکان»ی مۆنتیسیکۆ (١٧٣٣)، «زانستە تازەکان»ی ڤیکۆ (١٧٢٥) و «نامە فەلسەفیەکان»ی ڤۆڵتێر (١٧٣٣) بزانرێت. سەرەڕای ئەوە نابێت مەرگی قارەمانانی رۆشنگەری بە کۆتایی ئەم سەردەمە دابنرێت (هەموو فەیلەسوفە گەورەکانی رۆشنگەری جگە لە کۆندرێسە، کاتی لەدایکبونی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا، مردبوون).

لەبەرامبەردا مێژونوسە کۆمەڵایەتیەکانی دوایی، رۆشنگەری بە بزوتنەوەیەکی بەربڵاو دەزانن کە بەهۆی زۆرێک لە بیریاران، نوسەرانو ئەکتیڤیستە نەناسراوەکانەوە دەستی پێکردو بڵاوبۆوە. سەرەڕای ئەمە ئەم بزوتنەوەیە نەیدەتوانی بێ تۆڕێکی بەربڵاوی هاوڕێیان، لایەنگرانو بەرگریکەرانێک کە ئامادەبوون لەکاتی پێویستدا پەنا بە راکردوان بدەن یان نامەو نوسینو کتێبە شاراوەکانیان ئاڵوگۆڕ بکەن، بگەشێتەوە. تەنانەت هەندێک کات خاوەن پلە دەوڵەتیەکان بەرگری شاراوەیان لە بیریارانی رۆشنگەری دەکرد، چاویشیان لە بڵاوبونەوەی ئەو بەرهەمانە دەپۆشی کە نافەرمی بوون. لێرەوە ڕەنگە ماڵشر سەرۆکی بەڕێوەبردنی سانسۆری فەڕەنسا لە ناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەدا لەبەر سیاسەتە لیبرالیەکانی، باشترین هاوڕێی فەیلەسوفانی رۆشنگەری بووبێت.

جگە لەمەش ڕەنگە ســـەرجەم پرۆژەی ڕۆشـــنگەری بەبێ بەرگریکردن سەرەڕۆیانەو هەندێکجار زۆر مەترسیدارانەی کرێکارانی چاپخانەکانو پەخشکەرانی کتێبەکان کە کاری ڕێکخستنی قاچاخچێتی کتێبە نایاســـاییەکان لە دەرەوە لە ئەستۆ دەگرت، ڕوبەڕوی شکست بێتەوە. خاوەنە سەرەکیەکانی دەزگا پەخشکەرەکان، زۆرجار ریسکی گەورەیان بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی بیریارانی ڕۆشنگەری دەکرد، دیارە وەک دانتۆن ئاماژەی بۆ کردووە هەندێکجار ئەم مەترســـیەیان لەبەر بڕوای سیاسیانو زۆرتر لەبەر ئەو قازانجە زۆرەی بەرهەمی دەهێنا، بە گیان دەکڕی.

ئەمجۆرە چالاکیە «ژێرزەمینیانە» بۆ شـــکڵوەرگرتنی یەکەم گروپی چالاکوانانی ڕۆشـــنگەری، گرنگیەکی ســـەرەکی هەبوو. تەنزی بێبەزەییانەو تیورە توندڕەوەکان کە ئەم گروپانە پێشکەشیان دەکـــردو بڵاویاندەکردەوە، ڕادیکالتر بوو لە کۆی ئـــەو تیۆرانەی لەپاش ئەوەوە هێنرانە ئاراوە. وەک مارگارت یاکوب جەختی کردووە ڕەخنەی توندو نائاشـــتیانە لە مەزهەبو سیاســـەت، کە خەسڵەتی چالاکوانانی ســـەرەتای ڕۆشنگەری بوو، بەڕادەیەکی زۆر لە دڵی بەرهەڵستکاریەکەوە هاتە دەرێ کە دژی بەرەی یەکگرتوی زنجیرەی ســـتەمکارانەی بۆربۆنو ســـتیوارت لەگەڵ کەنیســـەی کاسۆلیکیدا دروســـتبوو. یەکگرتنێک کە لەدەیەکانی ســـەدەی حەڤدەهەمدا سێبەری خۆی بەسەر هەموو ژیانی کۆمەڵایەتیدا کێشابوو.

پەنابەرانی سیاســـیو مەزهەبی لە ئینگلتەرا لە ســـەردەمی چارلزی دوهـــەمو جیمزی دوهەمدا، هاوکات لەگەڵ پەنابەرانی پرۆتســـتانت لە فەرەنســـا (بەتایبەتی پاش هەڵوەشـــاندنەوەی فەرمانی نانس لە ١٦٨٥دا بەهۆی لویی چواردەهەمەوە) پەیوەندیان بە خەباتکاران، بیرئازادەکان، نوســـەران، کرێکارانـــی چاپخانەکانو پەخشـــکەرانی ناوچەیی لـــە کۆماری هوڵەنداوە کرد. ئـــەوان لە لاهای یا ئەمستردام لە فەزایەکی لێوانلێو لە ناڕوونی، دڵنیانەبوونو دەسیسەدا دەژیان. لە دەرئەنجامدا ئەوان ڕێکخستنو ناوەند و یانەی نافەرمیو شاراوەکانی خۆیان....، دروستکرد. ئەم ناوەندانە ڕێزیان لە بەها کۆماریەکانی ئازادی، یەکسانیو برایەتی دەگرت، چونکە ژیان لە تاراوگەدا ئەندامەکانی ناچاردەکرد، شێوەی ناسکانەی «کۆماری» قەبوڵ بکەن. ئەم ناوەندە بچوکە ئەدەبیانە بەتوندی هێرشیان دەکردە ســـەر حکومەتی دیسپۆتیزمی سیاســـیو ڕەخنەی خۆیان لە مەزهەبی دێرین پەرەپێدا و کامڵ کرد. نوســـینەکانی جان تۆڵند بناغەی سەرەکی ئەم ڕەخنەیەیان پێکدەهێنا کە لەسەر بناغەی بڕواکانی «یەکێتی بوون»، سروشتی دەکردە جێگری خوداو بانگەشەکەرانی پێغەمبەرانەیان لەو نوسینانەدا کە بەنهێنیانە دابەشدەکرا، بەیەک ڕادە ڕەتدەکردەوە. نوسینەکانی تۆلند (ئەو دورخراوە ئیرلەندیەی کە لە سیاسەتدا کۆماریخوازو لە فەلسەفەشدا ماتریالیست بوو) هاوئاهەنگترین دەربڕینی ئەو تیورە توندڕەوانە بوو کە لەناو فەزایەکی لەمچەشنەدا دەهێنرایە ئاراوە.

لێکۆڵەرەوە جیاوازەکان تائێستاش لەبارەی هەڵسەنگاندنی وردی ئەم «ڕۆشنگەریە ڕادیکاڵەی» ســـەرەتاو کاریگەرییەکانی، بیـــروڕای زۆر جیاوازیان هەیە. هۆی ئەمـــە تاڕادەیەک ئەوەیە کە ئەو بەڵگانەی لەم قۆناغە بەجێماوە، ئەوەندە پەرشـــوبڵاون کە هەڵسەنگاندنیان زەحمەت دەکات. بەڵام هەنوکە ڕوونە کە توندڕەوترین بیروڕاکان لە ڕەتکردنەوەی ڕوکەشـــیخوازی سیاســـیو مەزهەبی هەر لە هەمان ســـەرەتای ڕۆشـــنگەرییەوە هێنرابووە ئاراوە، بیروڕاگەلێک کە ڤۆڵتێری گەنجی ناچارکرد ڕەوتێکی میانڕەوانە بگرێتەبەر. وەک ئیراوید چەندان وەخت پێشـــتر دەریخستووە، ئەمجۆرە تیورانە

بەخێرایی لە ڕێگەی بڵاوکراوە نهێنیەکانەوە بڵاوبونەوەو زەمینەیان بۆ رادیکالیزمی دوایی‌و لە هەمویان پێشتر لە فەڕەنسا خۆشکرد.

هەنوکە بەر لە هەر کاتێکی دی ئەوە دەرکەوتووە کە بەشێکی سەرەکی بزوتنەوەی رۆشنگەری لە هەموو قۆناغەکانی خۆیدا وەک کێوێکی سەهۆڵ لە دیدەکان شاراوە بووە و ئەو مێژوونوسەش کە ئەم مەسەلەیە لەبەرچاو نەگرێت، توشی هەڵەیەکی گەورە دەبێت. لێکۆڵەرەوان ماوەیەکە سەرنجێکی زۆریان لە ئەنسکلۆپیدیای دیدرۆو دالامبێر داوە . ئەنسکلۆپیدیا کۆمەڵێکی گەورەی زانستی پراکتیکی‌و تیورەی پێشکەوتنخوازو سەرەڕۆیانە بوو کە نوسینی لە ساڵی ١٧٥١ دەستی پێکردووەو بەدرێژایی بیست ساڵ پتر لە بیست بەرگدا بڵاوکرایەوە و پاشان دوو بەشی دە بەرگی وێنەیی بۆ زیادکرا. هەندێک لە نوسەرانی ئەنسکلۆپیدیا تائێستاش نەناسراون و زۆرێک لە نوسەرانی وەک شوالیە دۆ ژاکۆ کە سەدان وتاری تیا نوسیوە، لە مێژوونوسی فەرمی رۆشنگەریدا فەرامۆشکراوە . هەموو ئەمانە گەنجینەیەکی زیندووی لە پشتیوانان‌و لایەنگرانی زەخیرەیی پیشاندەدات کە بیریارانی رۆشنگەری دەیانتوانی پشتیان پێببەستن. بەشی سەرەکی ئەنسکلۆپیدیا —ئەم ئەسپەی ترواداى رژێمی رابردوو- وتارگەلێکیان لەبارەی هونەرو پیشەسازی دەستی، زانست‌و تەکنەلۆژیا، پیشەسازی‌و کشتوکاڵی‌و هەموو ئەو شتانەی دی بوو کە داڕێژەران بۆ مۆدێرنکردنی فەڕەنسا بەتەواوی بەپێویستیان دەزانی. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەندێک وتاری ئەنسکلۆپیدیا بەئاشکرا دژی رژێم بوو، «گوتاری پێشەکی» خودی دالامبێر بەئاوازێکی ئاگادارکەرەوەوە، پێی لەسەر پێویستی شێوە تازەکانی بیرکردنەوە بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستیەکانی سەردەمی تازە دادەگرت.

لەهەمانکاتدا تاوتوێکردنی وردبینانەی وتارەکانی ئەنسکلۆپیدیا، بەبێ تێگەیشتن لە مێژووی ئەم بەرهەمە بێمانایە: ئەنسکلۆپیدیا چۆن سەرمایەگوزاری، چاپ‌و بڵاوکرایەوە؟ چ کەسانێک دابەشیان دەکردو چ کەسانێکیش دەیانکڕی‌و دەیانخوێندەوەو چ کاریگەریەکیشی دەکردنە سەر؟ رۆبرت دانتۆن لە تاوتوێکردنی وردبینانەی خۆیدا بۆ چاپە جیاوازەکانی ئەنسکلۆپیدیا کە زۆرجار لە بەرگی بچوکترو هەرزانتردا کە لە کۆتایەکانی سەدەی حەڤدەدا بڵاوکرابونەوە، زانیاری پڕ بایەخی لەبارەی ئەم مەسەلانەوە دەخاتە بەردەستمان. دەزگای پەخشی نیوشاتل لە سویسرا دەورێکی بەرجەستەی لە بڵاوکردنەوەی نوسخە هەرزانەکانی ئەنسکلۆپیدیادا هەبوو. ئەو دەزگایە پسپۆر بوو لە بڵاوکردنەوەی ئەو وتارو رۆمان‌و بەرهەمە ئەدەبیانەی تری نوسەرانی فەڕەنسی کە هێشتا بڵاوکردنەوەیان لە فەڕەنسادا مەترسیدار بوو. ئەم خاڵەش جێگەی سەرنجە کە پەخشکەرانی (موزعین) پاریسی کە چاودێرانی پلە دەوڵەتیەکان بەسەریانەوە بوو و هەروەها چەندان ئیمتیازاتیان هەبوو، لە بارودۆخێکدا نەبوون کە ئەو قازانجە زۆرانەی لە ئەنجامی خوێنەری بەرهەمەکانی فەیلەسوفانی رۆشنگەریەوە بەدەست دەهات، بکەنە نەسیبی خۆیان.

بەم وەسفە چ کەسانێک ئەنسکلۆپیدیاو بەرهەمە هاوشێوەکانی دەکڕی؟ بێگومان «خەڵکی» یان تەنانەت گروپە رادیکاڵەکانی چینەکانی خوارەوە، بەهۆی گرانی نرخی کتێبەکەوە، بەشێک نەبوون لە کڕیارانی ئەنسکلۆپیدیا. لەڕاستیدا ئەم بەرهەمە ڕادیکاڵانە بۆ دەوڵەمەندەکان بڵاودەکرانەوە . سەرەڕای ئەوەی بەشێک لە ئەنسکلۆپیدیا تەرخان کرابوو بۆ بازرگانی‌و تەکنەلۆژیا، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بۆرژوازی بازرگانی بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدا. بازرگانە فەڕەنسیەکان ئارەزویەکی زۆریان

بۆ قازانجکردنو بایەخیان بە شێوە دێرینەکان دەداو بەشێک بوون لە کۆنزەرڤاتڤترین ڕەگەزەکانی ڕژێمی رابردوی فەڕەنسا. لە هەموان زیاتر کەسانێکی خاوەن شەهادەی باڵا وەک پارێزەرەکان، کارمەندانو بەڕێوبەرانی ئیداری، رۆحانیە پلە بەرزەکان، ئەرستۆکراتە خاوەن زەویەکانو بەرپرسیارە گەورەکانی ویلایەتەکان، پێشوازیان لەمجۆرە بەرهەمانە دەکرد. ئەندامانی ئەنجومەنە ئەدەبیو ئەکادیمیە کلتوریەکان کە لە نیوەی سەدەی هەژدەدا نفوزێکی زۆریان لە پارێزگاکانی فەڕەنسادا هەبوو، هەر لەم ناوەندە خۆشگەزەرانو دەسەڵاتدارو لێهاتوەوە دەهاتن. سەیر ئەوەیە رۆشنگەری بە پشتبەستن بە یارمەتی مادیو پشتیوانی هەر ئەم پایانەی رژێمی رابردوو، واتە ئەو کەسانەی لە ڕووی سیاسیو کۆمەڵایەتیەوە بەتەواوی کۆنزەرڤاتیڤ بوون، بەڵام بەگشتی بە تامەزرۆیەوە بەدوای تازەگەریە فکریو کلتوریەکانیاندا دەچوون- بەردەوام بوو.

لەهەمانکاتدا رۆشنگەری لە قۆناغەکانی دوایيو رەونەقی خۆیدا کۆمەڵێک لێهاتووی لەخۆ دەگرت کە بەگشتی هەلومەرجی داراییان باش بوو، بۆ ئەندامەکانی چینی خۆشیان دەیانوسی. مۆنتسیکۆ، بارۆنو کۆندریسە، مارکی مارکیوز بوون. ڤۆڵتێر کە کوڕی پارێزەرێک بوو، لە ڕێگەی نوسینەکانیەوە هێواش هێواش سامانێکی بەرچاوی بەدەستهێناو وەک ئەرستۆکراتێکی خاوەن زەوی لە کۆشکی فرنیدا دەژیا. هلۆتیوس لە ڕێگەی بەکرێدانی زەویەوە، سامانێکی زۆری کۆکردەوە. گیبون منداڵی موڵکدارێکی نوێنەری پەرلەمان بوو کە پاش باوکی جێگەی گرتەوە. بنتهام بەهۆی ئەو سامانەوە دەژیا کە بە میرات بۆی مابۆوە. هەموو فەیلەسوفانی رۆشنگەری لێزانینە دەستیەکانیان دەنرخاند، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان پیاوانی خۆدروستکەرو هەڵقوڵاو لە خەڵکەوە بوون. دیدرۆو بنجامین فرانکلین لەو جۆرە بیریارانە بوون، فرانکلین خاوەنداری چاپخانەیەک بوو لە فیلادلفیا کە خۆی پەیڕەوی لە پەندێک دەکرد لە ساڵنامەی «رۆبینی فەقیر»دا نوسیبووی: « گەر دەتەوێت سامانو عەقڵی تەندروست ئەی دۆست، سەر لە ئێوارە بنوو، هەڵسە بەیانی زوو». هۆلباخ کە سەرەڕۆترین فەیلەسوفی ئازاد ئەندێشی رۆشنگەری بوو، بارونێکی بە رەچەڵەک ئەڵمانی بوو، کە لە پاریسدا ساڵۆنێکی خۆشگوزەرانی بەرێ خستبوو.

یەکەمجار لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا بوو کە بیریارانی رۆشنگەریو ناوەندە کلتوریە جەماوەریەکان لە فەڕەنسادا، کاریگەرییەکی دولایەنی قووڵیان (رەنگە کاریگەرییەکی پڕ لە گرژیشیان) کردە سەر یەکتر. وەک دانتۆن پیشانیداوە جۆرێکی تازەی رۆشنگەری، بەتایبەتی لە دەیەکانی ١٧٨٠دا دەرکەوت. جۆرێک رۆژنامەگەری خەڵکپەسەند و توندوتیژ. ئەو نوسەرانەی لەم رۆژنامانەدا کاریان دەکرد، نەک هەر هێرشێکی توندیان بە وشەی ناکامڵو خەڵکپەسەند بۆ سەر نەریتو کەسانی مەزهەبی و دەرباریەکان دەست پێکردبوو، بەڵکو رقێکی کوێرانەیان دژی هەموو چینە کۆمەڵایەتیەکانی سەرەوە بڵاودەکردەوە کە ئیمتیازاتیان هەبوو. ئەم رۆژنامەگەریە تازەو ساوێلکانەیە کە یەکەمجار لە فەڕەنسادا دەرکەوت، ئەمڕۆ لەلایەن رۆژنامەکانو بڵاوکراوە بازاڕیەکانو وروژێنەرەکانەوە سودی لێ وەردەگیرێت. رۆژنامەگەری بازاڕی لە فەڕەنسادا تایبەت بوو بەو راپۆرتە وروژێنەرانەی تایبەتن بە مەسەلە رۆژانەییەکانو فەزیحەتە جنسیەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دروشمە سادەو ئاسان تێگەیشتنەکانی رۆشنگەریشی دەبردە ناو خەڵکەوە. لە قۆناغێکدا کە فەیلەسوفانی رۆشنگەری تاڕادەیەکی زۆر بەلای سیستەمی کۆمەڵایەتیدا رادەکێشران، نوسەرانێکی

تازە وەک سباســـتیان مەرسیە و رســـتیف دلابرتۆن، سیاسەتی رۆشنگەریان بردە ناو چینە ناڕازیو هیچەکانەوە . ئەوانە سیاســـەتێکی تەحەداکارانەو پر هەراوهوریایان گرتەبەر و پێشڕەوی خۆیان بە ڤۆلتێر نەدەزانی کە زمانێکی زۆر ئالۆزی هەبوو، بەڵکو رۆســـۆیان بە پێشڕەوی خۆیان دەزانی کە لە ڕوانگەیەکی خەڵکپەسەندەوە هێرشی دەکردە سەر کۆمەڵگای پیشەسازی.

پترگی بیریارانی رۆشـــنگەری بە کۆمەڵێک شۆڕشـــگێڕی سەرســـەختو جێی ڕێز دادەنێت. ئەم وتەیە کە بەشـــێوەیەکی هەژێنەر داڕێژراوە، زۆر دوور لە ڕاستی نیە . گەرچی بیریارانی رۆشنگەری لە لوتکەی رەونەقی ئەم ســـەردەمەدا تیورەگەلێکی رادیکالیان پێشـــکەش دەکرد، بەڵام خۆیان سەر بـــە چینە دەوڵەمەندەکانو ســـەرەوەی کۆمەڵگا بوون یان رێگەی خۆیان بۆ ئـــەم چینە کردبۆوە، بەهەرحاڵ بە بەشـــێک لە گەورەکان دەژمێرران. لـــە ئینگلتەرا ئەنجومەنێکی بەناوبانگی لایەنگرانی رۆشـــنگەری بەناوی زانکۆی لۆنار لە بیرمنگهام هەبوو کە ئەندامەکانی لە رۆشنبیران، دکتۆرەکان، خاوەن زەویەکان، خاوەن کارخانەکانو داهێنەران پێکدەهات. لەنێوان ئەمانەدا دەکرێت ناوی جۆسیا وگـــۆد، ماتیۆ بۆڵتون کارخانەدار، جیمز واتی داهێنەر، ئەراســـمۆسو داروینو جۆزیف پرایســـتلی زانا بهێنیـــن. ئەم بیریارانە پێشـــکەوتنی کۆمەڵایەتیان بەرز دەنرخانـــد، کۆیلەدارێتیان مەحکوم دەکردو (تاڕادەیەکی زۆر) شۆڕشـــی گەورەی فەرەنســـایان بەرز دەنرخاند. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیچکامیان داواکاریەکانی «خەڵکیان» نەدەهێنایە پێشـــێ و لەڕاستیدا لەکاتی رودانی ئاژاوەیەکی نیشـــتیمانپەروەرانەو جەماوەری لە ســـاڵی ١٧٩٠ دا بوو کە خەڵکی خانوی پرایســـتلیان سوتاندو ناچاریان کرد ڕابکات بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکان.

تا ئێستا چەندانجار باسی «پیاوانی رۆشنگەریمان» کردووە، بەڵام دەکرێت چی لەبارەی «ژنانی رۆشـــنگەرییەوە» بڵێین؟ ناوهێنانی ئەو ژنانەی دەورێکی تایبەتیان لە بزوتنەوەی رۆشـــنگەریدا هەبووە ئاســـانە: شاتڵ خۆشەویســـتی ڤۆڵتێرو سۆفی ولند خۆشەویســـتی دیدرۆ هەردوکیان دوو ژنی زۆر لێهاتوو و رۆشـــنبیرو قســـەزان بوون. ژنانی وەک ئەلیزابیت مۆنتاگۆ و هاتا مر لە لەندەن ئەنجومەنێکی ئەدەبی تایبەت بە ژنانیان بەناوی «گۆرەویە شـــینەکان»ەوە دروستکردبوو. «ژنانی نەجیـــب» (ناوێک کە گیبۆن لێی نابوون) لە پاریس کۆشـــکی هونەریـــان بەرپاکردبوو کە تیایدا فەیلەســـوفانی رۆشنگەری بە قسەکانیان خەڵکیان بەتوندی دەبزواند و هەر لەم کۆشکانەشەوە بوو کە ناویان بووە وێردی ســـەر زمانی هەمووان. «بلێ دۆ زیولین»ی هۆڵەندی کە دواتر بۆ سویســـرا کۆچی کردو بە مادام شاریە بەناوبانگ بوو، ژنێکی زۆر لێهاتوو و شارەزا بوو کە بیروڕای کۆمەڵایەتی پێشکەوتوی هەبوو. جیمز بۆسۆل کە ماوەیەکی کەم پەیوەندی عاشقانەی بە مادام شاریەوە هەبوو، ناوی نابوو «ئازادیخوازی ئاگراوی» چونکە ئەو بە توندی دژی ئەخلاقی ریاکارانەی جنسی بوو.

لەگـــەڵ هەموو ئەمانەشـــدا کاتێک پتر گی باســـی «خێزانی» بیریارانی رۆشـــنگەری دەکات، خێزانێکی لەبەرچاوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە پیاوان پێکهاتووە . رەنگە هیچ ژنێکی رۆشنگەر لە ڕیزی پێشـــەوەی بیریارانی رادیکالی ئەم قۆناغە تا پێش ســـەردەمی شۆڕشگێڕێتی، واتە کاتێک ناوی مادام دواستێلو ماری ولستۆ کرافت (نوسەری مافەکانی ژن) (١٧٩٢) بوونە وێردی سەر زمانی هەموان، دەرنەکەوتبوون. کەنیســـە رێگەی بە ژنـــان دەدا وەک قەدیسو عارف دەرکەونو زۆرێک لە مەلیکەکانو ژنانی ئەرســـتۆکراتو پەیوەســـت بە دەربارەوە وەک دوو سیمای بەرجەستە ماریا ترزاو

کاترینی گەورە، دەسەڵاتێکی سیاسی زۆریان لە رژێمی پێشودا هەبوو. ژمارەیەکی زۆر ژنی نوسەر و ئەدیب لە ســـەدەی هەژدەهەمدا دەرکەوتن کە بیروڕای پێشـــکەوتنخوازانەو پێشڕەوانەیان هەبوو. بەڵام سەرەتا لە سەدەی نۆزدەهەمدا بوو کە ژنانی رۆشنبیری سەربەخۆ وەک گروپێکی کۆمەڵایەتی پێیان خســـتە ناو بواری کۆمەڵگاوە. لەم قۆناغەدایە کە دەکرێت باسی «بزوتنەوەیەکی بایەخداری ژنان» بکرێت. بزوتنەوەی رۆشـــنگەری بەئاراســـتەی رزگارکردنی مرۆڤایەتی، نەک رزگاربوونی ژنان کاری دەکرد.

بزوتنەوەی رۆشنگەری ئەوەندە لیبراڵ بوو کە ئەو دیدە بڵاوبکاتەوە کە دەبێت وەک بونەوەرانێکی لۆژیکی هەڵســـوکەوت لەگەڵ ژناندا بکرێت، بەڵام ئەوەندە نەدەچووە پێشێ کە ئازادی گشتی ژنانو یەکســـانی مافەکانی پیاوانو ژنان بکاتە ئامانجی خۆی. بە پێچەوانەوە هەندێک لە فەیلەســـوفانی رۆشنگەری بەتایبەتی رۆسۆ بەشێوەیەکی دیاریکراو پێداگریان لەسەر جیاکاری لەنێوان کاری ژنانو پیاواندا دەکرد. بەبڕوای ئەم بیریارانە کاری گشتیو مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان تایبەت بە پیاوان بوو، لەکاتێکدا ژنان دەبوو هەنگاو بۆ شێوەی شەرافەتمەندانە بەڵام نەک پڕ شانازی فەزیلەتە فەردیەکان، لێبوردەییو ژیانی خێزانیو پەروەردەکردنی منداڵان بنێن. تیورەکانی هاوچەشـــنی تیورەکانی رۆسۆ کە زۆر لە «فەمەنیســـت بوونی» سیاسەتو «ڕاکێشانی بۆ ژووری خەوتن» دەترسان، سەرلەنوێ لە وتاربێژیەکانی شۆڕشی فەڕەنسادا رەواجیان پەیدا کردەوەو لەسەدەی نۆزدەدا بوون بە بەشێک لە ڕاســـتی ژیانی گشتی. بزوتنەوەی رۆشنگەری بە نرخدانان بۆ «عەقڵ» و هەروەها بە دروشمکردنی چەمکی «خەسڵەتی دایکانە» سیاسەتێکی دولایەنەو ئاڵۆزی لەبارەی ژنانەوە رەواج پێدا.

## سەرچاوە:

وەرگێرانی فەسڵی پێنجەمی ئەم کتێبەیە:

روی پورتر: مقدمەهای بر روشنگری. ترجمە سعید مقدم. تهرات اختران ١٣٧٦.

# پۆستمۆدێرنە

هانز یۆئاخیم تیورك
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

## دەروازە:

ڕۆژ بە ڕۆژ هەمیشـــە پتر لە هونەرەکاندا، لە فەلســـەفە و تیۆریی زانستدا، وشەی «پۆستمۆدێرنە» دەبیســـترێت کە بە هەمان شێوەی «نیو ئەیج» خۆی لە نوێســـەردەم یان مۆدێرنە جیادەکاتەوە. لەژێر ئەم ناوەشـــدا هیوا ئاڕاســـتەی قۆناغێکی نوێی ســـەرەتاگرتوو دەبێتەوە، قۆناغێک کە گەرەکە لە ریشـــەوە کە تا–ئێستا–هەبووە، جیاواز بێت. فەیلەسوف پێتەر کۆسلۆڤسکی کۆتایی مۆدێرنە رادەگەیەنێت و پێشوازی لە پۆستمۆدێرنە دەکات. لە روانگەی ئەم فەیلەسوفەوە «مۆدێرنێتـــی (بریتییە لە) ... فەزڵدانی ئێســـتێتیکی و کۆمەڵایەتی بە نوێ»، پۆستمۆدێرنەش» یاســـاکەی مۆدێرنە بەســـەر خودی مۆدێرنەدا بەگەڕ دەخات: مەزنیدان بە نوێ. مۆدێرنە بە دینامیکەکەی خودی خۆی لە پۆســـتمۆدێرنەدا بە خۆی دەگاتەوە (...). ئیدیالەکانی خولگەیەتی (سیرکولاســـیۆن)، وەرچەرخاندن (رێڤەرسیبیلێتی)، بزۆکی و مۆدێرنیزەکردن لە خێرایی یەکجار زۆری سووڕانەوەدا هیچ شـــتێکی بەڕاســـتی نوێ ناهێننە ئاراوە، چونکە نـــوێ چیدی کاتی نەماوە بۆ ئەوەی ببێت بە یەکجارەکێتی، بە بەدیهاتووی نەشـــیاوی وەرچەرخاندن»[1]. مۆدێرنە داواکارییەکی بۆ دامەزراندنی دوایەمین کۆمەڵگە و ســـەردەمێکی کامڵ بەرزکردەوە، بەڵام مۆدێرنە ئێســـتا لە لایەن نوێترین مۆدێرنێتیی خودی خۆیەوە بۆڕەدرێتەوە و چواندنی لەکار دەخرێت، ئەمەش نەســـازییەکە کە تەنها بەڕێی

پۆستمۆدێرنەیەکەوە شیاوی لابردن (نەفیکردنە)ە.

بڕیارەکە سەبارەت بە نوێسەردەمی مۆدێرن، چ لە هزری نیو ئەیج و چ لە رەخنەی پۆستمۆدێرنانەی کولتووردا هاوشێوەیە. زۆر جار هەردوو بزووتنەوەکە وەک یەک دادەنرێن. بەڵام دەبێت لێرەدا ئاماژە بــۆ ئەوە بدەین کە ئەوان تەنها لە رەفزکردنی تا–ئێســـتا–هەبوودا لەیەک نزیکن نەک لە راگەیاندنی بهاتـــدا. ئەم بهاتــــە بۆ راگەیەنەرانی نیو ئەیج لە رووناکیی خامۆشـــدا دیاردەدات، وێنەی بە رەنگی هەمە چەشنە دەکێشرێت، مەردوم دەتوانێت گەشبینانە هیوای بۆ بخوازێت. جگە لەمە بەئاگابوونی نیو ئەیج ســـەرجەمێتیی گەردوون و سروشـــت و مێـــژوو دەگرێت، ســـنوورەکانی مرۆڤبوونی تاک (ئیندیڤیدوێل) دەتەقێنێتەوە و ئەم مرۆڤبوونە لەنێو پەیوەندییەکی گەردوونیانەدا دادەنێت کە هەر چۆنێک بێت گەرەکە وەک خودایانە بنرخێنرێت. گەر دەستڕاکێشانی هزریو و کرداریانە بۆ سەرجەم، بۆ هەمەکێتی بوون، ئەدگارێکی کرۆکیانەی مۆدێرنە بێت، وەک چۆن زۆر کەس دەبێژن، ئەوا لێرەدا نیـــو ئەیج تەنها بە دەســـتوێژی دیکە درێـــژە بە مۆدێرنە دەدات. بەڵام بەئاگابوونی پۆســـتمۆدێرن دەیەوێت لە پاشـــمۆدێرنەی سەرەتاگرتوودا ئاڕاستەیەکی تەواو جیاواز بگرێتە بەر. ڤۆلفگانگ ڤێلش کە یەکێکە لە شارەزایانی متمانەپێکراوی دانوستاندنی پۆستمۆدێرنانە، بەم چەشنە پۆستمۆدێرنە لە ئەدگارە پیشاندراوەکەی هزری نیو ئەیج جیادەکاتەوە: «پۆستمۆدێرنە لە هەموو فۆرمەکانی مۆنیزم و یەکایەتیدان و هەمەکیدان، لە تاکە یوتۆپیای چواندوو و زەبرە زۆرە شـــاراوەکان دووردەکەوێتەوە و بـــە پێچەوانەی ئەوانـــەوە رووەو پێورێکی رێکخەری جیـــاوازی، رووەو هەمەلایەنێتی و هاڤرکێی پارادیگمـــەکان و پێکەوەهەڵکردنی نەگونجاوییەکان (هێتەرۆگێنێتـــی) دەپەڕێتەوە»[٢]. هەروەها: «مەردوم لێرەدا لە پۆســـتمۆدێرنە دەســـتووری کۆگەراییەکی ریشەیی تێدەگات و بەرگری دەکات لە پۆستمۆدێرنیزم، وەک کۆنسەپســـیۆنەکەی (ئەو کۆگەراییە – و)»[٣]. کاتێک ئەم جۆرە نابەردەوامی و نەگونجاوییـــە، بەڵێ ئەم نەســـازییە لە هـــزر و ژیاندا، لەژێر مەرجەکانـــی مۆدێرنەدا وەک مایەی داخ و گەرەکی نەهێشـــتن، گەرەکی یەکالاکردنەوە دادەنرا، ئەوا هۆشـــی پۆستمۆدێرن بە پێچەوانەوە ستایشـــی ئەم حاڵەتە دەکات و وەک تاکە حاڵەتێکی شـــیاوی شایستەی ژیان وەریدەگرێت: «دوای ئـــەوە کە مەردوم (...) ماڵئاوایی لە چارەســـەرە گلۆباڵەکان وەک مایـــەی داخ نەبینێت، بەڵکو وەک قازانج پێشـــوازیی لێبکات و روو بکاتە گۆڕانی بێقەیدی کۆیەتی و ئاڕاســـتەوەرگرتنەکان، ئەوســـا ئیتر مەردوم بەڕاســـتی دێتەرمینیزم جێدەهێڵێت و دەچێتە نێو راومی / فەزای پۆســـتمۆدێرنانەی هزر و کردارەوە»[٤]. گەر بەمە هۆشـــی پۆســـتمۆدێرنانەی سەردەم کارەکتەریزە کرابێت، ئەوا مەردوم لێرەوە دەتوانێت بەســـانایی ببینێت کە هەتا چەند ئەم هۆشـــە وەک گومانگەرا و رەخنەیی، کۆیی و لێبووردە، لە گەشـــبینیی هزری ســـەرجەمگەرایانەی نیو ئەیج جیاوازە. لەبەر ئەوەی هەردووکیان دیاگنۆز و چارەســـەری جیاوازیان بۆ چاکبوونەوە لە نەخۆشـــییەکانی مۆدێرنـــە هەیە، ئەوا لێرەدا بەوردی لەتەکیاندا خەریک نابین. ئەوەندە بەســـە کە هۆشـــی کۆگەرای پۆســـتمۆدێرنە لە هونەر و فەلســـەفەدا، لە زانست و پراکسیسی ژیاندا، بکرێت بە بابەتی روونکردنەوە. بەڵام هەروەها جیهانی جیاواز ئەو دوو ســـێنە لە یەکتری جیادەکەنەوە: مرۆڤی پۆســـتمۆدێرن، لەبری ئەوەی روو بکاتە هەستێکی یەکایەتیی پیرۆزی گەشبین، لەلایەن حەزێکی تووڕەوە دەبزوێنرێت تاکو لەسەر بورکان سەما بکات.

## 1-پۆستمۆدێرنە لە هونەردا

### A- ئەدەبی پۆستمۆدێرن:

جێناوی «پۆستمۆدێرن» و ناوی «پۆستمۆدێرنە» بە واتای جیاواز لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمەوە لە لای هەندێک نووسەر دەردەکەون، بەبێ ئەوەی مەغزایەکی پوختی ئەم وشانە خۆی لە بەکارهێنانی گشتیی زماندا سەپاندبێت. ئەم کارەکتەریزەکردنانە بۆ یەکەم جار کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستەم لە دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبن بە ناوی قۆناغیی (وەک بۆ نموونە «رۆکۆکۆ»)، ئەمەش لـــە کایەی ئەدەبدا. دوای ئەوە کە ئیرڤینگ هۆو و هاری لێڤین شـــەکەتبوونی ئەدەبی هاوچەرخیان راگەیاند و ئەم دیاردەیەشـــیان بەرانبەر بە مۆدێرنەی کلاسیکی (بۆ نموونە ئێلیۆت، جۆیس) ناو نا «پۆســـتمۆدێرن»، ئیتر بەدووی ئەمەدا هێندەی نەخایاند کە کەســـانی دیکەیش ئەم جۆرە ئەدەبە پاشمۆدێرنەیان بەهۆی چۆنێتییە نوێکەیەوە ستایش کرد. رەخنەگرانی ئەدەبی، وەک سوزن سۆنتاگ و لێســـلی فیدلەر، پاڵهێزیان لەو ئاڕاستە جیاوازانەی هونەرەوە وەرگرت کە لە پەنجاکانەوە جنێویان بە هونەری مۆدێرنی ســـەقامگیربوو دەدا، لەسەر شێوازی تایبەتمەندیان رێیان بەو هونەرە دەگرت و بەمەش سیێنی ئێستێتیکییان توشی شۆک دەکرد. لێرەدا دەتوانین لە هونەری شێوەسازیدا بیر لە راوشـــنبێرگ و وێرهۆل بکەینەوە، لە ئەدەبدا بیر لە کێرۆئاک و گینســـبێرگ و مایلەر بکەینەوە، لە موزیکـــدا لە بیتلس، بـــەڵام لە پانتاییەکی فراوانتردا دەتوانین بیر لە کەیج (Cage) بکەینەوە . ئەم پۆستمۆدێرنەیەی شەســـتەکان، لە بواری بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکاندا، لە بواری چالاکییەکانی دژ بە جەنگی ڤیەتنامدا، لە دۆخی وەرچەرخانەکەی سەردەمی سەرۆک کەنەدی و جۆنسندا، سیمای لێشـــاوی وێنەیی وەرگرت. ئەم پۆستمۆدێرنەیە لە ئەمەریکا «یاخیبوونێک (بوو) دژی ترادیسیۆنی «هونـــەری مەزن» و داواکارییەکەی ئەو هونەرە بۆ هەژموون»، هاوکات پچڕان بوو لەو رەزامەندییە کە لەنێو کۆمەڵگەدا چواندنی هەبوو. لێســـلی فیدلەر، دیســـەمبەری ١٩٦٩ لە گۆتاری «لە ســـنوور بپەڕێنـــەوە، خەندەقەکـــە پڕبکەنـــەوە» (Cross the Border – Close the Gap) نوێیەتییەکـــەی ئەدەبی پۆستمۆدێرن دیاری دەکات. لە پۆستمۆدێرنەدا گەرەکە کولتووری باڵای مۆدێرن، کولتووری ئاڤۆنگاردی-ئێلیتییانـــە و کولتووری عەوامی رۆژانە / نزم لەنێو یەکتریدا شـــکۆفە بکەن. مەردوم بۆی هەیە تەنانەت هەموو شتێکی سواویش دەرببڕێت. «فرەزمانی» یەکێکە لە تێگە بناغەییەکانی ئەم ئەدەبە کە چۆن لەتەک رۆشنبیر دەدوێت، بە هەمان شێوە لەتەک عەوامی جمهوریش دەدوێت، هەروەهـــا دەلاقەی نێوان ئەندێشـــە و ریالێتی، ئەفســـانە و هەقیقەت، جیهانـــی خەون و جیهانی مەکینـــە، پڕدەکاتەوە . لەم ئەدەبەدا لەمپەری نێوان هونەری هەڵزنێنەری یەکشـــەممان و گفتوگۆی میللی ناهێڵرێت، ئەمەش بێگومان بەم بونیادە دوولایەنییە یان بونیادە هەمەلایەنییە دەکات کە چ لە کرۆکە سێمانتییەکەی و چ لە بازنەی ئەدرێساتەوە (وەرگرەوە) ئەو نەسازیانە هەڵدەگرێت (نەفی دەکات) کـــە لە مۆدێرنەدا چواندنیان پێدرابوو. ئەم بزووتنەوەیە لە ئەڵمانیا هەتا ئەمڕۆ نەک تەنها لە رۆژانەییکردنی زمانی ئەدەبی کاتبەســـەربردندا (بێللێتریستیکدا) دەبینرێت، بەڵکو بەتایبەتی یەکەمین هەنگاوەکانی هونەرمەندی شێوەســـاز یـــۆزف بۆیس رۆڵێکی بنەڕەتییان گێڕا بۆ ئەوەی بە

ئاشکرا بناسرێت: هەموو هونەرمەندن، ژیان خۆی هونەرە؛ یان وەک چۆن ئەمڕۆ زۆر جار دەگۆترێت: هەموو چالاکییەکی مرۆڤ کولتوورە.

"بەمەش مەردوم — ١٩٦٩، واتا دە ساڵ پاش سەرەتای دێباتی پۆستمۆدێرنانەی ئەدەب — دەگات بەو فۆرمولە بناغەییە کە ئیتر یەکسەر خۆی بە چواندنەوە بۆ کایەی دیکەش رادەگرێت: پۆستمۆدێرن لەوێدا هەیە، کاتێک کۆگەرایییەکی بنەماییانەی زمان و مۆدێل و شێوازگەلی کارکردن پراکتیزە دەکرێت، ئەمەش بێگومان نەک لەنێو ئیشگەلی جیاوازدا بەپاڵ یەکترییەوە، بەڵکو ئەم کۆگەراییە لەنێو خودی هەمان ئیشێکدا بەردەخرێت، بەکورتی بە شێوەیەکی هەڵنیشتوویی بەسەر یەکترییەوە. «پۆستمۆدێرنە» کە سەرەتا واژەیەکی دەگمەن و ئەوپەڕی نەساز بوو، لە دێباتی ئەدەبدا گەیشت بە سیمای تێگەیەکی راستەقینە و خەریکە لە واژەیەکی نێگەتیڤەوە کە فێنۆمێنگەلی سستکەری دەستنیشان دەکرد، سەربکەوێت بۆ بوون بە واژەیەکی پۆزەتیڤ کە بەرپرسیاریی هەنووکەیی و ئایندەیی دیاری دەکات و وەک ناوەرۆکیش کۆگەرایییەکی روون و ئاشکرای لەخۆ گرتووە»[٥].

ئەدەبناس ئەندریاس هەیسن سەرنجمان رووەو ئەوە رادەکێشێت کە ئامانجی ئەم یاخیبوونە پۆستمۆدێرنە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای شەستەکاندا، هەرگیز رووی نەدەکردە سەرجەمی مۆدێرنە لەکاتی رۆشنگەری یان تەنانەت لەکاتی رێفۆرماسیۆن و رێنیسانسەوە، بەڵکو تەنها چاوی بڕیبووە مۆدێرنیزمێکی ئێستێتیکی کە ریشەی دەگەڕایەوە بۆ بزووتنەوە سەرەتاییە ئاڤۆنگاردیستییەکانی پاش دووەم جەنگی جیهانی و لە پەنجاکاندا ماڵی کرابوو، ئینجا بوو بە پێکهاتەیەکی رەزامەندیی لیبەراڵ-کۆنسەرڤاتیڤ و لە رووی سیاسیشەوە لەکاتی «جەنگی سارد»دا قۆزرایەوە. بەهەر حاڵ قەدەری ئەم پۆستمۆدێرنە هونەرییە، بەتایبەتی پۆستمۆدێرنە ئەدەبییە، هەمان قەدەر بوو کە پێشتر بەسەر تەقەلا ئاڤۆنگاردیستییەکانی کولتووردا هاتبوو، واتا کاتێک ئەوانیش لە لایەن توێژە باڵاکانی کۆمەڵگەوە ماڵی کران. لە حاڵەتی ئەم پۆستمۆدێرنە ئەدەبی و هونەرییەشدا کە سەرەتا یاخیبوون بوو، قبووڵکردنی کۆمەڵایەتی سەریهەڵدا: مەردوم نە لە «دۆکومێنتا»ی کاسل و نە لە تیاتەر و نە لەکاتی خوێندنەوەی برگەی رووتی (خلاعی) نێو ئەدەبە بێستسێلەرەکانی (پڕفرۆشەکانی) کاتبەسەربردندا هەڵدەچێت. بەڵام چۆن کاریگەرییە هەژێنەرەکەی، بە هەمان شێوەش هاوکات هیوای یوتۆپیانە بۆ ئاشتکردنەوەی هونەر و ژیان، هیوا بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە، جێی چۆڵ کرد بۆ هەستێکی بناغەیی رەزامەند. ئیتر هێندەی نەخایاند ناونیشانی «پۆستمۆدێرن»، لەنێو ئەم دۆخگۆڕییەی مێنتالێتی و واتادا، پەڕییەوە بۆ نێو کایەیەکی دی: تەلارسازی.

## B- تەلارسازیی پۆستمۆدێرن:

تێگەی پۆستمۆدێرنە، دوای بەکارهێنانی دەگمەنی لە تەلارسازیدا، ساڵی ١٩٧٥ بەڕێی چارلس جێنکسی ئەمەریکییەوە کە تەلارساز و رەخنەگری کولتوورە و ئەو دەمە بۆ لەندەن گواستبوویەوە، بوو بە واژەیەکی چەسپیو. جێنکس ژمارەیەک نووسینی پەیوەست بەم تێمەوە بڵاوکردەوە، بەڵام بەتایبەتی نووسینەکەی بەناونیشانی «زمانی تەلارسازیی پۆستمۆدێرن» کە ساڵی ١٩٧٧ لە نیویۆرک بە ئینگلیزی بڵاوکرایەوە، تێگەکانی فیدلەری هێنایە نێو تەلارسازییەوە. لە تەلارسازیشدا، وەک لە

ئەدەبدا، دوواتایی وەک مۆرکی پۆســـتمۆدێرنە دادەنرێت: زمانەکەی دەبێت بۆ هەموو یەکێکی سەر جادە شـــیاوی لێتێگەیشتن بێت، بەڵام هەروەها دەبێت بۆ زەینچالاک (ئینتەلەکتوێل) و شارەزایش واتایەکـــی هەبێـــت. فرەزمانی تەنها روو ناکاتە لێروانەر و بەکارهێنـــەر، بەڵکو هەروەها روودەکاتە ناوەرۆکی دەربڕینە بینایییەکە. پۆستمۆدێرنە سەرجەم زمانەکانی تەلارسازی بەکاردەهێنێت، سەرجەم ستیلەکان بەگەڕ دەخات، دەیەوێت و دەبێت بە ئاراستە جیاوازەکانی چێژ بگونجێت. بەڵام مۆدێرنە بە پێچەوانەوە، تەنها رووی دەکردە توێژێکی هەڵبژاردە و فۆرمەکانی زمانی خۆی دۆگماتیزە دەکرد. تەلارســـازییەک بـــە مۆدێرنە دادەنرا، گـــەر ئاوەزمەندی و کارایی (فونکســـیۆن) مۆرکیان پێدابێت، ئەمـــەش لە ئیشـــەکانی رایت، لووک، گرۆپیوس، میـــس فار دێر رۆە، کۆبوزیـــر، ئالتۆ و هەروەها تەلارســـازی دیکەدا دەردەکەوت. ئەم ویستەی ستیل کە لە ســـەرەتای سەدەی بیستەمدا دەرکەوت، بۆ یەکەم جار لەکاتی کلاسیســـیزمەوە سەرلەنوێ فۆرمێکی گشـــتگیر و یەکایەتییانەی دەربڕینی (Ausdruck) خولقاند. ئەمە بۆ نموونە لە ئەڵمانیا لە تەلارسازی تێپەڕی کرد و چووە شێوەی بینا چەند نهۆمییەکانەوە (Bauhaus): ئەم مۆدێرنە تەلارســـازییە، لەچاو قۆناغەکانی دیکەی ســـتیلدا، هەرگیز نەبوو بە میللی، هەروەها لە سەردەمی دوای جەنگدا بوو بە بەرهەمی بێناوەرۆک و قێزەوەنی تەلارسازە وەڕس و بێئیدێکان، یان هینی ئەو دامەزراوانەی پلاندانان و بەڵێندەرایەتی کە بەتایبەتی گرنگییان بە هاوشـــێوەیی دەدا. داواکارییە ئاڤۆنگاردیست و فوتوریستییەکەی کە نزیکەی تەنها لە لایەن ئێلیتێکی ئێســـتێتیکییەوە دەرکی پێدەکرا و ستایش دەکرا، لەنێو نزمێتییەکانی سواوێتیی بێهۆشدا بزر بوو، ئەمەش هاوشێوەی دیاردە و کاریگەرییەکانی ئەدەبی پۆستمۆدێرن بوو، بێگومان هێندە نەبێت کە لەم تەلارسازییەدا روونتر بوو و نزیکەی سەرجەم وڵاتانی جیهانی گرتبووەوە.

لەدژی ئەم مۆدێرنە داوەشـــاوە کە چیدی ئێلیتەیی نەبوو، لە هەشـــتاکاندا نەک تەنها لە وڵاتە یەکگرتووەکانـــی ئەمەریـــکا، بەڵکو لـــە ئەڵمانیاش، کۆیەتیـــی پۆســـتمۆدێرن و فرەزمانییەکەی، دەوڵەمەندییەکـــەی لـــە ئیدێدا، دەرفەتی ســـانای خۆســـەپاندنی هەبوو. زمانـــە هەمەلایەنییەکەی تەلارســـازیی پۆســـتمۆدێرن رەنگ و هەمەلایەنێتیی هێنایە نێو بیناســـازییەوە، مەردوم سەرجەمی ســـتیلەکانی قۆناغەکانی رابـــووردووی بەکارهێنا و هاوکات بۆ ئیدێی نوێ کراوە بوو. ئێســـتا نەک تەنها کارایی دیاریکەری بیناســـازی بوو، بەڵکو ئەندێشە بە هەمان شێوە رۆڵی خۆی دەگێڕا (...). بێگومان تیۆریسازەکانی پۆستمۆدێرنە، لەوانە جێنکس، ڤێنتوری، کلۆتس، هەوڵ دەدەن سەرباری هەمـــوو هەمەلایەنێتییـــەک و کراوەییەک، داواکاری بۆ ســـەرجەمێتییەکیش بهێڵنەوە، بەڵام ئەوەی راســـتی بێت دەمێکە پراکســـیس ئەم داواکارییەی ئەوانی پوچەڵ کردۆتەوە. سیتاتگەرایی مێژوویی و بۆهاتنی (ئیلهامی) کەیفمەندانە زۆر جار گەڕەلاوژێیەکی دێتای دەخەنەوە، پەیوەســـت بەمەشەوە هەندێک کەس دەبێژن گوایە هەموو شـــتێک هاوبەهایە و هیچ شـــتێک بە تەنها دوا چواندنی نییە. ماڵە ناســـراوەکەی هونەرمەندی شێوەساز فریدنسراێش هوندەرتڤاسەر کە ئاشکرایە بە نموونەیەکی پۆستمۆدێرنە دانانرێت، چونکە دروستکردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مۆتیڤی دیکە، نموونەیەکی لەبارە بۆ وەرگرتنی کەیفمەندانەی ســـیتات لە ستیلەکانی رابوردوو و پێکەوەلکاندنی ئیلهامگەلی نوێ کە هەموویان بە پنتئامانجێکەوە پابەندکراون: پێکەوەژیانی مرۆڤ و ماڵ و سروشت. جگە لەمە ئەوەش بەســـەر مۆدێرنەدا هات کە پێشتر بەشی مۆدێرنەی کلاســـیکی بوو: بوو بە میللی، بەمەش بوو بە

شـــتێکی سواو. بەڵام ئەمە ئێستا لە پۆســـتمۆدێرنەدا لەنێو وەرسیی فۆرمە سادەکاندا دەرناکەوێت، واتا ئەو فۆرمە سادانە کە لەتەک کارایيە تەکنیکییەکاندا دەگونجان، بەڵکو لەنێو هەمەلایەنێتییەکی بێئیدیێـــی فۆرمە رابورد و لە خـــۆوە دۆزراوەکاندا دەردەکەوێت کە چیدی لـــە لایەن هیچ ئیدێیەکی پوختێنەرەوە ناگیرێن و بەم رێیەشـــەوە یەکایەتییەکی روون و ئاشـــکرایان پێبدرێت، نەخێر، لێرە کەیفمەندی سەروەرە.

بۆیە هیچ جێی ســـوورمان نییە کە کاتێک نوێنەرانی رەســـەنی پۆســـتمۆدێرنە هەوڵ دەدەن بە روونکردنەوە رەوایەتی بەم کەیفمەندییە بدەن، ئەوا فەیلەســـوف یورگـــن هابەرماس بە پێچەوانەوە دژبێژیـــی کرد: هابەرماس ئەم کەیفمەندییە وەک رۆچوونێک رووەو هەڵوێســـتێکی کۆنســـەرڤاتیڤ دادەنێت. بۆ هابەرماس ماڵئاواییکردنی پۆســـتمۆدێرنانە لە مۆدێرنە هێرشـــێکی ئازا نییە بۆ ســـەر ئایندەیەک، جا ئەو ئایندەیە لە هەر شێوەیەکدا بێت، بەڵکو سووک و ئاسان رۆچوونە بۆ نێو شێوازە هزرینێکی پێشمۆدێرن کە دەیەوێت رۆشنگەرییەکەی نوێسەردەم هەڵبووەشێنێتەوە.

هابەرماس ساڵی ١٩٨٠ لە میانەی گۆتاردانەکەیدا بە بۆنەی بەخشینی خەڵاتی ئادۆرنۆوە، هێرشەکەی بۆ ســـەر پۆستمۆدێرنە بەرخست و ســـاڵی ١٩٨١ لە کردنەوەی پێشانگای «ترادیسیۆنێکی دیکە»دا درێژەی پێدا. هابەرماس ســـەرەتا راڤەی ئەوە دەکات کە ناو دەنرێت هونەری مۆدێرنی بیناســـازی: «بزووتنەوەی مۆدێرن ئەو تەحەدایانە قبووڵ دەکات کە تەلارســـازیی سەدەی نۆزدەیەم دەرەقەتیان نەدەهات، (بزووتنەوەی مۆدێرن) کۆگەرایی ستیل و ئەو جیاکردنەوە و دابەشاندنانە یەکالا دەکاتەوە کە هونەری بیناســـازی خۆی لەتەکیاندا گونجاندبوو، هەروەها بەهۆی ئەو نامۆبوونەوە لە کولتوور کە کایە ئیندوستری-ســـەرمایەدارییەکانی ژیان بۆ نێوی دەخزێت، رووبەرووی ستیلێک دەبێتەوە کە نەک تەنها شـــەقڵ بە بیناکانی رێپرەزەنتاســـیۆن دەدات، بەڵکو تەنانەت دەچێتە نێو پراکسیســـی رۆژانەشـــەوە. ئاخر دەبێت هۆشـــی مۆدێرنە خۆی بە هەمەکێتیی دەربڕینە کۆمەڵایەتییەکانی ژیان رابگەیەنێت»[٦].

لە ســـەرجەمی لێهزرینە پابەندەکاندا بەم پرســـیارەوە هەمیشـــە هەمـــان دیاریکردنی مۆدێرنە دەگەڕێتەوە: یەکالاکردنەوەی ئەو شـــێوازەی ژیانی ســـەدەی نۆزدەیەم کە بەســـەر کایەی جیاوازی ژیاندا دابەشـــی بوو، کە شـــەرم و مەترســـیی دەچەپاند، بـــەڵام ئەم یەکالاکردنەوەیـــە لە خزمەتی ســـەرجەمە کۆنسەپسیۆنێکی راســـتگۆیانەدا ئەنجام دەدات کە لەنێو هەمەکێتییەکەیدا سەرجەمی کایە کۆمەڵایەتییەکان گونجێنراون. لە رووی تەلارسازییەوە، ئاوەزمەندی و هەمەکێتی و ریشەگەرایی هەڵوێســـت، دەبن بە پاڵهێز بۆ خســـتنەوەی یەکایەتیی فۆرم و کارایی. ئەو داواکارییە کە دەڵێت گەرەکـــە فۆرمـــی بیناکراو کارایی بیناکـــە دەرببڕێت، دەبێت بە دۆگمی مۆدێرنـــە. بەڵام هابەرماس ناچارە ئەو هەقیقەتەش بدرکێنێت کە مەردوم نەیتوانی گفتەکانی تەلارسازیی مۆدێرن بەدیبهێنێت: «یوتۆپیای فۆرمێکی بیرکراوەی ژیان (...) نەیتوانی خۆی بە ژیان پڕبکاتەوە، ئەمەش نەک بەهۆی بێئاگاییەکی بێهیواوە لە هەمەلایەنێتی و ئاڵۆزی و دۆخگۆڕیی ژینجیهانە مۆدێرنەکان، بەڵکو ئەمە بەو هۆیەشـــەوە رووی دا، چونکە کۆمەڵگە مۆدێرنیزەکراوەکان لەنێو پەیوەندیی سیستەمیانەیانەوە بەسەر رەهەندەکانی ژینجیهانێکدا تێپەڕ دەکەن کە پلاندانەر تەنها لەنێو ئەندێشەی خۆیدا دەیتوانی بیپێوێـــت. هۆی تەنگژەکانی تەلارســـازیی مۆدێرن کە ئەمڕۆ دەرکەوتـــوون، کەمتر دەگەڕێنەوە بۆ

تەنگژەیەکی خودی تەلارسازی، بە پێچەوانەوە زۆرتر دەگەڕێنەوە بۆ ئەوە کە تەلاسازی ئامادەباشانە دەرفەتی بۆ پەستاندنی خۆی رەخساند»[7].

مەردوم بەتایبەتی نەیتوانی بینای فابریک و بینای سۆسیالی گوزەران بهێنێتە نێو کۆنسەپتە کۆمەڵایەتی و ئێستێتیکییەکانەوە، مەردوم لەنێو دۆشداماوی و ورەبەردانـدا وازی لە گرتنی ئاڤۆنگاردیستیانەی فۆرم و کارایی (فۆنکسیۆنالێتی) هێنا، بەڵێ تەنانەت گومانی ئەوە لە کارایی کرا کە داخۆ شیاو بێت بەتەواوی لەتەک ناچارییە کۆمەڵایەتییەکاندا بگونجێت: «فۆرم و کارایی سەرلەنوێ پرۆگرامییانە لە یەکتری جیادەبنەوە. ئەمە، بە سواوی، نوێهیستۆریزمێک دەگرێتەوە کە فرۆشگە بۆ ریزە بینایەکی چەرخی-ناڤینانە وەردەگۆڕێت و هەواکێشی مێترۆ (U-Bahn) بۆ قەوارەی کتێبی گیرفانی ڤیلایەکی پالادینی. هۆی ئەم گەڕانەوەیە بۆ ئێکلێکتیسیزمی سەدەی رابوردوو، ئەمەش بە هەمان شێوە وەک چۆن ئەو دەمەش رووی دا، بریتییە لە پێداویستیی هاوکێشەگەرایانە (کۆمپێنزاتۆری). ئەم ترادیسیۆنالیزمە لەو رادەیەدا دەچێتە پاڵ نوێ-کۆنسەرڤاتیڤیزمی سیاسی، کە ئەویش کێشەگەلی ئەوتۆ کە خۆیان لەسەر پانتاییەکی دیکە دەبیننەوە، بۆ پرسیاری ستیل هەڵدەگێڕێتەوە و بەمەش لە بەئاگابوونی گشتی دەریان دەکێشێت. پەرچەکرداری هەڵاتن خۆی بە مەیلی ئەرێنییەوە گرێ دەدات: هەر شتێکی دی کە هەیە گەرەکە ئاوها بمێنێتەوە وەک ئەو خۆی چۆنە»[٨].

بێگومان هابەرماس ڕایدەگەیەنێت کە لە هەندێک ئیشی پۆستمۆدێرندا پرسیارە چارەسەرنەکراوەکان لایەنی کەم بە شاراوەیی شیاوی بینینن، کەواتە مەرج نییە هەمووی تەنها تەلارسازیی ساختەچییانەی کوالیس بێت، بەڵکو هەروەها لە پشتی هەڵوەشاندنەوەی کارایی و هەمەکێتیی مۆدێرنەوە مەبەستی ئەلتەرناتیڤ و زیندوویەتی (ڤیتالیستی) و ژینگەیی کاریگەرن. بەڵام هابەرماس سەرباری ئەم هەقیقەتە هێشتا هەر جەخت لە نرخاندنەکەی خۆی دەکات. ئەوە کە ناودەنرێت پۆستمۆدێرن، شیاوی تێگەیشتنە وەک پەرچەکردارێک لەسەر کێشە چارەسەرنەکراوە زۆر ئاڵۆزەکانی مۆدێرنە، بەڵام ئەم پەرچەکردارە تەنها وەک هەڵاتن رووەو نزمە ئاڵۆزێکی (Unterkomplexität) پێش-مۆدێرن، بەکورتی وەک نوێ کۆنسەرڤاتیڤ شیاوی راڤەکردنە. با ئەو پرسیارە وەلاوە بنرێت کە داخۆ هەموو تەلارسازە ئافرێنەرەکان بەم چەشنە لە خۆیان تێگەشتبێتن، بێگومان هابەرماس خۆشی نایەوێت شتێکی بەم چەشنە دەرببڕێت. بەڵام بەهەرحاڵ بیناکردنی پۆستمۆدێرن لە لایەن ئەو کەسانەوە قۆزرایەوە کە بەرەو پاش ئاڕاستەیان وەردەگرت و هیچ هیوایەکیان بە ئایندەی ئێستێتیکی و سیاسیی نوێ نەبوو.

تێزەکەی هابەرماس بەتیژی دژبێژی کرا. ئەدەبناسی ئەمەریکی ئەندریاس هەیسن لە وڵاتی سەرچاوەی پۆستمۆدێرنەوە لەم کێشەیە دەڕوانێت: «بەهۆی ئەو هێزکایە ئێستێتیکییەوە کە شەقڵی داوە بە تێگەی پۆستمۆدێرن، هیچ نوێ-کۆنسەرڤاتیڤێکی ئەمەریکی ناگات بەو تێڕوانینە کە پرۆژەی نوێ-کۆنسەرڤاتیڤ وەک پۆستمۆدێرن دابنێت»[٩]. ئاخر مۆدێرنە بۆ هابەرماس بریتییە لە: رۆشنگەری، رەخنە، ئازادکردن (ئێمانسیپاسیۆن)، بەڵام نوێ-کۆنسەرڤاتیڤەکان پشت بە نۆرم و بەهای گەیەنراو (ترادیسیۆنی) دەبەستن و داوای پاراستنیان دەکەن لەدژی رەخنە و گۆڕین. هەیسن، لایەنی کەم پابەند بە سیێنی ئەمەریکییەوە، دەبێژێت: «هابەرماس دەبێت لە هاوتادانانی

پۆستمۆدێرنە و نویَ-کۆنسەرڤاتیڤیزمدا بەسەهوودا چووبێت»[١٠].

بەڵام هەروەها هایدریش کلۆتس کە یەکێکە لە چاکترین شارەزایانی تەلارسازی، بەرهەڵستی لەدژی روونکرنەوەیەکی یەکمەغزایی پۆســـتمۆدێرنە دەنوێنێت. ئەم بەم چەشــنە پێناسەی پۆستمۆدێرنە دەکات: «گەر تەلارســـازی نەک تەنها هۆشرایەڵی بەدیهێنانی کارایی و ئاسانکردنەوەی شیاو، بەڵکو هەروەها هۆشرایەڵی یاسای دیکە بێت، گەر تەلارسازی رەهەندێک لە ئەبستراکسیۆنەوە بە ئاڕاستەی بابەتاندن وەربگرێت، ئەوا من لە تەلارسازییەکی پۆستمۆدێرن دەدوێم، بەمەش مەبەستم لەوەیە کە تەلارسازی چیدی لە لای خۆی بە کۆتاییەکەی خۆی ناگات، کۆتاییەک وەک ریالیزەکردنی جەستەگەلی سێڕەهەندیی پەتی، بەڵکو دەتوانێت ببێت بە دەسوێژ بۆ پیشاندانی ناوەرۆکگەلی هەمەچەشنەترین جۆر: تەلارسازی وەک 'ئیشێکی دیاردەی جوان، نەک تەنها وەک 'ئامرازی مەبەستبەدیهێنان»[١١].

ئەمە بۆ کلۆتس بە کۆنکرێت بریتییە لە: ناوچەگەرایی نەک نێونەتەوەگەرایی، داڕشتنی وێنەیی ئەندێشـــەیی نەک ئەبستراکسیۆنی ئەندازەیی، ئەندێشەی دیاردەییش نەک تەنها کارایی، فۆڕماندنی ناڕاتیڤ نەک هەڵبەستن (کۆنستروکسیۆن)، ئەندێشە نەک تەکنیک-یوتۆپیا، داڕشتنی فوجائی و سپۆنتانێتی نەک کامیلاندن (پێرفێکسیۆن)، یادهێنانەوە پێکەوە لەتەک سیتاتگەرایی تەوسمەنددا نەک دابڕاوی لە مێژوو[١٢].

لەم حاڵەتەدا ئیتر پۆســـتمۆدێرنەی کولتووری بریتی دەبێت لە درێژەدان بە مۆدێرنە (بێگومان نەک تەنها مۆدێرنەی تەلارســـازیی مۆدێرنی ســـەدەی بیســـتەم لە واتایەکی تەسکدا) و جیاوازترین پاڵهێزەکانی، ئەم درێژەدانەش بە ســـەرجەمی ئەو دەسوێژانە بەگەڕ دەخرێت کە بەمێژوویی پێمان گەیشـــتوون. مۆدێرنە لەم مەغزایەدا کە ئێمە هەتا ئێستا پیشـــانمان داوە، دەبێت بە ترادیسیۆن، پۆســـتمۆدێرنەش دەبێت بـــە ئایندەیەکی ئافرێنەر، ئایندەیەک کە چیـــدی دۆگماتیانە وەک رێنوما ناسەپێنرێت، جا گەرچی بێشەرمانە سەرجەمی ئەوە بەکاردەهێنێت کە رابوردووە.

هەروەها فەیلەســـوف ئەلبرێشت ڤێلمەر ساڵی ١٩٨٢ (...) بەرگریی لە تەلارسازیی پۆستمۆدێرن کرد. ئەم تەنانەت هیستۆریزم و ئێکلێکتیسیزمەکەی پۆستمۆدێرنەی وەک «راستکردنەوە لەنێو خودی ترادیســـیۆنی مۆدێرندا»[١٣] دیاری کرد. ڤێلمەر لە پۆستمۆدێرنەدا ئازادبوونێک دەبینێت: ئازادبوون لە تەســـککردنەوەیەکی زەبرمەند بەسەر شـــتێکەوە کە دەبوو مۆدێرن بێت، یان لە پۆستمۆدێرنەدا «بەردانی وزەکانی شـــیاوی راگەیاندن» دەبینێت، بەردانێک کـــە لێوەی «کۆگەراییەکی بەهاگەل و واتاگەل و فۆرمگەلی ژیان» شکۆفە دەکات[١٤].

بێگومان بەتایبەتی تەلارســـازەکان خۆیان نایانەوێت لە روانگەکەی هابەرماسەوە حسابیان لەنێو کۆنسەرڤاتیڤەکاندا بۆ بکرێت، ئەوان لەکاتی پیشانگا هەژێنەرەکەی بینالەی ١٩٨٠ لە ڤینیسیا (...) بـــەدواوە دەیانەوێت خۆیان لە کۆتەکانی مۆدێرنەیـــەک ئازاد بکەن کە لە خۆی کۆتاییەکی مێژوویی تەلارســـازی تێدەگەیشـــت- کۆتاییەکی نەشـــیاوی تێپەڕاندن. ئەوە ئازادبوونە لە یاساغ و وازهێنان و ســـنووردانانە مۆدێرنەکان کە ئایندەیەکی دیموکراتی ئـــاوەڵا دەکات. هەموو یەکێک دەتوانێت لە تەلارســـازییەکی ئازادکراودا دەروویەک ببینێتەوە و ســـۆزمەندانە خۆی پێـــوە پابەند بکات. ئا بەم شـــێوەیە تەلارســـازی رۆمی، پاولۆ پۆرتۆگێزی کە رێکخەری پیشانگاکەی ڤینیسیا بوو، مەسەلەکە دەبینێت.

## C-پۆستمۆدێرنە لە شێوەسازی و هونەری دیکەدا:

هەروەها لە هونەرە شێوەسازییەکانی دیکەدا، وەک چۆن لە تەلارسازیدا بینیمان، بزووتنەوەیەک لە کۆتایی حەفتاکانەوە دەبینرێت، بەڵام کەمتر ناونیشانی «پۆستمۆدێرن» بۆ ئەم بزووتنەوەیە بەکاردەهێنرێت. هۆی ئەمە ئاشکرایە: کاتێک ستیلی کارایی، ئەبستراکت، بۆ ماوەی چەندین دەیە سەروەریی خۆی لە تەلارسازیدا دابین کردبوو، ئەوا بە پێچەوانەوە پانتاییەکە لە رەسم و پەیکەری مۆدێرنەی سەدەی بیستەمدا هەمیشە فراوانتر و رەنگینتر بوو، بەڵێ تاڕادەیەک نەساز (متناقض) بوو. لە نێوان ریالیزمی نائیف و ئەبستراکسیۆنی پەتیدا هەموو جۆرێکی دیکە شیاو بوو، کە ئیتر دەشیا هەموویان لەژێر «مۆدێرنە»دا کۆبکرێنە و هیچ ئازادبوونێک بەئاڕاستەی شتێکی دیکەی جیاواز پێویست نەبوو. لێرە ماوەیەکی درێژخایەن کۆگەرایی ستیلگەل و فۆرمگەل و گۆزارەگەل مۆرکی خودی مۆدێرنە بوو، لێرەشەوە ئەو ئاماژەیە کە لە سەرەوە دامان، لەم کایەیەدا دەڕاستێنرێت: پۆستمۆدێرنە تەنها بەردەوامیپێدانی هەوڵە بنەماییە مۆدێرنەکانە، بەڵام بێگومان بە کۆییدانێکی ریشەییەوە. مێژووناسی هونەر ئاخیل بۆنیتۆ ئۆلیڤا ی ئیتالی ساڵی ١٩٨٠ پێشنیاری ناونیشانێکی نوێی کرد بۆ ئەوە کە (سەرباری ئەوەی گۆترا) دەیەوێت پاش-مۆدێرن بێت. ئۆلیڤا لە «ترانس-ئاڤۆنگارد» دەدوێت بە پێچەوانەی هاوتادانانی ئاڤۆنگارد و مۆدێرنە لە شێوەسازیدا کە هەتا ئەو دەمە باو بوو.

(«ترانس-ئاڤۆنگارد» ئەمە واتای وەرگرتنی هەڵوێستێکی کۆچەرییانە دەگەیەنێت کە رێز لە ئەنگاژمۆیەکی وەک رێنوما سەپێنراو ناگرێت، کە خاوەنی هیچ ئێتیکێکی فەزلپێدراو نییە، بەڵکو تەنها شوێن ئیلهامەکانی چوستێتییەکی هۆشەکی و هەروەها شوێن کەرەسە دەکەوێت، شوێن ئەوە دەکەوێت کە بە ئێرە و ئێستای ئیشەکە هاوکاتە». «ترانس-ئاڤۆنگارد خۆی ئاوەڵا دەکات و وەرچەرخانێک بە سێنسێتی / سێنسناسکی دەدات، ئەمەش وەرچەرخانێکە کە بە هەموو ئاڕاستەکاندا دەرفەتی بزووتنێک بۆ هونەر دەرەخسێنێت — بە رابوردوویشەوە»[١٥].

کەواتە مەسەلەکە بریتییە لە راستەوخۆیی و هەمەلایەنێتی، ئەندێشە و سێنسناسکی، بەڵام بەتایبەتی ئازادی خۆمەندانەی فۆرماندن بەبێ راسپاردەگەلی کۆمەڵایەتی و بەبێ یاساغی پڕموبالەغە! هونەر دوایەمین جێی حەوانەوەیە لەنێو جەرگەی کارەساتی گشتیدا، هونەر لە شێواوی (کائۆس) نزیک دەکەوێتەوە، بەڵام بەرانبەر بە تێکشکان مەناعەی هەیە، هونەر دوایەمین جێی مانەوەیە (بەقایە). ئۆلیڤا ئەم تێزانەی بە ئیشەکانی (Chia, Clemente, Cucchi, De Maria, Paladino) ئاوەڵا کرد، بەڵام مەردوم دەتوانێت ئەم تێزانە بە زۆر ئیشی پیشانگاکانی «دۆکومێنتا»ی کاسل بناغەبڕێژێت.

فەیلەسوف و نووسەر ئومبێرتۆ ئێکۆ کە بە رۆمانی (هەروەها فیلمی) «ناوی گوڵ» لەسەر ئاستی جیهان ناسرا، گۆڕانی دا بە تیۆرییەکی گرنگی هونەرە پۆستمۆدێرنەکان. ئێکۆ وای دەبینێت کە مەردوم سەرەتای پۆستمۆدێرنە هەمیشە بەردەوام بەرەو پاش دەباتەوە، هەتا ئیتر ناچارە بە هۆمێر بگات. لەم روانگەیەوە دەبێت هەموو قۆناغێکی هونەر لە بنەڕەتدا پۆستمۆدێرنەکەی خۆی لە خۆ بگرێت. بەڵام ئێکۆ دەبێژێت: «من بە پێچەوانەوە وا باوەڕ دەکەم، «پۆستمۆدێرن» ڕەوتێک

نییە کە کاتەکییانە شیاوی دیاریکردن بێت، بەڵکو هەڵوێستێکی هۆشەکییە، یان پوختتر ببێژم، شێوازێکی کارکردنە (Vorgehensweise)، ویستنێکی هونەرە»[١٦]. ئاڤۆنگارد هەمیشە دەیەوێت رابوردوو تێکبشکێنێت. لە رەسمدا فیگور هەڵدەوەشێنرێتەوە کە ئیتر مەردوم دەگات بە ئەبستراکت و ئینفۆرمێل، دەگات بە پەردەی سپی و لە کۆتاییدا دڕاوی سینەما، بەڵێ دەگات بە پەردەی سووتاوی سینەما. ئاڤۆنگارد لە موزیکدا سیستەمی تۆنالی دوڕ و مۆلی هەڵوەشاندەوە و ئینجا بەسەر ئاتۆنالێتیدا گەیشت بە ژاوەژاو (Geräusch)، بە تەقوهوڕ (Lärm)، بە بێدەنگبوونی تەواو. «بەڵام ئیتر پاشان ساتێک دێتە ئاراوە کە ئاڤۆنگارد (بەکورتی مۆدێرنە) ناتوانێت هیچ هەنگاوێکی دی بەرەو پێشەوە بنێت، چونکە ئەو ئێستا مێتازمانێکی هێناوەتە ئاراوە کە لەبارەی تێکستە مەحاڵەکانی خۆی دەدوێت (die Konzept Art). وەڵامی پۆستمۆدێرن بۆ مۆدێرنە بریتییە لە دەرککردن و پێزانین بەوە کە پێویستە رابوردوو، دوای ئەوەی دەرکەوت نەشیاوە تێکبشکێنرێت، چونکە تێکشکاندنی ئەو بێدەنگبوون دەخاتەوە، بە شێوازێکی نوێ رووی تێبکرێتەوە: بە تەوس (ئیرۆنی)، بەبێ بێگوناهی»[١٧]. کێشەکە لە ئاخافتنی رۆژانەشدا هەر بەم چەشنەیە: مەردوم چیدی ناتوانێت ببێژێت: «من تۆم خۆشدەوێت»، چونکە ئەمە سواوە، مەردوم بە پێچەوانەوە دەتوانێت ببێژێت: (وەک چۆن لە رۆمانی خۆشەویستیی NN دا دەبێژێت «من تۆم خۆش دەوێت»). تەوس بریتییە لە گەمەی مێتازمانیانە، لە داپۆشین، بەڵام سەرباری ئەمە مەردوم دەتوانێت تەوسەکە بەجیدی وەربگرێت، تەنانەت لەو کاتەشدا کە لێی تێناگات. چەند نموونەیەک لە شێوەسازییەوە: کۆلاژەکانی ماکس ئێرنست پۆستمۆدێرنن، بەڵام ئەوانەی براک، گریس و پیکاسۆ هێشتا مۆدێرنن.

رەهەندی هاوشێوە، کە لە شێوەسازیدا بینرا، دەشێت لە هەموو کایەکانی هونەردا ببینرێت: چ لە شانۆ و چ لە سەمادا، چ لە موزیک و چ لە ئەدەبدا. بێگومان ئێمە لێرەدا ئەو پرسیارە بە کراوەیی دەهێڵینەوە کە داخۆ کارەکتەریزەکردنەکەی ئێکۆ، کە دەڵێت پۆستمۆدێرنە واتای تەوس دەگەیەنێت، زۆرتر بێت لە تەنها تیژکردنەوەیەکی لەڕادەبەدەری کێشەکە. بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا پێوری (کانۆنی) ئەوە کە ئێستێتیک رێی پێدەدات یان وەک رێنوما دایدەنێت یان یاساغی دەکات، جێهێڵراوە. جوان هاومافانە خۆی بەپاڵ ناشرینەوە دەبینێتەوە: هەموو شتێک شیاوە. هەمیشە لەنوێوە دەگۆترێت: کۆییدانی ریشەیی کە هەموو شتێک لە خۆ بگرێت. ئەوەش تەنها نیشانەیەکی دەرەکییە بۆ دۆخێکی ناخەکییانەی ئێستێتیکی کە لە رووی یاساییەوە نە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و نە لە ئەڵمانیا نزیکەی چیدی هیچ سنوورێکی رەوشت و مۆراڵ و چێژ لە بەردەم هونەردا ناکێشرێت.

کلێسەکان و زۆر کریست لەتەک ئەم بەردانەی سەرجەم شیمانە هونەرییەکاندا ناگونجێن. پرۆتستۆ لەدژی فیلمی تایبەتی، هەرەشەی تەقاندنەوە لەدژی سینەماکان، خۆپیشاندان لە بەردەم نمایشەکانی شانۆدا، دانانی دادگای بلازفێمی بۆ هونەرمەندان، سکاڵای پڕتەقەلا لەدژی کتێبی تایبەتی و زۆری دیکەی هاوشێوە، لە نزیکترین رابوردوودا بینراون. بەڵام نزیکەی سەرجەمی ئەو جۆرە پرۆژانە بەبێ سەرکەوتن کۆتاییان پێهاتووە، بەڵێ بەزۆری رۆڵێکیان بۆ ناسینی زیاتری ئەو جۆرە ئیشە هونەری و هونەرمەندانە گێڕاوە کە هێرشیان کراوەتە سەر. بێگومان مەسەلەکە لێرەدا تەنها پرسیاری ستراتیژی و تاکتیک نییە لە راسپاردەی کلێسەکان و تاکە کریستەکاندا کە دەیدەن

بە ناوەندی گشـــتی، بەڵکو هەروەها بریتییە لەو پرســـیارە کە داخۆ ئەوان لە پرنســـیپەوە مافیان هەبێت یان زەروور بێت خۆیان لەو مەسەلانە هەڵبقورتێنن. ئایا پێویستە مەردوم بەئاشکرا چالاکانە لەدژی هۆشی ســـەردەم بەرهەڵستی بنوێنێت یان گەرەکە کریســـتەکان خۆیان لەنێو ئەم کایەیەدا بگونجێنن، بەڵێ تەنانەت دەرک بە چانســـەکانی بکەن؟ ئایا ئازادیی ئێســـتێتیکی و هەمەلایەنی، نەسازی و کراوەیی، مەترسین بۆ ئیمانی کریستیانی و ژیانی بەئیمان، یان ئەم لایەنانە لە سەردەمی ئەمڕۆدا شیمانەی نوێ و چاکتر بۆ ژیانێکی کریستیانەی راستەقینە دەخەنەوە؟ ئەمە هێندە ئاسان وەڵام نادرێتەوە.

## 2-فەلسەفەی پۆستمۆدێرن

### کۆتایی مێتا-چیرۆکەکان (حیکایەتە مەزنەکان): ژۆن-فرەنسوا لیۆتارد

تێگەی «پۆستمۆدێرنە» بە پوختترین و دیاریکراوترین شێوە لە فەلسەفەدا، لێرەش لە فەلسەفەی نوێی فەرەنســـیدا، هاتە دەربڕین. ئەم تێگەیە کە سەرەتا لە ئێستێتیک و سۆسیۆلۆژییەوە وەرگیرا بوو، بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٧٩ لە فەلسەفەی زانکۆییدا (پرۆفیسیۆنێلدا) دەرکەوت: بە نووسینەکەی ژۆن-فرەنســـوا لیۆتارد لەژێر ناونیشانی «زانینی پۆســـتمۆدێرن»دا (بە فەرەنسی: La Condition postmoderne). ئـــەو دەمە نە فەرهەنگی دودنی ئەڵمانی، بەشـــی رێنوس، و نە لێکســـیکۆنەکان یان کۆئیشـــەکان ئەم وشـــەیەیان دەناسی. وشەکە سەرەتا ســـاڵی ١٩٨٦ لە نۆزدەیەمین چاپدا وەک ناونیشـــانێکی تەلارسازیانە چووە نێو فەرهەنگی دودنەوە. «پۆستمۆدێرن» چەند ساڵێک درەنگتر، دوای ئەوە لە فەرەنسا بڵاوببووبۆوە، واتایەکی فەلسەفیی وەرگرت.

نووســـینەکەی لیۆتارد ئیشێک بوو کە ئەنجومەنی زانکۆی حکومەتی (Québec)ی کەنەدی وەک راسپاردە پێیدابوو. ئەم ئیشە گەرەک بوو بناغەیەک بۆ پلاندانانی زانکۆ و زانستدا برێژێت. لیۆتارد لەم پرســـیارەدا لە تەکنۆلۆژییە مۆدێرنەکانی ئینفۆرماســـیۆنەوە دەردەچێت، راڤەی رێســـای زانین (Wissen)ی گونجاو بەو تەکنۆلۆژییانە دەکات، لێرەشـــدا ئەو فۆرمە پێگونجاوەی زانین سەرلەنوێ وەک پێوەری رەخنەیی بۆ نرخاندنی تەکنۆلۆژییە نوێترەکان وەردەگرێتەوە.

ئـــەدگاری زانینی پاشـــمۆدێرن لە لایەک بەندە بە تەکنۆلۆژیای نوێی کۆمونیکاســـیۆنەوە، بەڵام ئـــەو زانینە لە لایەکی دی دەبێت تەحەداکانی هەمان تەکنۆلۆژیا قبووڵ بکات و بەدووی وەڵامگەلی رەخنەییدا بگەڕێت.

"زانینـــی مۆدێرن هەردەم فۆرمی یەکایەتیی هەبـــوو و ئەم یەکایەتییە بەڕێی گەڕانەوە بۆ مێتا-چیرۆکـــە مەزنـــەکان هاتبووە ئاراوە. تەنانەت لـــە دوورترینی وردە توێژینەوەکانـــدا گەڕانەوەیەکی بەو چەشـــنە بۆ رابەرە ئیدێیەکی رەوایەتیدەر دیار بوو. نوێســـەردەم یان مۆدێرنە ســـێ جۆری ئەم مێتا-چیرۆکانـــەی هێنایە ئاراوە: ئازادکردنی مرۆڤایەتی (لە رۆشـــنگەریدا)، تێلیۆلۆژیی هۆش (لە ئیدیالیزمدا)، هێرمینۆتیکی مەغزا (لە هیستۆریزمدا). بەڵام مۆرکی دۆخی هەنووکە بە پێچەوانەوە

ئەوەیە کە ئەمڕۆ ئەم تێڕوانینانەی یەکایەتی زیادەن، ئەمەش نەک تەنها بەگوێرەی ئەو ناوەڕۆکانە کـــە ناومان هێنان، بەڵکو هەروەها بەگوێرەی ســـەرجەمی جۆرەکەیان. هەمەکێتی کۆن بوو و ئیتر بەردانی کەرتەکان سەریهەڵدا»[18].

مێتا–چیرۆکـــەکان، واتا چیرۆک لەبـــارەی چیرۆک، بریتین لە سیســـتەمە رابەریکەرەکانی هزر کە هەموو شـــتێک لەنێـــو خۆیاندا دەگونجێنن و راڤـــە دەکەن. ئەوان چیرۆکـــن، چونکە روودانگە (Wirklichkeit) بۆ لیۆتارد، ئەمەش بەپوختی پابەند بە شێوازی هزرینی فەرەنسییەوە، راستەوخۆ شـــیاوی تێگەیشـــتن نییە، بەڵکو تەنها لە فۆرمی زماندا شـــیاوی گرتنە (تێگەیشتنە). ئیدێکەی رۆشنگەری ئەوە بوو کە مرۆڤان لە چەوساندنەوەی هۆشەکی و سیاسی و ئایینی ئازاد بکات، فەلسەفەی ئیدیالیســـتی وایدەبینی کە لە گەردووندا، لە کولتوور یان لە کۆمەڵگەدا، بەڵێ بەڕاســـتی لە تاکی مرۆڤدا، بزووتنێکی ئامانجداری (تێلیۆلۆژیانەی) ئاوەز کارایە، هیستۆریزمیش هەر تاکە مێژوویەک روون دەکاتەوە و تێیدا مەغزایەک ئاشـــکرا دەکات. ئـــەم هەموو مێتا–چیرۆکانەی مۆدێرنە لە لایەن هیواگەل، لە لایەن گەشبینیی ناسین (Erkenntnis/مەعریفە) و بڕوای پێشکەوتنەوە هەڵگیرابوون، ئەمانە سەراپا، بە شێوەیەکی کۆنکرێت، لەو ئیدێیانەدا دەرکەوتن کە شۆڕشی فەرەنسییان خستەوە، هەروەها لە مارکسیزمدا، لە جیهانەئیدێی هومانیستیانەی لیبەرالەکان و ئایینەکاندا دەرکەوتن، بەڵام بەتایبەتی لەوێدا دەرکەوتن کە کاتێک مەردوم دەخوازێت ســـەرلەنوێ لە سفرێکەوە سەرەتای مێژوو بداتەوە. بەڵام لە روانگەی لیۆتارد «دەتوانین بە ئەوپەڕی ئاســـانکراوی ببێژین: «پۆستمۆدێرنە» ئەو واتایە دەگەیەنێت کە مەردوم چیدی بڕوا بە مێتا–چیرۆکەکان نەکات»[19].

تەکنۆلۆژیا نوێکان رۆڵێکی کرۆکی دەگێڕن لەم داوەشـــانەی ئیدێ دروستکەرەکانی یەکایەتی و رەواندنەوەی ئەو هیوایانەدا کە بە خودی ئیدێی یەکایەتییەوە بەندن. تەکنۆلۆژیا نوێکان سەرجەمی ئینفۆرماسیۆنەکان بەسەر وردترین یەکەدا، واتا بەسەر بیتسدا (bits) دابەش دەکەن و ئەم یەکانە لەبارن بۆ ئەوەی هەر شـــێوەیەکی سیســـتەم، هەر شێوەیەکی مەبەســـت، رێکبخەن. ئەوە کە هەتا ئێســـتا ناو دەنرا کولتوور، وەردەفۆرمێندرێت بۆ ئیندوســـتری. سەرجەمی گەمە زمانییەکان شیاو و رێپێدراون، سەرجەمی مۆدێلەکانی (نموذج) کردار هاوتا بەپاڵ یەکترییەوەن، بەڵام هەروەها سەرجەمی شـــێوازەکانی ژیان و سەرجەمی نرخاندنەکان شیاو نین لەتەک یەکتریدا بەراورد بکرێن. نوێ لێرەدا بەتایبەتـــی ئەوەیە کە نەک تەنها ئـــەم هەقیقەتەی کۆگەرایی داوا دەکرێت، دەرکپێدەکرێت و رەنگە هەروەهـــا جێی داخ بێت، بەڵکو مەردوم هاوکات وەک چانس و قازانج لێی تێدەگات. پۆســـتمۆدێرنە تەنانەت تاســـەی بۆ یەکایەتیش نەماوە. بەم پێیە ئیتر هیچ مۆدێلێکی ناسین (Erkenntnis) یان ژیان فەزلی نییە، چیدی ئیتر ناشێت رەوایەتی بە چەوساندنەوە بدرێت.

"ئیتر با لە کۆتاییدا روون ببێتەوە کە ئێمە هیچ مافێکمان بۆ خستنەوەی هەقیقەت (Wirklichkeit) نییە، بەڵکو ئێمە ئەوپەڕی بۆمان هەیە لوغز بۆ شـــتێکی شیاوی هیزرین، بەڵام نەشیاوی داڕشتن، دابهێنیـــن (ئیختیراع بکەین). بێگومان مـــەردوم ناتوانێت لەم ئەرکە تەنانەت چاوەڕوانیی کەمترین گونجانـــدن (Versöhnung) لە نێوان «گەمە زمانییەکان»دا بکات: کانت کە ناوی دەنان توانســـت (Vermögen)، دەیزانـــی ئـــەوان بەرێی خەرەندێکەوە لە یەکتری دابـــڕاون، بۆیە ئەو تەنها پێیکرا هیوای بۆ بەدئەندێشـــەیەکی ترانســـێندێنتال (ئەوەکەی هێگل) هەبێت تاکو لەنێو یەکایەتییەکی

هەقیقیدا (wirklich) قبووڵیان بکات. بەڵام کانت هاوکات ئەوەشی دەزانی کە تەنها بە تێرۆر هەقی ئەم بەدئەندێشەیە دەدرێت. سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم سەرجەم بڕی ئەم تێرۆرەیان پیشانداین. تاسە بۆ هەمەکێتی و یەکایەتی، بۆ گونجاندنی تێگە و سێنسێتی (ئەلمەحسوسیە)، بۆ ئەزموونی شەفاف و شیاوی کۆمونیکاسیۆن، زۆر گران کەوت لەسەرمان. لەپشت داواکاریی گشتییەوە بۆ حەوانەوە و ئارامی، زۆر بەڕوونی دەرک بە بۆڵەی خۆزگە دەکەین تاکو جارێکی دی دەستبکرێتەوە بە تێرۆر، یان تاکو وێنای گرتنی سەرجەمییانەی روودانگە (Wirklichkeit) بچێتە فۆرمی کردارەوە. بەڵام وەڵامی سەرجەم ئەمە بریتییە لە: جەنگ دژی هەمەکێتی، با شایەتی بۆ ئەوە بدەین کە نەشیاوی داڕشتنە، با جیاوازییەکان چالاک بکەین، با شەرەفی ناو رزگار بکەین»[٢٠].

لێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێت، وازهێنان لە زمانێکی گەرەنتیدەر بە یەکایەتی، هەروەها هەمەلایەنێتیی توانستەکانی ناسین لەو شێوەیەدا کە کانت راڤەیان دەکات، نەک تەنها کێشەیەکی فەلسەفی لەخۆ دەگرێت، بەڵکو تەنانەت سەرەنجامی کۆمەڵایەتیی لێدەکەوێتەوە: بەناوی هێگلەوە کە ویستی گومانە رەخنەییەکەی کانت یەکالا بکاتەوە و هەمەکێتی لەنێو ناسین (Erkennen) و لەنێو جیهاندا دابڕێژێت، سیستەمی جیاوازی چ راستڕەو و چ چەپڕەو دامەزرێنران. ناسیۆنالیزمی پرۆیسی-ئەڵمانی بە هەمان شێوەی هەر جۆرێکی مارکسیزم، هەوڵی دەدا پابەند بە هێگلەوە رەوایەتی بە خۆی بدات. پۆستمۆدێرنە تەنها وازهێنانێکی ناسینیانە (مەعریفی) نییە لە هەمەکێتی، بەڵکو وازهێنانێکی سیاسیانەی هەمەکێتیشە.

بەڵام لێرەدا گەرەکە هاوکات ئاماژە بۆ ئەوە بدەین کە پۆستمۆدێرنە بۆ لیۆتارد بریتی نییە لە قۆناغێکی پاش مۆدێرنە، قۆناغێک کە کاتەکییانە شیاوی دیاریکردن بێت، بەڵکو لیۆتارد وەک هەڵوێستێکی هۆشەکی لێی دەڕوانێت کە هەر لە سەرەتاوە بە چەشنێک لەنێو مۆدێرنەی نوێتر، لەنێو مۆدێرنەی ئاڤۆنگاردیستیدا، هەیە کە هەر وەک لە باوەشی خۆی گرتبێت. لیۆتارد بەتوندی قۆناغاندنی رواڵەتی رەفز دەکات. جگە لەمە ڤۆلفگانگ ڤێلش کە بەڕاستی هاوهزرترین راڤەکەری (شارحی) لیۆتاردە، گەڤمان دەکات کە نابێت تێگەی «پۆستمۆدێرنە» لە لای لیۆتارد هاوواتا بە کەیفمەندیی بێپێوەر لە هزرین و ئاخافتن و کرداردا دابنرێت. ڤێلش دەبێژێت، کێشەکەی لیۆتارد روو دەکاتە «کارکردن لە» (redigieren) مۆدێرنەدا، ئەمەش بریتی نییە لە کۆتاییهێنان بە رابورد و سەرەتایەکی نوێ، بەڵکو ئەمە گەرەکە «کارتێداکردنێک (Durcharbeiten) بێت، بێگومان بەتایبەتی کارتێداکردنێکی زمانیانە: «ئەو کارتێداکردنە کە لێرە مەبەستە، وەک دیارە هیچ پەیوەندییەکی لەتەک ئەوەدا نییە کە لە بازاڕی ئیدیۆلۆژییەکانی ئەمڕودا ناو دەنرێت پۆستمۆدێرنە یان پۆستمۆدێرنیزم، با ئەمە روونتر دەربڕین: هیچ پەیوەندییەکی نییە بە بەکارهێنانی پارۆدی و سیتاتەکانی مۆدێرنە یان مۆدێرنیزم لە بینا و شانۆنامە یان لە رەسمدا، هەروەها زۆر کەمتریش لەمە پەیوەندیی هەیە بەو بزووتنەوە ئەدەبییەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ترادیسیۆنیترین فۆرمگەلی گێڕانەوە (چیرۆک). وەک ئاشکرایە، من خۆشم واژەی «پۆستمۆدێرن»م بەکارهێناوە. ئەمە بریتی بوو لە جۆر و شێوازێکی بەبەرهەم تاکو دێبات سەبارەت بە ناسین تەواو رۆشنبکرێتەوە. پۆستمۆدێرنە بریتی نییە لە قۆناغێکی نوێ، بەڵکو کارکردنە لە هەندێکی ئەو سیمایانەدا کە مۆدێرنە بۆ خۆی داوای دەکردن، لێرەشدا بەتایبەتی روودەکاتە موبالەغەکەی: بناغەڕشتنی رەوایەتییەکەی خۆی بەو

پرۆژەیە کە گوایە سەرجەم مرۆڤایەتی بەڕێی زانست و تەکنیکەوە ئازاد دەکات. بەڵام وەک گۆتمان، دەمێکە ئەم کارتێداکردنە لەنێو خودی مۆدێرنەدا بەرخراوە»[٢١].

لیۆتارد هـــاوکات لەدژی تۆمەتێکی دیکەش کە دراوەتە پاڵی، بەرهەڵســـتی دەنوێنێت: تۆمەتی نائاوەزگەرایی (ئیرڕاسیۆنالیزم): «من لەسەر پانتایی جیاواز خەباتم کردووە: لەدژی بەناوئاوەزمەندیی سەپێنراو لە لایەن سەرمایەدارییەوە، لەدژی پێرفۆرماتیڤێتی. من جەخت دەکەم لە لایەنی جیاڕایی کە لەنێو کۆمەڵی پەروەردەڤانان/زانایاندا، (Bildungsgemeinschaft) لە پرۆســـەی شکۆفەدان بە ناســـیندا، روو دەدات، بەکورتی: جەخت دەکـــەم لە ئاڤۆنگاردیزمەکـــەی»[٢٢]. لیۆتارد زۆر فۆرمی ئاوەز کە پێشـــتر لەنێو ئاڤۆنگاردی مۆدێرنەدا دەرکەوتوون، لـــەدژی «یەک تاکە» ئاوەز دادەنێت. بـــەڵام ئەم هەمەلایەنێتییە هاوواتا نییە بە ئیرڕاســـیۆنالێتی لە مەغزای نائـــاوەزدا، لە مەغزای دژ بە ئاوەزمەندیدا. بەڵام بەڕاســـتی لە لای لیۆتارد روون نییە کە داخۆ دەبێت ئاوەزی پۆســـتمۆدێرن جیاواز لە ئاوەزی مۆدێرنی تۆتالیتێر لە لایەک، هەروەها کەیفمەندیی پۆستمۆدێرنیســـتی لە لایەکی دی، چـــی بن و گەرەکە چی بن، ئەمەش ســـەرباری ئـــەو هەموو هونەرە هۆشـــزەنگینەی دەربڕین کـــە مۆرکی ئـــەوە. هاوکات لە لای لیۆتارد جیابوونەوەکە لە هەبوونی تەکنۆلۆژیای نوێی ســـەرجەم شتە شـــیاوەکان و زمانەکان تەنها لەنێو سنووردانانێکی نێگەتیڤدا دەمێنێتەوە: «ئێکلێکتیسیزم بریتییە لە پنتی ســـفری پەروەردەی هاوچەرخ: مەردوم گوێ لە رێگی دەگرێت، تەماشـــای فیلمی وێســـتەرن دەکات، نیوەڕوان لە مەکدۆنالد دەخوات و ئێواران خواردنی خۆماڵی دەچێژێت، لە تۆکیۆ عەتری فەرەنســـی لە خۆی دەدات، لە هۆنگ کۆنگ نۆستالگییانە خۆی دەپۆشێت، ئینجا ئەوە وەک ناســـین دەردەکەوێت کە گەمەی پرســـیار-وەڵامی تەلەڤیزیۆن لەبارەی دەپرســـێت. زۆر بە ئاسانی جەماوەر بۆ ئیشـــە ئێکلێکتیکییەکان پەیدا دەکرێت. ئینجـــا کاتێک هونەر دەبێت بە کیچ، ئیتر رووپامایی بۆ بێســـەروبەری دەکات، ئەو بێســـەربەرییە کە سەروەرە بەســـەر «چێژ»ی جەماوەردا. هونەرمەند، گالەریســـت، رەخنەگـــران و جەماوەر لەنێو کەیفمەندیی پەتیدا بە خۆیان هۆشســـامن. ئەمە ســـەردەمی سستبوونە. بەڵام ئەم ریالیزمەی کەیفمەندی ریالیزمی پارەیە: لەبەرئەوەی سەنگی مەحەکی ئێســـتێتیکی لەگۆڕێدا نییە، ئەوا دەشـــێت و سوودمەندە کە بەهای ئیشەکان بە بڕی ئەو قازانجە بپێورێت کە خودی ئیشـــەکان دەیهێنن. ئەم ریالیزمە خۆی لەتەک سەرجەمی رەهەندەکاندا دەگونجێنێت، ئەمەش بێگومان بە یەک تاکە مەرج دەکات: تەنها گەر رەهەندگەل و پێداویستیگەل خاوەنی کڕینهێزی (قوة الشراء) پێویست بن»[٢٣].

گەر ئەم تێکستەی لیۆتارد کە وەک سیتات هێنامانەوە، سەرەتا چواندنی بۆ کایەی ئێستێتیکی، بەتایبەتـــی بۆ کایـــەی ئەدەبی هەبێت، ئەوا نموونەکانی تێکســـتەکە شـــیمانەی بەکاربردنی ئەم پۆســـتمۆدێرنیزمە کە لیۆتارد رەفزی دەکات، بەسەر هەموو کایەکانی ژیاندا دەردەخەن. بەڵام لێرەدا هاوکات روخســـاری راســـتەقینەی هزر و ئاخافتن و ژیانی پۆســـتمۆدێرن بەڕوونی دەرناکەوێت. با جارێکی دی دەرفەت بدەین ڤۆلفگانگ ڤێلش بەپوختی بدوێت: «پۆســـتمۆدێرنە لەوێدا ســـەرچاوە دەگرێت کە کاتێک هەمەکێتی کۆتایی پێدێت (...). پۆستمۆدێرنە بەتایبەتی کۆتایی یەک (ئەلواحد) و هەمەکێتی بە شـــێوەیەکی پۆزەتیڤ بەکاردەهێنێت، ئەویش کاتێک هەوڵ دەدات هەمەلایەنێتییە ئاشکرابووەکە لە رەوایەتی و خۆجۆرییەکەیدا مسۆگەر و ئاوەڵا بکات»[٢٤].

## فەرهەنگۆک:

**ئاپۆری:** کێشەی تیۆریانەی نەشیاوی چارەسەرکردن.

**ئاتۆنال:** ئەو موزیکە کە بەند نییە بە پرنسیپی هارمۆنییەوە لە موزیکی تۆنالدا.

**ئاڤۆنگارد:** خەباتگێڕی پێشەوای ئیدێیەک یان جەرەیانێک، بۆ نموونە لە ئەدەب و هونەردا.

**بێستسێلەر:** وشـــەیەکی ئینگلیزیە، واتا: کتێبێک یان قەوانێک یان سیدییەک و هتد بۆ ماوەیەک زۆر چاک دەفرۆشرێت.

**بلازفێمی:** گاڵتەکردن بە خودا، گاڵتەکردن یان جنێودان بە شتێکی یان کەسێکی پیرۆز.

**پارۆدی:** لاسایی یان وەرگۆڕینی کۆمیکییانەی / مەهزەلەیی ئیشێکی هونەری یان ئەدەبی یان ستیلێک.

**پراگماتیک:** سیمیۆتیک وەک زانستی هێما بەسەر سێ لقدا بەش دەبێت: سینتاکس (لۆگیکی یان گراماتیکی هێما) کە راڤەی پەیوەندیی نێوان خودی هێماکان دەکات، ســیمانتیک (زانســتی واتا) کە لە پەیوەندیی نێوان هێمــا و هێماێنــراو دەکۆڵێتەوە، پراگماتیک (زانســتی بەکارهێنانی هێماکان لە کۆنتێکســتەکەیاندا) کە لە پەیوەندیی نێوان هێما و بەکارهێنەرەکەی دەکۆڵێتەوە.

**پێرفۆرماتیڤێتی:** تێگەیەکی تیۆریـــی کرداری ئاخافتــە (Sprechakttheorie). مەردوم بەرێی کرداری پێرفۆرماتیڤـــەوە ئاخافتن لـــە رووی کارایيە راگەیەنەرییەکەیەوە (کۆمونیکاتیــڤ) ئەنجام دەدات: «فەرمانت پێدەدەم کە دەرگاکە دابخەیت» (دەربڕراوە بۆ فەرماندان بە شــتێک)، یان: «ئیتزارت دەکەم، وا ئۆتۆمبێلەکە نزیکدەکەوێتەوە» (دەربڕراوە بۆ ئیتزارکردنی کەسێک). دەربڕینی پێرفۆرماتیڤ جیاوازە لە دەربڕینی کۆنستاتیڤ (چەسپیو). ئەمیان راستە یان هەڵەیە و پابەندە بە گۆتنی شتێکەوە، بەڵام دەربڕینی پێرفۆرماتیڤ نە ڕاستە و نە هەڵەیە، مەبەستەکەی تەنها ئەوەیە کە شتێک بکرێت، ئەمەش لە گۆتنی پەتی تێپەڕ دەکات.

**تۆنال:** ئەو موزیکەیە کە لەنێو پەیوەندییەکی دەنگیی یان هارمۆنیانە یان ئاکۆردیانەدا بنیات دەنرێت.

**تێلیۆلۆژی:** رێبازێکی هزرە کە هەموو شــتێکی نێو گەردوون وەک مەبەســتدار، ئاڕاســتەوەرگرتوو رووەو ئامانجێک، دادەنێت.

**تیۆریی سیســتەم:** مۆدێلێکی ناســینە (مەعریفەیە) بۆ کارکردن لە نێوان بەشــە زانســتییە (دیسپلینە) جیاوازەکانــدا. لە تیۆریی سیســتەمدا سیســتەمگەلی جیاواز بــۆ روونکردنەوەی فێنۆمێنی جیــاواز و ئاڵۆز بەکاردەهێنرێن.

**دیتای:** تاکە کەرت لە ئیشێکدا.

**دیتەرمینیــزم:** رێبازێکــی هــزرە کە وای دادەنێــت ســەرجەمی رووداوەکانی گەردوون و کۆمەڵ پێشــتر چەسپێنراون.

**دوڕ:** سێیەم پلەی تۆنەکانە لە سێیینەدا، کە تۆنێکی گڕە

**رووداگە:** بۆ وشەی (ڤیرکلیشکایت / Wirklichkeit)ی ئەڵمانی دانراوە، کە ئەمیش بۆ «ئەکتوالیتاس»ی لاتینیــی دانــراوە. رووداگە نیشــانەیە بۆ ئەو جــۆرەی بوون کە لــە شــیمانە (Möglichkeit) و زەروورە (Notwendigkeit) جیاکراوەتەوە. بەرانبەر بە جووتە تێگەی رووداگە / شــیمانە (Potenz / Akt) جووتە تێگەی ریالێتی / ئیدیالێتی دەوەستێتەوە. تێگەی رووداگە بە پێچەوانەی تێگەی ریالێتییەوە شتە ریالەکان وەک خودی شــت رووندەکاتەوە، واتا وەک شــتی ئەوتۆ کە کاریگەری (Wirkung) دەنوێنن یان توانایان بۆ نواندنی کاریگەری هەیە. لەم روانگەیەوە دۆخە ناخەکییەکانیش، بۆ نموونە ســۆزەکان، ســەر بە رووداگەن،

چونکە کاریگەری پیشان دەدەن.

**رێپرەزەنتاسیۆن:** تەمسیلکردن، پیشاندان. بەڵام بیناى رێپرەزەنتاسیۆن ئەو جۆرە بینایانەن کە بەتایبەتی بەهۆی زمانەکەیان یان فۆرمەکەیانەوە دەرکەوتوون (کەشخەن).

**رێگی:** جۆرێکی موزیکە.

**ریالیزمی نائیف:** ئەم جۆرە ریالیزمە وای دەبینێت کە شـــتەکان بەڕاســـتی هەر ئاوهان وەک چۆن لە لایەن مرۆڤەوە دەرکدەکرێن.

**سپۆنتانێتی:** (عەفەویەت)

**سیتات:** (ئیقتیباس)

**سیتاتگەرایی:** واتا وەرگرتنی سیتاتی جیاواز لە ئیشە کۆنەکانی تەلارسازییەوە (یان ئەدەب و هونەرەوە).

**سـیێن:** نواندنگـــە (وەک تیاتـــەر)، نێوەندی رووداني شـــتێک، هەروەها دەشـــێت ســـەرجەمی چالاکییە کولتوورییەکان بێت.

**شۆڕشـی کۆپەرنیکـی:** جێگرتنـــەوەی جیهانبینیی جیۆســـەنتری (زەمین وەک ســـەنتەری جیهان) بەڕێی جیهانبینیی هێلیوسەنترییەوە (خۆر وەک سەنتەری جیهان) لە سەرەتای نوێسەردەمی ئەوروپیدا.

**کۆنسەرڤاتیڤ:** کەسێک یان هێزێکی کۆمەڵایەتی کە دەیەوێت بەها دێرینەکان بپارێزێت.

**ئێتیک:** جیاوازیی مۆراڵ و ئێتیک ئەوەیە کە مۆرالی دراو تا رادەیەک ســـەرچاوەی ســـۆزمەندی هەیە (وەک قێز، کین، ترس) و پابەندە بە کولتوور و کۆمەڵگەوە، بەڵام ئێتیک بە پێچەوانەوە بەڕێی لۆگیکەوە هەوڵ دەدات پێوەر (ی رەها) دابنێت، یان وەک زانست یان هزرین لەبارەی مۆرال دەردەکەوێت.

**کیێچ:** هونەری کیێچ بۆ نموونە هونەرێکە کە تێیدا هەســـت بە تلیســـاوەیی لەنێو ئیشەکەدا سەروەرە، یان رەسەن نییە، بەڵکو ئەوە دەداتەوە کە پێشتر بە رەسەنی ئافرێنراوە، یان لە جێی هەڵەدایە، مەردوم بۆ نموونە وڵاتەکەی ناو دەنێت بەهەشـــتی ســـەر زەمین، یان نموونەی دیکەی کیێچ بریتین لە: وێنەی فریشتەی گووپن، یان دەربڕینی «من تینوێتیم بە گڕ دەشکێت».

**ئێکلێکتیسـیزم:** شـــێوازێکی کارکردنە بۆ نموونە لە بوارەکانی ســـتیل و فەلســـەفەدا کە ئیشێکی نوێ لە توخمگەلی ستیلە کۆنەکان یان سیستەمە کۆنەکان دروست دەکات. ئەم شێوازەی کارکردن لە هونەری ئەوروپیدا مۆرکی کلاسیســـیزم، بەڵام بەتایبەتی مۆرکی هیستۆریزم بوو، هەروەها لە پۆستمۆدێرنەشدا سەرلەنوێ واتا بۆ «پێکهێنانەوە» وەردەگرێت.

**ئینفۆرمێـل:** رێبازێکـــی هونەرییە کە دوای ١٩٤٥ لە پاریس هاتە ئاراوە. ئینفۆرمێل زۆر جار وەک تێگەیەک بەکاردەهێنرێت کە جەرەیانە ئەبســـتراکتەکانی هونەر لە ســـاڵانی پاش جەنگدا لە ئەوروپا نیشانە دەکات. لە هونەری ئینفۆرمێلدا سۆز و سپۆنتانێتی (عەفەویەت) گرنگترن لە کامیلێتی و ئاوەز و رێکخستن.

**ئەبستراکسیۆن:** دارِنین (تەجریدکردن)

**ئەنگاژمۆ:** (ئیلتیزام)

**نارڕاتیڤ:** گێڕەرەوە

**نۆسـتالگی:** ئاوڕدانەوەی ســـۆزمەندانە لە ســـەردەم و رووداوی رابوردوو کە تەنها لەنێو ئەندێشەدا هەن و مەردوم رۆمانسیانە دەیانڕازێنێتەوە.

**نیو ئەیج:** ســـەردەمی نوێ، لە چارەکی ســـێیەمی سەدەی بیستەمدا وەک ناونیشـــانێک بۆ ئەو لایەنانەی بزووتنەوەی هیپی بەکاردەهێنرا کە ئاڕاستەیان رووەو جیهانی ناخەکیی مرۆڤ وەرگرتبوو.

**لێکسـیکۆن:** ئیشـــێک (فەرهەنگێکی روونکەرەوە) کـــە پابەند بە ئەلفوبێوە هەمـــوو کایەکانی زانین یان کایەیەکی تایبەتیی زانینی بە پوختی تێدا روونکراوەتەوە.

**وێستەرن:** بە زمانی عەوام دەبێت بە «فیلمی عەسابە» (کاوبۆی).

**هیپۆتێز:** گریمانەی زانستی، کە جارێ سەلماندنی گەرەکە. دەسوێژێکی ناسینی زانستییە بۆ سەلماندنی شــتە یاسادارەکان یان دراوێکی ریالْ، کە لەشــێوەی گەڕانەوەدا بۆ سەرچاوەی دروستبوونیان خۆی دەنوێنێت. هیپۆتێز پێچەوانەی پرۆگنۆزە کە گۆڕانی ئایندەیی ڕادەگەیەێت.

**هیســتۆریزم:** دیاردەیەکی سەدەی نۆزدەیەمە لە مێژووی ستیلەکاندا. مەردوم لە هیستۆریزمدا دەگەڕێتەوە بۆ ستیلگەلی رابوردوو و لاساییان دەکاتەوە.

**مۆڵ:** یەکەم پلەی تۆنە / دەنگە لە سێیینەدا.

**مۆنیزم:** یەکئاڕاستەگەرایی کە پێچەوانەی دوالیزمە (دووگەرایی).

**فوتوریزم:** بزووتنەوەیەکی ئاڤۆنگاردیســتیی هونەر بوو کە لە ئیتالیاوە سەرچاوەی گرت. ئەم بزووتنەوەیە داواکاریی بۆ دامەزراندنی کولتوورێکی نوێ بەرزکردەوە. فیلیپۆ تۆماسۆ مارینێتی دامەزرێنەری فوتوریزم بوو کە ساڵی ١٩٠٩ یەکەم مانیفێستی فوتوریستی بڵاوکردەوە.

## پێرست:


1) Peter Koslowski, Vorwort, in: Moderne oder Postmoderne? Zur Signatur des gegenwärtigen Zeitalters. Hg. V. Peter Koslowski / Robert Spaemann / Reinhadt Löw, Weinheim 1986, XIf.

2) Wolfgang Welsch: „Postmoderne“. Genealogie und Bedeutung eines umstrittenen Begriffs, in: „Postmoderne“ oder Der Kampf um die Zukunft. Die Kontroverse in Wissenschaft, Kunst und Gesellschaft. Hg. V. Peter Kemper. F.a.M. 1988, S. 33

3) Wolfgang Welsch, Unsere postmoderne Moderne, Weinheim 1987, S. 4

4) Wolfgang Welsch, Postmoderne. Ein Diskussionsbericht, in: Information Philosophie, 15. Jg. (1987), H. 5, 22.

5) Wolfgang Welsch, “Postmoderne”, a.a.O., S. 15f.

6) Jürgen Habermas, Moderne und postmoderne Architektur, in: derselbe, Die neue Unübersichtlichkeit. Kleine politische Schriften V. Frankfurt a.M. 1985, 11-29

7) AaO., 23

8) AaO., 26

9) Andreas Huyssen, Postmoderne – eine amerikanische Internationale?, in: Postmoderne. Zeichen eines kulturellen Wandels. Hg. V. Anreas Huyssen u. Klaus R. Scherpe, Reinbeck 1986, S. 19

10) Ebenda

11) Klotz, Moderne und Postmoderne, S. 103

12) Ebenda, S. 108

13) Wellmer, Kunst und industrielle Produktion, Weinheim 1987, S. 108f.

14) Ebenda, S. 255

15) Achille Bonito Oliva, Die italienische Trans-Avangarde, in: Wege aus der Moderne, Hg. W. Welsch, Weinheim 1988, S. 126f.

16) Umberto Eco, Postmodernismus, Ironie und Vergnügen, in: Wege aus der Moderne, S. 75

17) Ebenda, S. 76

18) Wolfgang Welsch, Unsere postmoderne Moderne, S. 32

19) Lyotard, Das postmoderne Wissen, S. 7, deutsch S. 14

20) Ebenda, S. 203

21) Wolfgang Welsch, aaO., S. 213

22)Lyotard, Über den Terror und das Erhabene, in: Verabschiedung der (Post-)Moderne? Hg. V. Jacques Le Rider und Gérard Raulet. Tübingen 1987, S. 274

23) Lyotard, Beantwortung der frage: Was ist Postmoderne. S. 197

24) Wolfgang Welsch, Unsere postmoderne Moderne. S. 197

## تێبینی وەرگێڕ:

-کتێبی دیاریکراو ساڵی ١٩٩٠ بڵاوکراوەتەوە. ئەو دەمە دانوستاندنەکانی پۆستمۆدێرنە لە ئەڵمانیا لە ئاستێکی دیکەدا بوون وەک لە ئەمڕۆ.

-لەم نووسینە وەرگێڕراوەی بەردەمدا رەچاوی پرسیارە پۆستمۆدێرنەکان تەنها لە بوارەکانی ئەدەب، تەلارسازی، هونەری شێوەسازی و هونەرەکانی دی، هەروەهات فەلسەفەدا کراوە، لەسەر ئەم رەوتەیش دابەشاندنی ژمارەیی ئەنجام دراوە کە لە دابەشاندنی نێو کتێبەکە جیاوازە، چونکە ئەو کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنییە لەتەک پرسیار و کێشەکانی پۆستمۆدێرنەدا بەگشتی، لێرەشدا دەچێتە نێو بواری دیکەوە، وەک پەروەردەزانی و فەلسەفەی نوێتری فەڕەنسی و هتد.

-بە چاکمان زانی لەم وەرگێڕانەدا سەرچاوەی بڕێکی سیتاتەکان دیاریبکەین، چونکە رەنگە خوێنەر (نووسەر یان ئەکادیمی) بتوانێت بۆ توێژینەوە بەکاریان بهێنێت.

## سەرچاوە:

Hans Joachim Türk: Postmoderne. Mainz 1990

# نیکۆلۆ ماکیاڤیللی
# ١٤٦٩ - ١٥٢٧

د. مەهدی مەحفوز
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## یەکەم/
## کۆمەڵگەی ئیتاڵی لە سەردەمی «ماکیاڤیللی»دا:

هێزی نوێی بازرگانی و پیشەسازی لە ئیتاڵیای سەردەمی «ماکیاڤیللی»دا، هۆکارێک بوون بۆ تێکوپێکدانی سستمی کۆن، بەڵام لەبەر هۆکارگەلێکی سیاسی (کە دواتر دێینە سەر باسکردنیان)، هێزی دژە گۆڕان توانی کاریگەری ئەو هێزانە کەم کاتەوەو دەرەنجامەکانیشی دوابخات. «ماکیاڤیللی» سەروەختێک دەینوسی، ئیتاڵیا بەسەر پێنج هەرێمی ناکۆک و دژ بەیەکدا دابەش بوو بوو.

١-شانشینی ناپۆلی لە باشور.

٢-دۆقیە میلانۆ لە باکوری خۆرئاوا.

٣-کۆمارێکی ئۆرستۆکراتی لە ڤینیسیا لە باکوری خۆرهەڵات.

٤-کۆماری فلۆرنسا.

٥-دەوڵەتی پاپ لە ناوەڕاستی وڵاتدا.

ڕمانی کۆماری فلۆرنسا (ساڵی ١٥١٢) لەسەر دەستی بنەماڵەی «میدیتچی»، کاریگەری گەورەی لەسەر ژیان و نوسینە سیاسیەکانی «ماکیاڤیللی» بە جێهێشت. لەو قۆناغەی مێژوی وڵاتی ئیتاڵیادا، «پاپاکان» دزێوترین دەستەو تاقمێک بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیبویان دەوڵەتەکەیان بکەنە چاکترین دەوڵەت لە ئیتاڵیادا. «پاپا» وەکی تێکڕای فەرمانڕەواکانی دی، بوو بە

فەرمانڕەوایەکی ئیتاڵیایی. واتە پلە و پایەی «پاپا» لە پۆستێکی ئایینیەوە گۆڕا بۆ پۆستێکی دنیای، ئەویش لە پێناو هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوەڕاستی وڵاتی ئیتاڵیادا.

سەرەڕای تۆکمەیی دەسەڵاتی، بەڵام «پاپا» نەیتوانی یەکیەتی و نیشتمانی و یەکپارچەیی خاکی ئیتاڵیا بپارێزێت، وەک «ماکیاڤیللی» باسی دەکات: (وڵات لە دۆخێکی سیاسی مەنگ و پەنگخواردودا جێهێڵرابوو). هیچ هێزێکی گەورە و کاریگەریش پەیدا نەبوو، بتوانێت تەواوی ئیتاڵیا یەک بخات. «ماکیاڤیللی» بەرپرسیارێتی ئەو دۆخە ناهەموارە دەخاتە ئەستۆی کڵێسا، چونکە «پاپا» بۆ خۆی لەوە لاوازتر بوو بتوانێت بەو ئەرکە هەستێت، هاوکات ڕێگەشی بە هیچ فەرمانڕەوایەکی دیکە نەدەدا، ئەو کارە بکات. کڵێسا بەهۆی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیە چەپەڵ و شەڕانگێزەکانیەوە، توانی هێزی بیانی پەلکێشی وڵات بکات، کارێک کە بووە مایەی بێزاری «ماکیاڤیللی» و وایلێکرد بە تەوس و گاڵتەجاڕیەوە پەلاماری کڵێسا بدات.

"ماکیاڤیللی» پێیوابوو کۆمەڵگەی ئیتاڵی و سیاسەتی ئیتاڵی، ئەو دۆخی پشێوی و بێسەر و بەریەیان نیشان دەدا کە سستمی سیاسی و دامودەزگاکانی وڵات دوچاری بوو بوون. دۆخێک کە گەندەڵی سیاسی و ئەخلاقی گەیشتبووە ترۆپک. بەمجۆرە دامودەزگا مەدەنیەکان مەحفبونەوەو زەبر و زەنگ و پاکتاوکردن، بونە ئامرازێکی ئاسایی حوکمڕانی. لە بەرامبەریشدا بیروباوەڕی ڕاست و دروست و ڕاستگۆیی، بوونە نیشانەی گەمژەیی و ساویلکەی و هێز و فرت و فێڵیش، بوونە کلیلی سەرکەوتن.

ئەو قۆناغەی کۆمەڵگەی ئیتاڵی دەکرێت بە سەردەمی (چەتە و ناقۆڵاکان) ناودێر بکرێت، کۆمەڵگەیەک ڕێک لەگەڵ ئەو وتەزایەی «ئەرستۆ»دا یەک دەهاتەوە کە دەڵێت: (مرۆڤ کاتێک لە یاسا و دادپەروەری تەوەلا دەبێت، دەبێتە بەدترین ئاژەڵ). بۆ بەگژاچونەوەی ئەو واقیعە ناهەموارە، «ماکیاڤیللی» بانگەشەی بۆ ئەو تیۆریا سیاسیە دەکرد کە باس لە (میرو دەسەڵاتدارێکی بەشان و شکۆ) دەکات.

## دووەم/
## ژیانی «ماکیاڤیللی»:

"ماکیاڤیللی» بە خراپی ناوبانگی ڕۆشتووە و ماکیاڤیلیزم بۆتە هاوتای فرت و فێڵێکی بێ سنور. تەنانەت بە یەکێک لە ئیبلیسەکانی درامای ئەوروپی ناو دەبرێت و هەندێ جاریش دەیکەنە هاوتای ئیبلیس خۆی[1]. «ماکیاڤیللی» ساڵی ١٤٦٩ لە بنەماڵەیەکی دیاری شاری فلۆرنسای ئیتاڵیا هاتۆتە دنیاوە. مانەوەی لەو شارەدا بواری بۆ ڕەخساند تا بە چاوی خۆی، گۆڕانکاریە سەرەکیەکان لە پێکهاتەی سستمی سیاسی فلۆرنسادا ببینێت. حوکمڕانی بنەماڵەی میدیتچی تا ساڵی ١٤٩٤ خایاند و پاشان دەسەڵات دەکەوێتە دەست «ساڤونارۆلا»[2]. «ساڤونارۆلا» پیاوێکی ئایینی بوو، بۆ ماوەی سێ ساڵ بە ئاگر و ئاسن حوکمی فلۆرنسای کرد و سەرەنجامی ئەوەش سەری تیاچوو. ئەمە بواری بۆ هاتنە ئارای سستمێکی کۆماری ڕەخساند کە لە ساڵی ١٤٩٨ تا ساڵی ١٥١٢ بەردەوامبوو، دوای ئەوە بنەماڵەی میدیتچی گەڕانەوە سەر کورسی حوکمڕانی. بەو پێیەی باوکی یاسا ناسێکی

دیار و دایکیشی ئاشنایەتیەکی چاکی لەگەڵ شیعرداناندا هەبوو، «ماکیاڤیللی»حەزێکی زۆری بە خوێندنەوەی کتێب هەبوو. ئەو پەیوەندیە بەرفراوانەشی کە لەگەڵ نوسەران و بیریارانی ئەو سەردەمەدا هەیبوو، وایانلێکرد ڕۆشنبیریەکی لیبرالی بەرفراوان لە بواری یاسا و سیاسەت و مێژوو و فەلسەفەدا بەدەست بێنێ. ئەمەش هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساند، تا پۆستی ڕاوێژکاری گشتی دەوڵەت لە کۆماری فلۆرنسادا وەرگرێت و بۆ ماوەی چوارده ساڵ لەو پۆستەدا بمێنێتەوە، تا کۆتایی سەردەمی کۆماری لە ساڵی ١٥١٢. لەو ساڵەدا بنەماڵەی میدیتچی سەرلەنوێ و بەهۆی دەسوەردانی وڵاتانی بیانی لە کاروباری ناوخۆی ئیتاڵیا، گەڕانەوە سەر حوکمڕانی و جارێکی تر دەسەڵاتیان گرتەوە دەست.

ئەو پۆستە لە ژیانی «ماکیاڤیللی»دا گرنگ بوو، لەبەرئەوەی بواری بۆ ڕەخساند ڕاستەوخۆ ئاگاداری کاروباری سیاسی دەوڵەت بێت، لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە. «ماکیاڤیللی» زۆر جار بە ئەرکی دیبلۆماتی چۆتە دەرەوەی فلۆرنسا، بۆ نمونە چوار جار چۆتە لای پادشای فەرەنسا و جارێک بۆ لای ئیمپراتۆری ئەڵەمانیا و دوو جار بۆ لای «پاپا» و چەند جارێکیش بۆ لای قەیسەر «سیزار بۆرگیا» کە «ماکیاڤیللی» پێی سەرسام بووە[٣].

ئەو پۆستە باڵایە وایکرد، «ماکیاڤیللی» لە نهێنی و پێچ و پەناکانی دنیای سیاسەت حاڵی بێت، هەموو ئەمانەش لە نوسینەکانیدا باس بکات، ئەو نوسینانەی لە گوندەکانی تۆسکانیدا نوسینی، دوای ئەوەی بنەماڵەی میدیتچی بە تۆمەتی بەشداریکردنی لە پلانی کۆماریەکاندا بۆ کۆتایهێنان بە دەسەڵاتی بنەماڵە فەرمانڕەواکەیان، تۆمەتباریان کرد و وەک نەفیکراوێک ڕەوانەی ئەوێیان کرد. «ماکیاڤیللی» ماوەی دوانزە ساڵێک گۆشەگیر و دەستبەسەر، دوور لە وەزیفە مایەوە و بە درێژایی ئەو ماوەیەش چاوەڕێی ئەوەبوو لێی خۆش بن و بگەڕێتەوە سەر کارەکەی جارانی، بەڵام بێ سوود بوو. تا لە ساڵی ١٥٢٧ دا کۆچی دوایی کرد و میراتیەکی فیکریی گەورە و گرانی لە دوای خۆی بەجێهێشت، ئەو میراتیە فیکریە بە گرنگترین شتێک ئەژمار دەکرێت کە لەو سەردەمەدا نوسرابێت.

لە گرنگترین ئەو بەرهەمانەی «ماکیاڤیللی» لە دوای خۆی بەجێیهێشت، کتێبی (میر)ە کە لە ساڵی ١٥١٣ دا نوسیویەتی، لەگەڵ کتێبی (دەمەتەقێ) ساڵی ١٥١٩، (هونەری جەنگ) لە نێوان ساڵانی ١٥١٩ و ١٥٢٠ دا، دواجار کتێبی (مێژووی فلۆرنسا) کە لە ساڵی ١٥٢٥ دا بڵاوکرایەوە. لە نێو ئەم چوار کتێبەدا، گرنگی فیکری و سیاسی «ماکیاڤیللی» لە دوو کتێبی یەکەمدایە کە بریتین لە: (میر) و (دەمەتەقێ). هەر بۆیە ئێمەش لەم وتارەماندا گرنگی بەم دوو کتێبە دەدەین.

بیرو بۆچونە سیاسیەکانی «ماکیاڤیللی» بە ڕوون و ڕەوانی لە هەردوو کتێبی (میر) و (دەمەتەقێ)دا دەبینرێن. لە (میر)دا «ماکیاڤیللی» جۆر و شێوازی میرنشین و حکومەتە ڕەهاکان دیاری دەکات، لەگەڵ ئەو شێوازی حوکمکردنەی پێویستە بە مەبەستی پارێزگاری لێکردن و پاراستنی لە دارمان بگیرێتە بەر. هەرچی کتێبی (دەمەتەقێ)شە، ئەوا باس لە کۆمارەکانی ڕۆمان دەکات بەپێی مێژووی ڕۆمانی و بەو شێوەیەی کە «تیتۆس لیڤۆس» نوسیویەتی. لە هەر یەک لەم دوو کتێبەدا ئەو خەسڵەتە سەرەکیانە دەبینین کە «ماکیاڤیللی» پێی دەناسرێت، وەک: (گوێ نەدان بە بەکارهێنانی ئامڕازە نائەخلاقیەکان بۆ گەیشتن بە مەرامی سیاسی و قەناعەتهێنان بەوەی،

حوكمڕانی تاڕادەیەکی زۆر دەرگیری هێز و فرت و فێڵە). هاوکات ئەو دوو کتێبە زیاتر بەلای واقیعدا دەچن، وەک لەوەی قەرەی تیۆریای سیاسی بکەون. واقیعبونی «ماکیاڤیللی»یش لەم دەستەواژەیەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت: (بەو پێیەی ئامانجی من سودگەیاندنە بەوانەی لێم تێدەگەن، بۆیە بە چاکم زانی خۆم بە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی شتەکانەوە خەریک بکەم، نەک وێنەیەکی فانتازی و دوور لە واقیع بەردەست بخەم. زۆرێک وێنای میرنشین و کۆمار گەلێکیان دەکێشا، کە نە کەس بینیبونی و نە کەس هیچی لەبارەوە دەزانین. جیاوازیەکی گەورە لە نێوان ژیان وەکی خۆی و وەکی ئەوەی دەبێت وا بێت هەیە)[٤].

دیارترین خەسڵەتێک کە «ماکیاڤیللی» هەیبوو، ئەوە بوو بەشێوەیەکی پڕاوپڕ دەربارەی شێوازەکانی حوکمڕانیکردن و ئەو ئامرازانەی دەوڵەتی پێ بەهێزدەبن دەینوسی، لەگەڵ ئەو سیاسەتانەی دەتوانێت لە ڕێیانەوە دەسەڵاتی خۆی پێ بەرفراوان بکات و ئاگادارکردنەوەی حوکمڕانان لەو هەڵانەی دەبنەمایەی لاوازبوون و گلۆربونەوەی سستمی حوکمڕانیەکانیان.

گرتنەبەری ڕێوشوێنی سیاسی و سەربازی، گرنگترین شتێکە ئاوڕیان لێبداتەوەو گرنگی زۆریان پێبدات، هەریەک لەمانەش لە هەموو پێودانگێکی ئایینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دادەماڵێت. بە بڕوای ئەو مەبەستی سەرەکی لە سیاسەت، پارێزگاریکردنە لە هێزی سیاسی و زیادکردنی ئەو هێزەیە، تەنها پێودانگێکیش کە حوکمی پێ بدات سەرکەوتنیەتی لە بەدیهێنان و جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەدا، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئەو سیاسەتە دڵڕەقانە و زاڵمانەیە یاخود ناشەرعیە.

«ماکیاڤیللی» زۆر جار باس لەو خەسڵەتە نا- ئەخلاقیانە دەکات کە زۆر لێزانانە بەکاردەهێنرێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی حوکمڕانیکردن، ئەمەش دەبێتە خەسڵەتێکی دیاری سیاسەتی «ماکیاڤیللی» و بەر پرسیارە لە بەدناوی ئەو کە بڕوای تەواوی بەوەیە: (الغاية تبرر الوسيلة). بە کورتیەکەی ئەو سیاسەت لە هەموو پێودانگەکانی دیکە جیادەکاتەوەو وەها لە بارەیەوە دەنوسێت وەک ئەوەی بۆ خۆی ئامانج بێت.

## سێیەم/
## سروشتی مرۆڤ:

بە تێکڕای نوسینە سیاسیەکانی «ماکیاڤیللی» یەوە دیارە کە ئەو باوەڕی بە جێگیری و نەگۆڕانی سروشتی مرۆڤ هەبووەو لەو خەسڵەتە نەگۆڕاوانەشی لە ئەزەلەوە لەگەڵیدایە، خۆپەرستی و دوو دڵی و سپڵەییە. ئەمەش بە ئاشکرا بە خواست و ئارەزووی مرۆڤەکانەوە دیارە، بۆ دەستەبەرکردنی ئارامی و دابینکردنی پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیانیان، هەروەها بە ویست و حەزی حوکمڕانەکانەوە دیارە، بۆ پاوانکردنی حوکمڕانی و زیادکردنی دەسەڵات و هەژمونخوازیان. حەزی مرۆڤ بە خاوەنداریێتی زۆر و بێ سنور، وای لێدەکەن هەمیشە لە خەمی پاراستن و زیادکردنی ئەو شتانەدا بێت کە هەیەتی. بەو پێیەی پێویستی مرۆڤ بە هێز و موڵکداریێتی سنوری بۆ نییە، ئەمە وا دەکات مرۆڤەکان لە دۆخێکی کێبڕکێ و ململانێی بەردەوامدا بن و ئەمەش مەترسی هاتنە ئارای پشێوی و نائارامیەکی قووڵ دروست دەکات، گەربێت و بە هێزی یاسا ڕێگیری لێنەکرێت.

لێرەوە پێویستە سیاسەتی حوکمڕانیکردن لەسەر حەقیقەتێکی کۆنکرێتی دابمەزرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئاسایش و ئارامی، بەبێ بونی دەسەڵاتێکی بەهێز و تۆکمە دەستەبەر نابێت. یەکێک لەو مەسەلانەی «ماکیاڤیللی» باوەڕی پێی هەبوو، ئەوە بوو مرۆڤ بە گشتی بەدو خراپن و فەرمانڕەوای ژیر و سەرکەوتوش دەبێت، سیاسەتەکانی خۆی لەسەر ئەو بۆچونە دابڕێژێت. لەم بارەیەوە ئەوەتا دەڵێت: (خەڵک و خوا بەگشتی سپڵە و ڕاڕا و دوو ڕوون، خۆیان لە مەترسی بەدوور دەگرن و زۆر بە تەماح و چاوبرسین. تا بزانن بەکەڵکیان دێیت و بە سوودی بۆیان لەگەڵتدان، هەر بۆیە ئامادەن خۆیان و ماڵ و منداڵیان بە قوربانت کەن، بەڵام کە بارت لاربوو دێنەوە بە گژتاو لێت ڕادەپەڕن. پێویستە میر دەست نەبات بۆ موڵک و ماڵاتی خەڵکی، چونکە مرۆڤ لەدەستدانی موڵک و ماڵاتەکەی لە مردنی باوکی بەلاوە قورسترە)[٥]. ئەم وێنە بەدو خراپەی «ماکیاڤیللی» لە سروشتی مرۆڤدا دەیبینێت، بە بۆچونی ئەو پێویستە بکرێتە بنەمایەک بۆ هەر فەرمانڕەوایەک تا سیاسەتی حوکمڕانی و هێزی خۆی لەسەر بونیاد بنێت.

پێویستە حوکمڕانی و هێزی حوکمڕان هەمیشە لەسەر ئەو گریمانەیە دابمەزرێت کە خەڵک بەدو خراپن و مەترسی ڕوودانی پشێوی و نائارامی لە ئان و ساتدایە، ئەوەشی ڕێ بەم دۆخە دەگرێت تەنها هێزی فەرمانڕەوایە کە بەرپەرچی هەموو هەوڵێکی شەڕانگێزانە دەداتەوە. کەواتە «ماکیاڤیللی» پێیوایە، دەبێت دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بایەخ بە پێداویستی قوتارکردنی کۆمەڵگە بدات لە پشێوی و نائارامی. بونی هەر لاوازیەک لە حوکمڕانیکردندا، دەبێتە مایەی هەستکردن بە نائارامی و سەرهەڵدانی مەیلی شەڕانگێزی و دوژمنکارانە لەناو مرۆڤەکاندا، بە مەبەستی خۆسەپاندن و پاوانکردنی موڵک و ماڵاتی زیاتر و زۆرتر.

ئەم گریمانە سەرەکیانە دەربارەی سروشتی مرۆڤایەتی، پێویستە لەسەر کەسی فەرمانڕەوا بیانزانێت و لەبیریان نەکات، هاوکات فەرمانڕەوای سەرکەوتوو دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا و بەر لە هەر شتێ، کار بکات بۆ دەستەبەرکردن و دابینکردنی ئارامی و ئاسایش بۆ سەروماڵی هاوڵاتیان، چونکە ئەمە گرنگترین و گەورەترین حەز و ئارەزوی مرۆڤە. مرۆڤ ئەوەندە بە تەنگ سەروەت و سامانەکەیەوەیە، ڕەنگە ئاسانتر بێت لە کوشتنی باوکی خۆش بێت، وەک لەوەی ئەوانە ببەخشێت کە موڵک و ماڵاتیان خواردووە. کەواتە فەرمانڕەوای ژیر بە بەڕوای «ماکیاڤیللی»، ڕەنگە خەڵک بکوژێت، بەڵام موڵک و ماڵاتیان زەوت ناکات.

ئەم بیرو بۆچونانە لەمەڕ (خۆپەرستی و خراپەکاری) وەک ئەنگێزەیەکی سەرەکی سروشتی مرۆڤ، بۆیە بوو بوونە جێ بایەخی سەرەکی «ماکیاڤیللی»، چونکە بەشێوەیەک تەشەنەیان سەندبوو لە سەردەمەکەیدا کە بووبوونە خەسڵەتێکی دیاری کۆمەڵگەی ئیتاڵی و پشێویەکی کۆمەڵایەتی گەورەیان خوڵقاندبوو. «ماکیاڤیللی» پێیوابوو کۆمەڵگەی ئیتاڵی کۆمەڵگەیەکی گەندەڵەو لەچاو فەرەنسا و ئیسپانیادا، گەندەڵیەکەی بێ وێنەیە.

(ئەو ڕادەی گەندەڵیەی لە ئیتاڵیادا هەیە، لە هیچ شوێنێکی تر نابینرێت. ڕاستە لە فەرەنسا و ئیسپانیا بەشی خۆیان گەندەڵیان هەیە، بەڵام هەرگیز بەو جۆرەی لای ئێمە نییە. ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ خەسڵەتی خەڵکی ئەو دوو وڵاتە، هێندەی پەیوەندی بەو ڕاستیەوە هەیە کە هەریەک لە فەرەنسا و ئیسپانیا، خاوەن پادشا و دەسەڵاتدارێکی وان کە یەکپارچەیی خاکەکەیان دەپارێزن)[٦].

## چوارەم/
## ئایین لای «ماکیاڤیللی»:

ئەو هەلومەرجە سیاسی و کۆمەڵایەتیە گەندەڵ و ناهەموارەی لە ئیتاڵیادا لەئارەدا بوو، کاریگەریی گرنگی لەسەر بیروبۆچونەکانی «ماکیاڤیللی» هەبوو. پارچە پارچە بوونی کۆمەڵگەی ئیتاڵی و دابەش بوونی بەسەر چەند دەوڵەتۆکەیەکی ناکۆک و دژ بەیەکدا، وایان لە «ماکیاڤیللی» کرد بە دوای ئەوەدا بگەڕێت کە کێ لەو ڕەوشە بەرپرسیارە، سەرەنجام بینی «پاپا» و کڵێسای مەسیحی بەرپرسیارن لە نەهامەتیەکانی کۆمەڵگەی ئیتاڵی.

«پاپا» لەبری ئەوەی وەک دادوەرێک لە نێوان مەسیحیەکانی تەواوی ئەوروپادا بمێنێتەوە، خۆی وەک هەر فەرمانڕەوایەکی دنیایی لێکرد کە بەدوای هێز و دەسەڵاتدا دەگەڕێت. ئەمەش بووە مایەی خراپتربونی ڕەوشەکە و بوو بە کۆسپ لەبەردەم یەکخستنەوەی خاکی ئیتاڵیادا کە «ماکیاڤیللی» خەونی پێوەدەبینی. تاوانبارکردنی «پاپا» و کڵێسا لەلایەن «ماکیاڤیللی» یەوە، بە بڕوای ئەو لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە مەسیحیەت ڕۆڵی لە سوک تەماشاکردن و بەکەمگرتنی جوامێری و فەزیلەتی سەربازیدا هەبووە و وەک ئایینەکانی دی تەئکیدی لێنەکردونەتەوە.

بە بڕوای ئەو مۆراڵ و ڕەفتاری مەسیحی، تەنها گوزارشت لە خەجاڵەتی و ملکەچی دەکات. (ئاینی ئێمە بەختەوەری گەورە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی و بە سوک سەیرکردنی خواستە دنیاییەکاندا دەبینێت، لە کاتێکدا ئایینەکانی دیکە بە پێچەوانەوە، خێر و چاکەی گەورە لە مەزنی ڕۆح و هێزی جەستەدا دەبینن، سیفەتگەلێکی لەمجۆرەش مرۆڤ دەکەنە کەسێکی بەشان و شکۆ. پێموایە ئەم پرانسیپانە بونەتە مایەی ئیفلیجکردنی مرۆڤ و کردونی بە نێچیرێکی ئاسان بۆ ئەوانەی خاوەنی ئەقڵێکی شەڕانگێزانەن و ئەوانە دەتوانن زۆر بە شێنەیی کۆنترۆڵیان بکەن. مرۆڤ بۆ ئەوەی بەهەشتی بەنسیب بێت، هەوڵدەدات خراپەکاری دەسەڵاتدارانی شەڕانگێز قبوڵ بکات، لەبری ئەوەی بەگژیاندا بچێتەوە و بیر لە تۆڵە کردنەوە بکاتەوە)[٧].

ئەم پەرەگرافە لە نوسینەکانی «ماکیاڤیللی»، هەرچەندە لاقرتێی کڵێسای مەسیحی و ڕێنومایيەکانی ئەو ئایینەی پێوە دیارە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو کەسێکی مولحید و خوانەناس بوو، یان هیچ گرنگیەکی بە ئایین و ڕۆڵی بایەخداری ئایین لە کۆمەڵگەدا نەداوە. ئەو کە ڕەخنە لە ئایینی مەسیحی دەگرێت، لەبەر ئەوەیە پێیوایە مەسیحیەت فەزیلەت لە گوێڕایەڵی و گەردنکەچیدا دەبینێت. لە کاتێکدا ئایینەکانی دی، فەزیلەت لە شکۆی ڕۆح و هێزی جەستەدا دەبینن. ئەمەش مانەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگاکان مسۆگەر دەکات و دەیانپارێزێت. بەڕای «ماکیاڤیللی» گرنگی ئایین، لە لایەنە سیاسیەکەیدایە و لەو ڕۆڵەدایە کە لە بەدیهێنانی ئامانجی سیاسیدا دەیگێڕێت. ئایینی ڕاستەقینە و ڕاست و دروست دەشێت بۆ هەموو دەوڵەتێکی کۆماری یان پادشایی یاخود میرنشینێک کە بیەوێت پارێزگاری لە خۆی بکات، گرنگ و پێویست بێت. خراپترین ئاماژەیەک بۆ لەناوچون و ئاوابونی هەر کۆمەڵگە و دەوڵەتێک، بە سوک سەیرکردنی ئایین و ڕێوڕەسمی ئایینیە لەلایەن ئەو کۆمەڵگە و دەوڵەتەوە. بە بۆچونی «ماکیاڤیللی» ئایین دەتوانێت گوێڕایەڵی لە ڕیزی سوپادا و یەکیەتی لەناو میللەتدا زیاد بکات، ترادسیۆن بپارێزێت و شەڕ و

خراپەکاریش کەم کاتەوە... چەندە ترس لە خودا دەبێتە مایەی گەورە بوونی دەوڵەت، نەمانی ئەو ترسەش دەبێتە مایەی بچوکبونەوەو داڕمانی[٨].

لێرەوە تێدەگەین بۆچی «ماکیاڤیللی» بانگەواز خوازانی ئایین بە پلەیەک لە خوار دروستکەرانی دەوڵەتەوە دادەنێت، چونکە هیچ دەوڵەتێک بەبێ ئایین بوون و قەوارەی نابێت. واتە بونی ئایین مەرج و پێویستیە بۆ مانەوەو بونی دەوڵەت.

## پێنجەم/
## مۆراڵ و سیاسەت لای «ماکیاڤیللی»:

کاتێک «ماکیاڤیللی» لە بەرهەمەکانیدا باسی لە پێداویستی سیاسەت دەکرد، دەیویست بە تەواوەتی لە مۆراڵ و ئایینی جیا بکاتەوەو وەک کایەیەکی سەربەخۆ قسەی لەسەر بکات. بەمەش زیاتر لە «ئەرستۆ» نزیک دەبووەوە، بەتایبەت کتێبەکەی (سیاسەت). «ئەرستۆ» لەو کتێبەیدا باس لە چۆنیەتی پاراستنی دەوڵەت دەکات، بەبێ گوێدانە باشی و خراپیەکانی.

مەبەست لەم کارەش ئەوەیە کە «ماکیاڤیللی» پێیوابوو مەبەست لە سیاسەت، هێشتنەوەی هێزی سیاسەتی دەوڵەت و زیادکردنی بەردەوامی ئەو هێزەیە، سەرکەوتن لە بەدیهێنانی ئەوەشدا، بریتیە لە سیاسسەتی ڕاست و دروست، ئیتر ئەگەر ئەو سیاسەتکردنە ناپاک و زاڵمانەبێت یاخود نایاسایی بێت.

بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی سیاسی دیاریکراو، «ماکیاڤیللی» گرتنە بەری هەموو ڕێگایەکی نائەخلاقی (تەنانەت کوشتن و درۆش)، بە ڕەوا دەزانێت و ڕێگەی پێ دەدات. کەواتە گرتنەبەری ڕێگای نائەخلاقی لە پێناو پاراستنی حوکمڕانی و بەهێزکردنی دەسەڵاتدا لەلایەن کەسی فەرمانڕەواوە، شتێکی شەرعی و ڕێپێدراوە. بەڵام لە کاتی گرتنەبەری ئەو ڕێگایانە، دەبێت کەسی فەرمانڕەوا زۆر ژیر و لێزانانە و بە نهێنی کارەکانی بکات، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە لە کۆنترۆڵی دەرنەچێت و دوچاری پەرچەکرداری خراپ نەبێت.

«ماکیاڤیللی» زۆر باسی لە بەکارهێنانی شێوازی نائەخلاقیانەو زۆرزانانە کردووە و پیایدا هەڵداوە، لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانی کەسی فەرمانڕەوادا. هەموو ئەمانەش بەرپرسن لەو ناوبانگ خراپیەی «ئەو» کە لە وتەزای (الغاية تبرر الوسيلة)دا کورت دەبێتەوە. ئەو کاتێک سیاسەت جیادەکاتەوەو لە هەموو پێودانگێکی مۆڕاڵی و ئایینی دایدەماڵێت و ستایشی ئەو فەرمانڕەوایانەش دەکات کە گوێ بە بەها ئەخلاقیەکان نادەن، بۆ ئەوەیە پلە و پایەکانیان پارێزراو بێت و دەسەڵاتی خۆیان و دەوڵەتەکەیان بەهێزتر بکەن.

ئەم داماڵین و جیاکردنەوەیەی سیاسەت لە هەموو بەهاو پێودانگێکی ئەخلاقی، هەرگیز بەو مانایە نایەت کە «ماکیاڤیللی» کاریگەری مۆراڵ و ئایینی لەسەر جەماوەر و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی فەرامۆشکردووە. ئەو کاتێک کە بەهانە دەداتە دەست فەرمانڕەواکان تا بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانیان، ڕێگای نائەخلاقی بگرنەبەر، گومانی لەوە نییە کە دەوڵەتی بەهێز تەنها لەسەر بنەمایەکی پتەو لە ئەخلاق دروست دەبێت. ئەوەتا سەرسامی گەورەی خۆی بە فەزیلەتی ئەخلاقی و مەدەنی ڕۆمانەکان لە کۆندا و سویسریەکان لە سەردەمی خۆیدا نیشان دەدات و

پێیوایە ئەم فەزیلەتانە لە خۆڕا نەهاتوون، بەڵکو بەرهەمی کەش و هەوای ئارامی ژیانی ناوخێزان و سەربەخۆیی لە ژیانی تایبەتی و خاکیبوون لە هەڵسوکەوت و خۆنەویستی و دڵسۆزی نواندن لە جێبەجێکردن و ڕایکردنی ئەرکە گشتیەکانە، بەڵام ئەم فەزیلەتانە و ئەو ئەخلاقانە نابنە ڕێگر لەبەردەم کەسی فەرمانڕەواو ناچاری ناکەن بەوەی پابەندی ئەو ڕێسا و یاسا مۆراڵی و ئایینیانە بێت کە خەڵک و خوا باوەڕیان پێیەتی. بەمجۆرە «ماکیاڤیللی» دوو پێودانگ بۆ ئەخلاق لە دەوڵەتدا دادەنێت، یەکەمیان بۆ کەسی فەرمانڕەواو ئەوی دیکەیان بۆ هاوڵاتیانی ئاسایی. پێودانگی یەکەمیان بە ڕادەی ئەو سەرکەوتنانە دەپێورێت کە فەرمانڕەوا بەدەستی دێنێت، سەرکەوتویی لە پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتەکەی و بەهێزکردنی دەوڵەتەکەی، لە کاتێکدا پێودانگی دووەم، بە ڕادەی ئەو هێزە دەپێورێت کە لە ڕێیەوە هاوڵاتی، ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خۆی لەناو گروپ و دەستەیەکی کۆمەڵایەتیدا پێ بڵاودەکاتەوە.

کەواتە لە ڕێی ڕاستی هەڵوێستی لە ئایین و ئاکار، دەکرێت بڵێین «ماکیاڤیللی» بڕوای بە پێداویستی هێزی ڕوحی کۆمەڵگە هەبووە، شانبەشانی هێزی مادی. ئەو پێیوایە پێویستە لەسەر کەسی فەرمانڕەوا ئەو دوو هێزە بۆ کۆمەڵگە بەدی بهێنێت، گەر بیەوێت دەوڵەت بە بەهێزی بمێنێتەوە، لەگەڵ جەختکردنیشی لەسەر ئەوەی نابێت فەرمانڕەوا پابەندی ئەو ڕێسا مۆراڵی و ئایینیانە بێت کە جڵەوی کۆمەڵگە دەکەن، لەبەرئەوەی ئەو هەر لە بنەڕەتەوە پێی وایە کەسی فەرمانڕەوا لە دەرەوەی ئەو گروپ و حەشاماتەیە کە کۆمەڵگەی لێ پێکدێت، یاخود لە پەیوەندییەکی تایبەتیدایە لەگەڵی، بە جۆرێک ئەم پەیوەندییە وای لێدەکات لەسەر و کۆمەڵگەو ڕێسا ئەخلاقیەکانیەوە بێت و لە دەرەوەی بازنەی ئەو ئایینەش بێت کە کۆمەڵگە لەسەریەتی.

مەبەست لە جیاکردنەوەی سیاسەت لە ئایین و مۆراڵ ئەوەیە، «ماکیاڤیللی» پێی خۆش بووە سیاسەت بۆ خۆی ئامانج بێت و زانستێکی ئۆتۆنۆم و سەربەخۆ بێت و لە هەموو پێودانگەکانی تر بەدوور بێت. ئەم دابڕاندن و جیاکردنەوەیەی سیاسەت لە کایەکانی دیکە، پرۆسەیەکە بۆ «ماکیاڤیللی» حساب دەکرێت، لەبەرئەوەی یەکەم کەس بووە هەوڵی ئەوەی داوە دیاردەی سیاسەت و بەتایبەتیش دیاردەی حوکمڕانیکردن، بەشێوەیەکی جیاواز و تایبەت لە لێکۆڵینەوە فەلسەفی و تیۆریەکان تاوتوێ بکات، ئیتر ئەمە لەڕووی ئامانجەوە بێت یان لەڕووی شێوازی لێکۆڵینەوەکەیەوە بێت. بەم جۆرە یەکەمین بەردی بناغەی بۆ دامەزراندنی زانستێکی تایبەت و سەربەخۆ دانا کە ئەویش زانستی سیاسەت بوو.

## شەشەم/
## ئەرکەکانی فەرمانڕەوا:

ئامانجی سیاسەت لای «ماکیاڤیللی» بریتیە لە پاراستن و زیادکردنی هێزی سیاسی دەوڵەت. سەرکەوتن لە بەدیهێنانی ئەوەشدا ئامانجی سیاسەتە و پێوەری سیاسەتی ڕاستەقینەیە، ئیتر ئەو مومارەسەکردنەی سیاسەت، ڕەوا بێت یان ناڕەوا. «ماکیاڤیللی» بە چاوی خۆی هەلومەرجی ناهەمواری کۆمەڵگەی ئیتاڵی دەبینی کە چۆن بەسەر چەندین دەوڵەتۆکەدا پەرت و دابەش بووە و هەر دەوڵەتۆکەیەکیش دەسەڵاتدارێکی گەندەڵ فەرمانڕەوایەتی دەکات، دەسەڵاتدارێک کە شوێن

بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کەوتووەو بەرژەوەندی نەتەوەیی ئیتاڵیای وەلاوە ناوە. لێرەوە خەمی «ماکیاڤیللی» ئەوە بوو میر یاخود فەرمانڕەوایەکی بەهێز بدۆزێتەوە، تا بتوانێت کۆمەڵگەی ئیتاڵی لەو واقیعە سیاسیە دژوار و نابوتە دەربهێنێت.

بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە سیاسیەش، هەموو دەسەڵاتێکی بەخشیبووە فەرمانڕەوا، تەنانەت ئەگەر نائەخلاقیش بێت. هەروەها بە گونجاوی دەزانی فەرمانڕەوا زیاد لە کارەکتەرێکی هەبێت، تا لەگەڵ ئەو هەلومەرجە سیاسیانەدا بگونجێت کە پیایاندا تێدەپەڕێت. بەمجۆرە «ماکیاڤیللی» لە کتێبی (میر)دا، باسی لە هەموو ئەو سیفەت و خەسڵەتانە کردووە کە پێویستە لە فەرمانڕەوای بەهێز و سەرکەوتودا هەبێت و لێیان بەهرەمەند بێت، لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانیدا. ئەم خەسڵەتانە بە پێداویستیەکانی سیاسەتمەداری سەرکەوتوو ئەژماردەکات. بەمجۆرە پێویستە لەسەر (میر)، خۆی وەک کەسێکی بەخشندە و دڵفراوان نیشان بدات، بەڵام تا ئەو ئاستەی نەبێتە مایەی وروژاندنی زۆرینەی گەل. هاوکات پێویستە لەسەری وای نیشانبدات کە کەسێکی لێبوردەیە، بەڵام دەبێت بزانێت لە چ کاتێکدا دەبێت لێبوردەبێت، لەبەرئەوەی لێبوردن ئەگەر لە جێی خۆیدا نەبوو، ئەوا بە خراپ دەشکێتەوە. پێویستە میر لە یەک کاتدا خەڵک خۆشیان بوێت و لێشی بترسن، ئەمەش لەبەرئەوەی کارێکی قورسە، چاکتر وایە تۆقێنەر بێت نەک خۆشەویست. خەڵک بەشێوەیەکی گشتی دوودڵن و خاوەن بڕیار نین، هەرچیەکیان هەبێت لە ناخی خۆیاندا دەیشارنەوە. لە هەڕەشەو مەترسیەکان خۆیان لادەدەن و هەڵپەی دەسکەوت دەکەن. ئەوەندەی لە فەرمانڕەوایەکی سەختگیر دەترسن، ئەوەندە لە سەرکردەیەکی خۆشەویست سڵ ناکەن. سەرکردەی سەختگیریش هەرگیز مانای ئەوە نییە کە بێزراوەو خەڵکی ڕقیان لێیەتی. ڕقهەڵگرتنی خەڵک لە میر کارێکی ترسناکە و هەڕەشەیە بۆی، بۆیە دەبێت ئەوە بەسەر خۆیدا نەهێنێت. بۆ ئەوەی خۆی لە ڕق و تورەیی خەڵکیش بەدوور بگرێت، پێویستە میر دەستدرێژی نەکاتە سەر موڵک وماڵاتیان، یاخود چاو ببڕێتە شەرەفی ژنەکانیان. شتێکی جوانە میر لە بەڵێنەکانیدا ڕاستگۆ بێت، بەڵام ڕاستگۆیی بۆ هەموو کاتێک دەست نادات. زۆرێک لە میرەکان، لەبەرئەوە لە حوکمڕانیکردنیان سەرکەوتوو بوون و کۆنترۆڵی هاوڵاتیانیان پێکراوە، چونکە بەڵێن شکێنیان کردووە. پێویستە میر ڕوی خۆی بێ جیاوازی وەک مرۆڤ و ئاژەڵ نیشان بدات. چەکی مرۆڤ یاساو ڕاستگۆییە، بەڵام چەکی ئاژەڵ هێز و فرت و فێڵە. لەبەرئەوەی یاسا بە تەنها بەس نییە، بۆیە مرۆڤ ناچار دەبێت زۆر جار پەنا بۆ چەکی ئاژەڵ بەرێت. لەبەرئەوە پێویستە میری سەرکەوتوو لە یەککاتدا خەسڵەتی مرۆڤ و خەسڵەتی ئاژەڵی هەبێت، چونکە هەریەکەیان پاڵپشتی ئەوی دیکەیان دەکات. ئەگەر میر ناچار بێت خەسڵەتی ئاژەڵی هەبێت، پێویستە لەسەری لەیەککاتدا خەسڵەتی شێر و ڕێوی هەڵبژێرێت. لەبەرئەوەی وەک شێرێک پێویستە ڕێوی بێت تا تەڵەکانی بەرپێی خۆی ببینێت، وەک ڕێوییەکیش دەبێت شێر بێت، تا بتوانێت لەبەردەم هەڕەشە و پەلاماری گورگەکاندا پارێزگاری لە خۆی بکات[٩].

دەبێت میر ڕێگە بە کەسی دیکە نەدات ببێتە میرێکی بەهێز و خاوەن دەسەڵات، چونکە بەم کارەی خۆی وێراندەکات. هەروەها پێویستە لە ئاست ئەو کێشانەی دێنە پێش، بێلایەن نەبێت. بێلایەنی هەڵوێستی میرە لاواز و ڕاڕاکانە و دەبێتە مایەی کارەسات و ماڵوێرانی. میر دەبێت ئامۆژگاری کار و ڕاوێژکاری خۆی بێت و هەرکاتێکیش پێویستی بە مۆجیاری کەسانی دی هەبوو،

دەبێت ئەوە بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی بێت، نەک بەپێی حەز و ویستی ئەوانی دی.

ئەمانە خەسڵەت گەلێکی پێویستن بۆ هەر میرێکی سەرکەوتوو، بۆیە پێویستە بە ئاشکرا لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا ڕەنگ بداتەوە. (ڕەنگە پێویست نەبێت میر خاوەنی هەموو ئەو سیفەتانە بێت، بەڵام گرنگە وا خۆی دەربخات کە هەموو ئەو سیفەتانەی تێدایە. دەتوانم بڵێم: ئەگەر میر خاوەنی ئەم سیفاتانە بوو، هاوکات لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا نیشانی دان، ئەوا ڕەنگە زیانی پێ بگەیەنن، لە کاتێکدا چاکتر وایە بە ڕوکەش نیشانی بدات ئەو سیفاتانەی تێدایە. چاکتر وایە بۆ میر خۆی وەک کەسێکی بە بەزەیی و نەرم و نیان و ئیماندار و ڕاستگۆ نیشان بدات... پێویستە ئەوە باش بزانین کە ئەستەمە میر-بە تایبەتی میری نوێ-، لە هەڵسوکەوتیدا ڕەچاوی هەموو ئەو شتانە بکات کە خەڵک بە چاوی پیاو چاک سەیری بکەن، چونکە ئەو لە زۆر کاتدا ناچارە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت، لە دژی مرۆڤایەتی و لە دژی سۆز و بەزەیی و تەنانەت لە دژی خودی ئایین خۆشی کار بکات. پێویستە بیرکردنەوەی نەرم بێت و تا بۆی دەکرێت لە ڕێی خێر لانەدات، بەڵام دەبێت لە کاتی پێویستدا بزانێت چۆن ڕێگەی شەڕ و خراپە دەگرێتە بەر. پێویستە زۆر وریا بێت و قسەیەک نەکات بەدوور بێت لەو پێنج خەسڵەتەی باسمکردن، واتە هەر کاتێک خەڵک بینینی و گوێی لێگرتن، بزانێت میرێکە نەرم و نیانی و بەخشندەیی و مرۆڤدۆستی و شەرەف و بەر لە هەموو شتێکیش ئیمانداری لێدەبارێت. ئەمە گرنگترین شتێکە میر خۆی وا دەربخات، لەبەرئەوەی خەڵک بە شێوەیەکی گشتی، بە چاویان حوکمدەدەن و باوەڕ بەو شتانە دەکەن کە دەیبینن. خەڵک بە زۆری ڕوکار و سەروسەکتت دەبینن و کەمەکێکیان بە چاکی دەتناسن. ئەو ژمارە کەمەش زاتی ئەوە ناکەن بەگژ ڕای زۆرینەدا بچنەوە کە هێز و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایان لە پشتە)[10].

فەرمانڕەوای سەرکەوتوو چەند سیفاتێکی هەیە. هەموو میرێک دەبێت وا خۆی دەربخات کە خاوەنی ئەوانەیە، چونکە ئەو خەسڵەتانە ڕێگە بۆ سەرکەوتنی ئەو کارە سیاسیانە خۆشدەکەن کە میر ئەنجامیان دەدات و وا دەکات هاوڵاتیانی ڕێزی زیاترو زۆرتری بگرن. لە کاتێکدا ئەگەر میر بە جۆرێک ڕەفتاری کرد کە لەگەڵ ئەم خەسڵەتانەدا بگونجێت، ئەوا پێویستە لەسەری گوێ بە پێودانگە ئەخلاقیەکانی ڕەفتاری نەدات، مادامەکی ئەوە سەرکەوتن و بەردەوامی بۆ حوکمڕانیکردنەکەی مسۆگەر دەکەن، بەبێ ئەوەی ڕێز و خۆشەویستی گەلەکەی لەدەست بدات. ئەوەی لە کارو کردەوەی فەرمانڕەواییاندا بەهێند دەگیرێت، سەرەنجامی ئەو کارانەیە، بەبێ گوێدانە خەسڵەتی ئەو ئامرازانەی بۆ جێبەجێکردن و ڕایکردنی ئەو کارانە بەکارهێنراون. بەمجۆرە (پێویستە میر تەنها بیر لە پاراستنی ژیانی خۆی و دەوڵەتەکەی بکاتەوە). ئەگەر لەوەدا سەرکەوتوو بوو، ئەوا (هەموو ئەو ئامرازانەی پەنای بۆ بردون، بە شتێکی پیرۆز و ڕەوا دەدرێنە قەڵەم و تەواوی خەڵکی ستایشی دەکەن).

## حەوتەم/
## چاکترین سستمی سیاسی و خولیای نیشتمانی «ماکیاڤیللی»:

لە ڕێی بەرهەمەکانی «ماکیاڤیللی»یەوە سەرنج دەدەین کە سستمی حوکمڕانی بەسەر دوو جۆردا بەشکردووە، جۆرێکیان کۆماری و جۆرەکەی دیکەشیان میرنشین. (تێکڕای ئەو دەوڵەت و

سستمی حوکمڕانیانەی پێشتر و تا ئێستاش خاوەن دەسەڵاتن و حوکم دەکەن، یان کۆمارین یاخود میرنشینین). پێیوایە کۆماریەکان ئەو سستمە سیاسیانەن کە لەسەر ئازادی دامەزراون، بەڵام میرنشینەکان ئەو سستمانەن کە تاکە کەس حوکمی دەکات. لە کتێبی (میر)دا «ماکیاڤیللی» باس لە میرنشینەکان دەکات و پێیوایە چەند جۆر میرنشین هەیە:

١-میرنشینە نوێیەکان: ئەمانە دوو جۆرن: (هەیانە زۆر تازەن و هەشیانە بەرەنجامی پەیوەندیکردنە بە میرنشینێکی بۆماوەییەوە).

٢-میرنشینە ئایینیەکان: ئەگەرچی هیچ گرنگی و بایەخێکی لای «ماکیاڤیللی» نییە، بەڵام لە میرنشینەکانی دی زیاتر دڵنیایی و بەختەوەری تێدایە.

شێوازەکانی دەسەڵات گرتنە دەست لەم میرنشینانەدا بە بۆچوونی ئەو، بە چوار ڕێگا دەبێت: (یان بە هێز و توانای مرۆڤ خۆی دەبێت، یاخود بەخت یاوەری دەبێت، یان بە زۆرە ملێی و تاوان دەیکات، یاخود بە ڕەزامەندی هاوڵاتیان).

بەهەرحاڵ «ماکیاڤیللی» لە کتێبی (میر)دا، بەرەو ئەوە دەچێت ستایشی دەسەڵاتی ڕەهای تاکەکەس بکات، ئەو دەسەڵاتەی حساب بۆ هیچ شتێک ناکات و هەرچی ڕێگایە دەیگرێتە بەر بۆ پاراستنی کورسی حوکمڕانی خۆی.

هەرچی سستمی کۆماریشە، ئەوا «ماکیاڤیللی» لە کتێبی (دەمەتەقێ)دا تاوتوێی کردووەو لەوێدا ستایشی سستمی کۆماریی میللی دەکات و لە سستمی پادشایەتی تاکەکەسی بەچاکتر دەزانێت. لە میانەی ئەو بەراوردکاریەی لە نێوان سستمی پاشایەتی و کۆماریدا دەیکات، بۆمان ڕوندەبێتەوە کە سستمی کۆماریی میللی بەلاوە پەسەندترە، چونکە تەنها ئەم سستمە لە هەوڵی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گشتیدایە، تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی بەرژەوەندی تایبەتیش بێت. هەروەها ئەم سستمە بەهۆی ئەو ئازادیەی فەراهەمی دەکات، دەوڵەت دەتوانێت برەو بە تواناکانی و سەروەت و سامانی بدات، لە کاتێکدا حوکمی تاکەکەسی سەرەڕای تەوقدانی ئازادیەکان، تەنها لە خەمی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی کەسی فەرمانڕەوادایە. هاوکات لەسەر ئاستی چونیەکی و یەکسانیش، تەنها لە سستمە کۆماریەکاندا هەیە و جیاوازی و نایەکسانیش لە سایەی ڕژێمی پادشایەتیدا دەبینرێت.

سەرەڕای ئەوەش سستمی کۆماری توانای نوێبونەوەو گەشەکردنی هەیە، بەڵام سستمی پادشایەتی چەقبەستووەو بەگژ هەموو نوێبونەوەیەکدا دەچێتەوە. لەلایەکی دیکەوە سستمی کۆماری بوار لەبەردەم توانا و بەهرەکاندا دەڕەخسێنێ و دادپەروەری و یەکسانی فەراهەم دەکات، لە کاتێکدا سستمی پادشایەتی و بەپێی سروشتی بۆماوەیی خۆی، ئەوا لەگەڵ دادپەروەریدا یەک نایەتەوەو بەهرەو تواناکان نابوت دەکات. لە خەسڵەتەکانی دیکەی سستمی کۆماری ئەوەیە کە زیاد لە سستمی پادشایەتی، ڕێز لە ڕێکەوتن و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان دەگرێت، چونکە لە سستمی پادشایەتیدا ڕەنگە پادشا بەڵێنەکانی خۆی نەباتە سەر، گەر بزانێت جێبەجێکردنیان لەگەڵ بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیدا ناگونجێن.

نیشاندانی لایەنە پۆزەتیڤەکانی سستمی کۆماری لە کتێبی (دەمەتەقێ)دا، پێمان دەڵێن «ماکیاڤیللی» خوازیاری پراکتیزەکردنی ئەو سستمی حوکمڕانیە بووە لە وڵاتەکەیدا و بە ئومێدی

ئەوە بووە، کۆماری ئیتاڵیا بەشێوەی کۆمارەکانی ڕۆمانی کۆن چێ ببێت، بە جۆرێک خاوەن سوپایەکی بەهێز بێت و ئاستێکی بەرز و نۆرماڵی لە ئازادی مەدەنی تێدا بەرقەرار بێت. بەڵام گەندەڵی و ناهەمواری بارودۆخی کۆمەڵگەی ئیتاڵی، وایان لە «ماکیاڤیللی» کرد درک بە سەختی و گرانی چاکسازی و ڕزگارکردنی کۆمەڵگەی ئیتاڵی بکات، لە ڕێگەی سستەمی کۆمارییەوە . لە هەمان کاتدا قەناعەت بەوە بهێنێ کە ئەنجامدانی ئەو کارە لەڕێی میرێکی بەهێزەوە دەبێت، واتە ئەوەی بە ئازادی دەسگیر نابێت بە دیکتاتۆری و زوڵم و زۆر بەدیبهێنێت. دارمانی ئەخلاق و نەمانی فەزیلەت لای خەڵکی لەلایەک و سوکایەتیکردنی فەرمانڕەوایان بەو ئەرکە گشتیانەی لەسەر شانیانە لە لایەکی دیکەوە، هێنانە ئارای سستەمێکی حوکمڕانی کۆماری دەکاتە شتێکی مەحاڵ.

ڕونتر بڵێین: (ماکیاڤیللی پێیوابوو سستەمی کۆماری چاکترین مۆدێلی حوکمڕانییە، بەڵام تەنها بۆ ئەو میللەتانە دەست دەدات کە پابەندی ئەخلاقی بەرزن. هەرچی ئەو میللەتانەشە کە پابەندی ئەخلاق و ئایین نین، وەک میللەتی دارماوی ئیتاڵیا، ئەوا جگە لە سستەمێکی حوکمڕانی ستەمکاری ڕەها، هیچی تر بە دەردی نایەت. ئەم حوکمە ستەمکارییە دەتوانێت لە ڕێی هێزەوە، ئەخلاقی بەرز لە ناو هاوڵاتیاندا بچێنێ و هەرکارتێکیش ئەم ئاکارە بەرز و باشە هەموانی گرتەوە، دوای ئەوە میللەت دەتوانێت شان بداتە بەر باری حوکمڕانی. ماکیاڤیللی و بەپێی ئەم قەناعەتانەی، پێیوابوو ئەگەری دامەزراندنی سستەمی کۆماری لە هیچ جێیەکدا نییە، مەگەر تەنها لە سویسراو چەند هەرێم و ناوچەیەکی ئەڵەمانیادا نەبێت، لەبەرئەوەی ژیانی مەدەنی لەو شوێنانە بە پاکی ماوەتەوەو خەڵکیش ئەخلاق بەرزی خۆیان پاراستووە).

بەمجۆرە دەتوانین بڵێین «ماکیاڤیللی» بۆ ئەوەی لە نێوان ئەو دوو هەڵوێستە ناکۆک و دژ بەیەکەیدا، سەر دەربکات کە لەلایەک بە سستەمی پادشایەتی ڕەها سەرسام بووە، بۆ خاتری یەکخستنەوەی ئیتاڵیا و لەلایەکی دیکەش سستەمی کۆماری بە چاکترین سستەمی حوکمڕانی زانیووە، گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو تا ئەو شوێنە بڕوای بە سستەمی پادشایەتی ڕەها هەیە کە دەوڵەتی تازە لە سەرەتای دروستبونیدا بێت، یاخود لەسەر وەختی چاکسازیکردندا بێت بۆ قوتاربون لە گەندەڵی، بەڵام دوای ئەوەی ئەم دەوڵەتە بارودۆخی دامەزراو دەبێت و لە گەندەڵی دەرباز دەبێت و میللەت ئەخلاق و فەزیلەتی بۆ دەگەڕێتەوە، ئەو کات دەکرێت سستەمی کۆماری جێبەجێ بکرێت.

## هەشتەم/
## گرنگی یاسا:

ئەگەرچی «ماکیاڤیللی» لە کتێبی (میر)دا داکۆکی لە سستەمی پادشایەتی ڕەها دەکات و لە کتێبی (دەمەتەقێ)شدا، سستەمی کۆماری بە چاکترین سستم دادەنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەسەر ئەو قەناعەتە نەگۆڕەی خۆیەتی کە سەلامەتی و مانەوەی دەوڵەت بەشێوەیەکی سەرەکی دەرگیری چاکی و نۆرماڵی یاساکەیەتی، چونکە فەزیلەتی مەدەنی هاوڵاتیان لە یاساوە سەرچاوە دەگرێت. کەواتە حوکمڕانی ئارام و دامەزراو لە سستەمی کۆماری یاخود لە پادشایەتی ڕەهادا بە ڕای

«ماکیاڤیللی»، پەیوەستە بە چاکی و لەباری یاساکانیەوە. هیچ شتێک لە سەرپێچیکردنی یاسا لەلایەن فەرمانڕەوایانەوە، مەترسی بۆ سەر ئارامی و ئۆقرەیی حوکم دروست ناکات. لێرەوەو لەبەر گرنگی تایبەتی یاساکان، پێویستە ئەرکی نوسینەوەی ئەو یاسایانە بە یاسادانەرێک بسپێردرێت، ئیتر ئەگەر ئەوە بۆ بونیادنانی دەوڵەتێکی سەرکەوتوو بێت یاخود بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی چاک و تەندروست بێت.

بەو پێیەی فەزیلەت و ئەخلاق لە یاساوە سەرچاوە دەگرن و دروست دەبن، هەروەها لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی گەندەڵ توانای ئەوەی نییە خۆی چاک بکات، ئەوا تەنها یاسا دانەرێک دەتوانێت ڕێنوێنی بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئەو پرانسیپە ئەخلاقیانەی بۆی داناون. بە پشت بەستنی بە یاساکان، دەتوانین بڵێین «ماکیاڤیللی» بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگە، هەر بە تەنها گرنگی بە لایەنی سیاسی نەداوە، بەڵکو بە بایەخی زیاترەوە بە لایەنی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی میللەتەوە خەریک بووە. هەروەها مافی بە فەرمانڕەوای خاوەن دەسەڵاتی ڕەهاش داوە تا ئەو یاسایانە بسەپێنێت کە فەزیلەت و ئەخلاق لە کۆمەڵگەدا دەچێنن و بۆشی هەیە هەموو ئامرازێک لە پێناو چەسپاندنی ئەو یاسایانەدا بەکاربهێنێت، چونکە بەو جۆرە دەتوانێت گەندەڵی لە کۆمەڵگەدا بنەبڕ بکات و دەوڵەتێکی چالاک و سەرکەوتوش دامەزرێنێت. یاسادانەر ئەو ئەندازیارە نییە کە هەر بە تەنها دەوڵەت بونیاد دەنێت، بەڵکو ئەندازیاری کۆمەڵگەشە بەهەموو لایەنە ئەخلاقی و ئایینی و ئابوریەکانیەوە[11].

سەرەڕای ناکۆکی هەڵوێستی لە سستمی پادشایەتی و سستمی کۆماری، بەڵام «ماکیاڤیللی» ڕقێکی زۆری لە ئۆرستۆکراتیەت و خانەدانەکان هەبوو، چونکە پێی وابوو بەرژەوەندی خانەدانەکان هەرگیز لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا ناگونجێت. خانەدانەکان جگە لە کەڵەکەکردنی سەروەت و سامانی زیاتر و دابینکردنی خەرجی زۆرتر بۆ حەز و ئارەزووەکانیان، خەمێکی دیکەیان نییە. ئەوانە کەسانێکی زەغەل و کارنەکەرن و لەسەر دەسکەوت و قازانجی موڵک و ماڵاتەکانیان دەژین، بەبێ ئەوەی خزمەتێکی بەکەڵکی کۆمەڵگەکەیان بکەن. ئەوان لە هەر جێیەک بن، دوژمنی هەموو حوکمێکی مەدەنین، بۆیە پێویستە لەسەر فەرمانڕەوا ئیتر لە سستمی کۆماریدا بێت یان پادشایەتی، سەرکوتیان بکات و نەیانهێڵێت.

«ماکیاڤیللی» لە پاڵ ڕقی زۆری لە خانەدانەکان، بێزاری و توڕەیی خۆشی لە دەست لەشکری بەکرێگیراوەکان دەردەبڕێت کە بۆ بەرگریکردن لە دەوڵەت بەکاردەهێنرێن. پێی وابوو ئەوانە بەشێکن لە شلۆقی و پشێوی بارودۆخەکە لە ئیتاڵیا، چونکە هەوڵی بەردەوامیان بۆ دەسکەوتنی پارە، وایان لێدەکات بێ گوێدانە هیچ دڵسۆزی و خۆنەویستیەک، دەستبەرداری ئەم میر بن و پاڵ بدەن بە میرێکی ترەوە. (بەکرێگیراوەکان ئەو چەتە کاسەلێس و چڵکاوخۆرانەن کە ساز و ئامادەی شەڕن لە پێناو هەرکەسێکدا زۆرترین پاداشتیان بداتێ. ئەمانە دڵسۆزی کەس نین و زۆر جاریش لە دوژمن جێی مەترسی ترن بۆ سەر ئەو کەسەی بەکرێیان دەگرێت و کاریان پێ دەکات. ئەم بەکرێگیراوانەی توانیان ترس و تۆقاندن لە ئیتاڵیادا بچێنن، دەستەوستانی خۆیان لە بەرامبەر ئەو هێزانەدا نیشان دا کە لە فەرەنساوە هاتبوون و لە ڕووی دیسپلینەوە چاکتر و لە ڕووی ئینتیماو وەلائیشەوە دامەزراوتر بوون)[12]. بەمجۆرە «ماکیاڤیللی» سەرسامی خۆی بە فەرەنسا دەردەبڕی، دوای دامەزراندنی سوپا بەهێزەکەی کە بە چاکترین شێوە مەشق درابوو. ئەو پێیوابوو مەشقدانی

سوپایەک لە هاوڵاتیان، یەکەمین پێداویستی دروستبونی دەوڵەتێکی بەهێزە. هێزی کاسەلێس و بەکرێگیراو، مایەی ماڵوێرانیە بۆ ئەو فەرمانڕەوایەی پشتی پێدەبەستێت، چونکە لە ڕووی داراییەوە مایە پوچی دەکات و هەرکاتێکیش دوچاری تەنگانە هات، دەستبەرداری دەبن و وازی لێدێنن.

بەمجۆرە «ماکیاڤیللی» دەیویست تەواوی ئەو هاوڵاتیانەی توانای جەستەییان هەیە و تەمەنیان لە نێوان حەڤدە بۆ حەفتا ساڵیدا دەبێت، بخاتە ژێر باری مەشقی سەربازییەوە، چونکە بەهێزێکی واوە، هەموو فەرمانڕەوایەک دەتوانێت بەرگری لە دەسەڵاتەکەی بکات و سنوری دەوڵەتەکەشی فراوانتر بکات. گەرنا ئەوا ئەو وڵاتە دەبێتە گۆڕەپانی شەڕی ئەهلی لە ناوخۆدا و لە دەرەوەشدا دەبێتە جێ تەماحی میرو دەسەڵاتدارانی وڵاتانی دراوسێ.

کەواتە بایەخدانی «ماکیاڤیللی» بە گرنگی ڕۆڵی یاسا بۆ دەوڵەت لەگەڵ بونی سوپایەکی نیشتمانی و ڕقی زۆری لە خانەدانەکان، بۆ ئەوە بوو ئیتاڵیا لە ڕووی نەتەوەییەوە یەک بخات و لە هەموو پشێویەکی ناوخۆی و مەترسیەکی دەرەکی دووری بخاتەوە. ئەو لەوەدا ڕون و ڕەوان بوو کە دەیوت: (مرۆڤ لە پێناو نیشتمانەکەیدا، دەبێت هەموو ئەرک و مەسەلەکانی دی وەلاوە بنێت). ئەمەش وایلێکرد دەسەڵاتی پادشایەتی ڕەها بکاتە نمونەیەکی ئایدیالی، بۆ ڕزگارکردنی ئیتاڵیا لەو دۆخە ناهەموارەی تێی کەوتبوو. هەمیشە خەونی ئەوەی هەبوو، لە نێوان ستەمکارانی ئیتاڵیا و تەنانەت لە نێو بنەماڵەی میدیتچیدا، بەڵکو میرێک ڕابێت و خواستی ئەوەی هەبێت ئیتاڵیا بە یەکگرتویی ببینێت، ئەوەندەش بوێر و قارەمان بێت بتوانێت ئەو خواست و خەیاڵە بکاتە واقیع.

لێرەدا دەبێت ئەوەش بڵێین ئومێد خواستن بە ئارامی و یەکیەتی ئیتاڵیا کە هاندەری سەرەکی بزواندنی فیکری «ماکیاڤیللی» بوو، زیاتر شتێکی ویژدانی بوو وەک لەوەی پلانێکی سیاسی عەمەلی بێت بۆ هێنانەدی ئەو ئومێدە، چونکە جگە لە بڕوابونی بەوەی پێویستە ئیتاڵیا بچێتە ژێر ڕکێفی سەرکردایەتی پادشایەکی ڕەها، بە مەبەستی دروستکردنی قەوارەیەکی یەکگرتوو، وەک ئەوەی لە فەرەنسا و ئیسپانیا ڕویدا، شتێکی دیکەی نەبوو کە بشێت ناوی سیاسەتی یەکخستنەوەی ئیتاڵیای لێ بنرێت. هاوکات ئەگەرچی «ماکیاڤیللی» ناوبانگی بە لایەنگری فەرمانڕەوای ستەمکار و سیاسەتی نائەخلاقی ڕۆیشتبوو، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جگە لە هەواداری ئازادی و دیموکراسی و سەروەری گەل و یاسا، شتێکی تر نەبوو.

هەلومەرجی ژیانی خۆی لەو قۆناغە ناهەموارەی مێژووی وڵاتەکەی و گرنگی دانی بە دەستەبەرکردنی یەکیەتی ئیتاڵیا و هەوڵدانی بۆ بەدەستهێنانەوەی پێگەی خۆی لەلای بنەماڵەی مدیتچی، هەموو ئەو هۆکارانە وایان لێکرد کتێبی (میر) بەو شێوەیە بنوسێت و پێشکەشی فەرمانڕەوای نوێی فلۆرنسای بکات و داوای لێبکات کار بۆ یەکیەتی خاکی وڵاتەکەی بکات، بەهەر شێوەیەک بووە.

فەلسەفەکەی بۆ هاتنە ئارای دەسەڵاتێکی ڕەها، لەلایەن زۆربەی میر و فەرمانڕەواکانی وڵاتەوە پێشوازی لێکرا، لەبەر ئەوەی بە بەهانەیەکی بەهێزیان دەزانی بۆ تۆکمەکردنی دەسەڵات و حوکمڕانی خۆیان. ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە کتێبی (دەمەتەقێ) ئەو کتێبەی بیرو بۆچونەکانی خۆی تێدا بەیاندەکات، ئەو نێوبانگەی پەیدا نەکرد وەک کتێبی (میر). گەر ئەوە ببوایە دەیتوانی ئەو وێنە دیسپۆتیزمی و نائەخلاقیەی سەر «ماکیاڤیللی» بسڕێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا «ماکیاڤیللی» هەر بە یەکەمین بیریاری سەردەمی ڕێنیسانس دادەنرێت کە دیاردەی سیاسەتی بەجیا لە دیاردەکانی

دیکە بینیووەو بە میتۆدێکی نوێ و جیاواز لە میتۆدی سەدەکانی ناوەڕاست تاوتوێی کردووە. بە کورتیەکەی ئەو سیاسەتی لە چەمکێکی ئەبستراکت و لە دنیای خەون و خەیاڵەوە داگرتە سەر ئەرزی واقیع، ئەمەش دەسکەوتێکە و بۆ ئەو دەنوسرێت.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١-ئەرنستۆلاندی: ڕێبەرانی فیکری سیاسی- دار النهار للنشر، بیروت — ل ٤٠.

٢-پیاوێکی ئاینی بوو، بۆ ماوەیەکی کەم لە فلۆرەنسا حوکمڕان بوو، کە حوکمێکی ئاینی پەرگیر بوو.

٣-مارسێل بریلۆ: مێژووی فیکری سیاسی — ل ٢٠٧.

٤-نیکۆلۆ ماکیاڤیللی: میر، نەسکی ١٥ وەرگێڕانی: خەیری حەماد، لێکدانەوەی: فاروق سەعد — دار الافاق الجدیدة، بیروت، ١٩٧٧.

٥-نیکولۆ ماکیاڤیللی: میر، نەسکی ١٧.

٦-جۆرج سباین: گەشەکردنی فیکری سیاسی — کتێبی سێیەم، ل ٤٨٠.

٧-جۆرج سباین: ه. س. پ — ل ٤٧٧.

٨-د. ابراهیم اباظة و د. عبد العزیز غنام: مێژووی فیکری سیاسی — دار النجاح، بیروت، ١٩٧٣ — ل ١٨٤.

٩-بڕوانە: نیکۆلۆ ماکیاڤیللی، میر.

١٠-نیکۆلۆماکیاڤیللی: میر، نەسکی ١٨.

١١-جۆرج سباین: گەشەکردنی فیکری سیاسی — ل ٤٨٢.

١٢-نیکۆلۆماکیاڤیللی: میر، نەسکی ١٢.

## سەرچاوە:

د. مهدی المحفوظ: اتجاهات الفکر السیاسی فی العصر الحدیث — المؤسسة الجامعیة للدراسات و النشر و التوزیع، بیروت — الطبعة الثالثة، ٢٠٠٧.

# بونیادگەری

# مریشکی بونیادگەرەکان و هێلکەی ئومانیستی لیبراڵ

پیتەر باری
لە ئینگلیزییەوە:
مەنسور تەیفوری  و ڕێزان حەسەنی

بونیادگەری بزوتنەوەیەکی رۆشنبیرییە کە لە پەنجاکانی سەدەی بیستدا لە فەرەنسا دەستی پێکرد و یەکەمجار لە بەرهەمەکانی کلۆد دلێڤی شتراوسی (١٩٠٨) ئەنترۆپۆلۆگ و رۆلان بارت (١٩٨٠ - ١٩١٥)ی رەخنەگری ئەدەبیدا بینراوە. دابەزاندنی بونیادگەری بۆ یەک ئەنجام و چڕکردنەوەی لە یەک گوزارەدا کارێکی دژوار و گرانە، بەڵام ئەگەر ناچار بین مل بەم دابەزاندنە بدەین، دەتوانین بڵێین جەوهەری بونیادگەری بڕوایە بەوەی شتەکان بە تەنیا و دابڕاو دەرک ناکرێن — شتەکان دەبێ لە ناوکۆیی بونیادێکی گەورەتردا کە خۆیان بەشێکن لێی سەیر بکرێن. بونیادگەری، بە زۆری ١٩٧٠ کان گەیشتە بەریتانیا و کاریگەرییەکی بەرفراوانی دانا.

ئەو بونیادانەی لێرەدا باسدەکرێن ئەوانەن کە شێوەکانی تێگەیشتنی ئێمە بۆ جیهان و رێکخستنی ئەزموونەکانمان دەسەپێنن بەسەرماندا، نەک بوویەکی بابەتی کە پێشتر لە جیهانی دەرەکیدا بووبێ. ئەمەش بەم مانایە کە واتا یان دەلالەت جۆرێک ناوک یان جەوهەر نییە لە ناخی شتەکاندا: بەڵکو مانا هەمیشە لە دەرەوەیە. مانا هەمیشە تایبەتمەندییەکی شتەکانە (کە دەدرێتە پاڵیان)، گەر ڕاستتر بڵێین، ماناکان لەلایەن مێشکی مرۆڤەوە دەدرێنە پاڵ شتەکان، ماناکان بریتی نین لە شتەکان. بەڵام با لە نموونەیەک ورد ببینەوە کە رەنگە

بە پلەی یەکەم دەبێ بەو بونیادانەی کە پێوەندیان بە ئەدەبەوە هەیە بیری لێبکرێتەوە. بابڵێین ئەم نموونەی لەگەڵی رووبەڕووبین شیعری «دوا رۆژباش»ی جان دانە. لەوانەیە پەرچەکرداری راستەوخۆی ئێمە بەرامبەر ئەم شیعرە، لە روانگەیەکی بونیادگەرانەوە، ئەوەبێ کە بۆ تێگەشتن لەم شیعرە دەبێ پێش هەموو شتێک روون لەو ژانرە یان چەشنە ئەدەبیە بگەین کە شیعرەکە پارۆدی و لادانەکانی خۆی تێدا دەکات. هەر شیعرێک بە تەنیا نموونەیەکە لە ژانرێکی تایبەت و، ژانر و نموونەکەش پەیوەندییان پێکەوە هەیە، هەر چۆن هەر ڕستەیەکی بە ئینگلیزی وتراو، پێوەندیی بە زمانی ئینگلیزییەوە وەک بونیادێک و بە هەموو رێساو دابەکانیەوە هەیە. لە نموونەی شیعرەکەی داندا، ئەم ژانرە پەیوەندیدارە «alba» یان «Dawn sang» یان سەحەرییە، واتە ئەو هۆنراوەی سەرچاوەکەی بۆ سەدەی دوانزەهەمی زایینی دەگەڕێتەوەو تێیدا ئاشقان گلەیی لە هەڵاتنی کازیوەو بەیان دەکەن، چونکە هاتنی بەیان مانای ئەوەیە کە دەبێ لەیەکتر دوور بکەونەوە.

بەڵام بەبێ برێک ئاگاداری لە چەمکی ئەڤینی بە ئەدەبانەو وەکی تر وتنی ئەمەی کە ئالبا شیعرە، لە پێشدا گریمانی مەعریفەیەکی بەرامبەر ئەو شتەی کە لە شێوەی باو و کۆنەی ناسراودا بە شیعر دادەنرێ تێیدایە. ئەمانە تەنیا بەشێکن لەو بنیادە کولتوورییانەی کە شیعرەکەی دان بەشێکە لێیان. دواتر دەبینی کە بۆچوونی «بونیادگەرانە» بۆ ئەم شیعرە بەرەبەرە لە دەقەکە دوورمان دەکاتەوە و، بەرەو پرسیاری گەورەو تا ڕادەیەک دەرهەست لەسەر چەشن و مێژوو و فەلسەفە دەمانبات، لەباتی ئەوەی لە دەقەکە نزیک و نزیکترتان بکاتەوە، واتە ئەو شتەی کە نەریتی ئانگلۆ ئەمەریکە داوای دەکات. مادام تەمسیلی رەقی مریشک و هێلکەمان بەکارهێنا، دەتوانین بونیادە لەخۆگرەکان (ئالبا، ئەڤینی شەرمێونانەو شیعر خۆی وەک کردە یان پراکسیسێکی کولتووری) وەک مریشک و، نموونە تاکەکان (لێرەدا شیعرەکەی دان)، وەک هێلکە سەیر بکەین. لای بونیادگەرەکان گرنگترین چالاکی دیاریکردنی وردی سروشتی مریشکەکەیە، لای ئۆمانیستە لیبراڵەکانیش شیکردنەوەی وردی هێلکەکە گرنگترین کارە.

کەوابوو، لای روانگەی بونیادگەرانە بۆ ئەدەب، بزووتنێکی بەردەوام بەرەو دوورکەوتنەوە لە لێکدانەوەی دەقێکی یەکە ئامادەیە، لەگەڵ ئەم بزوتنەشدا پاڵنەرێکی هاوکات بەرەو تێگەشتن لەو بونیادە دەرهەستە گەورەترانەی کە سێبەریان لەسەر کردوون، هەیە. ئەم بونیادانە، وەک لە دەسپێکی ئەم نووسینەدا ئاماژەم پێدان، بەزۆری هێندەی مانای ئەدەب یان شیعر، یان چییەتی گێڕانەوە خۆی دەرهەستن، دەرهەستتر لە هەندێ تایبەتمەندیی «رووتی» وەک مێژووی ئالبا یان ئەشقی شەرمنانە، کە دوای هەموو شتێک دیسان دەکرێ لە مێژووی باوی ئەدەبدا تێیانبگەین. دەرکەوتنی بونیادگەری لە بەریتانیا و ئەمەریکا لە ١٩٧٠ کاندا گەلێ مشتومڕی خستەوە، ڕێک لەبەرئەوەی خوێندنەوەی ئەدەبیی لەم وڵاتانەدا بە نەریت گرنگییەکی زۆر کەمی بەو بابەتە دەرهەستە گەورانە دەدا کە بونیادگەرەکان حەزیان لە پەرەدانی بوو. ئەوە بەناوی «شۆڕشی کەمبریج» لە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە ئینگلیزییەکانی ١٩٢٠ەکاندا ناسراوە، ئاڕاستەکەی پێچەوانەی هەموو ئەمانە بوو: ئەم جۆرە خوێندنەوە حەزی لە خوێندنەوەی نزیکی دەق بوو، دابڕاو لە هەموو ناوکۆیی و بونیادێکی پان و بەرفرە: ئەم جۆرە خوێندنەوە بێوچان و ماندوونەناس «دەق — تەوەر» بوو و خۆی لە

ئایدیا، پرسی باس و خواسی دەرهەست و پرسیاری بەرفراوان دەپاراست. بونیادگەری، بەم مانا، خوێندنەوەی ئینگلیزیی پێچەوانە کردەوە، لە بایەخی هەموو ئەو شتانەیدا کە بۆ نزیکی نیو سەدە گرنگیان پێدرابوو، هەندێ پرسیاری سەرکوتکراوی زیندوو کردەوە، پرسیاری وەک: کە دەڵێین «ئەدەب» مەبەستمان چییە؟، «گێڕانەوە چۆن کار دەکات؟»، «بونیادی شیعری چییە؟». بە کورتی، ڕەخنەگرانی سوننەتی حەزیان لەو پێشنیارە نەبوو کە داوایدەکرد سەرنجیان لە هێلکەوە بۆ مریشک بگوێزنەوە.

## نیشانەکانی باوک – سۆسێر:

ئەگەرچی، وەک وتمان، بونیادگەری لە دەیەی ٥٠ و ٦٠ دا دەستی پێکرد، بەڵام ڕەگەکانی لە بیرکردنەوەی زمانناسی فەرەنسی، فێردیناند دۆسۆسێر (١٩١٣ — ١٨٥٧)دا بوو. سۆسێر سیمایەکی سەرەکی گەشەی بۆچوونی مۆدێرنی خوێندنەوەی زمانە. لە سەدەی نۆزدەدا شارەزایانی زمان بە زۆری ڕوویان لە لایەنی مێژوویی زمان کردبوو (کاری وەک گەشەی مێژوویی زمانەکان، پێوەندیی نێوان زمانەکان و لێکدانەوەی ریشەی زمانەکان). سۆسێر لەباتی ئەمە، چەقی کاری خۆی بۆ سەر نموونە و کاری ئەو زمانانە گواستەوە کە ئەمڕۆ لە کاردان، بەتایبەت چۆنیەتی رسکان و جێگیربوونی واتا و کارکردی بونیادە ڕێزمانیەکان.

بەڵام ئاخۆ ڕێک کامە سەرنجی سۆسێر لەسەر بونیادە زمانناسیەکان بوو کە دواتر لای بونیاگەرەکان هۆگرییەکی زۆری دروست کرد؟ داهێنانەکەی سۆسێر دەکرێ لە سێ خاڵدا کۆبکرێتەوە. یەکەم، سۆسێر جەختی کردەوە کە ئەو واتایانەی ئێمە دەیدەینە پاڵ وشەکان بەتەواوی بڕیارکردن و (arbitary) و، واتاکان تەنیا عورف و باویەتی پاراستوونی. بە وتەیەکی دیکە، وشەکان هەندێ نیشانەی پێکردەن، واتە هیچ پێوەندییەکی ناوەکی یان جەوهەری لە نێوان وشە و بابەتەکەیدا نییە. وشەی «پەناگە» بۆ نموونە، بە هیچ شێوە بۆ ماناکەی لەبار نییە و هەموو نیشانە زمانیەکان وەک ئەم نموونە زادەی بڕیار و ڕێکەوتنن. (ئەگەرچی هەندێ ناوە دەنگی وەک هیدس یان کووکوو لە دەرەوەی ئەم حوکمەن، بەڵام هەر ئەمانەش لە زمانەکاندا جیاوازن). پێداگریی لەسەر بڕیارکردیی نیشانە زمانیەکان تا ڕادەیەک شتێکی ئاشکرایە و لەوانەشە، شتێکی تازە نەبێ (ئەفلاتوون لە ڕۆژگاری یۆنانی کەونارارداد ئەمەی وتووە). بەڵام پێداگریی لەسەر ئەم بڕیارکردییەی نیشانە زمانیەکان چەمکێکی تازەیە (کە هەمیشە زۆر گرنگترە)، بونیادگەرەکان هۆگری ئەوە بوون ئەم باسە بێننە ئارا کە مادام زمان وەک سیستمێک لە نیشانە بنچینەی لەسەر بڕیارکردییە، ئەوەی بەدوایدا دێت ئەمەیە کە زمان ڕەنگدانەوەی جیهان و ئەزموون نییە، بەڵکو سیستمێکە تەواو دوور لە جیهان و ئەزموون، ئەم خاڵە دواتر پەرە دەدرێت.

دووهەم، سۆسێر جەختی کردەوە کە واتای وشەکان (کە ڕەنگە بتوانین وای ناوبنێین) ڕێژەییە، واتە دەتوانین بڵێین، هیچ وشەیەک بە تەنیایی و دابڕاو لە وشەکانی دیکە واتای نییە. واتای هەر وشەیەک گرێدراوی پێوەندییەتی لەگەڵ وشە «هاوبەند»ەکانی دیکە. بۆ نموونە، زماناسی وشەی «پەناگە» گرێدراوی شوێنیەتی لەنێو زنجیرەی جێنشینیدا، واتە ئەو زنجیرەیەی وشەکان لە کارکرد

و مانادا پەیوەستی یەکترن و دەتوانن لە ڕستەیەکدا لەباتی یەکتر دابنیشن. زنجیرەی جێنشینی لەم نموونەدا دەتوانێ ئەم وشانەی خوارەوە لەخۆ بگرێ:

## کەپر، ئەمبار، پەناگە، ماڵ، کۆشک، تەلار

ئەگەر هەر یەک لەم وشانە لە زنجیرەکەدا نەمێنن، مانای وشەکانی دیکەش گۆڕانی بەسەردا دێت. کەوابوو، پەناگە و ئەمبار هەردوو بچووکن و هاوبونیادن، بەڵام یەک شت نین: یەکێکیان لە بنەڕەتدا بۆ پەناگرتنە (پەناگەی نیگابانی شەو) لە کاتێکدا ئەوی دیکەیان بۆ هەڵگرتنە: بەبێ ئەوی دیکە، هەر یەک لەمانە دەبێ هەردوو ماناکە لە خۆ بگرێ و لێرەوەش ببێتە وشەیەکی جیاواز. هەر بەم شێوە، کۆشک دەتوانێ وەک نشینگەیەکی گەورە و فراوانتر لە ماڵێکی ئاسایی پێناسە بکرێ، بەڵام نەک هێندەی تەلارێک. کەوابوو، کۆشکمان لە ڕێگەی پێوەندیی لەگەڵ وشەکانی تەنیشتیەوە پێناسە کرد. ئەگەر نموونەکەمان دوانەیەکی لێکدژ بێت، ئەم پێناسەکرانە و بە وشەکانی بەرامبەر، تەنانەت ئاشکراتریش دەبێ: زاراوەی «نێر و مێ»، بۆ نموونە، لە مانادا توند پێکەوە گرێدراون: هەریەکەیان تەعبیرە لە بزریی و نەبوونی چۆنێتیەک کە ئەوی دیکە لە خۆی گرتووە، چونکە نێر، دەتوانێ وەک مانایەک سەیر بکرێ کە مێ نییە و بە پێچەوانەوە. هەروەک ئەمەش، چەمکی «ڕۆژ» مان لە دەرەوەی پێوەندی بە چەمکی «شەو»ەوە نییە، «باش» مانای نییە بێ بوونی «خراپ»ێک لە بەرامبەریدا. ئەم لایەنە، ڕێژەیی (یان پێوەندیانەی) زمان لە ئاماژەیەکی بەناوبانگی سۆسێرەوە سەرچاوەی گرتووە: لە هەر زمانێکدا تەنیا جیاوازیەکان هەن، بێ هیچ زاراوەیەکی نەگۆڕ. بەم شێوەیە، هەموو وشەکان لە تۆڕی جیاوازیدا هەن، تۆڕی وەک «جیاوازەکان»، یان دوانە لێکدژەکان، یان وەک زنجیرەی جێنشینی کە لە پێشتر لە باسی «شوێنەکان»دا ئاماژەمان بۆ کرد.

سۆسێر بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی خۆی لەمەی کە هیچ واتایەکی ناوەکی نەگۆڕ لە زماندا نییە، نموونەیەکی بەناوبانگ دەهێنێتەوە: قەتاری ٨:٢٥ دەققەی ژێنێڤ بۆ پاریس. چی شوناس بەم قەتارە دەبەخشێ؟ چ شتێکی ماددیی لە کاردا نییە، بۆ نموونە گۆڕانی هەررۆژەی مۆتۆر و واگۆنەکان، شۆفێر یان ڕێبوارەکانی و شتی لەم جۆرە. ئەگەر دوابکەون و سەعاتی ٨:٢٥ دەقیقەش ڕێنەکەوێ، ئاخۆ هێشتا هەر قەتارە؟ جارێکیان لە وێستگەی ساوتهامپتون هەواڵی قەتاری برایتۆنم پرسی و بلیتبڕەکە ئاماژەی بۆ پاسێک لەوبەری وێستگەکە کرد و وتی: ئەوەتانێ. ئەو ڕۆژە یەکشەممە بوو و لەبەرئەوەی ئەندازیارەکان کاریان لە هێڵەکەدا دەکرد، پاسێک ڕێبوارەکانی بۆ پشتەوەی وێستگەکە دەگواستەوە. هەندێ جار مەرج نییە قەتارێک قەتار بێت. ئەنجامەکەی سۆسێر ئەمەیە کە تاقە شتێک شوناس بەم قەتارە دەدات، پێگەیەتی لە بونیادی جیاوازیەکاندا: ئەم قەتارە لە نێوان ٧:٢٥ و ٩:٢٥ دا دێت، ئەمەشە کە شوناسی ئەو تەواو ڕێژەییە.

خاڵی سێهەم ئەمەیە کە، بەڕای سۆسێر، زمان جیهانی ئێمە ڕۆدەنێ و، کارەکەی تەنیا بۆ تۆمارکردن یان پلەبەندیکردنی جیهانی ئێمە کورت نابێتەوە. مانا هەمیشە لەلایەن زەینی مرۆڤەوە دەدرێتە پاڵ بابەت یان ئایدیایەک و بە زمان و لە ڕێگەی زمانەوە ڕۆدەنرێ: واتا پێشتر شتەکانی لەخۆنەگرتووە. ناسراوترین نموونە بۆ ئەم پرۆسە، هەڵبژاردنە لە نێو دوانەی جێگرەوەی تیرۆریست

یان ئازادیخوازدا. هیچ ڕێگەیەکی بێلایەن یان بابەتی بۆ جوێکردنەوەی کەسێکی وەها لە ئارادا نییە، تەنیا هەڵبژاردنی لایەکی هاوکێشەکەیە ئەم کەسە ڕۆدەنێ. نموونەیەکی دیکەی ئەم چەمکە دوو ڕێگەی ئاماژەیە بۆ باجی خۆماڵی کە دەوڵەتی تاچێر لە بەریتانیا دایناوە: دژبەرانی ئەم باجە پێی دەڵێن باجی دەنگ، کە وێنەی سەدەکانی نێوەڕاست و شۆڕشی وەرزێرانی تێدا وێنا دەکرێ. حکوومەت خۆی بەم باجە دەڵێ یارمەتی کۆمەڵ، واتە وشەی نەرێنیی باج بەکار ناهێنێ و زاراوەی کۆمەڵ بەکاردێنێ. ئەو زاراوەی بۆ ئەم جۆرە باجە لەلایەن تاکێکەوە بەکاردەهێنرێ خێرا پێگەیەکی سیاسی ئەو کەسە دەردەبڕێ، لێرەشدا دیسان دەبینین چ ڕێگەیەکی بێلایەن یان بابەتی لە ئارادا نییە. بەم پێیە دەتوانین بڵێین هەر چیرۆکێک سێ نوسخەی هەیە، نوسخەی تۆ، نوسخەی من و، حەقیقەتەکەی، بەڵام کێشەکە زۆر لەمە ئاڵۆزترە، مادام هەموو ئەو زاراوانەی بەدەستەوەن بێ کەم و زۆر زمانین — لە دەرەوەی زمانەوە هیچ حەقیقەتێک نییە.

سەیری کوێ بکەین، دەبینین زمان نەک ڕەنگدانەوەی جیهان، بەڵکو ڕۆنەری جیهانە. بۆ نموونە، ئەو وشانەی ڕەنگەکان ناو دەنێن واقیعێک دروست دەکەن، ئەم وشانە ناوی شتێک نین کە لێرەیە: ڕستی ڕەنگ بۆ حەوت ڕەنگی سەرەکی دابەش نەبووە، هەموو ڕەنگەکان تێکەڵی یەکترین، دەکرێ لەباتی حەوت، چواردە ڕەنگمان هەبێ. نموونەیەکی دیکە ئەو زاراوانەیە بۆ وەرزەکانی ساڵ بەکاریان دێنین. ئێمە چوار ناوی جودامان هەیە (بەهار، هاوین، پاییز، زستان)، بەڵام لە ڕاستیدا ساڵ بێ هیچ دابڕان یان گۆڕانێکی دیاریکەر تێدەپەڕێ و لە خۆیدا بۆ چوار وەرز دابەش نەبووە. بۆ شەش یان هەشت وەرز نییە؟ مادام گۆڕان بە درێژایی ساڵ بەردەوامە، دابەشکاریەکان دەتوانن لە هەر جێگەیەکدا بکرێن. کەوابوو، وەرزەکان ڕێگەیەکی سەیرکردنی ساڵن، نەک ڕاستیەکی بابەتیی سروشت. بەم پێیە بیرکردنەوەی سۆسێر جەختی لەسەر لایەنی بڕیارکرد، ڕێژەیی و ڕۆنەری زمان دەکاتەوە. ئەم جۆرە بیرکردنەوە لە زمان کاریگەریەکی زۆری لەسەر بونیادگەرەکان داناوە، چونکە مۆدێلێکی سیستمیان پێدەدات کە خۆ — بژیوە و تێیدا نموونەیەکی یەکە پێوەندیی بە نموونەکانی دیکەوە هەیە، لێرەوەش بونیاێکی گەورەتر دەخوڵقێ.

جوێکارییەکی دیکەی سۆسێر ڕێگەی بۆ بونیادگەرەکان خۆش کرد بتوانن بیر لەو بونیادە گەورەترانە بکەنەوە کە پێوەندییان بە ئەدەبەوە هەیە. سۆسێر زاراوەی «لانگ» و «پارۆل»ی بە ڕیز بۆ تەعبیرکردن لە زمان وەک سیستم یان بونیادێک لەلایەکەوە، هەر گوتەیەکی ئەو زمانە لەلایەکی دیکەوە، بەکارهێنا. گوتەیەکی تایبەت بە زمانی فەرەنسی (نموونەیەکی پارۆل) تەنیا ئەو کاتە لای ئێمە مانای دەبێ کە پێشتر شارەزای کۆی ئەو ڕێسا و دەستوور و هەڵسوکەوتە زمانیانە بین کە پێی دەڵێین فەرەنسی (ئەمە لانگە). بەپێی بڕوای بونیادگەرە کلاسیکەکان، گوتەیەکی یەکە، نموونەیەکی دابڕاوە کە تەنیا ئەو کاتە مانا وەردەگرێ کە لە پەیوەندی لەگەڵ بونیادێکی لەخۆگری بەرفراوانتردا سەیر بکرێ. ئێستا بونیادگەرەکان لانگ / پارۆل بۆ خوێندنەوەی بەرهەمێکی ئەدەبی یەکە بەکاردێنن (با بڵێین نۆڤێل میدلمارچ) وەک نموونەی پارۆلی ئەدەبی. بەرهەمی ئەدەبیش تەنیا لە ناوکۆیی بونیادێکی هەمەگیری گەورەتردا مانادار دەبێ. بەم پێیەش ئەو لانگەی پێوەندیی بە پارۆلی میدلمارچەوە هەیە، ڕوونکەرەوەی مانای ڕۆمانە وەک ژانر، وەک جەستەیەک لە چالاکیی ئەدەبی.

## بەریانی بونیادگەری:

بەڵام بونیادگەری تەنیا لە بارەی زمان و ئەدەبەوە نییە. کاتێ دەیەی ١٩٥٠ بەرهەمەکانی سۆسێر لەلایەن ئەو کەسانەوە کە ئێستا ناویان بونیادگەر بوو بە هاوبەرە ناسرا، هەستی ئەو کەسانە ئەمە بوو کە مۆدێلی سۆسێر بۆ چۆنیەتی کارکردنی زمان دەکرێ بگوێزرێتەوە و چۆنیەتی کارکردنی هەموو سیستمە دەلالیەکانی پێ روونبکرێتەوە. کلۆد لیڤی شتراوس روانگە و دەسکەوتەکانی بونیادگەرەکانی بۆ لێکدانەوەی ئوستوورە بەکارهێنا. بەڕای ئەو حەکایەتێکی یەکەی (پارۆلێک) سوورِێکی ئوستوورە مانایەکی دابڕاو و ناوەکیی نییە و تەنیا بە دانانی لە شوێنی خۆی لەنێو سوورِی گشتی (لانگ) و بەراوردی لێکچوون و جیاوازیەکانی لەگەڵ حەکایەتەکانی دیکەدا مانادار و قابیلی تێگەشتن دەبێ.

بەم پێیەش، سۆسێر لە لێکدانەوەی ئوستوورەی ئۆدیبدا، چیرۆکی ئۆدیب لە ناوکۆیی سوورِی کۆی ئەو چیرۆکانەدا دادەنێ کە پێوەندییان بە شاری تێبسەوە هەیە. سۆسێر پاش ئەمە دێتە سەر دەستنیشانکردنی ناواخن و بەریەککەوتنە دووپاتەکیەکان و، ئەمانە دەکاتە بنچینەی لێکدانەوەکەی. بەپێی ئەم میتۆدە، چیرۆکەکە و ئەو سوورِەش کە چیرۆکەکە بەشێکە لێی، لە زاراوەی لێکدژیە بنچینەییەکاندا بونیاد دەنرێنەوە: حەیوان / مرۆڤ، خزم/ بیانی، شوو/ کور و هتد. وردەکاریەکانی چیرۆکەکە لە ناوکۆیی بونیادێکی گەورەتردا ئاشکرا دەبێ و بونیادی گەورەتریش لێرەوە وەک تۆرِێکی بەرفرە لە جووتە دژەکان دەردەکەوێ کە بە ئاشکرا زایەڵەیەکی هێماییین، ناواخنی و سەرچەشنیانەیان هەیە (وەک ناتەبایی نێوان هونەر و ژیان، نێر و مێ، شار و دێ، گێرِانەوە و پیشاندان و هتد).

چەشنی بزووتن و کارکردنی بونیادگەری، بزووتنەوەیە لە هەندەکیەوە بەرەو گشتی. دانانی کارێکی یەکەیە لەنێو ناوکۆیی بەرفرەی بونیاددا. بونیادی بەرفرەتر دەکرێ کۆی بەرهەمی نووسەرێک بێت: یان ئەو ژانرە باوە بێت کە ئەو نووسەرە تێیدا کاری لە مژارێکی تایبەت کردووە (بۆ نموونە لێکدانەوەی رۆمانی رۆژگاری ناخۆشی چارلز دیکێنز بە پێی لادانی لە ژانری باوی رۆمان و کشانی بەرەو ژانری وەرگیراوتری وەک میلۆدراما و قەسیدە) یان لە بەیەکبوونی ریزێک لێکدژینی بنچینەیی نائاشکرادا. سیستمێکی دەلالەتی، لەم مانادا، چەمکێکی زۆر بەرفراوانە: واتە بە مانای هەر کۆمەڵەیەکی رێکخراو و بونیادداری نیشانەیە کە مانای کولتوورییان هەڵگرتووە. ئەم وتەزایانە دەکرێ گەلێ دیاردەی جۆراوجۆر لەخۆ بگرێ: بەرهەمی ئەدەبی، دابی خێڵەکی (بۆنەی ئەندامێتی، یان سەمای باران)، مۆدەکان (لە جل و بەرگ، خواردن، شێوازی ژیان و هتد)، شێوازی ئۆتۆمبێلەکان، تاکو ناوەرۆکی بانگەشە (بازرگانیە)کان. بە ڕای بونیادگەرەکان، ئەو کولتوورەی ئێمە بەشێکین لێی، دەبێ وەک زمان بخوێندرێتەوەو هەمان بنەما بۆ خوێندنەوەی بەکاربهێنرێ، چونکە کولتوور لە گەلێ تۆرِی بونیادی پێکهاتووە کە دەلالەتێکیان هەڵگرتووە و دەکرێ ئاشکراش بکرێ کە بەشێوەیەکی سیستمدارانە کار دەکەن. ئەم تۆرِانە لە رِێگەی «کۆد»ەکانەوە وەک سیستمێک لە نیشانەکان کار دەکەن، کۆدەکان دەتوانن هەر وەک زمان رِستەیەک دروست بکەن و دەکرێ لەلایەن نیشانەناس یان بونیادگەرەکانەوە بخوێندرێنەوە یان (وەک کۆد) بکرێنەوە.

بۆ نموونە، مۆد (جل و بەرگ) یان فاشن دەکرێ وەک زمانێک بخوێندرێتەوە. دەستوور و ڕێسایەکی ئاڵۆز لە پشتەوەی زیادکردنی بەش یان تایبەتمەندییەک بە جل و بەرگێک کار دەکات: ئێمە هیچ کات نەعل و قات پێکەوە لەبەر ناکەین: ئێمە بە جلی سەربازییەوە نایەین بۆ لێدوان و وانە وتنەوە. هەر بەم شێوە، هەموو نیشانەیەک، بەشێک لە ماناکەی لە ناوکۆییەکی بونیادیەوە دێت. هەڵبەت، گەلێ مۆدی جل و بەرگ بە شکاندنی ئەم ڕێسایانە، بەشێوەیەکی ناسراو، دروست دەبن، بەڵام ئەو رستەیەی بە ئەم ڕێسا بەزاندنە دروست دەبێ (بۆ نموونە، دروونی جلی سەرەوە بە جۆرێک کە لە جلی ژێرەوە بچێ، یان برینی بە ڕواڵەت بێ سەرنجی پارچەی گرانبەها) گرێدراوی ئەوەیە پێشتر ڕێسا یان عورفێک هەبێ کە ببەزێندرێ.

لە جیهانی ئێستەی مۆدی جل و بەرگ یان فاشندا، بۆ نموونە، (کۆتایی ١٩٩٤) تێکەڵکردنی تایبەتمەندیی وەک تەقەڵی ئاشکرا، ڕواڵەتی لۆچ و لەبەردا گەورە یان بچووک، دەلالەتی لە مۆدێک دەکرد کە (لەم ناوکۆییەدا سەرنجڕاکێشە) بە هەڵوەشاندنەوەیی ناسراوە. ئەگەر هەریەک لەم تایبەتمەندییانە لە ناوکۆیی ئەوانی دیکە دەربێنی، بۆ نموونە چاکەتەکەت بەروپشت لەبەر بکەی یان واز لە ئوتووکردن بێنی، دیسان دەلالەتێکی دەبێ. ئەم بەشە یەکانە شوێنی خۆیان لە بونیادی گشتگردا هەیە، بونیاد دەلالەتێکی گەورەتری لە نموونە یەکە و تاکەکان هەیە.

سیمایەکی سەرەکی دیکەی قۆناغی نزیکتری بونیادگەری کە میتۆدی بونیادگەرانەی بۆ خوێندنەوەی بواری گشتی کولتووری مۆدێرن بەکارهێنا، ڕۆلان بارتە. بارت لە ڕوانگەی ئەنترۆپۆلۆژیای کولتوورییەوە لە کتێبێکی بچووکدا بە ناوی «میتۆلۆژی» کە ساڵی ١٩٥٧ لە فەرەنسا چاپ بوو، فەرەنسای مۆدێرنی تاقیکردەوە. ئەم کتێبە باسی گەلێ بوار و بابەتی تێدایە کە پێشتر نەکەوتبووە بەر شیکاریی ڕۆشنبیران، بابەتی وەک: جیاوازیی نێوان مشتبازی و زۆران، دەلالەتی خواردنی ستەیک و چیپس، دیزاین و دارشتەی ئۆتۆمبێلی سیترۆئێن، وێنەی سینەمایی سیمای گرێت گاربۆ، وێنەی سەربازێکی جەزایری لە ژێر ئاڵای شەکاوەی فەرەنسا لە گۆڤارێکدا. بارت هەریەک لەم نموونانەی لەنێو بونیادی بەرفراوانتری بەها، بڕواو هێماکاندا وەک کلیلێک بۆ تێگەیشتن لێیان، داناوە. بەم پێیەش، بۆکس یان مشتبازی ئەو وەرزشەیە بەرگەگرتن و خۆخواردنەوەی تێکەڵە و، ئەمەش جیاوازە لە وەرزشی زۆرانبازی کە تێیدا ئازار بە شێوەیەکی درۆزنانە دەنوێندرێ. مشتبازەکان لە کاتی لێدراندا هاوار ناکەن، لە کاتی یاریدا ، یاساکان بە هیچ شێوە قابیلی لادان نین و مشتباز وەک خۆی دەجەنگێ، نەک بەڕواڵەتی گەورەکراوەی شەقاوەیەکی دەستکرد یان قارەمانێکەوە. بە پێچەوانەی مشتبازانەوە، زۆرانبازەکان بە ڕقەوە تووڕە دەبن و دەنرکێنن، ئازار و بردنەوەیان دەگۆڕن بۆ دیمەنێکی شانۆیی و جەنگەکە لە ڕادەی ژیانی خراپەکار یان بان — قارەمانێک گەورەتر دەکەنەوە. دیارە ئەم دوو جۆرە وەرزشە، ئەرکێکی تەواو جیاوازیان لە کۆمەڵگادا هەیە: مشتبازی دان بەخۆداگرتن و هەناسەدرێژی و سەبوری دەنوێنێتەوە –کە هەندێ جار لە ژیاندا پێویستە–، لە کاتێکدا زۆرانبازی دوایین شەڕ و ململانێی نێوان خێر و شەڕ پیشاندەدات. کەوابوو، بۆچوونی بارت کە لێرەدا سەر بە بونیادگەریی کلاسیکە ئەمەیە: نموونەیەکی یەکە، بونیادگیر یان ناوکۆییگر، دەبێ بە بونیادو، لەم پرۆسەشدا توێژە دەلالەتیەکان دەردەکەون. لە دەیەی ١٩٨٠دا بونیادگەری لە سەر دەستی هەندێ کەس کە لە پاریس فێری ئەم قوتابخانە ببوون، گوێزرایەوە بۆ بەریتانیا و ئەمریکا (...).

## ڕەخنەی بونیادگەرانە چی دەکات؟

١-بەزۆری گێڕانەوەی پەخشانی شیدەکەنەوە و دەق بە بونیادە لەخۆگرە گەورەکانەوە گرێدەدەنەوە، بونیادی وەک:

ئا: نەریتی چەشنێکی ئەدەبی تایبەت.

بێ: تۆڕی پێوەندیی نێوان دەقیی.

ج: مۆدێلێکی بەرجەستەی بونیادێکی گێڕانەوەیی جیهانیی نائاشکرا.

د: مانایەکی گێڕانەوە وەک گەڕانەوەی ئاڵۆزی گێڕانەوە یان مۆتیڤەکان.

٢-لێکدانەوەو ڕاڤەی ئەدەب بەپێی لێکچوونی لەگەڵ بونیادی زمان بەو جۆرەی زمانناسیی مۆدێرن باسی دەکات. بۆ نموونە، چەمکی ئوستوورۆچکە، لەلایەن شتراوسەوە و بەپێی چەمکی مۆرفیم دانراوە، کە لە زمانناسیدا بە مانای بچووکترین یەکەی ڕێزمانیی ماناداره. نموونەی مۆرفیم «ed» کە کاتی کردارێک دەگۆڕێ بۆ رابردوو.

٣-ئەوان چەمکی سەرنموونەسازیی و بونیادگیریی سیستمدارانە لەسەر کۆی پانتای کولتووری ڕۆژئاوایی پیادە دەکەن و لە ڕێگەی کولتوورەکانەوە، هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو شتێک وەک سیستمێک لە نیشانەکان دەکەن، هەر لە ئوستوورەکانی یۆنانی کەوناراوە تاکو مارکەی سابوون.

## ڕەخنەی بونیادگەرانە، نموونە:

بنەڕەتی ئەم نموونانەم لەسەر ئەو میتۆدە داناوە کە رۆلان بارت لە کتێبی s/zی خۆیدا بۆ شیکردنەوەی ئەدەبی کاری پێکردوون. ئەم کتێبە ٣٠٠ لاپەڕەییە کە لە ١٩٧٠ دا بڵاوبۆتەوە، باسی چیرۆکێکی باڵزاکە بەناوی سێزارین کە خۆی ٣٥ لاپەڕەیە. بارت چیرۆکەکە بۆ ٥٦١ یەکەی مانایی یان lexies دابەشدەکات و دواتر لە ژێر پێنج کۆددا خانەبەندییان دەکات و کە لای وایە ئەم پێنج کۆدە بونیادی سەرەکیی و نائاشکرای هەموو گێڕانەوەیەکن. بەم پێیە وەک لە سەرەتادا لەسەر بونیادگەری گوتمان (ئەمەی کە بونیادگەری بەنیازە نموونەیەکی یەکە لە ڕێگەی دانانیەوە لە ناوکۆیی بونیادێکی گەورەتردا کە ئەم یەکە سەر بە ئەوە، شیبکاتەوە) نموونەی یەکە لێرەدا ئەم چیرۆکە تایبەتەی باڵزاکە، بونیادی گەورەتریش سیستمی کۆدەکانە، کە لای بارت سەرچاوەی هەموو گێڕانەوەیەکی ئەگەرداری واقیعین، هەر چۆن بونیادی ڕێزمانیی زمانێک دەتوانێ وەک سەرچاوەی کۆی ئەو ڕستانە سەیر بکرێ کە دەشێ لەو زمانەدا بنووسرێن یان بگوترێن. دەبێ ئەمەش زیاد بکەم کە وەرگرتنی نموونەی باسی بونیادگەرانە لە دەقێکی بارت کە ١٩٧٠ بڵاوکرابێتەوە، کارێکی گرانە، چونکە وەک دەڵێن بارت ١٩٧٠ بە وتاری «مەرگی دانەر»ەوە کە ١٩٦٨ نووسراوە دەچێتە قۆناغێکی کاریەوە کە بە قۆناغی پاش بونیادگەرانەی بارت ناسراوە. هۆی من بۆ پێداگری لەسەر سەیرکردنی s/z وەک بەرهەمێکی بونیادگەرانە ئەمانەیە: یەکەم، لەم بەرهەمەدا بارت هێشتا خۆی بە ڕەسم و دابەکانەوە خەریک دەکات: ئەمەش لەلایەن گەلێ کتێبی ناسراوی بواری بونیادگەریەوە پشتڕاستکراوەتەوە. بەڵگەی دووهەمم ئەمەیە کە ئەگەرچی s/z ئاشکرا هەندێ توخمی لەخۆ گرتووە

کە پۆزەتیڤیزمی دڵنیای بونیادگەری هەڵدەوەشێنێتەوە، کەچی کتێبەکە لە جەوهەردا لە هەوڵ بۆ دابەزاندنی ئاڵۆزیی گەورەو ئەگەری جۆراوجۆری نێو ئەدەبی گێڕانەوەیی بۆ کاری پێنج کۆد دەدات، ئەگەرچی ڕەنگە ئەم هەوڵانە بە گاڵتە وەربگیرێن. ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەم کتێبە لە سەر سنووری نێوان بونیادگەری و پاشبونیادگەریدا وەستاوە: ئەم بەرهەمە سەرتایەکە بۆ بەرهەمێکی تەواو پاش بونیادگەرانەی ١٩٧٣ی بارت بە ناوی «چێژی دەق». ئەو پێنج کۆدەی بارت لە s/z دا دەستنیشانیان دەکات بەم شێوەیەن:

١-کۆدی گێڕانەوەیی: ئەم کۆدە بەڵگە و ئاماژەکانی ڕووداوەکان دابین دەکات. «کەشتیەکە نیوەشەو ڕێکەوت»ە، «ئەوان دەستیان پێکردەوە»و هتد).

٢-کۆدی هێرمۆنێتیکی: ئەم کۆدە ئەو مەتەڵ و پرسیارانە بناغە دەنێ کە مۆلەقی یان سۆسپانسی گێڕانەوە دروست دەکەن. (بۆ نموونە «ئەو بە پەلەپیتکە لە دەرگایەکی تایبەتی گەڕەکی پۆل ستریتی دا»، خوێنەر دەخاتە ئەم دڕدۆنگیەوە کە کێ لەوێ دەژی، ئەو گەڕەکە چۆنە و هتد).

٣-کۆدی کولتووری: ئەم کۆدە بریتیە لەو ئاوڕگایانەی لە دەرەوەی دەقەوە وەک مەعریفەی گشتی و هاوبەش گرنگیان پێدەدرێ. (بۆ نموونە ڕستەی، «ئاجێنت ئانجێز لەو پیاوانە بوو کە هەندێ جار بە گۆرەویی سەیرەوە لە شوێنی کارەکەیدا دەردەکەوت»، وێنەی لەپێشداهەبووی ئەم چەشنە پیاوە لە زەینی خوێنەردا زیندوو دەکاتەوە — کلێشەی کەسێکی شپرزەی بێکەڵک، بەرامبەر ئەو وریایی و خێراییەی کە لە چەمکی، کارگێڕ (agentدا وێنا دەکرێ).

٤-کۆدی واتایی: ئەم کۆدە پاڵەکیشی پێدەگوترێ و پێوەندیی بە تێما یان ناواخنەوە هەیە و (وەک ڕابێرت سکوولز دەڵێ) ئەم کۆدە کاتێ لە دەوری ناوێکی تایبەت ڕێکبخرێ، کاراکتەر بونیاد دەنێ.

٥-کۆدی هێمایین: ئەم کۆدەش پێوەندیی بە ناواخنەوە هەیە، بەڵام بە ڕادەیەکی بەربڵاوتر؛ هەروەها پەیوەندی بە ئاخاوتنیشەوە هەیە. ئەم کۆدە بریتیە لە بەریەککەوتن و پێوەندیی دوولایەنە بە جەمسەربەندییە دوانە بنچینەییەکانەوە — نێر و مێ، شەو و ڕۆژ، خێر و شەڕ، ژیان و هونەر و هتد. ئەمانە بونیادی ئەو توخمە ناتەباییانەن کە بونیادگەرەکان وەک بنەڕەتی تێگەشتن و ڕێکخستنی مرۆڤ بۆ واقیع سەیریان دەکەن.

مادام دوو کۆدی دوایی زیاترین کێشەیان دروست کردووە (بەتایبەت کێشەی جوێکرانەوەیان لە یەکتر) هەوڵدەدەم هەرکامیان لە ڕێگەی نموونەیەکەوە ڕوونتر بکەمەوە. کارەکەش بە کۆدی هێماییەوە دەست پێدەکەم و وەک بنەمایەکی ڕێکخەر بۆ لێکدانەوەی چیرۆکێک بەکاری دێنم، چیرۆکەکەش هی ئێدگار ئالێن پۆی ئەمەریکییە کە لەلایەن بونیادگەر و پاشبونیادگەرەکانەوە گرنگییەکی زۆری پێدەدرێ، چیرۆکی «پۆرترێتی بەیزی»ە.

کورتەیەکی چیرۆکەکە دەتوانێ یارمەتیدەر و بەکەڵک بێ. لە ڕۆژگارێکدا کە وا دیارە کاتی شەڕی ناوخۆییە لە وڵاتێکی ئەوروپیدا کە نووسەر ناوی نابات، ئەفسەرێکی بریندار (وەک گریمانی دەکەین وەها بێ) پەنا دەباتەبەر قەڵایەکی تازە رووخاو. ئەو ژوورەی ئەفسەرەکە تێیدا دەخەوێت پۆرترێتێکی ئێجگار زیندووی ژنێکی گەنجی تێدایە. ئەفسەرەکە نووسراوێکیش دەدۆزێتەوە کە

باسی ئەو پۆرترێتەیە. نووسراوەکە دەڵێ هونەرمەندی ئەو پۆرترێتە مێردی ژنەیە و لە کاتی کێشانی وێنەکەدا هێند شەیدا و بێئاگا بووە کە ئاگای لەو «ژیان»ە نەماوە هاوکاتی کرانی گیان بە بەر وێنەکەدا لە ژنەوە دێتە دەر و، لە کۆتایی چیرۆکەکەدا بە دوایین رەنگێک کە وێنەکە تەواو دەکرێ، ژنەی بابەتی وێنەکەش دەمرێ. جیاوازیی هەرە بنەڕەتی لە نێوان خوێندنەوەی ئۆمانیستیی لیبراڵ و خوێندنەوەی بونیادگەرانەدا ئەمەیە کە بونیادگەرەکان زیاتر سەرنجی بونیاد، هێما و داڕشتە دەدەن، زیاترین شت لەسەر ئەمانە دەنووسرێ و گرنگیەکی زۆر کەم بە دەلالەتی ئەخلاقیی بەرفرەتر و لە ڕاستیدا تەفسیری دەقەکە خۆی دەدرێ. بە پێچەوانەی باسکردنی راستەوخۆی ناوەڕۆک لای ئومانیستە لیبراڵەکان، بونیادگەرەکان ریزێک هاوتایی، دەنگدانەوەو، رەنگدانەوە، سەرنموونە و ناتەبایی دەردەخەن بە شێوەیەک کە گێڕانەوە بۆ شتێک کە ڕەنگە بکرێ پێی بڵێین دیاگرامی زمانی گەڵاڵەرێژ یان وەربگێڕدرێ. ئەوەی ئێمە وەک رەخنەگرێکی بونیادگەر بۆی دەگەڕێین و بە نیازین بیدۆزینەوە، دەکرێ لە شێوەی ئەم خشتەیەی خوارەوەدا نیشان بدرێ. ئێمە بۆ ئەو هۆکار یان فاکتەرانە دەگەڕێین کە لە لای چەپی ریزەکەدان و چاوەڕێ دەکەین لە بەشەکانی چیرۆکەکەدا، لەلای ڕاستدا بیاندۆزینەوە:

| | | |
|---|---|---|
| گەڵاڵە | | هاوتاییەکان |
| بونیاد | | رەنگدانەوەکان |
| مۆتیڤ/ کاراکتەر | لە | دووپاتبوونەوە/ دەنگدانەوەکان |
| دۆخ/ پێگە | | ناتەباییەکان |
| وێناسازی/ زمان | | سەرنموونەکان |

ڕیزکردنی هەندێ هاوتایی و شتی دیکەی نێو چیرۆکەکەی پۆ لەوانەیە باشترین رێگەی روونکردنەوەی باسەکە بێت. یەکەم خاڵ ئەمەیە چیرۆکەکە خۆی بونیادێکی دوانەی هەیە (بونیادی دوانە لێکدژەکان) کە لە دوو نیوە یان لەتی ناتەبا پێکهاتووە: نیوەی یەکەم گێڕانەوەیەکی چوارچێوەدارە، کە بریتییە لە باسی ئەفسەرە بریندارەکە؛ لە کاتێکدا نیوەی دووهەم چیرۆکێکە — لە — نێو — چیرۆکدا کە ئەفسەرەکە لە بارەی شێوەکاریەکەوە دەیخوێنێتەوە. خێرایی گێڕانەوە لە نێوان ئەم دوو نیوەدا جیاوازە، یەکەمیان هی زەینی ئارام، تەنانەت بێڕۆح و وشک، رەنگدانەوەیی، واقیعیخواز و ئەقلانیی ئەفسەرەکەیە؛ گێڕانەوەی دووهەم خێرا و بڕگە بڕگە، روو لە خولقاندنی هونەری و رەوتی دابەزینی تەندروستیی بابەتی وێنە / قوربانیەکەی تێکەڵە.

لێکدژیی دووهەمی نێو چیرۆکەکە، قەڵا یان خانووەکەیە، کە لە هەر نیوەیەکدا کارێکی جیاوازی هەیە. لە نیوەی یەکەمدا شوێنی پەنا و داڵدەیە بۆ ئەفسەرەکە و تێیدا لە دوژمنانی دەپارێزرێ و دەتوانین وەک گەڕانەوەی تەندروستیی ئەو سەیری ئەم خانووە بکەین. بە پێچەوانەوە، خانووەکە لە نیوەی دووهەمدا شوێنی مەترسی و لە دواییدا تێداچوونە بۆ بابەتی وێنەکە، شوێنێکە ژنە دەکەوێتە دەستی سەوداکانی هونەرمەند — مێردەکەی و ژیانی لەکیس دەچێ.

ئەمانە هەموویان هاوتایی، لێکدژیی و شتی لەم بابەتەی نێوان دوو نیوەکەن، بەڵام هێشتا شتی زیاتر لە نێو ئەم دوو نیوەدایە. یەکەم، لێکدژییەکی قووڵ لە نێوان مێردەکە وەک هونەرمەندێکی

سەوداسەر لەلایەکەوە و پەژارەو ئارەزووی جنسیی باوی پیاوێک بۆ تازە بووکەکەیدا هەیە. ئەم مێردە، لەباتی شەیدایی بۆ ژنەکەی، بەرامبەر بەرهەمەکەی تووشی شەیدایی بزوێنەری ئیرۆتیکی بووە. لە ڕاستیدا، مادام مێردەکە وەک کەسێک کە پێشتر لە هونەرەکەیدا بووکێکی هەبوو، وەسف دەکرێ، زەوجینەکە لەگەڵ دوو ژن، یان دوو ژنەیە. ئەو چەند هەفتەیەی کە ئەو بە تەنیا لەگەڵ بووکە تازەکەی خەریکی شێوەکارییە، جۆرێک درێژەدانی نەرێنیی لاساییکردنەوە یان پارۆدیی مانگی هەنگوینە. چەندین هەفتە سەیری یەکتر دەکەن، مێردی شێوەکار، تاسەیەکی گەرم و بەکوڵی بۆ ئەرکەکەی هەیە، شەو بەدەم ڕۆژەوە دەدات، وردەکاری دەکات و تا لە کۆتایی نزیکتر دەبێتەوە، بە تین و گڕی کارەکەی وەحشیتر دەبێت. لە ڕاستیدا مێردە، هەنگوینە مانگەکەی بە پەژارەوە بۆ بووکی یەکەم، نەک بووکی دووهەم تێدەپەڕێنێ.

ئاستی سێهەمی لێکدژی و هاوتایی ئەوانەن کە نە نواندن، زمان و، لەگەڵیشیدا، ناوەڕۆکەوە خەریکن. بۆ نموونە، هاوتایی نێوان گێڕەرەوەکانی دوو نیوەکە. هەردوو گێڕەرەوە، تا ڕادەیەک نەناسراون و لە گێڕەرەوی دووهەمدا نەناسراویەکە پڕ و تەواو دەبێت و ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەسەر نووسەری وشە داهێنەرانە و لێڵەکانی چیرۆکی نێو چیرۆکەکە نییە (تاقە کارەکتەرێک ناوببرێ پیدرۆی خزمەتکارە، کە سیمای هەرە ناگرنگی چیرۆکەکەیە). بەڵام بارت بونیادگەرەکان هاندەدات بوێرن بپرسن: کێ قسە دەکات؟ ئەگەریش ئەم پرسیارە سەبارەت بە نیوەی دووهەمی چیرۆکەکە بپرسین، وەڵامەکە هەڵکەندنی گێڕەرەوەکەیە لە پێگەی چاودێرێکی بێلایەن کە تەنیا تۆمار دەکات، چونکە ئەم باسە دەبێ لەلایەن کەسێکەوە نووسرابێ کە بێ هیچ هەوڵێک بۆ دەستکاریکردن شایەتی ئەم ڕووداوانە بووبێ. لانیکەم، ئەم شایەتە کەسێکی بێ بەسیرەتە کە لەو کەسانەی پۆرترێتەکەیان بینیوە جوێناکرێتەوە: بە وشەی کەم و نزم باسی لێکچوونەکانی کرد، وەک سەرسوڕمانێکی زۆر، بە خۆڕاگیرییەکەوە کە کەمتر نەبوو لە هێز و توانای وێنەکێش لە ئەشقی قووڵیدا بۆ ئەو ژنەی کە بەو باشیە وێنەی لێ کێشایەوە».

هەموو ئەم لێکدژیانە لە چەشنێکی زۆر تایبەتن و تەنیا لەگەڵ ئەم چیرۆکەدا دەگونجێن. لێرەدا دەتوانین بە کشانێکی سادە، کە زیاتر لە دیاریکردنی بڕی هاوبەش بۆ ریزێک ژمارە دەچێ لە بیرکاریدا، ئەم لێکدژییانە بۆ ڕیزێکی گشتگیرتر کورت بکەینەوە: لێکدژیی و ناتەبایی نێوان ژیان و هونەر، نێر و مێ، ڕووناکی و تاریکی، سەیر و کردە، واقیع و نواندنەوەی واقیع. تێزی بونیادگەرەکان ئەمەیە بونیادی گێڕانەوەکان لەسەر بنچینەی دوانە لێکدژەکان دانراوە، بە جۆرێک کە ئەم لێکدژییانە هەیکەلێکی بونیادین کە هەموو گێڕانەوەکانیان لەسەر دانراوە. ئەگەر بڕیار بێ لە دواییدا ئەم نالێکدژییانە بۆ یەک جووت لێکدژی دابەزێنین، ئەوا دوانەی هونەر/ ژیان دەمێنێتەوە، چونکە وەک دیارە چیرۆکەکە خۆی باسی سەیرکردنی ژیان و هونەرە وەک هەندێ هۆکار لە ئابوورییەکی باندەرووتیی سەرتاپاگیر.

دوایین پرسیار ئەوەیە چیرۆکەکە لایەنی کام لای ئەم هاوکێشەیەی گرتووە. بێ هیچ گومانێک دەتوانین بڵێین لایەنی هونەری گرتووە، چونکە خوڵقاندنی هونەری و، بەڕادەیەکی کەمتر، قووڵبوونەوە لە کاری هونەریدایە کە ورد و گەرمتر لە چیرۆکەکەداو زۆر زیاتر لە پەژارە بۆ تێداچوونی ژیانێکی گەنج، لە چیرۆکەکەدا باس دەکرێ. سەوداسەریی ئەم پیاوە شەیدا، نائارام و ڕاڕایە بەرهەمێکی

هونەریی هێند زیندوو دەخوڵقێنێ، چما لە بوونێکی ئاسمانی بەرهەم هاتووە. هیچ ڕێگەیەک بۆ ئەوە نییە، «ژیان» (هاوکێشەکە) بباتەوە. لە شێوە «ڕەسمی»یەکەیدا، چیرۆکەکە سەرکۆنەیەکی زوهدفرۆشانەی قوربانیکردنی ژیانێکی گەنجە، بەڵام لە کردەوەدا ئەم قوربانیکردنە بە جۆرێک تاسەی ئاشقانەوە باس دەکرێ. وەک دی. ئێچ. لۆرانس بە تەواوی ددانی پێدانەنا: «هیچ کات بڕوا بە ئەخلاق مەکە، بڕوا بە چیرۆک بکە».

ئەوەندە بۆ کۆدی هێمایین تەواوکەرە. نموونەی دووهەم لەسەر کۆدی واتاییە لە نێو دەقدا. ئەم کۆدە وەک وتمان پێوەندی بە پرۆسەی ناواخن و کەسایەتیسازیەوە هەیە، بەڵام لە بەریانێکی تەسکتر لە کۆدی هێمایین لەگەڕدایە. لای هاوکێر، ئەم جۆرە کۆدە ئاماژەکان بەکاردێنێ یان تیشکی مانا دەداتەوە، مادام لە ڕێگەی جیاوازیی هەست پێنەکراو و نائاشکرای وشە و دەستە وشەکانەوە کار دەکات، باشترین ڕێگە بۆ تاقیکردنەوەی بەکردەوەی، ئەو شتەیە پەروەردەکاران پێ دەڵێن، cloze procedur لەم شێوە تاقیکردنەوەدا، هەندێ وشە لە دەق لادەبرێ و داوا لە خوێنەران دەکرێ بە پێی بونیادی گشتی و تێگەیشتنی خۆیان لە دەقەکە، وشەیەک لە جێگەی وشە لابراوەکان دابنێن.

ئەم کۆپلەیەی خوارەوە، سەرەتای ڕۆمانێکی مێرڤین جۆنزە. کەسایەتیی ناوەندی، ئاغای ئارمیتەیج، لە دیمەنی سەرەتای ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێ و هەر خێراش کەسایەتیەکەی جێگیر دەبێ. من هەندێ بۆشایی لە دەقەکەدا بەجێدێڵم و لە کۆتایی هەر ڕاستەدا کۆمەڵێک وشە دادەنێم کە دەتوانن بۆشاییەکە پڕبکەنەوە (یەکێک لەم وشانە، هەر ئەو وشەیە نووسەر خۆی بەکاری هێناوە. دەبینین بەپێی بەکارهێنانی وشەکان، کەسایەتیەکەش وەردەچەرخێ و ئەمەش ڕێگەمان بۆ دەکاتەوە بە کردەوە لە کۆدی داتایی تێبگەین. بۆ ساناکردنەوەی کارەکەش پاراگرافەکان ژمارەیان بۆ کراوە. بەپێی ریزی بونیادگەرەکان چی دەکەن، ئەم کارە دەچێتە خانەی یەک (ج)ەوە، کە بریتییە لە گرێدانەوەی دەقێک بە بونیادی هەمەگیری ئەو گێڕانەوەی کە لە پشتەوەی دەقەوە ئامادەیە، بەو پێیەی کە ڕەخنەگران ڕەنگە لایان وابێ پێنج کۆدە بارتیەکە بنەڕەتی کارکردنی هەموو گێڕانەوەکانن. ئێستا وشەیەک بۆ هەریەک لە بۆشاییەکان هەڵبژێرن و دواتر دێینەوە سەر باسەکە.

١-جان ئیدوارد سکات ئارمیتاج: پەنجا و پێنج ساڵ تەمەن، پێنج پێ و یانزە ئینج باڵا، کێش سی ستۆن و سێ .................. (پۆند ، ئۆنس)

٢-هەشتی جوون: بەیانیەکی خۆش، کاتژمێر نۆ و پانزە خولەک هاوکات لەگەڵ گۆڕانی بەرنامەی ڕادیۆدا، ڕێک نۆ و پانزە خولەک گاڤێ کاتی کاتژمێرە ..........ەکەی دەستی تاقیکردەوە.

(چەند کارە، سویسری، نموونە، تایمێکس، گیرفانی، میکی ماوس)

٣-جادەی هێدێن، ئارمیتەج ئۆتۆمبێلێکی جەگواری پێیە، دوو بواری تێپەڕاند، تازەییەکەی سەرخۆشی دەکرد، بۆنی ........... چەرم، سفری پاکی سەر خێرایی پێوەکە. ئەو لەو پیاوانە بوو چ کات تەمەنی ئۆتۆمبیلەکەیان نەدەگەشتە یەک ساڵ.

(گران، خۆش، سەرمەستکەر، ئارەزوو بزوێن، گەش)

وردەکاریی دیکەش ماوە. پاشان ئارمیتەج خێرایی ئۆتۆمبیلەکەی کەم دەکاتەوە بۆ ئەوەی سەیری ئەو دوو ڕێبوارە مفت سوارە بکات. ئەوان داب و دەستوورەکەی ئەمیان بینی و ئەمیش پێشنیاری کرد لەگەڵی سوار بن، بەڵام وەڵامەکەی دوودڵیی خێرای ئەوان بوو. دەقەکە بەردەوام دەبێ:

٤-كوڕه هێشتا بزه گەشەكەی لەسەر لێو بوو. بەڵام سواری ئۆتۆمبیلەكە نەبوو. ئێستا وا دیار بوو نەک هەر نیگەرانی ڕێگا، بەڵكو نیگەرانی ئۆتۆمبیلەكە و تەنانەت ئارمیتەجیشە. ڕێبوارەكە، ئەوەی ڕاستی بێ، بیری لەوە دەكردەوە لەباتی ڕێگەكەی دیكە، شۆفێرەكە هەڵبژێرێ. ئارمیتەج ............ بوو. زۆری نەمابوو هەڵچێ، كچەكە وتی: باش — وایە — زۆر خۆش (وڕوكاس، وەڕەز، سەرسام).

٥-كچە بە گەرموگوڕی و بە پێچەوانەی دڕدۆنگیی كوڕە قسەی دەكرد. بەدەم ئارمیتەجەوە پێدەكەنی، بەڵام كەنینێكی پتر لە خەنینەوە ............ ئارمیتەج وەهای دەبینی. دیارە بەختیان یار بوو جاگوارێكیان دەستكەوتبوو. كچە ئاشكرا بەمەی زانی: ئەو، وەک دیار بوو، جگە لەمەش هەر حەزی دەكرد لەگەڵ ئارمیتەج سەركەوێ. ئارمیتەج هەر كە ئەمەی بە خەیاڵدا هات، لە بێماناییەكەی تێگەشت. بەڵام دروستكردنی ئەم هەستە، بۆ كچە سەرنجڕاكێش بوو.

(شاد، چێژدەر، هەڵخڕێنەر، لە بار)

٦-كچە......... پێشەوەو، كوڕە چووە پشتەوە. ئارمیتەج هەوڵیدا ڤەنێكی باری تێپەڕێنێ. جۆرێكی شارەزایانە لێیدەخوڕی و هەموو هەلێكی دەقۆستەوە، لە كاتی گرمەی گێڕی سێدا ئۆتۆمبیلی دیكەی جێدەهێشت. دەیزانی و، بیری دەچوو، كە بوونی كچە وایكردووە شارەزایی خۆی لە لێخوڕیندا بنوێنێ.

(خێرا بازی دا، قورس هەڵكشا، بە مەكرەوە خۆی خزاندەسەر، بە ئاسایی خۆی خزاندە سەرێ، نەزانكارانە سەركەوت، هێواش خۆی خزاندە سەرێ)

بە كورتی لەسەر بۆشایی هەریەک لەم پەرەگرافانە دەدوێم.

لە پەرەگرافی یەكەمدا، وشەی نێو دەقەكە خۆی، «ئۆنس»ە، كە پیاوێكی وردەكار و بەداب و دەستوورمان پیشان دەدات. (چەند كەس هەن تەنانەت ئۆنس و گرەمی كێشی خۆیان بزانن؟)

لە پەرەگرافی دووهەمدا، بە گۆڕینی كاتژمێرەكەی دەستی ئارمیتەج، وێنا بۆ كەسایەتیی ئەو دەگۆڕێ. هەر یەک لەم كاتژمێرانە دەتوانێ جۆرێک كەسایەتیی پێببەخشێ، لە پیرەمێردێكی بەداب و دەستوورەوە تاكو كەسێكی مۆدپەرست، یان كەسێكی شاد و گاڵتەچی بە كاتژمێرێكی میكی ماوسەوە.

لە پەرەگرافی سێهەمدا، وشەی «خۆشی» ، «سەرخۆشكەر» و «بزوێنەر»، ئارمیتەج دەگۆڕن بۆ كەسێكی فتیشیست، لە كاتێكدا «گران» بە شێوەیەكی ناڕاشكاو تەعبیرە لەوەی لای ئەو بڕی چێژوەرگرتن لە شتەكان پێوەندیی بە نرخی شتەكانەوە هەیە. وشەی «گەش» وەک وشەیەكی دەقەكە دەمێنێتەوە، بەڵام وا دیارە تەعبیر لە جۆرێک هۆگری بۆ چۆنایەتی و گرنگیدان بە شتەكان لەبەر خۆیان دەكات.

لە پەرەگرافی چوارەمدا (وەک بەزۆری لە ئەدەبی خەیاڵیدا هەیە) ئەو وشانەی گێڕەرەوە هەڵیاندەبژێرێ ڕەنگدانەوەی ئەو كەسایەتییەیە كە وەسف كراوە و هەریەک لە وشەكان دەتوانن كەسایەتی ئارمیتەج بە جۆرێک بگۆڕن، كە جیاواز بێت لە وێنەكەی دیكەی.

لە پەرەگرافی پێنجەمدا، تێگەشتنی ئارمیتەج بۆ سروشتی بزەی كچەكە، توخمی ناوەندیی بەدیهاتنی كەسایەتیەتی. ئەگەر وشەی نێو بۆشایی دەقەكە ئەمەبێ كە ئارمیتەج كچەكەی بە بزەیەكی «شاد»ەوە لەسەر لێو بینی، تەعبیرە لەوەی ئارمیتەج حەز دەكات كە پەرچەكردارێكی

ئەرێنی بەرامبەری نوێنراوە. ئەگەر کەنیزی کچەی «ئارەزوو بزوێن»ی دیبا، تەعبیر بوو لەوەی پاڵنەرەکانی ئارمیتەج جنسی بووە.

لەلایەکی دیکەشەوە، بزێوانە پێکەنین، سیمایەکی نەک گەورە ساڵ، بەڵکو منداڵانە بە کچە دەبەخشێ.

لە پەرەگرافی دواییدا، هەموو دەستەوشە سرِدراوەکان تەعبیرن لەوەی ئارمیتەج کچەی لا سەرنجڕاکێشەو بە جەستە ئاگای لێیەتی. دەقەکە پێمان دەڵێ کچە، سانا خۆی خزاندە پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە، کە تەعبیرە لە ناسکیی و ڕێک و پێکیی جەستەی. ئارمیتەج کەمتر سەرنجی کوڕە دەدات، واتە کوڕە «سووک و سانا» چووە پشتەوە، ئەگەر شوێنی ئەم دوو دەستەوشە بگۆڕین، باسەکە دەبێتە ئەوەی کە ئارمیتەج زیاد لە کچە، ئاگای لە کوڕەکەیەو، کچە لە پێشەوە دانیشت و کوڕە «بە سانایی خزایە دواوە»و، ئەمە کاریگەریی حەزە بۆ وێناکردنی ئارمیتەج وەک کەسێکی هۆمۆسێکسواڵ، تەنانەت ئەگەر هیچ ڕستەیەکی راشکاویش لە ئارادا نەبێ(....).

دەتوانین چۆنیەتی کارکردنی دوو کۆدەکەی دیکەش لەم کۆپلە هەڵهێنجین. بۆ نموونە، کۆدی هێرمۆنتیک ئاشکرا تێیدا گرنگی پێدەدرێ. ڕێک لە سەرەتای دەستپێکردنی ڕۆمانەکەوە خوێنەر ڕادەکێشرێتە نێو پرۆسەی مەزندەکردنی ئەنجامەکان، کردنەوەی مەتەڵەکان و بەدیکردنی سەرنموونەکانی رووداو و مۆتیڤەکان. بەم پێیەش، لەگەڵ ئەم نموونەدا، ئێمە دەستبەجێ بەم پرسیارانە دەورە دەدرێین، «ئەم دیدارە چی لێدەکەوێتەوە؟ «،» ئاخۆ ڕێبوارەکان ئەوەندەی دیارە بێگەرد و پاکن؟»»، بڕوابەخۆبوونی ئارمیتەج لەگەڵ پێشکەوتنی ڕۆمانەکەدا روو لە سستی دەکات و لە پەرەگرافی سێیەمدا کۆدێکی کولتووری هەیە لەو شوێنەدا کە دەڵێین «ئارمیتەج لەو جۆرە کەسانە بوو کە چ کات تەمەنی ئۆتۆمبیلەکەیان ناگاتە یەک ساڵ».

لێرەدا دەقەکە هەموو ئاگادارییی پێشتری ئێمە لەسەر ئەم جۆرە کەسانە وەک کەسانێکی جودا بە کۆمەڵێک ڕەفتار و چۆنێتی تایبەتەوە بانگدەکاتەوە.

### سەرچاوە :

ئەم وتارە بەشی دووەمی کتێبێکە بەم ناونیشانە:

Peter Barry,Begining theory, An introduction to literary and cultural theory,Second edition, Manchester University Press, New York, 2002

### تێبینی:

چەند پەرەگرافێکی ئەم وتارە لەبەرئەوەی پەیوەندیی بە بەشەکانی دیکەی کتێبەکەوە هەبووە، لێرەدا وەرنەگێڕدراون، وەکی تر، کۆی ئەم کتێبە لەلایەن کۆمەڵێک وەرگێڕەوە دەکرێتە کوردی و بەشی پێنجەمی کتێبەکە بەناوی «ڕەخنەی دەروونشیکارانە» پێشتر وەرگێڕدراوە و بڵاوبۆتەوە، بەم ناونیشانە: نەرێکار، کۆمەڵە وتاری فەلسەفەو دەروونشیکاری، مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان، کوردستان، ٢٠٠٨.

# تیرۆریزم و لەکەلتورخستن

ئۆلیڤەر روا
لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

بۆچونێکی جەماوەری لەنێو ڕۆژنامەنوسان و شارەزایاندا هەیە کە تیرۆریزمی ئیسلامی بریتیە لە دەربڕینێک لە ڕق و قینی موسوڵمان. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە بێت، کەمینەیەکی پێشەنگ —تیرۆرستەکان- شێوازگەلێکی نەگونجاو بەکاردەهێنن بۆ دەربڕینی سەرجەم سکاڵا و گلەییەکانی کۆمەڵگە. ئەمەش پەرچەکرداری کۆمەڵگەیەکە کە هەست بکات لەژێر هەڕەشەدایە: وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ دەستدرێژییەکانی خۆرئاوا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا و سەپاندنی بەها خۆرئاواییەکان بەسەر ئەو موسوڵمانانەی کە لە خۆرئاوادا دەژین. لەڕاستیدا، هەرچەندە ئەوە ڕوونە کە زۆرێک لە موسوڵمانان پەرچەکرداری نێگەتیڤانەیان هەیە بەرامبەر ئەوەی کە خۆیان بە دوژمنکاری سیاسی و کەلتوریی دادەنێن، دیراسەیەکی نزیکتر لە تیرۆرستانی ئیسلامی کە لە ساڵی ٢٠٠١ لە خۆرئاوادا و بەردەوامیشن لەسەر ئەنجامدانی چالاکی تیرۆرستی، لە ئێستاشدا ئەو بۆچوونە پووچەڵدەکاتەوە کە ئەوەی دەیکەن پەیوەندی هەیە بە بەیەکداکێشانی کەلتورەکان، یان شارستانیەتەکان یان ئاینەکان، تەنانەت ئەگەر خۆشیان هەندێ جار ئەم زاراوەگەلە بەکاربهێنن.

## ئەوان لەکوێوە هاتوون؟:

گەر ئێمە ڕاڤەی میلیشیا ئیسلامیە توندڕەوەکان بکەین کە لە خۆرئاوای

ئەوروپادا لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا دەردەکەوتن، ئەوا مۆدێلێکی ڕوونمان بۆ دەردەکەوێت. ئەو کارەکتەرە تیرۆرستانە، تەنانەت کاتێک باکگراوندێکی خێزانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان هەبوو، بەڵام لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە نەهاتبوون بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆرستی لە خۆرئاوا، هەروەها لەلایەن گروپە تیرۆرستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە نەنێردرابوون، بەجۆرێک کە هەڵگری ئەجێندایەکی لۆکاڵی بن، وەک ئازادکردنی فەلەستین. ئەوان بەشێکن لە تۆڕگەلێکی ئیسلامی بەجیهانیکراوی سەرئاسا (supranational)، بەجۆرێک کە سەرچاوەی سەرهەڵدانیان خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، بەڵام لە خۆرئاوا سەرگەرمی ئەنجامدانی کارەکانیانن. باکگراوندیان هیچ پەیوەندی بە ململانێکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە نییە، یان بە پەروەردەی ئاینی نەریتیەوە، جگە لە هەندێک سعودی و یەمەنی نەبێت، بەتایبەت ئەوانەی سەرپەرشتی ڕوخانی دوو تاوەرەکەی ئەمریکایان کرد لە ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا. بەجیاواز لەوان، ئەو کارەکتەرە تیرۆرستانە، لە ئەوروپا پەروەردە بوون و زمانگەلێکی خۆرئاوایی باش دەزانن، بە پەروەردەی خۆرئاوا پەروەردەکراون: بۆنمونە، هیچ کام لەوانە ئەزموونی پرۆگرامی قوتابخانە ئیسلامیەکانیان نییە، یان هەر پەروەردەیەکی قوتابخانە ئاینیەکان. هەندێک لەوان لە ئەوروپا لەدایکبوون، هەندێکیشیان کە بەمنداڵی، یان خوێندکار یان پەنابەری سیاسی بوون کە هاتونەتە ئەوروپا، تەنانەت هەندێکیان بوون بە هاوڵاتی ئەوروپی. هەموو فڕۆکەوانەکانی ڕوداوەکەی ١١ی سێپتەمبەر و هاوەڵەکانیان، جگە لە یەکێکیان کە سعودی بوو، هەموویان وڵاتی دایکیان جێهێشتبوو بۆ ئەوەی لە خۆرئاوا بابەتگەلی لەمەڕ زانست و تەکنەلۆژیا بخوێنن. هەموو ئەوانە باکگراوندێکی سێکولاریان هەیەو خووی ڕۆژئاواییان وەرگرتووە، وەک خواردنەوە و ژوان لەگەڵ کچان هەتا ڕۆژی گەڕانەوەیان بۆ (باوەشی) ئیسلام. ئەوان هەموو خەڵکانێکی دابڕاون لە خێزانەکانیان. هەرچەندە ئەوان دانیشتووی خۆرئاوان، بەڵام تێکەڵ بە ژیانی کۆمەڵگەی لۆکاڵی ئیسلامی نەبوون، یان بەشدار نین لە کۆبوونەوە ئاینیەکاندا. بە شێوەیەکی فراوانتر هیچ کام لەوان هاوسەرگیری نێوان خزم و ئامۆزا یان کچانی هاوگوندی خۆیان ئەنجام نەداوە. لەڕاستیدا زۆرێک لەوان لەگەڵ ئەوروپیە ناموسوڵمانەکاندا هاوسەرگیریان کردووە کە بە هەر جۆرێک بێت هاوسۆزی ئاینی ئیسلامن.

گەر بەشێوەیەکی تر بڵێم، ئەوان کەلتورێکی مەنفی (exile)ان هەیە و لە پەراوێزی کۆمەڵگەدا دەژین، لە وڵاتانی خۆیان بێت یان لە هەر وڵاتێکی تر ئەوان کارەکتەرگەلێکی نامۆ و پەراوێزخراون. سەرنجڕاکێشتر، هەموو ئەو کارەکتەرە موسوڵمانە تیرۆرستانە- سەرباری ئەوەی وەک ژیانی ئاسایی وڵاتەکانیان یان لە ئەوروپای خۆرئاوا- بوون بە موسوڵمانگەلێکی دووبارە لەدایکبووەوە born-again Muslims لە ئەوروپا. مزگەوتەکانی هامبۆرگ، قودس، لەندەن، پارکی فێنسبێری و مارسێلس، ڕۆڵی گەورەتر دەبینن لە قوتابخانە ئاینیەکانی سعودیە لە پرۆسەی بەئیسلامکردنی ڕادیکاڵدا. پێشتریش لە ساڵی ٢٠٠٤وە تا ئێستا، بەڕادیکاڵکردنی ئیسلام لە دەرەوەی مزگەوتدا ڕوودەدات، لەوانە لەناو گروپێکی لۆکاڵی هاوڕێدا، یان ڕەنگە لەناو زیندانیشدا ئەو پرۆسەیە ڕوو بدات. بە هەرجۆرێک بێت، گرنگترین خاڵ ئەوەیە کە ئیسلامیە ڕادیکاڵەکان بەخۆرئاوایی و بەجیهانیکراون، بەو مانایەی کە ئەوان چیتر پەیوەست نین بە وڵاتەکەیانەوە، لەوانە ئەو وڵاتەی کە بنەچەی خێزانەکەیانی لێیە. گروپەکانیان هەمیشە بارگاوین بە پەروەردەی ئەو سەرکردانەی کە سەر بە چینی مامناوەندن و

بەشێکن لەو کارەکتەرە ئەوروپپیە ڕادیکالانەی ساڵانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠کان. ئەو گروپانەش بریتین لە گروپی سوپای سوری ئەڵمانی و کەتیبە سورەکانی ئیتاڵیا و بزوتنەوەی (کرداری ڕاستەوخۆ) لە فەرەنسا.

لە هەموو شانەیەکی ئەلقاعیدە لە ئەوروپا کەسانی هەڵگەڕاوە دەبینرێن. ئەوان بەشدارن لە ژیانی ئاسایی خەڵک بەوەی کە ئەوان موسوڵمانگەلی دووبارە لەدایکبووەوەن. زۆرێک لەوان سەر بە چینی مامناوەندن. ئەمەش لەسەر ئاستی کەلتوری خۆرئاواش هەر دروستە. بیست ساڵ پێش ئێستا چەندین کەس پەیوەندیان بە بزوتنەوەی چەپڕەوە ڕادیکاڵەکانەوە کرد، بەڵام ئەوان لە فەزای کۆمەڵایەتیدا پەرگیربوون یان بوبون بە بۆرژوا وەک گروپی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ لە فەرەنسا، کە توانیان لەسەدا پێنجی دەنگەکانی سەرۆکایەتی لە هەڵبژاردندا ببەنەوە. ئێستا تەنها دوو بزوتنەوە لە ڕایدکاڵە پرۆتیستۆخوازەکان لە خۆرئاوا وەک ئینتەرناسیۆنالیست خۆیان ڕاگەیاند: ئەوانیش بزوتنەوەی دژە جیهانگیری و ئیسلامیستی ڕادیکاڵ بوون. بۆ گۆڕینی ئیسلامی ئەوروپی ڕێگەی یاخیبوون ئامانجە. ئەوە دوای ئەوە دێت کە نەوەی دووەمی میلیشیاکانی ئەلقاعیدە کە لە دوای ساڵی ١٩٩٢ بوژانەوە و پەیوەندی خۆیان بە جیهانی موسوڵمانی ڕاستەقینەوە بچڕاند و خۆیان وەک ڕەمز نیشاندا. ڕوونتر بڵێم ئەوان زیاتر پەروەردەی ئیسلامییەکی بەخۆرئاوایکراون لەوەی کە سەر بە سیاسەتی نەریتپارێزی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بن. هەرچۆنێک بێت، ئایندناسی « سەردەمی کۆن»ی ئەوان ئێستا پشت بە دەنگە خۆرئاواییەکان دەبەستێت، هەرچۆنێک ئەوان بیر لە خۆیان بکەنەوە، بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دیارن کە زیاتر دیاردەیەکی پۆستمۆدێرنن، لەوەی کە کارەکتەرگەلی پێش مۆدێرنە بن.

لەبەرئەوە، دوور لە نواندنی نەریتە ئاینیەکانی کۆمەڵگە یان کەلتور، ئەو کارەکتەرە چەکدارانە، هیچ پەیوەندیەکیان بە ڕابردووی خۆیانەوە نییە و هیچ پەیوەندیەکیشیان بە ترادسیۆنی ئیسلامەوە نییە و هیچ ئەزمونێکی تاکەکەسیشیان لەگەڵ ئەو گروپ و کەسانەشدا نیە کە شوێنیان کەوتوون، بەمانایەکی تر: ئەوان لە بەردەوامبوون لەسەر ترادسیۆنی ئیسلامی خۆیان شکستیان هێناوە. ئەمە وێناکردنێکی ڕوونە، بۆ نمونە، محەمەد عەتا ڕایگەیاند کە ئەو نایەوێت بە ترادسیۆنی میسری بنێژرێت و وەک کارەکتەرێکی نائیسلامی مامەڵەی لەگەڵ کرا. ئەو چەکدارە تیرۆرستانە دواکەوتەی هیچ قوتابخانە یان زانایەکی بەناوبانگی ئیسلام نین، هەمیشە بە ستانداردێکی نائیسلامی ژیان دەگوزەرێنن. لەڕاستیدا، بۆچوونی «تەقوا» یان هەر بۆچوونگەلێکی شاراوەی کەسێک، بریتیە لە بۆچوونی گشتی بۆ ڕەفتارێکی لەو جۆرە. بۆنمونە ئەوە کارێکی ئاسان نییە تۆ ببینیت چۆن کارەکتەرێکی تیرۆرست دەخواتەوە یان چۆن هەوڵدەدات بە پارە لەگەڵ سۆزانیەکدا بنوێت، ئەمەش لە شەوێکدا پێش ئەوەی کارێکی تیرۆرستی ئەنجام بدات- وەک ئەوەی هەندێک لە کارەکتەرە تیرۆرستەکانی ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر ئەنجامیاندا- کە ڕەنگە ڕێگەیەکی باش بێت بۆ فێڵکردن لە دوژمن.

## ئەوان بۆکێ دەجەنگن؟:

بۆچوونی کارکردنی تیرۆرستەکان بچووکترە لەوەی بتوانێت بەرگری بکات لە ئیسلامی ڕاستەقینە

و هەرێمی نەریتی کە موسوڵمانەکان لەسایەی بڕیاردەر و پیاوانی ئاینی موسوڵماندا دەژین. یەکەم: ئەوان هەمیشە وا نابینن کە ئایەتوڵاکانی ئێستا شەرعی بن، تا ئێستاش لەلایەن سەرکردە ئیسلامیە ڕاستەقینەکانەوە شەڕیان لەگەڵ نەکراوە بۆ هەڵکەندنیان لە دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا. ئەلقاعیدە- لە ئەفغانستان و بۆسنە و چیچانەوە بۆ نیویۆرک و فەلوجە – لە شەڕدان، یەکەمجار دژ بە خۆرئاوا و هاوپەیمانەکانیان( بۆنمونە جولەکە و شیعەکان)، بەڵام دژ بە ڕژێمە هەنوکەییەکان نین. ئەلقاعیدە ئارەزووی ئەوە دەکات گورز لە ئامانجە جولەکەییەکان بوەشێنێت، بەڵام هەرگیز گورز لە ئامانجە ئیسرائیلیەکان ناوەشێنێت. تەنانەت لە عەرەبستانی سعودی قاعیدە گورز لە بیانیەکان دەوەشێنێت نەک لە بەرپرسە حکومیە لۆکاڵیەکان. لەڕاستیدا ئەوە بەتەواوی بەو مانایە دێت کە ئەوان وا لە ئیسلام دەڕوانن کە چەمکێکی جیهانی و دژە لۆکاڵییە: لە هەرشوێنێک موسوڵمانان لەژێر گوشاردابن، ئەوا ئەو شوێنە گونجاوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ ناموسوڵمانەکاندا. شەڕی ئەلقاعیدە پێش بوونی میلیشیا خۆرئاواییەکان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفغانستان دەستی پێکرد. ئوسامە بنلادنی بەرپرسی ئەلقاعیدە -عەبدوڵا عەززام لە برایانی موسوڵمانی فەلەستین – دەسبەرداری شەڕکردن بوون بۆ ئازادی فەلەستین، چونکە گەر ئەمەیان بکردایە ئەوا دەچوونە ناو ململانێیەکی ناسیۆنالیستیەوە لەوەی کە جیهادێکی خاوێنی ئاینی بکەن. ئەندامە نائەوروپییەکانی ئەلقاعیدە ئەوروپا و ئەمریکایان جێهێشت بۆئەوەی شەڕ بۆ ئیسلام بکەن بۆ وڵاتەکەی خۆیان یان خێزانەکانیان، جگە لە هەندێ لە فەلەستینیەکان. ئەوان بۆسنە و ئەفغانستان و کشمیریان هەڵبژارد. بۆنمونە، هەموو جەزائیرییەکان بەتایبەت ئەوانەی کە لە ئەوروپاوە هاتوون، سەرسامن بە ئەلقاعیدە- یان وەکو ڕوسیەکان لە ئەوروپا بوون بە کارەکتەری ڕادیکاڵ. ئەو بیانیانەی کە لە یەمەن سەبارەت بە دەستگیرکردنی بارمتەکان لە کانونی دووەمی١٩٩٩ دادگایی کران کە بریتی بوون لە شەش هاوڵاتی بەریتانی کە بە ڕەگەز پاکستانی بوون، پێکهاتبوون لە کوڕەزای شێخ هەمزەی ئیمامی پێشوی بەڕەگەز میسری و دوو جەزائیری. شێخ سەعید عومەر لە پاکستان دادگایی کرا، ئەمەش لەبەرئەوەی دانێڵ پیرڵی بەریتانی ڕفاندبوو. ئەو دوو گەنجە موسوڵمانەی لە مەغریب دادگایکران سەبارەت بە سوتانی ئوتێلێکی گەشت و گوزاری لە مەراکیش لە ساڵی ١٩٩٤ سەر بە دوو بنەماڵەی فەرەنسی- جەزائیری بوون. بە مانایەکی تر، چەندین کەیسی توندوتیژی ئیسلامی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر دەستی موسوڵمانە خۆرئاواییەکان ئەنجامدراون. موسوڵمانە دووبارە لەدایکبووەکانی ئەوروپا لەسەر پەراوێزەکانی خەونی ئوممە شەڕ دەکەن، چ کێشەیەک بوو کە ئامانجی بەخۆرئاوایکردنیان زیاتر لە شوێنێک کە لێوانلێوە لە ململانێ کە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە. سەرجەم ئەو ئەدەبیات و وێبسایتانەی کە سەر بە گروپی ئەلقاعیدەن و بانگهێشتی جیهاد دەکەن لە بۆسنەوە بۆ فلیپین، سەرباری ئەوەی کە ململانێکان لە فەلەستین و عیراق پەیوەندی بە کێشەی سەنتەری ئەو دوو وڵاتەوە نییە- بەڵکو ئەوە گرنگییەکە کە ڕەخنەگرتنە لە زۆرێک لەو میلیشیا عەرەبانەی وەک شێخ ئەبو ئەیبام ئەلهیلالی سعودی بیردەکەنەوە. بێگومان زۆرترین ئەو وێبسایتانەی کە بانگهێشتی جیهاد دەکەن، بنکەکانیان لە خۆرئاوا و باشوری ئەفریقایە. ئەمە پەیوەندی بە کۆنترۆڵکردنەوە نییە، هەروەها بەشێوەیەکی زۆر گرنگ، لەبەرئەوەی ئەو خەڵکانەی لەپشتەوەی ئەو وێبسایتانەوەن موسوڵمانی خۆرئاوایین.

## چ جۆرێک لە ئیسلام؟:

بەڕادیکاڵیزمبوونی تیرۆریستەکان بەهیچ شێوەیەک وەک کەلتور کۆمەکی ئیسلام ناکەن. ئەوە هەرگیز دەربڕینێکی ناسنامەی گشتگیر نییە بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی. لەکەلتورخستن و بەتاکگەرایکردن دوو مەسەلەی گرنگی پرۆسەی بەڕادیکاڵکردنن و ئیسلام هەڵگری دەربڕینی بنیادنانەوەی خودە کە پابەندە بە فەزیلەتی ئوممەوە. لەڕاستیدا ئەو ئیسلامەی کە خەڵکانی گەنج هەڵگری ناسنامەکەین هەرگیز لەو کەلتورە ئیسلامیە ناچێت کە خێزان و خەڵکانی وڵاتانی ئەو گەنجانە پەیڕەوی لێدەکەن. ئەوان سەلەفی و جیهادیستیەکانن. سەلەفیستەکان سەرگەرمی بە پاکڕاگرتنی ئیسلامی ڕاستەقینەن لە هەر کاریگەرییەکی دەرەکی، بە پشتبەستن بە کەلتور و نەریتەکانی کۆمەڵگەی موسوڵمان و ئایەتە قورئانیەکان و کردەوەکانی موحەمەدی پێغەمبەر. سەلەفیزم بەشێوەیەکی بنەڕەتی دژ بە فۆرمگەلی کەلتوری و نەتەوەیی بووە لە ئیسلامدا. ئەمە بەو مانایە نیە کە هەموو سەلەفیستەکان جییهادیستن. بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ تیرۆرستەکان دەیکەن بەشێکن لە کردەوەی جیهادیستەکان، تا ئەو کاتەی کە ئەوان بە ململانێی چەکداری دەستیان پێکرد، وەک ئەوەی کە ئەوان بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە ساڵانی حەفتاکاندا بە لێدان لە ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەستیان پێکرد، لەجیاتی ئەوەی کە پاڵپشتێکی سەرەکی بن بۆ بزوتنەوە لیبراڵە نەتەوەییە دیاریکراوەکان. لەڕاستیدا بۆ زۆرێک لە ڕادیکاڵەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە هەڵگری کەلتورێکی گۆڕاون، ئەکتیڤیزم وادەردەکەوێت کە شوێنی تۆمەتە ئاینیەکانی گرتبێـتەوە.

وەکو ئەوەی ئاماژەم پێدا، بەڕادیکاڵکردن دەرکەوتەی موسوڵمانە بەخۆرئاوایکراوەکانە، کە لە ئەوروپا لەدایک بوونەتەوە و ئێستاش لەوێ دەژین. ئەوە پەیوەندی بە بۆشایی نەوەکان و پایە کۆمەڵایەتیە خەفەکراوەکانەوە هەبووە، ئەمەش کاریگەری ترادسیۆنێکی پێش بوونی چەپڕەوەکانی لەسەربووە، کە پێیاندەوترێت کارەکتەرەکانی جیهانی سێیەم، یان گەنجە ناڕازییە دژ بە ئیمپریالیستەکان. سەرباری ئەوەی بەڕادیکاڵکردنی زۆرێک لە موسوڵمانە ئەوروپییەکان دۆخێکی بیروباوەڕی ئاشتیانە و ژینگەی ناموسوڵمانیان لە پراکتیک و هەندێ جاریش لە ئەلتەرناتیڤدا دەهێنایە ئاراوە. کێشەکە لەوەدایە دیفاکتۆی لیبرالیزم تا ئێستا نەبۆتە بنەمایەک یان دەربڕینێک بۆ تێرمە ئایدۆلۆجییەکان. ئەمە بەو مانایە دێت کە ئەم جۆرە لە لیبرالیزم هەنگاونان نیە بەرەو میکانیزمی بەسۆسیالیزمکردن کە بتوانێ بەئاسانی ببێتە شوێنکەوتەی نەوەکان، بەپێشنیاری ئەوەی کە نەوەی ئێستا بەشێوەیەکی کراوە لەقۆناغی بەڕادیکاڵکردندا دەمێننەوە.

## ئایین یان کەلتور؟:

فەندەمێنتاڵە نوێیەکان، هەرگیز ئەو کۆمەڵگانە ناکەنە ئامانج کە پەیوەندیەکی بنەڕەتی و کەلتورییان بە کارەکتەرە تیرۆرستەکانەوە هەیە، بەڵکو لەجیاتی ئەوە دەگەڕێن بەدوای ئەو تاکانەی کە لە ناسنامە و بیروباوەڕیاندا لە گومانێکی گەورەدا دەژین. ئەمەش وەک لەڕیشەهەڵکێشانی کەلتوری دەردەکەوێت، بەگشتی لەناو گەنجان و خوێندەواراندا، بەڵام ئەوان گەنجگەلێکی دڵتەنگ و خەمۆکن. گومانی تێدا نیە کە سەلەفیزم سەرنجی ئەو کەسانە ڕادەکێشێت کە لەکەلتور خراون

و کەلتوری کۆمەڵگەیان دۆڕاندووە، بەڵام لەکەلتورخراوەکان هیچ لەبارەی زاراوەگەلی ئابوورییەوە حاڵی نابن: لای ئەوان کێشە هەژاری نییە، بەڵکو ناسنامەی تاکەکەسییە. هەرچەندە سەلەفیزم لەنێو خوێندەوارانی چینی مامناوەندەوە گەشەی کردووە، بەڵام ئەوە وەک شۆڕشێکی بەرپرسیاری تەماشا ناکرێت، هەرچەندە ئەوان ئەزموونێکیان لەگەڵ تێکەڵبوون بە کەلتورەکانی تردا هەیە. بۆ نمونە لە میسر و پاکستان، سەلەفیزم وایکردووە کە چەندین کرێکار لە وڵاتانی کەنداو بکشێنەوە. چەندین تاکی لەکەلتور هەڵکەندراو- لە خۆرئاوابێت یان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست فەندامێنتالیزم لە بیابانەکانی ئەفغانستانەوە بۆ حەرەمی کۆلێژەکانی ئەمریکا، پێشنیاری ڕەفتاری سیتەماتیکراو دەکات، یەکسان بە ژینگە و بارودۆخی ئەو کۆمەڵگە جیاوازانە. لەڕاستیدا ئیسلام- وەک خیتابەکانی تاڵیبان و وەهابیەکان لە سعودیە و گەنجە ڕادیکاڵەکانی بنلادن- سەرگەرمی دوژمنکارین، تەنانەت ئەگەر لەنێو ئەو کەلتورە موسوڵمانەشدا بێت کە خۆیانی لێ لەدایک بوون. هەرچونێک بێت مەبەست لە وێرانکردنە، لە گۆڕی محەمەدەوە بۆ پەیکەرەکانی بوودا لە ئەفغانستان، یان سەنتەری بازرگانی جیهانی، هەموو ئەمانە مەبەست لێی ڕەتکردنەوەی کەلتور و شارستانیەتە ماتەریاڵەکانە، ئەمەش کەلتوری موسوڵمانان وەک ئامانجی یەکەم و کەلتوری خۆرئاوا وەک ئامانجی دووەم دەردەکەوێت. بۆ ئەم کردەوانە، خۆرئاوا هیچ یارمەتییەکی بۆ هەرجۆرە کەلتورێکی ئیسلامی ڕەت نەکردۆتەوە. سەلەفییەکان هەرگیز وەک کەلتور پابەندی ئیسلام نین، بەڵام وەک نموزەجێکی ئایینی کە ڕەهەندە شمولی و پاکێتیەکەی ونکردووە، پابەندی کەلتورێکی دیاریکراون. ئەمەیە کە دەبینین بۆچی نەوەی دووەمی گەنجان لە ئەوروپا پابەند نین بە کەلتورەوە.

خەونی سەلەفییەکان خەونی بەها کلاسیک و گەورەکانی شارستانیەتی موسوڵمانان نییە، بۆ نمونە ئومەوی یان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. ئەوان قوتابخانە ئاینیە جیاوازەکان ڕەت دەکەنەوە، لەوانە سۆفیزم، کە یارمەتیدەری نیشاندانی ئیسلامە وەک بوونێکی نێگەتیڤ. چۆن دەتوانین دیراسە لەسەر یەمەن بکەین بەبێ قسەکردن لەسەر ئەو بۆشاییەی کە لەنێوان زایدیزم و شافێیزمدا هەیە؟ یان قسەکردن لەسەر سەنتەری ئاسیا بە فەرامۆشکردنی ڕۆڵی حەنەفیزم و سۆفیزم؟ سەلەفیستەکان ئیسلامی لۆکاڵی ڕەت دەکاتەوە و شەڕێکی بەردەوام دەکەن دژ بە نەریتی لۆکاڵی و تەنانەت ئایین و نەریتە باوەکان و عەلمانیەتیش. بۆ نمونە ئەوان دژ بە هەر ئاینگەلێکی موقەدەسن، لەوانە (زیارەت) لە ناوەڕاستی ئاسیا و(مەوسیم)لە باکوری ئەفریقیا، کە دوو حەجکردنی ئاینین کە خەڵک بۆ نوێژکردن ڕوو دەکەنە شوێنە پیرۆزەکان- تەنانەت ئەوان دژ بە یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلامن، کە پێی دەوترێت مەولود. ئەوان دژ بە سۆفیزم و پراکتیزەی ڕۆحانین کە پێی دەوترێت (زیکر)، وە ئەوان دژ بە هەر فۆرمێکی نمایشکردنی هونەرین، کە باس لە پراکتیزەکردنی ئایین بکات، لەوانە مۆسیقای (قاوالی) لە پاکستان، بە هەندێک جیاکارییەوە لەوانە گۆرانی ئایینی تاکەکەسی بە کەرەستە مۆسیقییەکان. ئەوان دژ بە گۆڕستان و گۆڕی تایبەتن،(نمونەی تێکدانی گۆڕی نەقشبەندەکان لەلایەن ئەنسار ئیسلامەوە لە کوردستانی عیراق لەساڵی ٢٠٠٢ ). بەشێوەیەکی ئاشکرا، ئەوان هەروەها بەشداری یادەوەرییە نائایینی و سێکولارییەکان حەرام دەکەن. بۆنمونە، جەژنی نەورۆزی فارسەکان لە ٢١ی مارتی هەموو ساڵێکدا، لەلایەن تاڵیبانەوە قەدەغەکرا، ئەنجومەنی فەتوای سعودی دژ بە ئاهەنگی نەریتی Grayqaan یان Quraiqaan وەستایەوە، کە لەو ڤیستیڤاڵەدا

منداڵان لەسەر ڕۆخی کەنداو لە دەرگای ماڵەکان دەدەن و پارە و شتومەک کۆدەکەنەوە.

تاڵیبان، بۆنمونە، زۆر بە جدی دژ بە کەلتوری نەریتی ئەفغانستان بوو. وەک پراکتیزەکردنی سەرجەم سەلەفییەکان، سەرەتا موسوڵمانە خراپەکانیان کردە ئامانج، هەرچەندە دوای ئەوان کەلتوری خۆرئاوا دەکرایە ئامانج. ئەوان تا پایزی ١٩٩٧پەیوەندیەکی باشیان لەگەڵ ئەمریکا هەبوو وە هیچ کێشەیەکیشیان لەگەڵ ڕێکخراوە ناحکومیە خۆرئاواییەکان نەبوو، لەجیاتی ئەوە ئەوان دژ بە نەریت و کەلتورە ئەفغانیەکان تەواو توند بوون. ئەوان مۆسیقا و ڤیدیۆ و سەما و هەڵدانی کۆلارەیان قەدەغە دەکرد، لەبەرئەوەی هەرکەس کۆلارەی هەڵبدایە بەدار و دیواردا هەڵدەگەڕا و ماڵانی دەبینی و ڕەنگە ئافرەتی بێ حیجابی لە ماڵەکەی هاوسێیان ببینێت. ڕاگرتنی باڵندە قەدەغە بوو، چونکە ئەو باڵندانە دەیانخوێند و وەک لاسایکردنەوەی نوێژکردن هەژمار دەکرا. تاڵیبان پەیکەرەکانی بودایان ڕوخاند، ئەمەش نەک لەبەرئەوەی دژ بە بودیزم بوون– وەک بەشێک لە سیمبوڵی حەرامکراوی ئیسلامی لە فۆرمی مرۆڤدا– بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو پەیکەرانە هیچ پەیوەندیەکیان بە ئاینی ئێستای ئەفغانستانەوە نەبوو. تەنانەت ئەو پەیکەرانە هیچ مانایەکی ئاینیان هەڵنەگرتبوو، یان هیچ مانایەکی نێگەتیڤی ئایینیان نەبوو، بەڵام دەبوو هەر بیرووخێنن. لای تاڵیبان، ئایین پێویستە کێڵگەیەکی ڕەمزی مۆنۆپۆڵکراو بێت. تاک پێویستە ژیان بەتەواوی تەرخان بکات بۆ ژیانی دوایی، وە ئەمەش بە تەنها بە سیستەمێکی توندوتیژ و بەردەوام دژ بە ڕەفتارە کۆمەڵایەتیەکان ئەنجام دەدرێت.

نمونەیەکی دیار بۆ دژایەتیکردنی نێوان سیستەم و کەلتور بریتیە لە خواردن دژ بە چێشتلێنان. سەلەفیستەکان گرنگی بە مەتبەخ و چێشتلێنان نادەن، لای ئەوان هەر شتێک حەلاڵ بێت ئەوا باشە– بە هەر میتۆد و شێوازێک بێت. کاتێک ئەوان لە خۆرئاوا چێشتخانەیەک دەکەنەوە، شێوازی چێشتخانەی سەردەمی عوسمانی و مەغریبی بەکار ناهێنن، لەجیاتی ئەوە ئەو خواردنانە ئامادە دەکەن کە حەلاڵن و تەنانەت وەکو خۆرئاواش خواردنی خێرا ئامادە دەکەن. بەشێوەیەکی لێکچوو، جلی حەلاڵ هەروەکو جلی باران و دەستکێش و لەچکی جوانی خۆرئاوا و شتی تر بەکاردەهێنن. بۆیە حەلاڵ سیستەمێکی جێگیرە بۆ هەر کەلتورێک. شتەکان مێژووی خۆیان هەیە بۆ حەرامکردن و مانایەکی کەلتورییان هەیە، سەردەمێک ئەو جۆرە خواردنە هەڵبژێردراوە، ئەوانیش داواکارییەکی ڕێژەییان لەسەری هەبووە، بەڵام پەیوەندی بە کەلتورێکی دیاریکراوەوە نییە. لەوەها بۆچونێکدا ڕەنگە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان سەلەفییەکان و دوژمنە ئەوروپییەکانی کەلتوری دەسەڵاتخوازی ئەمریکیدا هەبێت. لای سەلەفییەکان هەمبەرگر بەشێوەیەکی کەلتوری قبوڵدەکرێت چونکە بەدرێژایی بوونی ئەم خواردنە لە سەردەم و نۆرمە ئاینیەکاندا خواردنی ئاسایی بووە. بۆ نمونە لە ساڵی ٢٠٠٣ بزنسێکی تایبەتی موسوڵمان بەشێوەیەکی سەرکەوتوو لە فەرەنسا خواردنەوەیەکی سادەی دروستکرد پێیان دەوت مەککە کۆلا، کە کوالیتیەکی بەرزی هەبوو، لە شێوە و تامیشدا وەک کۆکا کۆلا وابوو، زۆرینەی کڕیارەکانی مەککە کۆلا بریتیبوون لە ئیسلامییەکان و ئەمەش ئامادەکردنێکی پشتیوانی بوو بۆ فەلەستینیەکان. هەروەها لە ساڵی ٢٠٠٤ ستایلێکی نوێی بەرهەمهێنان لە مارکێتەکانی ئەوروپا دەرکەوت کە پێیان دەوت «پۆشاکی دەعوا» کە لۆگۆیەکی ئیسلامی لەسەربوو کە ستایەڵی پیاوێک بوو لەکاتی نوێژکردندا، ئەو جلە لەگەڵ کەلتوری گەنجە مەدەنیەکاندا دەگونجا.

## بوژانەوەی ئاینێک؟:

لەبەرئەوە سەلەفیستەکان گرنگی بە خوڵقاندنی کەلتورێکی تایبەت بە موسوڵمان نادەن و لەسەری ناوەستن. ئەوان ئەو چەمکە ڕەت دەکەنەوە، تەنانەت هەندێ جار واز لە بەرکارهێنانی ئەو زاراوەیە دێنن کە ڕێگە بۆ زمانێکی باو خۆش دەکات لەگەڵ کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا، ئەویش زمانی فرەکەلتورە multiculturalis کە دەربڕینێکی سەرەکیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جیاوازییەکاندا. بۆیە ئێمە سەلەفیستێکی ڕۆماننوس، شاعیر، مۆسیقار، بەرهەمهێنی فیلم یان کارەکتەری کۆمیدی نابینین. بۆ جەختکردنەوە لە سپەیسی نێوان کەلتور و ئایین و بە هەوڵدان بۆ بنیادنانی ئاینێکی خاوێن کە جیاکرابێتەوە لە عەلمانیەت و خەسڵەتە گشتیە جیهانیەکان، سەلەفیستەکان بەشدارن لە بەعەلمانیکردنێکی دژیەک لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا، لەبەرئەوەی ئەوان ئاینیان لە هەر ڕەهەندگەلێکی ژیانی کۆمەڵایەتی جیاکردۆتەوە کە حەز دەکەن –بەڵام ناتوانن– کایەکانی حەیات بەجاهیل بکەن یاخود تێکیبشکێنن. لە هەمانکاتدا فۆرمگەلێکی کاتی زیادەڕۆییکردن لە ئاییندا religiosity لەنێو نەوەی دووەمی موسوڵمانانداا بەکاردێنن لە دەرەوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە ئەمەش زیاتر لە چاودێرە کریستیانە ئەمریکیەکانەوە نزیکە لە سەدەی نۆزدە و بیستدا وەک لە ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. بەکورتی، ئەوان نموزەجگەلێکن لە بزوتنەوەی هەستی ئایینی revivalism . دواجار بزوتنەوەی هەستی ئایینی ڕۆڵ نابینێت لە بەها نەریتی و خێزانییەکاندا، بەڵکو کار دەکات لەسەر ئەو تاکانەی کە لە ئەزمونی قەیرانی ناسانامە و دابڕاو لە خێزان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا ژیان دەگوزەرێنن. ئەوەش لەگەڵ تاکگەرایی individualism هارمۆنییەک دروست دەکات، بنیادنانەوەی کۆمەڵگەیەکی وێناکراو، کە بریتیە لە کۆمەڵگەیەکی باوەڕدار یان ئوممە، کە لە قەیرانی دەسەڵات و مەعریفە، یان لە ئازایەتیدا هەنگاو بەرەو شەریعەت دەنێن و هەڵگری مەعریفەی ئاینی و فێربوونی خودی و سوربوون لەسەر سیستەم و بەها و بیروباوەڕی بزاون ، ئەمەش زیاتر لەوەی کە جەخت لەسەر فەلسەفە یان ئایۆلۆجیای ڕەها بکەنەوە. لە سەردەمی ئێمەدا بزوتنەوەی هەستی ئایینی هەمیشە بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی کۆنزێرڤاتیڤە، لە قامچی بایبڵی ئەمریکیەوە بۆ بزوتنەوەی Lubavitch و لەوێشەوە بۆ ئازارە جەستەییەکانی پاپا جانپۆڵی دووەم لەسەر ئازادی ئایین، هەروەکو ئینجیل تەفسیرێکی شۆڕشگێڕیی چەپڕەویان هەبووە. سەرکردە ئاینیە کۆنزێرڤاتیڤەکان دژ بە گەندەڵی و ونکردنی بەهاکان دەوەستنەوە. لەم ڕوانگەیەوە، ئیسلامی نەریتخوازی ئەوروپی بوونەتە بەشێکی لۆجیکی لە مشتومڕکردن لەسەر بەهاکان لەگەڵ ئەوروپییەکاندا. زۆرێک لە گوتاری ئیمامەکان لەبارەی پەرەدان بە دڵخۆشی و چاکردنی دەرامەتی خەڵک و جەختکردنەوە لەسەر جیاوازی ڕەهای چاکە و خراپە right and wrongو خوڵقاندنی ژیانێکی باش و هتد..... کە لە مەسەلەی ڕۆحانیەتەوە هیچ جیاوازییەکی نییە لە کریستیان و ئاراستەی مۆرسۆدۆکسی جولەکە کە بانگەوازی خواپەرستی دەکەن. بەڵام ئەو خەڵکەی کە گرنگی بە تیرۆریزمی جیهانی دەدەن موسوڵمانەکانن.

ئەمەی لێرەدا مشتومڕی لەبارەوە دەکەین ئەوە نیە کە ئاینەکانی تر بەهەمانشێوە توندوتیژی سیاسی بەرهەم دەهێنن. ئەوە ڕوونە کە لەنێو ئاینە خۆرهەڵاتیەکاندا باڵانسێکی ڕاستەقینە نییە، لەوانە ئاینی ئیسلام، کە لەهەوڵدایە بۆ وەرگێڕان لە ئایینی ڕادیکالیزمەوە بۆ توندوتیژی سیاسی.

بەڵام تایبەتمەندی ئیسلام لە قورئان و ترادسیۆنی کەلتوری سیاسی موسوڵمانەوە نەهاتووە، بەڵکو لە موسوڵمانەکانی سەردەمەوە هاتووە، وە ئەو فاکتەرانەی کە پەیوەندیان بە ئیسلامەوە هەیە بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیوەندیان بە بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکانی موسوڵمانانەوە هەیە لە خۆرئاوای ئەوروپا. بۆنمونە کەم تا زۆر لەنێو نەوەی دووەمی موسوڵمانانی ئەمریکادا تیرۆریست نادۆزیتەوە. نەبوونی ڕادیکاڵیزم بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیوەندی بە دوو جۆر لە جەماوەری موسوڵمانی خۆرئاواوە هەیە ، ئەوانیش بریتین لە سیمبوڵ و چاوەڕوانی. موسوڵمانان لە ئەمریکا بەشێکن لە بزوتنەوەیەکی فراوانی کۆچبەرانی خەڵک کە خوازیاری ئەوەن لە ئەمریکا بژین، لەکاتێکدا نەوەی دووەمی موسوڵمانانی ئەوروپا منداڵی هەڵەیەکن: دایک و باوکی ئەو نەوەیە هەرگیز خوازیاری ئەوە نین ببن بە ئەوروپی. موسوڵمانانی ئەمریکا بەشێوەیەکی فراوان سەر بە چینی ناوەڕاست یان تەنانەت سەر بە چینی باڵان– تەنانەت هەندێکیان داهاتیشیان زۆرترە لە دانیشتوانی ئەمریکا– لەکاتێکدا لە ئەوروپا ڕێژەی بێکاری لەنێو نەوەی دووەمی موسوڵماناندا زیاترە لە دۆخی قەبڵێنراو لە ئەوروپادا. هەمان نیشانەی خەڵک لەگەڵ باکگراوندی موسوڵمان لە دەربڕینی زیندانیکراوەکانیشدا دەردەکەوێت. زۆرێک لە ڕادیکاڵە ئەمریکیەکان بریتین لە هەڵگەڕاوەکان، لەوانە جۆس پادیلا، کە هەڵگەڕاوەیەکی ئەمریکی بوو کە تاوانبارکرابوو بە پشتیوانیکردن لە گروپی ئەلقاعیدە لە ساڵی ٢٠٠٥ وە ئەو هەڵگەڕاوانە لە هەمان جۆری هەڵگەڕاوە ئەوروپییەکان دەچن کە بریتین لە کەمینە ڕادیکاڵەکان و مەنفییەکان.

## ململانێی شارستانیەتەکان؟:

ئامانج ئەوەیە کە ئێمە نە لەبارەی ململانێ و نە لەبارەی دیالۆگی کەلتورەکانەوە قسە ناکەین، لەبەرئەوەی بە زۆرێک لە چەمکەکان کەلتور لەقەیراندایە. لەبەرئەوە، بوونی مشتومڕ لەسەر ئیسلام –لەڕاستیدا بەشێوەیەکی فراوان بارگاوییە بە بیروبۆچونی لەمەڕ ئاسایش–کە تا ئێستاش لەژێر پارادیمی دیالۆگ –بەیەکداکێشانی شارستانیەتەکان، کەلتور یان ئایین خۆی دەبینێـتەوە، کە بەشێوەیەکی فراوان پەیوەندی فراوانی بەو سێ چەمکەوە هەیە. کەم تا زۆر مشتومڕ لەسەر ئەوەیە کە چۆن شەڕی تیرۆریزم دوو بۆچوون لەسەر ململانێکان پێشنیار دەکات، یەکەم: ئیسلام مەسەلە سەرەکیەکەیەو ئێمە بەرەو ململانێی شارستانیەتەکان دەچین بێ ئەوەی بەشێوەیەکی قووڵ ڕیفۆرم لە ئاینذا ڕوبدابێت، یان دووەم: ئیسلام مەسەلە سەرەکییەکە نیە و پێویستە ئاراستەی بەیەکداکێشان بگۆڕین بە دیالۆگ لەنێو شارستانیەتەکاندا، ئەمەش وەک ئەدرێسێکی خاوەن ڕەگوڕیشەگەلێکی فراوانی ڕقوقینە لەنێو موسوڵماناندا. هەردوو حاڵەتەکە بەندە بە بنەمای بونیادە گشتییەکانەوە: ئایین بارگاوییە بە کەلتور، وە کەلتوریش لەسەر بنەمای ئایین دامەزراوە، ئەمەش بەو مانایە دێت کە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیو سیاسی باوەڕداران سوورن لەسەر بیروباوەڕی لاهوتی ئاینەکانیان. بانگەوازی ریفۆرمی ئاینی باوەڕداران والێدەکات گرنگی پێ نەدەن و بەخۆگونجان و ئەزموونی بیروباوەڕیان لەڕێی پراکتیزەکردنەوە بێت نەک لەڕێی مشتومڕگەلێکی ئاینزانییەوە. بانگەوازی سەرکردەکانی کۆمەڵگە بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەوە جاهیلەکان پرۆسەی لەکەلتورخستنە. ئەدرێسی کێشەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، کە خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی پۆزەتیڤە، گرنگینەدانە

به بەتیرۆرکردنی ئیسلامی هاوچەرخ. شتێک نیە بەناوی کۆمەڵگەی موسوڵمان، بەڵکو لەجیاتی ئەوە دانیشتوانێکی موسوڵمانان هەیە و ئەزموونێکی جیاوازیان هەیە کە چۆن ببن بە موسوڵمان-تەنانەت ئەگەر بەشداری هەمان ڕێبازیش بن.

لە ئەوروپا بۆچوونێکی گشتگیر هەیە بۆ دژایەتیکردنی ئەو دوو ڕێبازە، بەتایبەت لە بەریتانیای فرەکەلتور، کە موسوڵمانان لەلایەن ناسنامەیەکی لێوانلێو لە جیاوازی و فرە کەلتورییەوە پێناسە کراوە، یان توانەوەی ڕەگەزیی لە فەرەنسا، کە موسوڵمانان ڕەنگە ببنە هاولاتیگەلێکی فەرەنسی لەرێی توانەوەی ناسنامەی بنەڕەتی خۆیانەوە. ئێستا بەشێوەیەکی ئالۆز هەردوو ڕێگاکە بەشدارن لە هەمان تیۆر: ئایین ڕەگو ڕیشەی لە کەلتوردا چەسپیوە، لەبەرئەوە، موسوڵمانان سەر بە کەلتوری جیاوازن. بەشێوەیەکی فراوان، هەرچەندە بالانسی ڕادیکالیزم بەشێوەیەکی زۆر کەم دەتوانێ لەگەڵ سیاسەتی حکومەتدا ڕەفتار بکات: هەڕەشەیەکی تیرۆریستی زۆر لەسەر بەریتانیای مەزن و فەرەنسا و ئیسپانیا و بەلجیکا و هۆڵەندە هەیە، هەرچەندە لە هەریەک لەو کەیسانەدا سیاسەتی ئەو وڵاتانە بەرامبەر بە ئیسلام زۆر جیاوازە. مەبەستەکە ئەوەیە کە ڕادیکاڵەکان وەڵامیان بۆ سیاسەتێکی نەتەوەیی دیاریکراو نییە، بەڵام بۆ وشیاری جیهانی دەوڵەتی ئوممە وەڵامیان پێیە. بە هەر شێوەیەک بێت، فرەکەلتورگەرایی و توانەوەی ڕەگەزی بۆ هەمان مەبەست شکستی هێنا: موسوڵمانان لە خۆرئاوا بەرەو ناسنامەی ڕەگەزی و کەلتوری هەنگاو نانێن، بەڵکو دەیانەوێت تەنها وەک باوەڕدارێکی کۆمەڵگە بناسرێن. لە بەریتانیای مەزن موسوڵمانە دووبارە لەدایکبووەکان گرنگی بە کەلتوری کۆمەڵایەتی نادەن، بۆیە وەڵامیان بۆ سەرکردە نەریتپارێزەکانی کۆمەڵگە پێ نییە. لەلایەکی ترەوە سێکولاریستی فەرەنسی زۆر سەرسامە بە بینینی ونبوونی کەلتوری نەریتی موسوڵمانان، هاوشان لەگەڵ هێز و توانای ئاینیدا: بالاپۆشی کتوپڕی هەندێک لە خوێندکارە کچەکانی فەرەنسا لە سالانی نەوەدەکان  کە بە «کێشەی لەچکەکە» ناسراوە، پەیوەندی بە گواستنەوەی کەلتورییەوە نییە، بەڵکو لە ئەنجامی بنیادنانی ناسنامەیەکی ئاینی خاوێندا ڕوویدا لەنێو کچە ڕۆشنبیر و خوێندەوارەکانی قوتابخانەکانی فەرەنسا. بۆچوونی کۆنترۆڵکراو لە ڕای گشتی فەرەنسادا ئەوەبوو کە تێکەڵبوونی کەلتوری هەنگاوە بەرەو بەعەلمانیکردن. چەمکی ژیانەوەی ڕەگەزی و کەلتوری ئاینی وەک زاراوەیەکی بیرلێنەکراوە دەبینرێت، بەڵام هەر ڕوویدا. بەهۆی دامەزراندنی ئەنجومەنی موسوڵمانە باوەڕدارەکانی فەرەنسا، حکومەت بەنابەدڵییەوە تەنها وەک ئاینێک  دانینا بە بوونی ئیسلام لە فەرەنسادا.

********

لێرەوە چ وەڵامێک بۆ ئەم هەموو قەیرانە هەنوکەییانە هەیە؟ ئەو کێشەیە لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا هیچ چارەسەرێکی نییە، بەڵکو ئەوە پرۆسەیەکی لەکەلتورخستن و بانگەشەکردنی ئیسلامە تەنها وەک ئاینێک. بەو مانایەی کە دروستکردنی شوێنێک بۆ ئیسلام لە خۆرئاوا وەک ئاینێکی خۆرئاوایی لەنێو ئەوانی تردا- نەک وەک گوزارشتکردنێک لە کەلتوری کۆمەڵگە. ئەوە پرۆسەیەکی ڕاستەقینەی بەعەلمانیکردنە، کە هیچ لەگەڵ ڕیفۆرمی ئاینیدا ناکات، جگە لەوەی دەتوانێ پەرە بە مشتومڕی لاهوتی بدات وەک ئەوەی کەنیسەی کاسۆلیکی لە کیشوەری ئەوروپا بەتایبەت لە خۆرئاوادا ئەنجامی

دا بەجۆرێک کە پرۆسەی بەسێکولارکردن پێگەیەکی بەهێزی هەبوو: دەرکەوتنی دیموکراتی مەسیحی –ئەمەش وەک قبوڵکردنێکی تەواوەتی کەنیسە بۆ دیموکراسی – دەرئەنجامێکە و پێویستیەک نیە بۆ پرۆسەی بەعەلمانیکردن. دەسەڵاتە سیاسییەکان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ خۆرئاوا پێویست ناکات نە چاودێری بیریارە مۆدێرنە ئاینیەکان بکەن و نە کۆمەکی سیڤیڵ و ئیسلامی لیبراڵ بکەن. ئەوان پێویستە جێیەک بۆ ئیسلام چێ بکەن بەبێ ئەوەی یاسا و پرنسیپەکان بگۆڕن. پلورالیزمی ڕاستەقینە باشترین ڕێگەیە بۆ خۆدەربازکردن لە ململانێ لەگەڵ دانیشتوانی موسوڵماندا کە زۆر جیاوازن لە بونیان وەک هێزێک لە کۆمەڵگەدا. وەک ئەو خۆپیشاندانانەی لەلایەن خەڵکانی پرۆتیستانت و کاسۆلیک و جولەکەکانەوە ئەنجام دەدرا، کۆنزێرڤاتیڤەکان و تەنانەت بۆچوونی فەندەمێنتاڵیستەکانیش لەبارەی ئایینەوە بەشێوەیەکی دەستبەسەرداگیراو دەردەکەوێت لە ژینگەیەکی پلوراڵدا. لەڕاستیدا ڕێگەی پلورالیستی ڕێگە بە کۆمەڵگەی مەدەنی دەدات کە گەنج بێتەوە و بتوانێ نمونەیەکی ئامانجدار بۆ گروپە ڕادیکاڵەکان و سەلەفیستەکان بخولقێنێت. سیاسەتی دەوڵەت هەرچۆنێک بێت لەسەر بنەمای تەواوکاری موسوڵمانەکان و سەرکردەکانی کۆمەڵگە بنیادنراوە لەسەر پایەیەکی پلورالیستی. گرنگترین شت ئەوەیە کە پێویستە پەیوەندی فەندەمێنتاڵە بیانیەکان بە بەنێگەتیڤکردنی ئیسلام لاواز بکرێت و پابەندبوونی قوڵیان لەگەڵ ڕەفتاری ئاینەکانی تر ڕێگە پێدەدراو بێت. شەفافیەت Transparency و دیموکراسی لە ئامانجە سەرەکیەکانن.

**سەرچاوە:**

The Roots of Terrorism.
Edited by:
Louise Richardson.
New York 2006.

# "کارڵ پۆپەر" و ئەندێشەی دادپەروەری

بەهرام موحی
لە فارسییەوە: رەزا مەنوچەهری

لەدرێژەی بەداواچوون لەسەر باسی دادپەروەری دەگەینە سەدەی بیستەمو باس لە بیروڕاکانی کارڵ رایمۆند پۆپەری فەیلەسوفی ئینگلیزی بەرەچەڵەک نەمسایی دەکەین. پۆپەر لەگەڵ دەرکەوتنی حکومەتە تۆتالیتارەکان لە ئەوروپادا دوو نووسینی گرنگ، واتە «کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی» و «هەژاریی مێژووگەرایی»، کە بناغەی فەلسەفەی سیاسیی پۆپەر پێکدەهێنن، بڵاوکردەوە. ئەو دوو کتێبە هەوڵی پۆپەر بۆ بەرگری لە ئازادیو ڕووبەڕووبوونەوەی شەڕو تاراندنو دوورخستنەوەی ئەندێشە سیاسییە تۆتالیتار و دەسەڵاتخوازەکان دەخاتە ڕوو.

پۆپەر، ئەو بیرمەندانەی، کە ڕامانەکانیان بەکردەوە لە خزمەتی دەسەڵاتە سەرەڕۆ و لاسارەکاندا بووەو ڕێگایان بۆ حکومەتە ملهوڕەکان خۆش کردوە، بە «پێغەمبەرە درۆینەکانیان» ناودەبات و جەخت لەوە دەکاتەوە، کە دەبێت ئێمە بۆ ڕەخنەگرتن لە کەلەپووری کولتوریی خۆمان بەڕوونی قسە بکەینو واز لە خووی بەرگریکردن لە گەورە پیاوان بهێنین، چونکە هەندێک لەو گەورە پیاوانە بە پەلاماردانو هێرشکردنە سەر ئازادیو ئاوەز تووشی هەڵەی گەورە بوونو هێشتا زاڵبوونی ئەندێشەکانیان بووە بە هەوێنی سەرلێشێواندنو گومڕایی مرۆڤەکان. لە نووسینەکانی پۆپەردا بە وردبینییەکی هەڵسەنگێنەرانەوە بەرهەمی «پێغەمبەرە درۆینەکان» ڕەتدەکرێتەوەو لەئەنجامدا لە بەرامبەر دادوەریی دادگەی ئاوەزدا دادەنرێن. ئەفلاتۆنو هێگڵ دوو بیرمەندن، کە پۆپەر ئەوان بەشایانی سەرکۆنەو سەرزەنشتکردنی زۆر توند دەزانێتو ئەندێشەکانیان بەوە دەزانێت، کە لە

خزمەتی دژایەتیکردنی ئازادیو بەرز ڕاگرتنو هەڵکشانی سیستمە تۆتالیتارەکاندایە.

کارڵ پۆپەر مارکسیزمیش وەک هەوڵێک لەپێناو بنیاتنانی جیهانێکی باشتر بەیەکێک لە هەڵە گەورە مرۆییەکان دەژمێرێتو لە هەڵسەنگاندنی بیروڕاکانی مارکسدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە پێشبینییەکانی مارکس سەبارەت بە داهاتووی «سیستمی سەرمایەداری» بە هەڵە دەرچوونو ئەو تیۆرییەی مارکس بەدینەهات، کە دەڵێت لەگەڵ گەشەی سەرمایەداریدا، ڕۆژانەو بەشێوەیەکی ڕوو لە زیاد بوون کرێکاران ڕووبەڕووی هەژاریو چەرمەسەری دەبنەوەو چینە ناوەڕاستەکانیش دەچنە ناو لێشاوی گەورەی کرێکارانەوە. پۆپەر لەو بڕوایەدایە مارکس لەو بانگەشەیەدا تووشی پارادۆکسێکی (دژبەیەکبوونێکی) ناوخۆیی بووەتەوە، چونکە ناکرێت لەلایەک بەشێوەیەکی بەردەوام ڕێژەی بەرهەمهێنانی کاڵا زیادو بەرز بکرێتەوەو لەلایەکی دیکەوە بانگەشەی ئەوە بکرێت، کە بەردەوام لەشکری هەژارەکانو نەدارەکان ڕوو لەزیادبوون دەکات، کەواتە کێ ئەو ڕێژە زۆرە لە کاڵای بەرهەمهاتوو بەکاردەهێنێت؟

پۆپەر هەڵدەستێت بە بەرگریکردن لە دەستکەوتەکانی دیموکراسیی لیبراڵو وێڕای ڕەخنەگرتن لە لاوازییەکانی، دیموکراسیی لیبراڵ بە دادپەروەرانەترینو باشترین سیستم هەڵدەسەنگێنێت کە تاکو ئێستا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەدیهاتووە. لە ڕوانگەی پۆپەرەوە هەموو ئەو سیستمانە، کە بەدرێژایی مێژوو بەڵێنی بەهەشتیان لەسەر زەویدا بەمرۆڤەکان داوە، لە ئەکامدا دۆزەخیان لێکەوتووەتەوە، بەڵام دیموکراسی تاکە سیستمە، کە دەتوانێت بەتەنها لەسەر هەوڵو ویستی خودی خەڵک لەسەر پێ بمێنێتەوە. پۆپەر لەو بڕوایەدایە گەر بڕیار بێت جگە لە ئازادی، «دیموکراسیی ئابووری»یش (دادپەروەریی کۆمەڵایەتیش) پێکبێت، هەر هەمان «ئازادیی ڕواڵەتی (مۆراڵیی) ڕووت» تاکە گەرەنتی بەدیهاتنیەتی. پۆپەر ڕایدەگەیەنێت، مارکس لە بۆچوونێکی ساویلکانەدا دەوڵەت بە ئامڕازی سەرکوتی چینی دەسەڵاتدار هەڵدەسەنگێنێتو بەڵێنی ڕووخانو هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگەیەکی بێ چیندا دەدات، بەڵام مارکس هەرگیز لەو مەتەڵەی ئازادیی تێنەگەیشت کە دەوڵەت دەتوانێت چ خزمەتێک بۆ دابینکردنی ئازادیو مرۆڤایەتی بکات، یان دەبێت چ خزمەتێک بکاتو جێبەجێیشیان بکات. بەپێی بۆچوونی پۆپەر دەبێت لەڕێگەی جێگیرکردنی ئازادییەوە دەسەڵات کۆنترۆڵ بکرێتو ئەو دەسەڵاتەش ماڵی بکرێت. پاشان دەکرێت لە ڕێگەی پێکهێنانی دەزگاگەلێک لە چوارچێوەی سیستمی دیموکراتیکدا دەسەڵاتی ئابووریش کۆنترۆڵ بکرێتو ڕێگە لە کۆتوبەندکردنی (یەخسیرکردنی) مرۆڤەکان بگیرێت، بەڵام بە لەدەستچوونی ئازادی تەنانەت یەکسانیی نێوان زیندانیەکانیش نامێنێت.

ئەوەی بەشێوەیەکی دیاریکراو پەیوەندیی بە باسی دادپەروەرییەوە هەیە، پۆپەر لە بەرگی یەکەمی «کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی»دا و لەژێر ناونیشانی «ئەفسوونی ئەفلاتۆن» دەست دەکات بە هەڵسەنگاندنی روانگەکانی (ئەفلاتۆن)، فەیلەسوفی کلاسیکی یۆنانو زۆر بەتوندنی «دادپەروەریی تۆتالیتار» ، کە ئەفلاتۆن ئاماژەی پێدەکات، سەرکۆنە دەکات. هەروەها پۆپەر ئەوە بەیاد دەهێنێتەوە ئەو تێگەیشتنەی ئەفلاتۆن لەکاتێکدایە، کە چەمکی دادپەروەری لە مێشکی ئێمەدا بە مانای دابەشکردنی یەکسانو وەکیەکە لە بەرپرسیاریەتیی هاووڵاتیبووندا، واتە دابەشکردنی سنووردانانەکانی ئازادی، یەکسانی لە بەرامبەر یاساو بێلایەن بوونی دادوەرەکانی سیستمی دادوەری، ئەفلاتۆن ئەو چەمکە (چەمکی دادپەروەری) بەمانای بەرژەوەندیو سوودی چینایەتی تێدەگات.

بەپێی بۆچوونی پۆپەر تێگەیشـــتنی مرۆڤدۆستانە لەسەر دادپەروەری لەو مانایەدایە، کە وەکیەکی لەناو مرۆڤەکاندا بچەسپێتو ئیمتیازی «سروشتی» بسڕێتەوە، تاکگەرایی بپارێزرێتو لە ئەنجامدا بەرگریکـــردن لە ئازادیی هاوولاتیان بـــە ئەرکی دەولەت بزانرێت. پۆپەر لـــەو بڕوایەدایە ئەفلاتۆن لەبەرامبەر هەریەک لەو داخوازییە سیاسییانە بنەمایەک دادەنێت: بنەمای لەپێشدابوونی سروشتی، بنەمای تۆتالیتاریو ئەو بنەمایە کە دەبێت پشتیوانیو بەهێزکردنی دەولەت ئەرکی تاک بێت.

پۆپەر لە گەڕان بەدوای سیســـتمێکی دادپەروەرانەی سیاســـیدا ئەو پرســـیارە کلاســـیکییەی ئەفلاتۆن لەسەر دەولەت، کە دەلێت «دەبێت کێ حکومەت بەڕێوە ببات؟» بە پرسیارێکی ناڕاست دەزانێت. پۆپەر لەو بڕوایەدایە پرسیارێکی لەمشێوەیە لەسەر بنەمای بۆچوونێکی دەسەلاتخوازانەیەو وەلامێکی مەرجەعیەت ئاسای دەوێت. هەر لەمڕووەوە پرسیارێکی لەمشێوەیە وەلامی کلاسیکییانەی بـــەدوای خۆیـــدا هێناوە، بۆ نمونە «دەبێـــت چاکترینەکان حکومەت بەڕێوە ببـــەن» ، یان «زاناو بیرمەندان» ، یان لە باشترین دۆخدا «دەبێت زۆرینە حکومەت بەڕێوە ببات». پۆپەر لەو بڕوایەدایە جێگای سەرســـوڕمان نییە، کە ئەو وەلامە پێشکەشـــکراوانە نەک تەنها هەندێک ناکۆکییان لەگەل خۆیانـــدا هێنـــاوە، بەلکو لە دوایدا گۆڕاون بـــۆ ئەلتەرناتیڤێکی بێمانـــاو بەکەلک نەهاتووی وەک «حکومەتی کرێکاران، یان ســـەرمایەداران» و.... دەکرێت بەکورتی بگوترێت، کە لەلای پۆپەر و لە بواری بەڕێوەبردنی حکومەتدا پرسیاری «کێ» لەئارادا نییە، بەلکو پرسیاری «چۆن» لەئارادایە.

هەر لەمڕووەوە پۆپەر لە بەرامبەردا پێشـــنیاز دەکات، کە باشـــتر وایە پرســـیارێکی خاکیانەتر لەبری پرســـیارە کلاسیکییەکەی ئەفلاتۆن سەبارەت بە دەولەت بکەینو ئەویش ئەوەیە، کە بپرسین «دەتوانین چی بکەین تاکو دەزگا سیاسییەکانمان بەجۆرێک رێکبخەین، کە دەرفەتی زیان پێگەیاندن لەلایەن دەسەلاتدارە خراپو نەشـــیاوەکانەوە، کە ژمارەشیان زۆرە، بگەیەنینە لانیکەم». پۆپەر لەو بڕوایەدایە، کە بەبێ گۆڕان لە داڕشـــتنەوەی ئەو پرسیارە ئاماژە پێکراوەدا، هەرگیز ناتوانین بگەینە تیۆرییەکی ئاوەزیانە سەبارەت بە دەولەتو دەزگاکانی دەولەتو سیستمێکی سیاسیی دادپەروەرانە بەدیبهێنیـــن، کەواتە دەبێت لەبری ئەو پرســـیارە ئەفلاتۆنییە، کـــە «دەبێت کێ حکومەت بەڕێوە ببات؟»، خاکیانە بپرســـین «کام شـــێوەی حکومەت رێگا دەدات، کە بتوانین حکومەتێکی ملهوڕ یان هەر حکومەتێکی دیکەی خراپ بەبێ خوێنڕشـــتن وەلا بنێین؟». بەمجۆرە دەکرێت ئەو ئەنجامە بەدەســـت بێت، کە دیموکراســـیی ئەمڕۆش وەک دیموکراسیی ٢٥٠٠ ســـالی پێش ئێستا لە ئەسینا هەولێکە بۆ پێکهێنانی ئەو جۆرە حکومەتانە، کە دەبێت پێش لە بەرزبوونەوەو هەلکشـــانی ملهوڕ و دیکتاتۆری بگرێت.

پۆپەر ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات، کە دیموکراســـی بە مانای «دەســـەلاتی خەلک» ماناو ناوێکی فریودەرانەیـــە، چونکە لە هیچ شـــوێنێکدا خەلک دەســـەلاتدار نییە، یان حکومـــڕان نییەو نابێت دەســـەلاتداریش بێت. چونکە بە ئاســـانی حکومەتی زۆرینە دەتوانێت ببێـــت بە خراپترین جۆری ملهوڕیو دیکتاتۆریو بەتەواوەتی مافی کەمینە نەهێلێت. بەلام دیموکراسی تەنها فۆرمی حکومەتە، کە سەرباری ناوە فریودەرانەکەیو لەژێر گوشاری کێشەکانو دژوارییە کردارییەکاندا توانیویەتی ئەو ئامانجە لەبەرامبەر خۆیدا دابنێت، کە بە نووســـینی یاســـا مەرجدارەکان، ئایدیاکانی دادپەروەری، مرۆڤایەتیو زێدەتر لەهەر شتێک ئازادی لە چوارچێوەی یاسامەندبووندا بهێنێتە دی، هەلبەت تاکو ئەو شـــوێنە، کە گونجاو و رێگەپێدراو بێت. بەپێی ئەو بۆچوونە بێت دەکرێت بوترێت دیموکراســـی

لە روانگەی پۆپەرەوە نەک دەســـەڵاتی خەڵکە، بەڵکو ئامادەکردنی دەزگایەکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دیکتاتۆریدا. دیموکراســـییەکان لەهەوڵدان تاکو بە ســـوودوەرگرتن لە یاســـا مەرجدارەکانو دامەزراوە دروستکراوەکان ڕێگری لەوە بکەن کە دیکتاتۆریی سەر بەرز بکاتەوە، گەرچی هەموو کات ئەو هەوڵانە نزیک نەبوونەتەوە لە سەرکەوتن.

پۆپەر بۆ دەستنیشانکردنی هەڵسەنگاندنی سیستمی سیاسیی ئازاد (کراوە)، باسی ئەوە دەکات ئەو سیستمە لە ڕووی سیاسییەوە ئازادە، کە دەزگا سیاسییەکانی لە ڕووی کردارییەوە ئەو دەرفەتە بۆ هاووڵاتییەکانی برەخســـێنێت، کاتێک کە زۆرینە بتوانێت دەسەڵاتدارەکان بەبێ خوێنڕشتن وەلا بنێت. لە مانایەکی دیکەدا ئێمە کاتێک لە ڕووی سیاسییەوە ئازادین، کە بتوانین دەسەڵاتدارەکانمان بەبێ خوێنڕشـــتن لابدەینو تاکو ئەو کاتە، کە دەرفەتی لەو شێوەیەمان لەبەردەستدا بێت پێویست ناکات لەوە نیگەران بین کێ دەســـەڵاتی بەدەســـتەوەیە. پۆپەر سیستمێکی سیاسیی لەو شێوەیە، کە لە دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوادا بوونی هەیە ناو ناوە «کۆمەڵگەی کراوە». جگە لە تایبەتمەندیی هەڵســـەنگێنەرانە، گرنگتریـــن تایبەتمەندیی کۆمەڵگـــەی کراوە ململانێی ئازادە لەســـەر تیۆرییە زانستییەکانو شەفافیەتە لە مەیدانە بەرفراوانەکانیدا. کۆمەڵگای کراوە خاڵی بەرامبەری کۆمەڵگای داخراو و تۆتالیتارە، کە تیایدا لەبریی ململانێی سەربەستو ئازادانە لەسەر تیۆرییە زانستییەکان، سیستمێکی تەواو و کامڵ لەسەر بڕوا ئایدۆلۆژییەکان، کە بانگەشەی مۆنۆپۆلکردنی ڕاستیی هەیە، زاڵـــە. لە کۆمەڵگای کراوەدا شـــێوازی ڕەخنـــەی ئاوەزگەرایانە نابێتە هـــۆی لەناوچوونی ڕەخنەگر، هەروەها توندوتیژی لە سڕینەوەی (کوشتنی) بۆچوونی پێچەوانە، یان بۆچوونی ڕکابەرەکاندا ڕۆڵی نییە. ڕەخنە بەدوورە لە توندوتیژی، چونکە ڕێگا بۆ دۆزینەوەو کردنەوەی ئاوەز دەکاتەوە.

پۆپەر بـــۆ بەرگریکردن لە دیموکراســـیی لیبراڵ ڕایدەگەیەنێت: دەبێت لە خۆمان بپرســـین دوا ڕاپۆرتو ئەنجامی چاکەو خراپە، کە سیستمی دیموکراسیی لیبراڵ تاکو ئێستا بوویەتی چۆنە؟ ئایا چاکەکانی سیســـتمێکی لەو جۆرە زیاترە، یان زاڵترە بەســـەر خراپەکانیدا؟ پۆپەر ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: گەرچی دیموکراسی باشترین سیستم نییە، کە شایانی وێناکردن بێتو لەڕووی لۆژیکییەوە باشترین سیستمی گونجاو نییە، دەکرێت لە زۆربەی بوارەکاندا باشتر بکرێت، یان دەبێتو پێویستە باشـــتر بکرێت، بەڵام ئەو سیســـتمە لەڕووی مێژووییەوە باشترین سیســـتمی سیاسییە کە تاکو ئێســـتا ڕێمان پێبردووە. ئەو قســـەیە بەو مانایە نییە کە نابێت ڕەخنە لەو سیســـتمە بگرین. لە بنەڕەتدا دیموکراسی بە ڕەخنە زیندوو ڕادەگیرێتو ناکرێت هەمیشە دەستکەوتەکانی بەوە بزانرێت، کە ناگەڕێتەوە بۆ دواوەوە. هەمیشـــە ئەو مەترســـییە بوونی هەیە کە سیستمی دیموکراسی ئەوەی بەدەستی هێناوە بەخێرایی لەدەستی بدات.

پۆپەر لە نووسراوێکی دیکەی گرنگیدا بەناونیشانی «گومانەکانو ڕەتکردنەوەکان» بۆ ڕوونکردنەوەی تێگەیشتنی خۆی لەســـەر دادپەروەری، دەگەڕێتەوە بۆ باسکردن لەسەر سەرەتاو ڕچەشکێنیەکانی لیبرالیـــزمو تێزی جۆراوجۆر لەو بارەیەوە پێشـــکەش دەکات. بەپێی بۆچوونـــی پۆپەر دەوڵەت لە بنەڕەتدا نەگریس (ئاژاوەو خراپییە)، بەڵام خراپیەکی پێویستە. نابێت دەرەتانو بواری (دەسەڵاتی) دەوڵەت زیاتر لەوە بێت کە پێویستییەکانی دەیخوازێت. پۆپەر لەو بڕوایەدایە بۆ نیشاندانی ڕێژەی ئەو خراپییە پێویســـت ناکات پەنا بۆ تۆماس هۆبز ببەینو مرۆڤ بە گورگی مرۆڤ بزانین. تەنانەت ئەگەر مرۆڤ بە دۆستی مرۆڤ، یان مرۆڤ بە فریشتەی مرۆڤ بزانین، ئەوە دیسانەوە لە جیهانێکی

لـــەو شـــێوەیەدا مرۆڤی لاواز و مرۆڤـــی بەهێز بوونیان دەبێت، بەڵام لە ڕاســـتیدا لە جیهانێکی لەو شێوەیەدا مرۆڤە لاوازەکان ئەو مافەیان نییە، کە تاکە بەهێزەکان (دەسەڵاتدارەکان) قبوڵیان بکەن‌و بەهۆی بەزەیی‌و نەرمییان بۆ قبوڵکردنیان سپاسگوزاری بەهێزەکان بن. چونکە (ئەگەر بڕیار بێت) هەر کەس- چ لاواز، یان بەهێز — لەســـەر ئەو بۆچوونـــە بێت، کە هەر تاکێکی مرۆیی مافی ژیانی هەیە، ئیدی پێویســـتە داکۆکی لە مافەکانی بکرێت، (ئیدی) بۆیە پێویســـتیی بوونی دەوڵەت بە فەرمی دەناسێنێت، دەوڵەتێک، کە دەبێت مافی هەموان بپارێزێت‌و داکۆکییان لەسەر بکات.

پۆپەر لە درێژەدا ئەوە ڕادەگەیەنێت پیشـــاندانی ئەم مەبەســـتە، کە دەوڵـــەت لە هەمان کاتدا مەترسییەکی هەمیشەیی‌و بەردەوامە، کارێکی قورس نییە، چونکە گومانی تێدا نییە ئەگەر دەوڵەت بیەوێت ئەو ئەرکانە، کە پێی سپێردراوە جێبەجێیان بکات، دەبێت دەسەڵاتو بواری لە یەک بەیەکی هاوڵاتیان‌و تەنانەت گروپە کۆمەڵایەتیەکان زیاتر هەبێت. ئەو ڕێوشـــوێنانە، کە بیریان لێدەکەینەوە بـــۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەترســـیی خراپ بەکارهێنانی ئەو دەســـەڵاتو بوارپێدانە ئەوەیە، کە بۆ ئەو مەبەســـتە دەزگاو ڕێکخـــراو پێکبهێنین، بەڵام هیچیەک لەوانـــەش ناتوانن بەتەواوەتی ئەو مەترسییە بڕەوێننەوە، یان ئەو مەترسییە نەهێڵن. ئێمە هەمیشە ناچارین بەهای پارێزگاریکردن لە مافەکان بە دەوڵەت بدەین. ئەویش نەک تەنها بە دانی باج بە دەوڵەت، بەڵکو تەنانەت بە بەهای ئەو سوکایەتیکردنە، کە بەهۆی خۆبەزلزانین‌و لەخۆبایی بوونی دەسەڵاتدارانەوە کە بەرامبەرمان بەکاری دەهێنن، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو بەهایە کە دەیدەین زۆر زیاد و لە ڕادەبەدەر نەبێت.

بەڕای پۆپەر دیموکراســـی ناتوانێت‌و ناشـــبێت لە بەرامبەر مافی هاوڵاتیاندا چاکەکاری بکات. لەڕاســـتیدا دیموکراســـیش بەتەنها خۆی ناتوانێت کارێک ڕێکبخات، یان بەجێی بگەیەنێت. دەبێت چاکـــەکاری لەلایەن هاوڵاتیانەوە ئەنجام بدرێت. دیموکراســـی هیچ نییـــە جگە لە چوارچێوەیەکی گونجاو بۆ کار و کردەی مرۆڤەکان‌و نابێت ڕێگا بە خۆمان بدەین دیموکراســـی‌و ئازادی بە مانا، یان وەک ئاسوودەیی‌و پەرچووی ئابووریی بزانین. هەڵەیەکی گەورەیە بانگەشەی ئەوە بۆ خەڵک بکەین، کە ئازادی بۆ هەموان ئاســـوودەیی‌و دیموکراســـیش بۆ کۆمەڵگا بەخششـــی ئابووری لەگەڵ خۆی دەهێنێت. هەرگیز ئازادی بەمانای ئاسوودەیی‌و بەختەوەریی یەک بەیەکی مرۆڤەکان نییە . ڕەنگە ئەو بابەتە تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندیی بە چانس‌و بەخت، یان ڕەنگە بە شێوەیەکی ڕێژەیی پەیوەندیی بە توانایی‌و هەوڵو کارچاکیی (فەزیلەتی) دیکەوە هەبێت. دەبێت بەشێوەیەکی واقعبینانە سنوورەکانی دەوڵەتی ئاسوودە ڕەچاو بکەین‌و کارێکی ترسناکە ئەگەر بەرپرسیاریەتیی مرۆیی سەبارەت بە خودی مرۆڤەکەو دەوروبەرەکەی لە مرۆڤ بســـەنرێتەوە، یان کێشمەکێش‌و ململانێکانی ژیان بۆ مرۆڤێکی لاو (گەنج) زۆر ئاســـان بکەین، چونکە راســـتەوخۆ لە ئەنجامی نەمانی بەرپرسیاریەتیی تایبەت بە کەسەکان، دەکرێت مانای ژیانیش لەلای مرۆڤەکان لەدەست بچێت.

پۆپەر لەو بڕوایەدایە دەکرێت ســـەبارەت بە دیموکراســـی‌و ئازادی بگوترێت، کە باشترین حاڵەت ئەوەیـــە تا ڕادەیەک دیموکراســـی‌و ئازادی توانـــای تایبەتی تاکەکان بۆ ئاســـوودەبوونیان بەهێزتر دەکەن. کەواتە نابێت ئێمە ئازادی لەبەر ئەو هۆکارە هەڵبژێرین کە چاوەڕوانیی ژیانێکی ئاسوودەی لێبکەین، بەڵکو دەبێت لەبەر ئەو هۆکارە بێت کە ئازادی بۆ خۆی پاساوی بەهاکانە‌و ناکرێت هەرگیز تاکو ئاســـتی بەها مادییەکان دابەزێنرێت. لەمڕووەوە پۆپەر ئەو قسەیەی فەیلەسوفی یۆنانی کۆن دیموکریتۆس بەیاد دەهێنێتەوە کە دەڵێت: «ژیانی هەژاری‌و کەم دەستانە لە دیموکراسیدا باشترە

لە ژیانێکی دەوڵەمەندانە لە حکومەتێکی دیکتاتۆریدا، چونکە ئازادی لە کۆیلایەتی باشترە»، پۆپەر ئەوەشـــی لێ زیاد دەکات، ئێمە ئازادیی سیاســـیمان بۆ ئەوە هەڵنەبژاردووە کە بەڵێنی ئەمە، یان ئەوەمـــان پێدەدات، بەڵکو بۆ ئەوەمان هەڵبـــژاردووە، کە تاکە فۆرمی مرۆیی پێکەوە ژیان لە نێوان تاکە مرۆیەکاندا مەیسەر دەکات، تاکە فۆرم، یان شێوازە، کە دەتوانین بە تەواوەتی بەرپرسیاریەتی خۆمانـــی تێدا لەئەســـتۆ بگرین، بەڵام ئایـــا دەتوانین ئەو دەرفەتو توانایە، کـــە ئازادی بۆ ئێمەی دەســـتەبەر دەکات بهێنینە دی؟ ئەوەش پەیوەندیی بە زۆر هۆکارەوە هەیەو لە هەمووشـــیان زیاتر پەیوەندیی بە خۆمانەوە هەیە.

پۆپەر بەیادی دەهێنێتەوە، ئێمە لەبەرئەوە دیموکرات نین، کە هەمیشـــە هەق بە زۆرینە بدەین، چونکە کاتێک زۆرینە بڕیاری لەپێناو بەرژەوەندیی ملهوڕیو دیکتاتۆریدا، ئیدی بڕیار نییە (پەیمان بەوە نەدراوە) کەسێکی دیموکرات دەستبەرداری بیروڕاکانی خۆی بێت، یان لە بیروڕاکانی بکشێتەوە. پۆپـــەر زۆر بـــە بایەخەوە رۆڵی ئەو دەزگاو رێکخراوانە، کە ریشـــەیان لە نەریتـــە دیموکراتیەکانی کۆمەڵگادا هەیە هەڵدەسەنگێنێتو یۆتۆپیای لیبراڵ، واتە ئەو دەوڵەتە، کە بەشێوەی ئاوەزگەرایانەو پشتبەســـتووە بە بناغەیەکی بەبێ نەریت، بە ئەســـتەمی دەزانێت بێتە دی. لەلای پۆپەر لیبراڵیزم بڕوایەکە، کە پشتبەستووە بە گۆڕانکارییە ریفۆرمخوازەکانو کاری هێدی هێدی و هەنگاو بەهەنگاو، نـــەک پرۆژەو بەرنامەیەکی شۆڕشـــگێڕانە. پۆپەر ئەوەش بەیاد دەهێنێتـــەوە ئەو گروپە لە نەریتە دیموکراتییەکان لـــە گرنگترینەکانن، کە چوارچێوە ئاکارییەکانـــی (گونجێنراو لەگەڵ چوارچێوەی دەزگایەکی یاســـایی) کۆمەڵـــگا پێکدەهێننو وێنای مانایەکی نەریتیی دادپـــەروەریو دابونەریتو هەســـتە ئەخلاقیەکانن. ئەو چوارچێوە ئەخلاقییە بناغەیەکە دەکرێت لەســـەر ئەو بنەمایە لە هەر شوێنێکدا پێویستی کرد رێکەوتنێکی دادپەروەرانەو ویژدانمەندانە لە نێوان حەزەکانو بەرژەوەندییە ناکۆکەکاندا دەســـتەبەر بکرێت. بێگومان سروشتییە ئەو چوارچێوەیە گۆڕانی بەسەردا بێتو گۆڕان قبوڵ بکات، بەڵام گۆڕانکارییەکانی تا رادەیەک هێدیو لەســـەرخۆ دەبێت. هیچ شـــتێک بە ئەندازەی تێکدانـــی ئەو چوارچێوەو نەریتە ترســـناک نییە. هەنگاوێکی تێکدەرانەی لەو شـــێوەیە (هەر وەک دەرکەوتنی رژێمی ناســـیۆنال سوســـیالیزم (نازی) لە ئەڵمانیا، بە ناچار (بـــە زۆر) دەبێتە هۆی پێشێلکردنو لەناوبردنی هەموو بەها مرۆییەکان.

پۆپەر ســـەبارەت بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لە ئاســـتی جیهاندا رایدەگەیەنێت: ئەمرۆ بەهۆی دەستکەوتە تەکنەلۆژییەکانو گەشـــەی ئابووری، ئەو هەلە بۆ مرۆڤایەتی رەخساوە تاکو برسێتیو هـــەژاری لە جیهاندا بنبـــڕ بکات، بەڵام گرفتی دیکـــە رێگرە لەبەردەم ئـــەم کارەدا. پۆپەر یەکێک لەو گرفتو رێگریانە بەبوونی حکومەتە (دەســـەڵاتە) سیاســـییە گەندەڵەکانو ملهوڕەکان لە وڵاتە گەشـــە نەکردووەکاندا دەزانێت. ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات هێشـــتا خەڵک لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا بە کامڵبوونێکی موراڵیی ئەوتۆ نەگەیشـــتوون تاکو بتوانن چارەنووسی خۆیان لەسەر دەستی خۆیان دیاری بکەن.

## سەرچاوە:

ئەم بابەتە ساڵی ٢٠٠٦ لە دۆیچە ڤێلە بڵاوبووەتەوەو لەم ماڵپەڕەی خوارەوە وەرگیراوە.

http://philosophers.atspace.com/falsofe.htm

# وێستگە گرنگەکانی فەلسەفەی ئەوروپی

**هاشم ساڵح**

**لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد**

سەرسامم بەو کتێبانەی لەبنەڕەتدا بۆ خوێندکارانی زانکۆ دەنووسرێن و بابەتە پێویســـت و سەرەکییەکانی تیادا دەخرێنەڕوو، تادواتر خوێندکار زانیارییەکانی فراوان و دەوڵەمەند بکات. لێرەدا باســـی کتێبێک دەکەین کە توێژەری فەرەنسی دۆمینیک فۆلشید نووســـیویەتی بەناونیشانی (وێستگە گەورەکانی فەلسەفەی کلاسیکی و نوێ و هاوچەرخ)، ئەم نووسەرە مامۆستایە لە زانکۆی مارن لاڤالێ لە پاریس.

نووسەر لەم کتێبەدا ناونیشانی گرنگترین ئەو کتێبە فەلسەفییانە دەخاتەڕوو کە لە ســـەدەی سیانزەهەمەوە تا ئەمڕۆ لە ئەوروپادا سەریانهەڵداوە، واتە ناوی ســـەدان کتێب دەژمێرێت کە کاریگەرییان لەســـەر فیکری بەشـــەریدا هەبووە. بێگومـــان ئێمە لێـــرەدا ناتوانین ناوی هەموو ئەو کتێبانە بهێنین کە دەشـــێت پێویستیی بە دەیان وتار هەبێت، بەڵام من گەشتێک بەنێو کتێبەکەدا دەکەم و لەتەک هەندێ وێستگەدا دەوەستم کە پێم وایە وێستگەی سەرەکین.

پێشـــوەخت داوای لێبـــوردن لە خوێنەران دەکەم بەهۆی ئەم گەشـــتە خێراو موشـــەک ئاســـایەم، چونکە زۆر بەکورتی لەسەر هەندێ وێســـتگە دەوەستم و هەندێکی دیکەیان وەلادەنێم کە دەشێت بایەخیان کەمتر نەبێت لەم وێستگانەی لێرەدا هەڵم بژاردوون. بەرلەوەی بچمە ناو کرۆکی باسەکەوە، دەڵێم ئەم نووسەرە بەچەندین کتێبـــی پڕ بایەخ کتێبخانەی فەرەنســـیی دەوڵەمەند کردووە، وەک:

فەلســـەفەی ئەڵمانی لە کانتەوە بۆ هایدگەر، گیانی ئاتەئیزم (ئیلحاد)و چارەنووســـی، فەلســـەفە گەورەکان...تاد.

## 1- ئیمانۆیل کانت (1724-1804):

یەکەمجـــار لەلای کانتی دامەزرێنەری مۆدێرنەی فەلســـەفی، بەپلەی نایاب، دەوەســـتم. کتێبی «رەخنە لە ئەقڵی پەتی» کە لە ســـاڵی ١٧٨١دا چاپ کراوە، مێژووی فەلســـەفە بەسەر دوو بەشدا دابەش دەکات: پێش خۆی و پاش خۆی. ئەم کتێبە لە سەرەتادا پڕبوو لە زاراوەی قورس و ناڕۆشن و تێکەڵ و پێکەڵ، بەڵام دواتر و پلە بە پلە بایەخ و مەزنیی کتێبەکە ڕوون بۆوە. کانت ئەم کتێبەی، وەک لێکۆڵینەوەیەکی میتۆدی، بۆ وەڵامی ئەم پرســـیارانە تەرخان کردووە: لەم ژیانەدا دەتوانم چی بزانم؟ دەتوانم چی بکەم؟ دەتوانم هیوا بە چی بخوازم و تەمەنای چی بکەم؟

لەڕاســـتیدا کانت دەیویست سنوورێک بۆ دوو تەوژمی فەلسەفی دابنێت کە لە سەردەمی خۆیدا باو بوون: یەکەم، تەوژمی دۆگماتیزمی میتافیزیکی کە خاوەنی باوەڕ و یەقینێکی جێگیرو کۆتایی بوو و گفتوگۆی قبوڵ نەدەکرد، دووەم: تەوژمی گومانکاری کە متمانەی بەهیچ شـــتێک نەبوو. ئەم دوو تەوژمە فەشـــەلی خۆیان سەلماند پاش ئەوەی چوونە نێو چەندین گفتوگۆی نەزۆکەوە لەبارەی پرســـیارە بێشـــومارە میتافیزیکییەکان. لەم ســـاتەوەختەدا کانت دەرکەوت تا ئاســـۆیەکی نوێ بۆ فەلســـەفە بکاتەوەو تا ببێت بە بابەتێکی ســـوودبەخش بۆ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی. لێرەدا بایەخ و مەزنیی ئەم فەیلەسوفە دەردەکەوێت.

کانت وایدەبینێت ئەو شتە بنچینەییەی لە سەردەمەکەی خۆیدا ڕووی دا، بریتی بوو لە زانستی سروشتی فیزیکیی ماتماتیکی، واتە زانستی نیوتن کە لەسەر ئەزموونگەری و دۆزینەوەی ڕێساکانی گەردوون ڕاوەســـتابوو. لەپاش دەرکەوتنی زانستی نیوتن، ناتوانین بەشێوەیەکی میتافیزیکی باسی فەلسەفە بکەین، دەبێ لێرە بەدواوە فەلسەفە بریتی بێت لە بیرکردنەوە لە میتۆد و دەرەنجامەکانی زانست، نەک وەهم فرێدان لە بۆشاییەکانی میتافیزیکداو زۆر بڵێیی لەسەر شتێک هیچ بنەمایەکی نییە. ئەمە مانای وایە چیتر ناتوانین لەخۆمانەوە شـــتێک بڵێین وەک ئەوەی گوتاری فەلســـەفەی گشـــتی لە رابردوودا دەیکرد. بەڵکو دەبێ وتەی فەلســـەفی تەبا و گونجاو بێت لەگەڵ وتەی زانست کە شـــوێنی متمانەو باوەڕە. بە مانایەکی تر ئەو ســـەردەمە بەسەرچوو کە لەبارەی «هیچ» هەموو شتێکمان دەووت، لەبارەی هەموو شتێکیش هیچمان دەووت.

کانت شۆڕشـــێکی کۆپەرنیکیی لە بواری فەلســـەفەدا هەڵگیرســـاند، لەو شۆڕشـــە دەچێت کە کۆپەرنیکـــۆس لە بواری فەلەکدا ئەنجامی دا، وەک چـــۆن کۆپەرنیکۆس وتی زەوی بەدەوری خۆردا دەســـوڕێتەوە نەک بەپێچەوانەوە، کانتیش وتی فەلســـەفە بەدەوری زانستدا دەسوڕێتەوە. زانستی فیزیکی-ماتماتیکی کە ڕێســـاکانی سروشت و گەردوون دەدۆزێتەوە، بنچینەی مەعریفەیە. بەمجۆرە کانت فەلسەفەو زانستی لەیەکدی جیا کردەوە کە پێشتر تێکەڵی یەکدی ببوون، پێی وابوو زانست لەپێش فەلســـەفەوەیە، ئەو شـــتەی دامەزراند کە ئەمڕۆ ئێمە پێی دەڵێین ئیپســـتیمۆلۆژیا: واتە فەلسەفەی زانستەکان.

## 2- فریدریک هیگڵ (1770-1831):

هیـــگڵ لەدوای کانتەوە دێت، لە مێژووی فەلســـەفەدا کتێبی « فینۆمینۆلۆژیای رۆح»ی هیگڵ هیچی کەمتر نییە لە کتێبی «رەخنە لە ئەقڵی پەتی»ی کانت.

هیگڵ لە ســـاڵی ١٨٠٧دا وتارێک دەنووســـێت بەناونیشـــانی: سیستمی زانســـت، لەوێدا دەڵێت فینۆمینۆلۆژیای رۆح بەشـــی یەکەمی ئەم سیستمەیە. لە ساڵی ١٨١٧دا دووەم کتێبی چاپ دەکات بە ناونیشـــانی: ئینسایکلۆپیدیای زانستە فەلســـەفییەکان، لەوێدا پێی وایە فەلسەفە خۆی خۆی پێشـــکەش دەکات و پێش هەموو شـــتەکانی دیش دەکەوێت، پاشان دەڵێ: لێرەدا چەند ڕیشەیەکی مێژوویی بۆ فەلســـەفە هەیە، بۆیە دەبێت هەموو فەلســـەفەیەک لەنێـــو چوارچێوە مێژووییەکەی خۆیدا بخوێنین، فەلســـەفە ســـەردەمەکەی خۆی بنیات ناوە، ئامانجی ئەم فەلسەفەیە بریتییە لە چارەســـەرکردنی گرفتە گەورەکەی هەمـــوو چەرخێک. بەڵام ئایا پەیوەندیـــی لاهوت (تیۆلۆجیا) بە فەلسەفەوە چییە؟ بە چ شێوەیەک دەشێت گونجانێک لەنێوان تیۆلۆجیا و فەلسەفەدا بخوڵقێنین؟

ئاشـــکرایە تیۆلۆژیستەکان دەڵێن ڕاستیی ڕەها لە ئاییندا دژ و ناتەبایە لەگەڵ ڕاستییە بچووک و نایەقینییەکانی ئەقڵ، بگرە ئەوان ڕاستییەکانی ژیانی دونیایی ناچیزە دەکەن. بەڵام هیگڵ دەڵێ فەلسەفەو ئایین هەمان ناوەڕۆکیان هەیەو لە هەمان گرفت دەکۆڵنەوە، بەڵام بە دوو ڕێگەی جیاواز. ئایین لە ڕێگەی وێنەگرتنی مەجازی و هەڵقوڵینی سەرســـوڕهێنەری گوتاری پەیامبەری گوزارشت لـــە هەقیقەتی ڕەها دەکات، ئەمە لەکاتێکدا فەلســـەفە لەڕێگەی تێگەیانـــدن و لۆجیک و ئەقڵەوە گوزارشتی لێدەکات. پاشان فەلسەفەکردن بەمانای گواستنەوە لە قۆناغی وێناکردنی خەیاڵییەوە بۆ قۆناغی تێگەیشـــتنی زاراوەیی و ئەقڵانیی شتەکان. لێرەدا –بەپێی بۆچوونی هیگڵ- دژایەتی نییە لەنێوان فەلسەفەو جەوهەری ئاییندا، بەڵام دژایەتییەک هەیە لەنێوان فەلسەفەو توێکڵی ئایین یان تێگەیشتنی ڕوکەشانە لە ئایین.

## 3- ئۆگست کۆنت (1798-1857):

فەیلەسوف و سۆسیۆلۆژیستی فەرەنسی ئۆگیست کۆنت، لەنێوان ساڵانی ١٨٣٠-١٨٤٢دا کتێبێکی گرنگ دەنووســـێت بەناونیشانی (چەند لێکچەرێک لەبارەی فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم)، لەوێدا ئۆگست کۆنت وایدەبینێت مەعریفە گەڕان و توێژینەوەیەکی خۆڕایی نییە، بەڵکو ئامانجی مەعریفە بریتییە لە سوود گەیاندن بە مرۆڤایەتی و پێشخستن و چاککردنی دۆخی بەشەری. مومکین نییە پۆزەتیڤیزم کورت بکرێتەوە بۆ عەقیدەیەکی زانســـتیی پەڕگیر، واتە پۆزەتیڤیزم لە پەرســـتنی زانست و متمانە بەخشین پێی، کورت ناکرێتەوە.

فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم ئەوە دەزانێت کە گەیشتن بە هەقیقەتی ڕەها مەحاڵە، بەو پێیە زانستیش توانای بەســـەر هەموو شتێکدا ناشـــکێت، بەپێچەوانەی ئەوەی کە زانســـتی پەڕگیر بانگەشەی بۆ دەکات. ئەمە واتە لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان پۆزەتیڤیزم و زانستی پەڕگیر.

## 4- کیر کیگارد (1855-1913):

کیر کیگارد، هەروەکو مارکس، قوتابیی هیگڵ بوو، بەڵام ئەویش، هەروەک فەیلەسوفی کۆمۆنیزم، لــە مامۆســـتاکەی هەڵگەڕایــەوە، ئەگەرچی بە مەبەســـت و ئامانجی تەواو جیـــاواز لە مارکس، لە مامۆستاکەی هەڵگەڕایەوە.

کیــر کیگارد خــۆی تەرخان کرد بۆ فەلســـەفەی بوونگەرایی و خودی، نکوڵیی لە فەلســـەفەی بابەتگەرایی ساردوســڕ دەکرد کە لەسەر زانست وەســـتابوو، واتە لە واقیعدا رەخنەی لە فەلسەفەی هیگڵ دەگرت.

کیر کیگارد، لە زانکۆدا وانەی نەدەوتەوە، وەک ئەوەی هەردوو مامۆســـتاکەی: هیگڵ و شـــیلینگ دەیانوتەوە، چونکە کیر کیگارد لە زەمەنی خۆیدا بە ئەندازەیەکی زۆر دژایەتی دەکرا، بەهۆی ئەوەی بە پێچەوانەی ڕەوتی سەردەمی خۆی دەرۆیشت. بەڵام دواتر کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت، چونکە خەڵکی لەودا یەکەمین فەیلەســوفی بوونگەراییان دەبینی، کە دواتر فەلسەفەی بوونگەرایی دابەش دەبێتە ســـەر دوو ڕەوت یان دوو بەش: بەشــێکیان باوەڕدارەو خۆی سەرۆکایەتیی دەکرد، بەشەکەی دی بێباوەڕ (ئاتەئیست-مولحید) بوو بە سەرۆکایەتیی هایدگەر و سارتەر.

## 5- ئەرنست ڕێنان (1823-1892):

مێژوونوس ئەرنســـت رینان لە ساڵی ١٨٦٣دا کتێبێک دەنووسێت بەناونیشانی «ژیانی یەسوع» کە بەهۆیەوە ناوبانگێکی فراوانی پەیدا کرد، رینان لەو کتێبەدا میتۆدی مێژوویی بەســـەر تێکستە مەسیحییەکاندا پراکتیزە دەکات، دواتر ئەو نووسینانە لە نێوەندی باوەڕدارە مەسیحییە توندڕەوەکاندا ناڕەزاییەکی زۆری لێدەکەوێتەوە، ئەو تێڕوانینە مێژووییەی رینان تیۆلۆژیســـتەکانی دوچاری شۆک کرد.

دەتوانیــن بڵێین لەڕووی فەلســـەفییەوە کتێبی بنەڕەتی رینان بریتییە لــە کتێبی «ئایندەی زانســـت» کە لە ســـاڵی ١٨٤٨دا دیزاینی بۆ کرابوو بەڵام چاپ نەکرا، تا کۆتاییەکانی ژیانی نووسەر کە لە ساڵی ١٨٩٠دا چاپ کرا.

رینان لەم کتێبەدا باوەڕێکی گەورەی بە زانســـت و ئایندەی زانســـت هەیە، پێی وایە زانست لە ئایندەدا دەتوانێت هەموو گرفتەکانی بەشەریەت چارەسەر بکات. بەهۆی زیاد لە پێویست باسکردنی توانای زانســـتی فیزیکی-ماتماتیکی-بایۆلۆجی، هەندێ کەس بە زانســـتخوازێکی پەڕگیر تاوانباریان کرد، هەروەها رەخنەیان لەو وتەیەی گرت کە دەڵێ لە ئەوروپادا زانست بەیەکجاری شوێنی ئایینی مەسیحی دەگرێت. بەڵام ئایا رینان تا ئەو ئەندازەیە هەڵە بوو؟ ئایا ئەمڕۆ ئەو کۆمەڵگایانە نەبوون بە بەهەشـــتی سەر زەمین: واتە کۆمەڵگەی زانســـتی و عەلمانی و مۆدێرن کە پڕن لە ئازادییەکانی تاکەکەس و کۆمەڵ؟

## 6- **ولیام جێمس** (1842-1910):

ئەم فەیلەســوفە لە ســاڵی ١٩٠٧دا کتێبی «فەلســەفەی پراگماتیزم» چاپ دەکات، ئەم کتێبە بەشــدارییەکی کاریگەری کرد لە بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی پراگماتیزم و هەژموونی ئەم فەلسەفەیە لە ئەقڵیەتی ئەمریکیدا.

پوختەی تیۆری ولیام جێمس بریتییە لەوەی کە: بەهای هەر فیکرێک بە ســوودە زانستیەکەی دەپێورێت نەک بەوەی تا چەند ڕاستە یان هەڵەیە. ئێمە ئەمە دەڵێین و دەشزانین کە هەقیقەت لە گۆڕانکارییەکی هەمیشەییدایە و پێدراوێکی ئامادە نییە، مومکین نییە جەخت لە هەقیقەت بکرێت تەنها ئەو کاتە نەبێ کە بتوانێت خزمەت پێشــکەش بە تاک بکات، لە ئاکامی ئەمەشــدا چەندین هەقیقەت یان فرە هەقیقەت، لەیەک کاتدا، لەدایک دەبێت، ئەمەیە پرەنسیپی پلورالیزم (فرەیی).

## 7- **جۆن دیۆی** (1859-1952):

ئەم فەیلەســوفە ئەمریکییە تەمەنێکی زۆر ژیاوە، یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی «سروشتی بەشــەری و رەفتار»ە کە لە ســاڵی ١٩٢٢ چاپی کردووە، جۆن دیۆی لەنێو کەشوهەوای فەلسەفەی پراگماتیزمــدا نێوبانگی دەرکردووەو ڕەوتێکی داهێناوە بەناوی فەلســەفەی کەرەســتەگەری، ئەمە فەلسەفەیەکە پێی وایە مەعریفە کەرەستەیەکە بۆ پرۆسەی زانستی، ئەگەرنا هیچ سوودێکی نابێت. ئەگەر فەلسەفە لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی ژیانی رۆژانەماندا یارمەتیمان نەدات، ئەوا شایستەی ئەوە نییە بۆ ماوەی نیو سەعاتیش خۆمانی پێوە خەریک بکەین.

جۆن دیۆی بەوەش ناســرا کە فەیلەســوفی پەروەردەی ئەمریکییە، هەموو قوتابییەکان لەسەر تیۆری پیداگۆجی پەروەردە بوون کە ئەو تیۆرە کاریگەری و ســەرکەوتنی ســەلماندووە. هەروەها ئەم فەیلەسوفە گەورەیە بەشداریی لە دامەزراندنی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی لە ئەمریکادا کردووە. هەندێ کەس وایدەبینن تیۆری جۆن دیۆی بریتییە لە شۆڕشێکی کۆپەرنیکی لە بواری سایکۆلۆژیا و پەروەردەدا، چونکە بایەخێکی بەرچاوی بەو ژینگە کۆمەڵایەتییە داوە کە مناڵ یان قوتابیی تیادا پەروەردە دەبێت.

## 8- **ماکس هۆرکهایمەر** (1895-1973) و **تیۆدۆر ئادۆرنۆ** (1903-1969):

ئــەم دوو بیرمەندە ئەڵمانییە دامەزرێنەری قوتابخانــەی فرانکفۆرتن، هەروەها خاوەنی کتێبی «دیالێکتیکــی رۆشــنگەری»ن. لە ســاڵی ١٩٤٧دا پێکــەوە کتێبێک چاپ دەکەن بە ناونیشــانی «دیالێکتیکی ئەقڵ»، لەوێدا رەخنە لە ئەقڵی خۆرئاوایی دەگرن کە بووە بە ئامرازێک بۆ هەژموون و کۆنترۆڵکردنی نەک تەنها هەر سروشت، بەڵکو خەڵکیش.

پاشـــان هۆرکهایمەر بە ناونیشـــانی «خامۆشـــیی ئەقڵ» کتێبێک چاپ دەکات و تیایدا دەڵێت ئەقڵ بووە بە ئامرازێکی ماتماتیکیی ساردوســـڕ کە هەموو ئامانجی بریتییە لە قازانج و هەژموون و دەســـەڵات، ئەمەش بنەمای شەڕ و خراپەکارییە لە دونیای هاوچەرخدا. جیهانی سەرمایەداری یان بورژوازی ئەقڵ بۆ رزگاری بەکارناهێنێت، بەڵکو بۆ کۆنترۆڵکردنی کەســـانی دی و بۆ کۆلۆنیالکردن و ســـەپاندنی دەســـەڵات بەکاریدەهێنێت، بگرە ئەو ئەقڵە لەناو خودی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکانیشدا بەکاردەهێنێت بۆ چەوســـاندنەوەی چینی کرێکاران و زەحمەتکێشان بۆ بەرژەوەندیی کەڵەکەکردنی سەرمایەی زیاتر.

دەشـــێت ئەقڵ بۆ چاکەکاری و هەروەها بۆ خراپەکاریـــش بەکاربهێنرێت. رەخنەی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە مۆدێرنەی خۆرئاوایی یەکێکە لە رەخنە هەرەقوڵ و ڕیشـــەدارەکانی رەخنەی هاوچەرخ. بـــەڵام هەندێ کـــەس پێیان وایە ئەمانـــە زیادەرۆییەکی زۆریان کردووە لـــە رەخنەگرتن لە ئەقڵ و ئەقڵانییـــەت، بەڕادەیەک بیرۆکەی ئەقڵیـــان ناچیزە کردووە، بۆ نموونە ئەو رەخنانەی ئاراســـتەی میشێل فۆکۆ دەکرێت بەو پێیەی فۆکۆ هەمان ڕەوتی گرتبوو.

### سەرچاوە:

www.alhewar.org

# ئایدیاڵە سیاسییەکان

برتراند راسڵ
لە عەرەبییەوە: ئەکبەر حەسەن

مـــرۆڤ لە رۆژگارە تاریکەکاندا پێویســـتی بە باوەڕێکـــی بەهێزو هیوایەکی چەسپیوو هەیە، کە ئازایەتییەکی هێمن بەرهەم دەهێنن، ئازایەتییەک کە حساب بۆ ئاســـتەنگەکان ناکات. ئەو ساتانەی ئێســـتا پیایاندا تێدەپەڕین[1]، دڵنیایان کردین لەسەر ئەوەی کە باوەڕمان پێیەتی.. ئەو شتانەی وەک خراپ دەمانبینین، لەڕاســـتیدا خراپن.. بۆمان دەرکەوت ئەو ئاراستانەی دەبێت خەڵک بۆ گەشتن بە ژیانێکی باشتر بیگرنەبەر، پێویستە لەسەر دارو پەردووی جیهان بونیادنرابێت، جەهانێک کە خەریکە بەدەســـتی خۆی خۆی هەڵدەداتە وێرانەوە. دەبینین ئەو مامەڵە سیاســـیانەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا دەیکەن، لەســـەر ئایدیاڵی هەڵە بونیادنراون. هەتا ئەوکاتەش ئەو ئایدیالانە سەرچاوەی کوژانو وێرانکردنو تاوان بن، ئەگەری رزگاربوونیان نابێـــت، مەگەر بە ئایدیاڵی تازە، کە تەواو جیاوازبن لە ئایدیاڵە کۆنەکان.

پێویستە ئایدیاڵە سیاسییەکان لەسەر بنەمای ئایدیاڵە بابەتییەکانی ژیانی تاکـــەکان بونیـــاد بنرێن. چونکە دەبێت ئامانجی سیاســـەت باشـــکردنی ژیانی تاکـــەکان بێت بـــە گونجاوترین رێگا. نابێت سیاســـەتمەدار لە دەرەوە یاخود لە ســـەرەوەی پیاوانو ژنانو مندالان، کە جیهان پێکدەهێنن، بیربکاتەوە. کێشەی سیاســـەت بریتییە لە رێکخستنی پەیوەندی نیوان مرۆڤەکان، بە شێوازێک هەر تاکێک بتوانێت زۆرترین پشکی چاکە لە بوونیدا بەدەست بهێنێت. ئەم کێشەیە

داوامان لێدەکات پێش هەرشـــتێک چاوێک بگێڕین بەو شتانەدا، کە بۆ ژیانی تاک بەچاکی دەزانین. لە ســـەرەتادا دەڵێین ئێمە نامانەوێت مرۆڤەکان هاوشـــێوەی یەکتری بـــن، نامانەوێت ئایدیاڵێکی دیاریکراو دابنێین کە تیایدا هەمووان، ســـەرباری جیاوازییە گروپیەکانیان هاوشێوەی یەکتری بن، چونکە ئەمە ئامانجی ئیدارەیەکی بزێوو ســـەرەڕۆیە. مامۆســـتای خراپ هەوڵـــدەدات بۆچوونەکانی بەســـەر قوتابییەکانیدا بسەپێنیت، لە ئەنجامدا کۆمەڵێک قوتابی بەرهەم دەهێنێت، کە هەموویان هەڵگری یەک وەڵامی سنورداروو تەمومژاوین.

دەربارەی «برنادشۆ» دەڵێن پێی وابووە کە شانۆنامەی (ترۆیلسو کریسدا) باشترین شانۆنامەی «شکســـپیرە». لەگەڵ ئەوەی من هاوڕای ئەم بۆچوونەی «برنادشـــۆ» نیـــم، بەڵام وەک یەکێک لە نیشـــانەکانی تاکگەرایی پیشوازییەکی گەرمی لێدەکەم. زۆربەی مامۆستایان لەم تێڕوانینە نابەوەی قوتابیان نابوورن. ئەم قســـەیە تەنها بەسەر مامۆســـتایاندا پراکتیزە نابێت، بەڵکو بەسەر هەموو کەســـێکی ئاسایی ناو دەسەڵاتیشـــدا پراکتیزە دەبێت کە خوازیارن چالاکیو کاری ژێردەستەکانیان هاوشێوەو لێکچووبن، بەشێوەیەک کە بەئاسانی پێشبینی بکرێنو نەبنە مایەی بێزاری. دەرئەنجامی سەپاندنی ئەم هاوشـــێوەییەش دروســـتبوونی ڕۆتینناتە. دواجار ڕۆحی داهێنانو تاکگەراییەکانیان تیادا دەکوژن. خۆئەگەر ئەمەیان پێ نەکرا ئەوا هەر کاتێک بۆیان بلوێت، گەمارۆیان دەدەن.

ناتوانیـــن ئایدیاڵێـــک بۆ هەمـــووان دابنێین، بەڵکو پێویســـتە هەر تاکەکەســـێک ئایدیاڵێکی دیاریکراوی خۆی هەبێت. لە هەموو کەســـێکدا مەیلی پەرەســـەندن بـــەرەو چاکە یان خراپە هەیەو باشترینو خراپترین ئەگەر لەبەردەمیدا هەیە. ئەوەشی بڕیار لەسەر ئاڕاستەکردنی پەرەسەندن بەرەو چاکـــە یان خراپە دەدات، بارودۆخو ژینگەن. بارودۆخو ژینگەش یان پاڵنەرە خراپەکان پتەو دەکەن، یاخود هەنگاو بە هەنگاو ڕووەو کەناڵی باشتر دەیانگۆڕن.

ســـەرباری ئەوەی ناتوانین بە وردی ئایدیاڵێک دابنێن کە بشێت بەسەر هەموو جیهاندا پراکتیزە ببێـــتو ناتوانین بڵێین دەبێت هەموو مرۆڤەکان چالاکو لەخۆبردوو و فیداکار بن، یاخود شـــەیدای مۆسیقابن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بنەمای گشتی هەیە کە دەکرێت بۆ ئاڕاستەکردنی تواناکانمان بەکاربهێندرێن بە نیسبەت ئەو شتانەوە کە شیاو و خوازراون.

دەشێت جیاوازی لەنێوان دوو جۆر کاڵاو ئەنگێزەدا بکەین، کە هاوتای یەکن. جۆرێک کاڵا هەیە، کە هەموو کەســـێک دەتوانێت بەکاری بهێنێتو ببێتـــە خاوەنی، جۆرێکی دیکەش هەیە کە خەڵک لەنێوان خۆیاندا دابەشی دەکەن. پۆشاکو خواردنی کەسێک، پۆشاکو خواردنی کەسێکی دیکە نییە. ئەگەر دەرامەتەکان بەس نەبوونو بەشـــی هەمووانی نەکرد، ئەوا ئەمە ئاماژەیە بۆئەوەی کەسێک کە دەبێت بە خاوەنی دەرامەت، لەســـەر حسابی کەسێکی دیکە دەبێتە خاوەنی. بەگشتی ئەمە بەسەر کاڵا مادییەکانـــدا پراکتیزە دەبێت. لەلایەکی دیکەوە کاڵا فکریو ڕۆحییەکان موڵکی تاکەکەســـێکی دیاریکراو نین. ئەگەر کەســـێک شـــتێکی زانی، ڕێگەی زانینی ئەو شـــتە لە کەسانی دیکە ناگرێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە بەو زانیاریانەی خۆی یارمەتیان دەدات تا فێری بن، ئەگەر کەســـێک وێنەکێش یاخود شـــاعیرێکی گەورە بێت، نابێتە ڕێگر لەبەردەم وێنەکێشانو شیعرهۆنینەوەی ئەوانی دیکەدا، بەڵکو فەزایەک دەخوڵقێنێ کە زۆرێک لەم مەســـەلانە شیاو دەکات. ئەگەر کەسێک نیازی پاک بوو

بەرامبەر ئەوانی دیکە، مانای ئەوە نییە نیازپاکی ئەوانی دیکە کەمترە. هەتا نیازپاکی لای مرۆڤێک زیاد بکات، ئەگەری ســەوزبوونی لای ئەوانی دیکەش زیاد دەکات. لەم جۆرە مەسەلانەدا موڵکایەتی بوونی نییە، چونکە رێژەیەکی دیاریکراو بوونی نییە تا هەمووان بەشــداری تیا بکەن. زیادبوون لە هەر شوێنێکدا، دەبێتە هۆی زیادبوون لە هەموو شوێنێکدا.

لەسەر ئەم بنەمایە دوو جۆر پاڵنەرمان هەیە، کە بەرامبەر دوو جۆر کاڵان: پاڵنەرە خاوەندارێتییەکان کە ئامانج لێیان بەدەستهێنانو پاراستنی کاڵا تاکەکەسیەکانەو بواری بەشداریکردنیان تیادا نییەو جەخت لەسەر پاڵنەری موڵکایەتی دەکەن. پاڵنەرە داهێنەرانەکان یاخود بونیادنەرەکان کە ئامانجیان دۆزینـــەوەی یاخود ئاســـانکردنی کەڵکوەرگرتنە لەو کاڵایانەی کە موڵکی تاکەکەســێکی دیاریکراو نین.

ژیانـــی باش ئـــەو ژیانەیە کە پاڵنـــەرە داهێنەرانەکان رۆڵێکی گەورەی تیـــادا دەبینن‌و پاڵنەرە خاوەندارێتییەکانیـــش رۆڵێکـــی بچووک دەبینن. ئەمە دۆزینەوەیەکی تـــازە نییە. ئینجیل دەڵێت: گرنگی مەدەن بەوەی چی دەخۆین‌و چی دەخۆینەوەو چی دەپۆشـــین، چونکە بیرکردنەوە لەم شتانە لە بیرکردنەوە لە مەســـەلە گرنگەکان دوورمان دەخاتەوە. ئەوەی خراپە خوگرتنە بە بیرکردنەوە لەم شـــتانە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی کێبڕکێ‌و ئیرەیی‌و زۆر شـــتی خراپی دیکەش کە جیهان گەندەڵ دەکەن‌و بەشـــێوەیەکی تایبەتیش دەبن بەهۆی بەکارهێنانی درندەیانەو زیانبەخشانەی هێز. دەشێت بە بەکارهێنانی توندوتیژی‌و هێز کەلوپەلە مادییەکان بدزین‌و ســـودیان لێوەربگرین، بەڵام ناتوانین بەهەمان رێگا کەلوپەلە رۆحی‌و فکرییەکان بدزین. دەتوانین هونەرمەندێک یاخود بیرمەندێک بکوژین، بەڵام ناتوانین دەســـت بەســـەر هونەرەکەی یاخود بیرکردنەوەکەیدا بگرین. مرۆڤێک دەکوژیت تەنیا لەبەرئەوەی هاوولاتیانی خۆشدەوێت، بەڵام ناتوانیت بەو کارەت خۆشەویستییەکەی (کە بەختەوەری دەکات)، بەدەست بهێنیت. هێز لە بەرامبەر ئەم شتانەدا هیچی پێناکرێت. جگە لە کاڵا مادییەکان، کاریگەری لەسەر هیچ شتێکی دیکە دانانێت. بەمپێیە بۆمان دەردەکەوێت ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەکارهێنانی هێز هەیە، ئەوانەن کە کاڵا مادییەکان فکرو شەهووەتەکانیانی جڵەوکردووەن‌و دەستیان بەسەردا گرتووە.

کاتێـــک پاڵنەرە خاوەندارێتییەکان بەهێزدەبن، ئەوا ئەو چالاکییانەی پێویســـتە داهێنەرانە بن، لاواز دەبـــن. ئەو زانایەی داهێنانێـــک دەکات، لەوانەیە دڵی پڕ بێت لە ئیرەیی بەرامبەر بە زانایەکی دیکە کە داهێنانێکی تر دەکات، ئەگەر زانایەک چارەســـەری شـــێرپەنجەی دۆزیەوە، زانایەکی دیکە چارەســـەری سیلی دۆزیەوە، لەوانەیە یەکێک لەوان خۆشـــحاڵ بێت بە بەدرۆکەوتنەوەی چارەسەری زاناکەی تر، لەبری ئەوەی دڵگران بێت بۆ ئازاری ئەو نەخۆشانەی کە لەوانەبوو چارەسەر بکرێن. لەم حاڵەتەدا زاناکە لەبری گەڕان بەشوێن مەعریفە بۆ خودی خۆی یان بۆ بەرژەوەندی گشتی، بەشوێن ناوبانگدا دەگەڕێت. هەموو پاڵنەرێکی داهێنان لەژێر سێبەری پاڵنەرێکی خاوەندارێتیدایە، تەنانەت ئەو کەسەی دەیەوێت ببێت بە قەشە، دەبێت ئیرەیی بە قەشەیەک ببات کە لە خۆی سەرکەوتووترە. بەزۆری ئیرەیی یاوەرو هاوڕێی هەستو سۆزەکانە، ئەوەش پاڵنەرێکی خاوەندارێتیەو بەسەر پاڵنەری داهێنانەوە مشەخۆری دەکات. لە هەموو ئەمانە خراپتر ئەو ئیرەییەیە کە پاڵ بە کەسێکەوە دەنێت، بۆ رێگرتن لە کەسێکی تر لە وەرگرتنی چێژو ئاڵوگۆری خۆشەویستی لەگەڵ دۆستو ئازیزەکانیدا،

چونکە کەســی یەکەم دۆســتو ئازیزەکانی لەدەست داوەو کەسێکی وەها نزیک شک نابات، کە چێژ لە دۆســتایەتیو خۆشەویســتیەکەی وەربگرێت، بەم هۆیەشەوە پاڵنەری ئیرەیی لا دروست دەبێت. هەڵوێستی پیرەکان بەرامبەر بە گەنجەکان برێکی زۆر لەم ئیرەییەی تیایە.

مرۆڤیش بەهەمان شێوەی ئاژەڵو رووەک پاڵنەری سروشتی تایبەت بە گەشەکردنی هەیە. ئەمە ســەبارەت بە گەشەی عەقڵیو جەستەییش ڕاســتە. وەرزشو خۆراکو هەوای پاک یارمەتی گەشەی جەســتەیی دەدەن، بەڵام جۆرو چەشــنی مامەڵەکردن رێگە لە گەشەی جەستەیی دەگرن کە بووە بەهــۆی بچوکی پێی ئافرەتی چینی، وەک چۆن دەشــێت کاریگەرییــە دەرەکییەکان یارمەتیدەری گەشــەی عەقڵی بن، یاخود رێگربن لەبەردەمیدا. ئەو کارتێکەرە دەرەکییانەی یارمەتی ئەم گەشەیە دەدەن، هانــدانو خۆراکی عەقڵیو هەموو ئەوانەن دەرفەتی بەکارهێنانی توانا عەقڵییەکان فەراهەم دەکــەن، ئەوانەش کە رێگریی لێدەکــەن، ئەوانەن بەهۆی هێزەوە بەکاردەهێنرێن، ســا ئەگەر ئەو هێزە دســپلینکراو بێت یاخود دەسەڵات یان ترس یان ستەمکاری ڕای گشتی بێت، یاخود زەرورەتی پەیوەســتبوون بە کارێکی تەواو نەشیاوەوە بێت. ترسناکترینی ئەم پاڵنەرانە ئەوانەن، کە دەبن بە رێگر لەبەردەم پاڵنەرە ســەرەکییەکاندا، یاخود دەیانشــێوێننو لە جیهانی ئەخلاقیدا خۆیان وەک ویژدان پیشــان دەدەن. ئەم جۆرە کارتێکەرانــە زیانێکی ناوەکی وەها بەمرۆڤ دەگەێنن کە هەرگیز ناگەڕێتــەوە باری ئاســایی خۆی. ئەو کەســانەی درک بەو زیانە دەکەن کە بەهــۆی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە بەوانی دیکە دەگات، هەســت بە بێبەهایی ئەو کاڵایە دەکەن کە دەشێت بەم ئامرازە بەدەســتبهێنرێت، رێز لە ئازادی ئەوانی دیکە دەگرنو نابنە بەربەســت لە رێگەیاندا. لە حکومداندا هێواشو لە هاوســۆزیکردندا خێرانو بەنەرمو نیانییەوە مامەڵــە لەگەڵ هەموو بونەوەرێکدا دەکەن، چونکە بنەمای چاکە لەهەر مرۆڤێکدا بەهایەکی زۆری هەیە. سەرزەنشــتی ئەو کەســانە ناکەن کە هاوشێوەیان نین. دەزانن کە تاکگەرایی سەرچاوەی هەمەچەشنییەو هاوشێوەیی واتا مەرگ. تەمەنای ئــەوە دەکەن مــرۆڤ بونەوەرێکی لەڕادەبەدەر زیندوو و چالاک بێتو بــە کەمترین ڕادە بەرهەمێکی میکانیکــی بێت. بەم هەڵوێستەشــیان مانا بە هەموو تاکێک دەدەن کــە جیهان بێبەزییانە تێکی دەشکێنێ. مامەڵەیان لەگەڵ ئەوانی دیکە پاڵنەرێکی قووڵی رێزگرتنی هەیە.

ئەوەی بۆ تاکەکان تەمەنای دەکەین، ئێســتا ڕوونە: بەهێزبوونی پاڵنەری داهێنەرانە، زاڵبوون بەسەر پاڵنەری خاوەنداریێتیدا، رێزگرتن لە ئەوانی دیکەو رێزگرتن لە پاڵنەرە داهێنەرانە بنەڕەتییەکان لە ناخی خۆماندا. جۆرێک لە رێزلەخۆگرتنو شــانازی سروشــتی پێویستن بۆ ژیانێکی باش. مروڤ ئەگەر بیەوێ بمێنێتەوە، نابێت هەست بە تێکشکانی ناوەکی بکات، بەڵکو پێویستە بوێرو بەهیواو خاوەن بڕیار بێت، بۆئەوەی بتوانێت ژیانێکی شایستە بژیو رووبەڕووی ئاستەنگەکان ببێتەوە، جا ئەگەر ئاســتەنگی دەرەکی بن، یاخود ناوەکی بن. هەتا مرۆڤ زیاتر بەتوانابێت، زیاتر ئەگەرەکانی ژیانی ریالیزە دەکات. ئەمە ئەگەر هاتوو خاوەنی ئەم ســێ شتە بوو: پاڵنەری داهێنەرانە، رێزگرتن لەوانی دیکە، رێزگرتن لە پاڵنەری سەرەکی ناو ناخی خۆی. پێویستە دامەزراوە سیاسیو ئابورییەکان بەهەمان برِی چاکەو خراپە هەڵبســەنگێنرێن کە بۆ تاکەکانی دەهێنن. ئایا زیاتر پاڵنەری داهێنان هاندەدەن یان خاوەنداریێتی؟ ئایا رۆحی رێزگرتن لەنێوان مرۆڤەکاندا بەرجەستە دەکەن؟ ئایا بنەمای رێز لەخۆگرتن دەپارێزن؟ .

سەبارەت بەم مەسەلانە، دەبینین دەزگاکانمان هێندەی دووری زەویو ئاسمان دوورن لەو شتانەی کە پێویستە بیانکەن.

دامەزراوەکان، بەتایبەتی دامەزراوە ئابورییەکان کاریگەری قوڵیان هەیە لە داڕشتنی کارەکتەری تاکەکاندا. لەوانەیە بۆ سەرکێشیو بەهیوابوون هانیان بدەن، لەوانەشە ترسو دڵنیاییان تێدابچێنن. لەوانەیـــە عەقڵی تاکـــەکان بەڕووی ئیمکانیاتی گـــەورەو بەرفراواندا بکەنەوە، لەوانەشـــە جگە لە سەرکێشیکردن لە ڕێگای هاتو نەهاتدا، هەموو دەرگاکانیان بەڕوودا دابخەن. ڕەنگە وا لە بەختەوەری مرۆڤ بکەن، پشتبەســتوو بێت بەوەی تاچەند دەتوانێت زیادەیەک بخاتە ســەر سامانی گشتی لە جیهاندا، یاخود پشت بەستووبێت بەو کاڵا تایبەتیانەی دەتوانێت دەستەبەریان بکاتو ئەوانی دیکە ناتوانن تیایدا بەشــدار بن. ســەرمایەداریی مۆدێرن بڕیاری هەڵەی ئەم ئەڵتەرناتیڤانە دەسەپێنێت بەسەر هەموو ئەوانەی قارەمان نینو بەختێکی باشیان نییە.

پاڵنەرە مرۆییەکان بە کاریگەری ڕێکخستنی ناوچەیی لەلایەکو دەرفەتو ژینگە لەلایەکی دیکەوە، بەتایبەتی ژینگەی بەرایی، پێکدێن. ئامۆژگاریکردنی ڕاستەوخۆ زۆر بە کەمی ئەم پاڵنەرانە دەگۆڕێت. هەرچەندە ئەم ئامۆژگاریکردنە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی ڕێگای گوزارشتکردنی ڕاستەوخۆ لەخۆیان بگرن، هەندێ جار دەبێت بەهۆی چەپاندنی پاڵنەرەکانو دواتر لە فۆرمێکی شێواودا دەردەکەونەوە. کاتێکیش ئەو پاڵنەرانەمان بۆ دەرکەوێت کە حەزمان لێیانە، پێویســتە خۆمان نەدەین بەدەســت ئامــۆژگاریو ڕێنماییکردنەوە، یاخود هەوڵنەدەین تەنیا ڕوخســارە دەرەکیەکــەی بەرهەم بهێنین بەبێ ســەرچاوە ناوەکییەکەی، بەڵکــو هەوڵبدەین دامەزراوەکانمان بەجۆرێــک بگۆڕین کە ژیانی پاڵنەر بە ئاڕاســتەیەکی خوازراودا ببات. دامودەزگاکانی ئێســتامان لەســەر دوو بنەما وەستاون: هێزو خاوەندارێتی. ئەم دوانەش بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە دابەشکراون، هەردووکیشیان لە ژیانی واقعیدا گرنگییەکی گەورەیان هەیە لە دەســتەبەرکردنی بەختەوەری تاکدا. هەردووکیان کەرەستەی خاوەندارێتین، بەبێ ئەوان بەدەستهێنانی کاڵاکان، وەک ئەوەی ئێستا هەیە سەختو دژوارن.

لەڕاســتیدا مرۆڤ بەبێ موڵک ئازاد نییەو لەبەدەســتهێنانی پێداویســتییەکانی ژیانێکی پڕ لە لێکبوردەیــدا دڵنیا نابێت، مرۆڤ بەبێ هێز هیچ دەرفەتێکــی لەبەردەمدا نییە بۆ داهێنان. ئەگەر ویســترا دەرفەت بۆ تاکەکان بڕەخســێنرێت بۆئەوەی پاڵنەرە داهێنەرانەکان دەستەبەر بکەن، ئەوا پێویستە لە هەژاری مادیی ڕزگار بنو بەشی پێویست هێزیان هەبێت، بۆئەوەی لە مەجرای ژیانیانو بارودۆخیانــدا مومارەســەی داهێنانەکەیان بکەن. لە جیهانێکدا کە لەســەر کێبڕکێ بونیادنرابێت، کەمن ژمارەی ئەو کەسانەی کە زیاتر داهێنەرن هەتا موڵکدار. جیهانێک کە زۆربەی خەڵک لەبەردەم ئەگەری بێبەشــبووندان ئەگەر هاتوو بەدەســتهێنانی کاڵا مادییەکانیــان فەرامۆش کرد. جیهانێک کە لەبری حیکمەت ســەروەت دابین دەکات. جیهانێک کە یاسای تیادا بەرجەستە دەبێت، بەڵام لە بەرژەوەندی خاوەندارەکانو ســامانداراەکان. ســتەمی ئەوانەی هەیانە، ڕووبەڕووی ئەوانە دەبێتەوە کــە نیانەو نەدارن. لەم جۆرە ژینگەیەدا دەبینین تەنانەت ئەو کەســانەش کە سروشــت پاڵنەری داهێنانی پێبەخشیوون، ژەهری کێبڕکێ کاریگەریان لەسەر دادەنێت. خەڵک لەپێناو بەدەستهێنانی هێزی زیاتر بۆ دابینکردنی کاڵا مادییەکان لە گروپە گەورەکاندا کۆدەبنەوە. دڵســۆزیش بۆ گروپ خەرمانەیەکی شــێوە ئایدیاڵی بەدەوری پاڵنەری چاوچنۆکیدا بڵاودەکاتەوە. یەکێتی سەندیکاکانو

حزبی کرێکاران[٢] بەهەمان شێوەی حیزبو کەرتەکانی دیکەی کۆمەڵگا لەم خەوشە بەدەر نین، هەرچەندە ئەوەی پاڵیان پێوە دەنێت بۆ کارکردن، هیوایە بە جیهانێکی باشتر. بە زۆریش ئامانجی راستەوخۆی بەدەستهێنانی زۆرترین بڕی کاڵای مادی چەواشەیان دەکات. لەڕاستیدا ناکرێت نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئەم ئارەزووە لەگەڵ دادپەروەریدا دەگونجێت، بەڵام ئەوەی گەورەترو بونیادنەرترە، پێداویستی هەبوونی ئایدیاڵێکی سیاسییە .. ئەمە ئەگەر هاتوو سەرکەوتووەکانی سبەینێ نەیانەوێت چەوسێنەرانی رۆژی دواتر بن، پێویستە ئیلهامو دەرئەنجامەکانی بزوتنەوەی چاکسازی، ئازادیو رۆحی بەخشندە بن، نەک کۆتو بەندو رێکخستن.

سیستەمی ئابووری ئێستا دەستپێشخەری دەداتە دەست ژمارەیەکی زۆر کەمی دەوڵەمەندەکان، بەڵام ئەوانی تر کە سەرمایەدار نین، جگە لە هەڵبژاردنی بەرتەسکی پیشەیەک بۆ مومارەسەکردنی چالاکییەکانیان، هیچ بوارێکی دیکەیان نییە . ئەوان بەشێک نین لەو هێزەی کە ئامێرەکان دەجوڵێنێت، بەڵکو بەشێکی پاسیڤی ئامێرەکانن کە بەبێ ئاگاییەوە دەسوڕێنەوە . سەرباری دیموکراسی سیاسی، هێشتا جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان هێزی ئاڕاستەکردنی خودیی لای سەرمایەدارو نێوان ئەو کەسەی پێویستە بژێوی خۆی پەیدابکات. بەزۆری پەیوەندییە ئابورییەکان زیاتر لە پەیوەندییە سیاسییەکان دەست لە ژیانی مرۆڤ وەردەدەن. لە ئێستادا ئەو مرۆڤەی سەرمایەیەکی نییە، ناچارە هێزو توانای خۆی بە دەزگایەکی گەورە بفرۆشێ، بۆ نمونە کۆمپانیای گەیاندن، بەبێ ئەوەی هیچ دەنگێکی هەبێت لە بەڕێوەبردنیدا، یاخود هیچ ئازادییەکی سیاسی هەبێت زیاتر لەوەی کە سەندیکاکەی بۆی دابین دەکات. خۆ ئەگەر هاتوو خوازیاری جۆرێک لە ئازادی بوو کە بەلای سەندیکاکەیەوە بێنرخە، ئەو کاتە بێتوانا دەبێت، بەوەش هیچ چارێکی نابێت جگە لە خۆبەدەستەوەدان یاخود لە برسامردن.

هەمان شت بۆ پیشەوەرەکانیش راستە . زۆربەی رۆژنامەنووسەکان بۆ ئەو رۆژنامانە دەنووسن کە لەگەڵ بیرو بۆچوونە سیاسییەکانیاندا یەکناگرنەوە . هەرچی دەوڵەمەندیش نەبێت، ناتوانێت ببێت بە خاوەنی رۆژنامەیەکی گەورە، بەڵام بێ سامانەکان تەنیا لەڕێگەی رێکەوتەوە دەتوانن بیروباوەڕەکانیان دەرببڕن. زۆربەی عەقڵە گەورەکانی نەتەوە لە بواری خزمەتگوزارییە مەدەنییەکاندا کار دەکەن، بە جۆرێک، کە ناچارن بێدەنگ بن بەرامبەر بەو هەڵە گەورانەی لەبەرچاویاندا دەکرێت. وەزیر سەرچاوەی بژێوییەکەی لەدەستدەدات، ئەگەر بیرو بۆچوونەکانی لەگەڵ حیزبەکەیدا یەکنەگرێتەوە . ئەندامی پەرلەمان کورسییەکەی لەدەستدەدات ئەگەر دووڕوو نەبێت، یاخود تا ڕادەی پێویست گەمژە نەبێت کە لە هەموو بارودۆخێکدا بکەوێتە دوای ڕای گشتیو هەڵکشان و داکشانەکانی. لە هەموو روویەکی ژیانەوە دەبینین هەتا سیستەمی ئابووری زیاتر گەشەبکاتو تۆکمەتر بێت، سزای سەربەخۆیی بیرورِا تێکشکانو شکستهێنانە . ئایا سەیرە لە بارودۆخێکی وەهادا خەڵک زیاتر ساویلکە بنو ئامادەی ملکەچی بن بۆ ئەو کەسانەی کە فەرمانیان بەسەردا دەکەن؟ ئایا سەیرە دەستبەرداری مافی بیرکردنەوەی خۆیان بن؟ بەم پێیە هیچ رێگاچارەیەک لەبەردەم شارستانیەتدا نییە جگە لە نقومبوون لە چەقبەستنی بیزەنتیدا (مەبەست سەردەمی سەدە تاریکەکانە).

ئەگەرچی ترسان لە هەژاریو بێبەشبوون نابن بە پاڵنەری داهێنان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پاڵنەری سەرەکین کە کرێکاران هاندەدەن بۆ کارکردن. ئارەزووی بەهێزتربوونو دەوڵەمەندبوونی

زیاتر لە هەر مرۆڤێکی دیکە، پاڵنەرێکی بەهێزە لای دەوڵەمەندەکانو کاریگەرییەکی هێندە خراپی هەیـــە کە مرۆڤەکان ناچار دەکات عەقڵیان بەرووی دادپەروەریـــدا دابخەن، بگرە رێگریان لێدەکات دەســـتپاکانەو راستگۆیانە بیر لە پرســـە کۆمەڵایەتیەکان بکەنەوە، هاوکات لە ناخیاندا بەزەحمەت هەســـت بەوە دەکەن کە خۆشیو چێژەکانیان لەسەر نەهامەتی ئەوانی دیکە بونیادنراوە. لەسەر ئەم بنەمایە نابێت نەداریو بێبەشـــبوون هەبێت. ئەو کاتەش ترس لە دەروونی زۆر کەسدا دەرەوێتەوەو هیواو ئاواتیش شێوەیەکی باشتر وەردەگرن لە ژیانی ژمارەیەکی کەمتری خەڵکدا.

بەڵام ئاســـایشو ئازادی جگە لە رووە نێگەتیڤەکەی دامەزراوە سیاســـییە باشەکان، هیچی دیکە نیـــن. ئەگەر بەدەســـتمان هێنـــان، ئەو کاتە رووە پۆزەتیڤەکانیشـــمان دەوێت کـــە هاندانی وزەی داهێنەرانەیە. رەنگە ئاســـایش تەنیا کۆمەڵگایەکی ئارامو سەقامگیر بەرهەمبهێنێت: داوای داهێنان دەکات وەک بەشـــە تەواوکەرەکەی، لە پێناوی زیندووهێشـــتنەوەی گرنگیدان بە ژیانو جوڵان رووەو ئەوەی تازەو چاکە. دەزگا مرۆییەکان ئامانجێکی کۆتاییان نییە، بەڵکو فرە ئامانجنو باشـــتریندیان ئەوەیە کە هانی پێشـــکەوتن بەرەو باشـــتر دەدات. ژیانی مرۆڤایەتی ناتوانێت بەبێ هەوڵدانو گۆڕان بە باشـــی بمێنێتەوە. جیهانی ئێمە جیهانێکی یۆتۆپی نییە کە پێویستە ببێت، بەڵکو جیهانێکە تیایـــدا خەیاڵو هیوا لەوپەری زیندوێتی خۆیاندان. بەڵگەی غەمناک لەســـەر ئەو ماندووبوونەی کە مرۆڤایەتی بە دەســـتیەوە دەناڵێنێت، بوونی بەهەشـــتەکەیەتی بە شوێنێک کە هیچ شتێک تیایدا روونادات‌و ناگۆڕێت. ماندووبوون ئەو وەهمە دەخولقێنێ کە تاکە پێداویســـتی بەختەوەری پشووە، بەڵام کاتێ خەڵک بۆ ماوەیەک پشـــوو دەدەن، بێزاریو وەڕسبوون سەرلەنوێ پاڵیان پێوەدەنێن بۆ چالاکی. ئەگەر ویســـتمان ژیان کەڵکو ســـوودێکی هەبێت، ئەوا دەبێت چالاکییەکانمان داهێنەرانە بێت، نەک هێرشکەرانە یاخود بەرگریکارانە. چالاکی داهێنەرانەش پێویستی بە خەیاڵو رەسەنایەتی هەیە، ئەوە ئەوانیشـــن کە بارودۆخەکان دەگۆڕنو شۆڕش لە دژی هەڵدەگیرسێنن، بەڵام لە ئێستادا دەبینین ئەو کەســـانەی جڵەوی دەسەڵاتیان لەدەستدایە، لە گۆڕانی ئەم بارودۆخە دەترسن: نەوەک ســـامانە ناشـــەرعیەکەیان لە دەست بچێت. ئەو کەسانەی کە لە نەســـەقی باو سوودمەند دەبن، بە رێککەوتن لەگەڵ غەریزە نەریتیەکاندا[٣]، کە خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤو ئاژەڵە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەیە، سیستەمێکیان دامەزراندوە کە هەر لە ساتی یەکەمی چوون بۆ قوتابخانە هەتا ساتی مردن رەسەنایەتیو خەیاڵ دەکوژێت. پێویستە ئەو رۆحیەتە گشتیە بگۆڕدرێت کە پەروەردەی پێ ئاڕاستە دەکرێـــت، ئەوەش بۆ ئەوەی تواناى ئەوە هەبێت منداڵان هانبدرێن بیربکەنەوەو هەســـت بە خۆیان بکەن، نەک ئەوەی بە شـــێوەیەکی نێگەتیڤ بیرو بۆچوونو هەستو سۆزی ئەوانی دیکە وەربگرنو قبوڵی بکەن.

ئـــەوە خەڵاتەکانی پاش پێشـــبرکێ نین کە داهێنان بەرهەم دەهێنـــن، بەڵکو داهێنان بەرهەمی کەشـــێکی فکریو عەقڵـــی قووڵە. رۆژانێک تێپەرین، کە ئەم کەشـــەیان تیادا هەبـــوو، بۆ نمونە رۆژانی پڕ لە ســـەروەریو شـــکۆمەندی یۆنانو ئینگلتەرای سەردەمی شـــاژنە ئەلیزابێس، بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ستەمکاری دامەزراوە نیمچەئامێرییەکان کە لەلایەن کەسانێکی بێباک بەرامبەر بـــە ژیانی ژمارەیەکـــی زۆری خەڵک بەڕێوە دەبرێن، تاکگەراییو ئازادی فکریی دەکوژن یان فشـــار دەخەنە ســـەر مرۆڤ بۆ ســـازانو شکڵگرتن لە بۆتەیەکدا، بە شـــێوازێک کە دەرفەتی گۆڕان نەبێت.

دامەزراوە گەورەکان رەگەزێکی پێویستو ناچاری ژیانی مۆدێرنن. هەر لەبەر ئەوەش بێسوودە هەوڵی تێکشکاندنیان بدەین، وەک ئەوەی ریفۆرمستەکانی وەک ولیام مۆریس(٤) دەیانویست. لەڕاستیدا ئەمە وا دەکات پاراستنی کەسێتی سەخت بێت، بەڵام ئەوەی پێویستە، شێوازی پێکەوە بەستنیانە، بە فراوانترین مەودای دەستپێشخەریە تاکەکەسییەکانەوە. بۆ دەستەبەرکرنی ئەم مەبەستە، هەنگاوێکی گرنگ هەیە، ئەوەش دانانی دیموکراسیەتی حکومەتە لە ناو هەموو دامەزراوەیەکدا، بەڵام ئەوەی لە کاتی ئێستادا تێبینی دەکەین، ئەوەیە کە دامەزراوە یاساییەکان کەم تا زۆرێک دیموکراسین، جگە لە حەقیقەتێکی گرنگ کە دابرانی ژنانە لێیان(٥)، بەڵام هەرچی سیستەمی بەڕێوەبردنە، هێشتا بیرۆکراتیو سیستەمی ئابوری مۆنارکی(٦) یان ئۆلیگاریشە(٧). بۆ نمونە هەموو کۆمپانیایەکی سنوردار، کۆمەڵێک کەسی خۆبەکوێخازان بەڕێوەی دەبەن. هەتا ئەو کاتەی کرێکارانی ناو کۆمپانیاکان بڕیاریان نەبێت لە بەڕێوەبردنو رێکخستنی کۆمپانیادا، شتێک نییە ناوی دیموکراسیو ئازادی بێت بە مانا راستەقینەکەی.

بەخشینی ئۆتۆنۆمی بە گروپە لاوەکییەکان جا ئابووری بن یاخود جوگرافی، پێوەرێکی دیکەیە کە ئازادی شەخسیو هەستکردنی مرۆڤ بەو ئازادییە زیاد دەکات. دەوڵەتی مۆدێرن بەرفراوانو گەورەیەو میکانیزمەکانی بە کەمی فام دەکرێن. تەنانەت ئەو مرۆڤەش کە لە هەڵبژاردنەکاندا مافی دەنگدانی هەیە، هەست ناکات رۆڵێکی کارای هەیە لەو هێزەدا کە پاڵپشتی سیاسەتەکانی دەکات. جگە لە چەند مەسەلەیەک کە دەتوانێت لەگەڵ گروپێکی بەهێزدا کاری تیابکات، هەست دەکات لە بوارەکانی دیکەدا دەستەوەستانە. حکومەتیش وەک حاڵەتێکی دوورەدەستی بابەتیی وایە کە دەبێت وەک بارودۆخی کەشو هەوا بە سادەیی تەحەمول بکرێت. لەوانەیە مرۆڤ بتوانێت بە هاوبەشیکردن لە ئیدارەکردنی دەزگا بچووکەکاندا، هەست بە دەرفەتی شەخسیو بەرپرسیارێتی بکات. وەک ئەوەی کە لە یۆنانی کۆنو رۆمای سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوو.

کاتێک کە لەناو گروپێک خەڵکدا هۆشیاریەکی هاوبەشی بەهێز دەبێت، وەک ئینتیماکردن بۆ بەرەیەک یان نەتەوەیەکی ئاینی، ئەوا خواستی ئازادبوونی ئەم گروپە دێتە ئاراوە، بۆئەوەی خۆی بڕیار لە چارەنوسی خۆی بدات لەو پرسانەدا کە گرنگییەکی بە رووی جیهانی دەرەوەدا هەیە. ئەمە بنەمای جاڕنامەی گەردوونیی سەربەخۆی نەتەوایەتییە، بەڵام ئەوە تەنیا نەتەوەکانن کە مافی ئۆتۆنۆمیان بۆ مەسەلە ناوخۆییەکان هەیە. هاوکات وەک سەرجەمی نەتەوەکانی دیکە، نابێت مافی ئازادی هەڵسوکەوتکردنیان هەبێت لەو مەسەلانەدا کە بۆ نەتەوە بێگانەکانی دیکە گرنگن. ئازادی پێویستی بە ئۆتۆنۆمی هەیە، نەک مافی دەستوەردان لە ئازادی ئەوانی دیکە. ئازادی، تەنانەت لە بالاترین ماناکانیدا بە ئانارشیزم بەدەستناهێنرێت. پێکهاتنەوەو ئاشتەوایی نێوان حکومەتو ئازادی کێشەیەکی گەورەیە، بە جۆرێک، پێویستە هەر تیۆرێکی سیاسی رووبەڕووی ئەم کێشەیە بێتەوە.

جەوهەری حکومەت بەکارهێنانی هێزە لە سنوری یاسادا، بۆ پاراستنی ئەو ئامانجە دیاریکراوانەی خاوەن هێزەکان بە خوازراوی دەبینن. ناچارکردنی تاکێک یان گروپێک بە هێز کەم تا زۆر زیانبەخشە، چونکە ئەگەر حکومەت لەئارادا نەبوو، دەرئەنجامەکەی نائامادەیی هێز نییە لە پەیوەندی نێوان تاکەکاندا، بەڵکو ئەوانەی کە بەهێزن هەموو هێزی ئەنگێزە زیانبەخشەکان بەکاردەهێنن بۆ

کۆیلەکردنی بێهێزەکان. ئەمە حاڵەتی باوی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە کە دەرئەنجامی نەبوونی حکومەتێکــی جیهانییــە. دەرەنجامی ئاژاوەی نێوان دەوڵەتەکان بەســە بۆئەوەی رازیمان بکەن کە ئانارشیزم چارەسەرێکی پێ نییە بۆ کێشەکانی جیهان. لەراستیدا تاکە مەبەستی بەکارهێنانی هێز لەلایەن حکومەتەوە، دەشــێت مەبەستێکی ســوودمەند بێت، کەمکردنەوەی بڕی هێزە لە جیهاندا. ئاشــکرایە قەدەغەکردنی یاساییانەی کوشــتن، بەکارهێنانی توندوتیژی لە جیهاندا کەم دەکاتەوە. کەس ناڵێت باوکان ئازادییان هەیە لە ئازاردانی رۆڵەکانیاندا. بەو پێیەی کەسانێک هەن، دەیانەوێت توندوتیژی لەگەڵ ئەوانی دیکە بەکاربهێنن، ئەوا ئازادییەکی تەواو لەئارادا نییە. یان دەبێت رێگری لەم ئارەزووی توندوتیژییە بکەین، یان لێگەرێین قوربانیان ئازار بچێژن. لەبەر ئەم هۆیە، هەرچەندە تاکەکانو کۆمەڵگاکان ئازادی تەواویان هەبێت لە کاروبارە مرۆییەکاندا، بەڵام ئەم ئازادییە رەهایەیان نییــە لە مامەڵەکــردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. بەخشــینی ئازادی بە بەهێزێک بۆ چەوســاندنەوەی لاوازێک، ئەو رێگایە نییە کە ئازادی لە جیهاندا دابین دەکات. ئەمە بنەمای شۆڕشــێکی کۆمەڵایەتی دژ بە ئازادییە کە هەندێک لەو ئابووریناســانەی بڕوایان بــە بنەمای (لێگەرێ با کاربکات) هەیە، بانگەشەیان بۆ دەکرد.

دیموکراتی لە باشــترین ئــەو رێگایانەیە، بۆ کەمکردنەوەی دەســتێوەردانی حکومەت لە ئازادی هێنراوەتە کایەوە. ئەگەر نەتەوەیەک دابەش بوو بەسەر دوو گروپداو دوو رێگای جیاوازیان گرتەبەر، ئــەوا دیموکراتی-لانی کەم لە ڕووی تیۆریــەوە- رێگایەک بۆ زۆرینە دەکاتەوە، بەڵام دیموکراتی بە تەنیا بەس نییە ئەگەر هاتوو ئاڵوێردی دەسەڵاتی لەگەڵدا نەبێت، چونکە حەزکردن لە هاوشێوەیی یان دەســتێوەردان یاخود رکابەرایەتی چێژە جیاوازەکانو مەزاجە ناچونیەکەکان دەبنە هۆی ئەوەی، زۆرینە لە زۆر مەسەلەدا کەمینە کۆنترۆڵ بکات، لە کاتێکدا لەوانەیە ئەو مەسەلانە هیچ گرنگییەکیان بۆ زۆرینە نەبێت. هیچ کەس لە ئێمەی ئینگلیز حەز ناکات پەرلەمانێکی جیهانی چارەسەری کێشە ناوخۆییەکانی بەریتانیای گەورە بکات (ئەمە ئەگەر پەرلەمانێکی لەو شــێوەیە هەبێت)، ئەگەرچی لەوانەیە پەرلەمانێکی لەم جۆرە کێشــەکان باشــتر چارەســەر بکات لە هەر ئامرازێکی حکومەتیی دیکە.

تیۆری بەکارهێنانی هێزی رەوایی پێدراو لە کاروبارە مرۆییەکاندا، لەو شــوێنانەدا کە حکومەت هەیــە، بــە روونی دەردەکەوێت. پێویســتە هێز دژی ئەو کەســانە بەکاربهێنرێت کە هەوڵ دەدەن هێز بۆ ملکەچکردنی ئەوانی دیکە بەکاربهێنن. یاخود دژی ئەو کەســانەی کە رێز لە یاســا ناگرن، بەتایبەتی ئەو حاڵەتانەی کە بڕیاردانی گشتی پێویستە، یاخود کاتێک کەمینە بەرهەڵستی چالاکی زۆرینــە دەکات. ئەمانە حاڵەتــە رەواکانی بەکارهێنانی هێزن و پێویســتە حاڵەتە رەواکانی نێوان پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکانیش بن.. ئەمە ئەگەر حکومەتێکی جیهانی هەبێت، بەڵام کێشەی حاڵەتە یاســاییەکانی بەکارهێنانی هێز لە غیابی حکومەتدا، کێشــەیەکی جیاوازەو لە ئێســتادا خۆمان لە قەرەی نادەین.

هەرچەندە پێویســتە حکومەت دەســەڵاتی بەکارهێنانی هێزی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین زۆر لە ریفۆرمســتەکان خوازیاری بەرهەمهێنانی کۆمەڵــە دامەزراوەیەکن کە زەرورەتی بەکارهێنانی هێز کەمدەکاتەوە. زۆر لە ئێمە دزی ناکەین، نەک لە ترســی یاســا، بەڵکو لەبەرئەوەی حەزمان لە

دزیکـــردن نییه . مرۆڤ چەندە فێر بێت ژیانی داهێنەرانە بـــژی زیاتر لە ژیانی خاوەندارانە، کەمتر ئارەزووی دەســـتێوەردانی توندوتیژانـــە دەکات لە ئازادی ئەوانی دیکـــەدا. زۆربەی زۆری ململانێی بەرژەوەندییـــەکان کە دەبن بەهۆی ناکۆکی نێوان تاکـــەکانو گروپەکان، وەهمێکی رووتن. دەتوانین بەڕوونی ئەمە ببینین، ئەگەر هاتوو خەڵک ئەو کاڵانەیان ویست کە بواری هاوبەشیکردنی هەمووانی تیایەو ئامانجیان ئەو کەلوپەلە شەخسیانە نەبوو کە دەبن بەهۆی ناکۆکی. هەتا خەڵک زیاتر ژیانی داهێنەرانە بژین، کەمتر ئارەزووی دەســـتوەردان لە ژیانی ئەوانی دیکە دەکەن. زۆر لە مەسەلەکانی ئێســـتا پێویستیان بە دەستێوەردانی گشـــتی نییەو دەکرێت بۆ بڕیاردانی تایبەتی جێبهێڵرێن. لە کۆندا وا باوبوو دانیشتوانی دەوڵەتێک لەسەر یەک ئایین بن، بەڵام دەزانین لە ئێستادا ئەمە پێویست نییە . بۆ نمونە کاتێک غەریزەکانی خەڵک پێگەیشـــتوترو پەروەردەکراوتر دەبن، ئەوا بەشـــێک لەو بیروبۆچوونەی بەسەریاندا سەپاوە، کەڵکو سوودێکی ئەوتۆیان نامێنێت، بگرە زیانبەخشیش دەبن. دەزگا سیاسییە باشەکان بە دوو ڕێگا پاڵنەری هێزو کۆنترۆڵکردن لاواز دەکەن:

یەکەم/ رەخســـاندنی دەرفەتی زیاتر لەبەردەم پاڵنەرە داهێنەرانەکانو پەرەدان بە پەروەردە، بە جۆرێک ئەم پاڵنەرە بەهێز بکات.

دووەم/ کەمکردنەوەی دەرفەتی گوزارشتکردن لە پاڵنەرە خاوەندارێتیەکان. دابەشکردنی دەسەڵات لە هەردوو بواری سیاسیو ئابووریدا، لەبری چڕکردنەوەی لە دەستی فەرمانبەرە گەورەکانو پیاوانی پیشەســـازیدا، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دەرفەتی دەرکەوتنـــی دیکتاتۆرییەت. ئۆتۆنۆمی هەرێمو دەزگاکانیـــش فاکتەرێکی گرنگی کەمکردنەوەی دەســـتوەردانی حکومەتن. کاتێک ســـەرمایەداریو سیستەمی کرێ هەڵدەوەشـــێنەوە، بەدوایدا پاڵنەرە سەرەکییەکانی ترسو چاوچنۆکی دەپوکێنەوە کە هەموو ژیانێکی ئازاد بۆگەنو گەندەڵ دەکەن.

کەمن ژمارەی ئەو کەســـانەی پێیان وایە ئەو خراپانەی کە بەدەســـتیانەوە دەناڵێنین، پێویست نینو دەتوانین بە هەوڵێکی یەکخراو لە ماوەی ســـاڵانێکی کەمدا بەسەریاندا زاڵ بین. ئەگەر لە هەر وڵاتێکی شارستانیدا زۆرینە خوازیاری ئەو شتانە بوون کە ئێمە خوازیارین، ئەوا دەتوانین لە ماوەی بیست ســـاڵدا هەموو هۆکارەکانی هەژاریو نەخۆشـــیو کۆیلایەتی ئابووری ریشەکێش بکەین، کە ٩٠٪ی دانیشـــتوانی جیهانیان گیرۆدەکردوە بەخۆیانەوە . دەتوانین جیهان پڕ بکەین لە بەختەوەریو جوانیو شانشینی ئاشتی جیهانی زامن بکەین. ئەو ئاستەنگەی کە رووبەروومان دەبێتەوە، بەتەنیا ناگەڕێتـــەوە بۆ ئەوەی خەڵک بێباکن، بەڵکو لەبەرئەوەی خەیاڵیان خاوەو بە شـــێوەیەک دەڕواننە سیســـتەمی باو، وەک ئەوەی شـــتێکە پێویستە هەبێتو باوبێت. بەڵام دەشێت بە بوونی نیازپاکیو بەخشندەییو زیرەکی هەموو ئەم شتانە فرێ بدرێنە لاوەو دوور تور هەڵبدرێن.

## پەراوێزەکان:

(١) مەبەستی نووسەر جەنگی جیهانی یەکەمە.

(٢) حزبــی کرێکارانــی بەریتانیا حزبێکی سیاســییەو خــۆی تەرخان کردووە بۆ ریفۆرمــی کۆمەڵایەتیو بەرگریکردن لە بەرژەوەندییەکانی کرێکاران.(و.ک).

(٣) لە ئینگلتەرا بەمە دەڵێن رۆحی گاڵتەجاڕی.

(٤) ولیام ریچارد مۆریس (١٨٧٧-١٩٦٣)بازرگانو چاکســازی بەریتانیە. لە ســەرەتادا پاســکیلی دروست دەکرد، کارەکانی پەرەیان ســەندو بوو بە یەکێک لە پێشــەواکانی خاوەن کارگەی ئۆتۆمبێل. مۆریس هێشتا لە ژیاندا مابوو کە ســامانەکەی پێشکەش کرد بۆ بونیادنانی خەستەخانەو دامەزراوەو پەیمانگاکانی لێکۆڵینەوە، بەتایبەت زانکۆی ئۆکسفۆرد.

(٥) یاســای ســاڵی ١٩١٨ داوای خســتنەناوەوەی ژنانی تەمەن ٣٠ ساڵ دەکات، یاســای ساڵی ١٩٢٨ داوای خستنەناوەوەی هەموو ژنو پیاوێک دەکات کە تەمەنیان ٢١ ساڵ بێت.

(٦)مۆنارکی واتە پاشایەتی.

(٧)ئۆلیگاریشــی ســتایڵێکی حوکمڕانییــە تایبەتە بە حوکمی کەمینــە، یاخود لایەنگیــری ئەم جۆرە حوکمڕانیەیە. (وەرگێڕی عەرەبی.

## سەرچاوە

برتراند رسل: مثل علیا سیاسیة – ترجمة: سمیر عبدة، ١٩٧٩.

# شۆڕشی فەرەنسی
# کە سەری منداڵەکانی خۆی خوارد

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

ئەوەتا فەرەنسا بە خۆیو میللەتو حکومەتو سوپاکەیەوە، لەمرۆدا بە بۆنەی تێپەڕبونی ٢٣٠ ساڵ بەسەر شۆڕشی ١٤ تەموزی ساڵی ١٧٨٩، کە ڕێڕەوی مێژوی فەرەنساو جیهانی پێکەوە گۆڕی، ئاهەنگ دەگێڕن. وەلێ میللەتی فەرەنسا پێش هاتنی ١٤ تەموز دەستی بە ئاهەنگگێڕان کرد، شارەکانی فەرەنساو لادێکانی، گەڕەکەکانی پاریس، گۆڕەپانو چاخانەکانو سەیرانگاکانی، پڕبوون لە هەموو جۆرە خەڵکێکی هەمەڕەنگو هەمە ڕەچەڵەکو لەسەر ئامێری ئۆکۆردیۆنو ئامێرەکانی دیکە، دەستیانکرد بە سەماکردنو گۆرانی وتن. کەوتنە خواردنەوەی شەرابو بینینی تەقاندنی فیشەکە شێتە ڕەنگاو ڕەنگەکان کە ئاسمانی ڕازاندەوەو شێوەیەکی ڕۆمانسی بەخشییە ئەو یادە، ئەمە لە کاتێکدابوو تۆپەکان بەو یادەوە تەقەیان دەکرد.

لە بەرەبەیانی ١٤ تەموزدا، لەسەر ئاستی حکومیو بەشێوەیەکی فەرمی ئاهەنگەکان دەستیپێکرد. شەقامی (شانزلیزێ) پڕبوو لە جەماوەری فەرەنسیو گەشتیاران کە هاتبوون دیمەنی نمایشی سەربازی ببینن، بەتایبەتی دیمەنی نمایشە ئاسمانییەکانی فڕۆکە فەرەنسییەکان. سەرۆک کۆمار «نیکۆلا سەرکۆزی» لەسەر سەکۆی گۆڕەپانەکەو لەنێو میوانانی شەرەفو باڵیۆزە بیانییەکانو وەزیرەکاندا، ئامادەی بینینی نمایشەکان بوو. هند میوانی شەرەفی ئەم ساڵ بوو، تیپێکی سەربازیی لە سوپای هند هاتبوو نمایشی سەربازی پێشکەش

بکات، ئەم تیپە لەپێناو ئەم مەبەستەدا، نزیکەی مانگێک لەووبەر مەشق و ڕاهێنانی لەسەر ئەو نمایشە کردبوو. ئەوە ئاهەنگێکی شکۆدارەو شایەنی ئەم یادەیە، گەرچی فەرەنسییەکان لەمڕۆدا توشی قەیرانی دارایی و کێشەی ناوخۆو نێودەوڵەتی بونەتەوە، وەلێ ئەم یادە خۆشی و شانازی نیشتیمانی لەلای فەرەنسییەکان دەوروژێنێت.

ئەو شۆڕشە مەزنە شایانی شانازیە، نەک تەنها لە فەرەنسادا، بەڵکو لە تەواوی جیهانیشدا. ئەو شۆڕشە توانی دەرئەنجام و شوێنەواری گرنگ لە بوارەکانی فیکر، سیاسەت، کۆمەڵایەتی، لە هەمو دنیادا جێبێڵێت. ڕۆڵی شۆڕش و پاشان هێرشی «ناپلیۆن»، کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر ڕێنیسانسی هاوچەرخی عەرەب هەبوو. هەمومان کتێبەکەی «رفاع الطهطاوي» دەناسین (تخليص الابريز فی تلخيص باريز) کە لە ساڵی ١٨٣٤ بڵاویکردووەتەوە. نوسەر لەو کتێبەدا دروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسی بڵاوکردۆتەوەو دەستوری فەرەنسی و شارستانیەتی فەرەنسی و ئافرەتی فەرەنسی بە نەمر دادەنێت و ستایشیان دەکات. «طهطاوي» پێیوابوو ئەو سیستمەی کە لە شۆڕشی فەرەنسییەوە هەڵقوڵاوەو لەسەر ئیرادەی هاوڵاتیان و بەشداریکردنیان لە حوکمدا دامەزراوە، یاسایەکی عەقڵییەو لەگەڵ ئیسلامدا ناکۆک نییە.

لەڕاستیدا شۆڕشی فەرەنسی خەیاڵی نوسەران و ڕۆماننوسان و شاعیرانی، لە زیاد لە وڵاتێکدا وروژاند. لەوانە ڕۆمانی (چیرۆکی نێوان دوو شار)ی «چارلس دیکنز»و چەندانی دیکەو فیلمێکی زۆریش لەسەر شۆڕشی فەرەنسی بەرهەمهێنراوە. ڕەنگە هەندێ لە خوێنەران ئاگاداری ئەوە نەبن کە لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٤ تەموزی ئەمساڵدا، تەلەفزیۆنی عێراقی مۆسیقای سرودی نیشتیمانی شۆڕشی فەرەنسیان لێدەدا (مارسیلیز). لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە شۆڕشی فەرەنسی، تاڕادەیەکی زۆر تاقە شۆڕشە لە جیهاندا، ئیلهامی بەخشیوەتە ژمارەیەکی زۆری میوزیک زان و ئاواز دانەران، ئەمەش وایکردووە فەرەنسا لەمڕۆدا شانازی بەوەوە بکات خاوەنی ژمارەیەکی زۆری گۆرانی نیشتیمانی و پڕ حەماسەتە کە کاریگەریان بەسەر تەواوی گۆرانییە نیشتیمانییەکانی جیهانەوە هەبووە، بگرە تەنانەت سرودە ناسراوەکەی (ئەنتەرناسیۆنالیزمی) کرێکارێکی فەرەنسی نوسیویەتی. هەروەها ئاشکرایە گۆرانییەکانی شۆڕشی میسری لە پەنجاکاندا، بەشی هەرە زۆری لەژێر کاریگەری ڕیتمی حەماسەتئامێزی شۆڕشی فەرەنسیدا بووە.

وەلێ ئەم خۆشی و شادی و سەمای شەوانەیە، ناتوانێت لایەنی خوێناوی شۆڕشی فەرەنسی بشارێتەوە، ئەو لایەنەی جڵەوی بۆ ململانێی توندو غەریزەی تۆڵەسەندنەوە تا دواهەمین ئاست شلکرد. لە ساتێک لە ساتەکانی شۆڕشدا، پاریس بە تەنها جێهێڵرا، ئیدی خەڵکە ڕەشۆکەکەی لە هەموو کوچەو کۆڵانێکیدا، دەستیانکرد بە بڵاوکردنەوەی پەشێوی و توندوتیژی. ئەمەش بووە هۆی لەسێدارەدانی زیاد لە ١١ هەزار هاوڵاتی بە تۆمەتی دژایەتیکردنی شۆڕش، لەنێویاندا ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی شۆڕشی تێدابوو، لەوانە «دانتۆن»و «ڕۆبسپێر». بەڵام سەرکردەی شۆڕشگێڕ «مارا»، لە کاتی خۆشۆردنیداو لەناو گەرماوەکەی خۆیدا، بە دەستی ئافرەتێک کە ناوی «شارلوت» بوو تیرۆرکرا. لێرەوەیە دروستە شۆڕشی فەرەنسی بە ناوی (ئەو شۆڕشەی منداڵەکانی خۆی دەخوات) ناوببرێت.

لە ڕاســـتیدا شۆڕشی فەرەنسی نمونەیەکی خوێناوی پێشـــکەش بە شۆڕشەکانی دواتر کرد. ئەو شۆڕشانەی دواتر ڕوویاندا، ئەوانیش کەوتنە خواردنی منداڵەکانی خۆیان، چ بە تاک چ بە کۆ. مەیلی توندوتیژی کە شۆڕشی فەرەنسی جڵەوی بۆ شلکرد، تا ئێستاش پاشماوە دەرونیو سیاسییەکەی، بەشێوەیەک لە شـــێوەکان، لە ژیانی سیاسی فەرەنسیدا دەبینرێت، بەڵام بەبێ بەکارهێنانی چەک! بەتایبەتی مەبەستمان لەو شێوازی توندوتیژییەیە کە لە خۆپیشاندانی سەندیکاکانو خوێندکاراندا پەیڕەوی لێدەکرێت. هەروەها مەبەســـتمان لەو ئۆپۆزسیۆنە هەمیشە گرژەیە کە باوەڕی بە گفتوگۆ نییە. بگرە لەوەش زیاتر مەبەستمان لەو شێوازە باوە تازەیەیە کە لە ئێستادا پەیڕەوی لێدەکرێت، شـــێوازی وێرانکردنی هێڵەکانی شەمەندەفەرو هەڕەشـــەکردن لە تەقاندنەوەی ئەو کارگانەی بەهۆی مایەپوچییانەوە (ئیفلاس) داخراون.

شۆڕشـــی فەرەنســـی زنجیرەیەک جەنگی دەرەکـــیو جەنگی ناوخۆیی بەرپاکـــرد کە بوونە هۆی تێکدانو لەقکردنی ئارامیو ئاسایشـــی وڵات، ئەو جەنگانە بەردەوام بوون تا ئەو کاتەی «ناپلیۆنی یەکەم» دەسەڵاتی گرتەدەست. «ناپلیۆن» توانی پابەندبون بە ئامانجەکانی شۆڕشو مسۆگەرکردنی ئەمنو ئاســـایش پێکـــەوە کۆبکاتـــەوە. «ناپلیۆن» بڕوای وابوو ئەمنو ئاســـایش پەیوەســـتە بە دادپەروەریو ئازادییەوە. ئیدی دەســـتی کرد بە داگیرکردنی وڵاتانی ئەوروپاو تەختی پاشـــایەتیو هێزە کۆنزەرڤاتیڤەکانی هێنایە لەرزین. هەرچی هێرشـــەکەی بوو بۆ ســـەر میسرو داگیرکردنی، ئەوا مێژوو دەریخســـت هەندێ لـــە دەرئەنجامەکانی ئەو داگیرکارییە، بریتی بـــوو لە کرانەوەی جیهانی عەرەبی بەڕووی شارستانیەتی ڕۆژئاواداو سەرەتای کاریگەرییەکی پۆزەتیڤ بوو بەو شارستانییەتە، بەتایبەتی دوای ئەوەی «محەمەد عەلی» دەســـتیکرد بە ناردنی شاندی خوێندن بۆ فەرەنسا، بگرە کارێکی تازەگەری بوێرانەو زۆر گرنگی ئەنجامدا، ئەویش ئەوەبوو چاپخانە عەرەبییەکەی لە ڤاتیکان وەرگرتو هێنایەوە بۆ میسر. وەک ئەوەی لە ئینسایکلۆپیدیای (بریتانیکا)دا باسیلێوەکراوە.

## شۆڕشی فەرەنسی چۆن ڕوویداو بۆچی ڕوویدا؟

ســـەبارەت بە هۆکارەکانی ڕودانی شۆڕشـــی فەرەنســـی، بیروڕاو لێکدانەوەیەکی زۆر هەیە. وەلێ دەتوانین بڵێین بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی، دەرئەنجامی کۆمەڵێ هۆکاری بەناویەکداچوی ئاڵۆزەو ئەو هێزانەی شۆڕشـــیان بەرپاکرد، هێزگەلێکی چونیەک یان لەیەکچوو نەبوونو سەرکردایەتییەکی یەکگرتویان نەبوو. بگرە دەکرێ بڵێین ســـەرەتای دەستپێکردنی شۆڕش، سەرەتایەکی هەڕەمەکیانە یان نیمچە هەڕەمەکیانە بوو. بارودۆخی بەرپاکردنی شـــۆڕش بە تەواوی ســـازو ئامادەبوو، ئەویش بەهۆی بێزاری کەڵەکەبووی خەڵکی لە هەژمونی کڵێســـا بەسەر فیکرو کۆمەڵگاوە. بێزاری خەڵکی لە ئاراســـتەکانی ئیشـــکردنی دەســـەڵات. بێزاری خەڵکی لە خـــاوەن زەوییە ئەرســـتۆکراتەکان کە جوتیارەکانیان تەواو چەوســـاندبووەوەو نابوتیان کردبوون، هەروەها ئەو ئەرستۆکراتانە بۆ چاکردنی بارودۆخی خراپی ئابوریو دارایی، ملیان بۆ هیچ ڕێوشـــوێنێکی پاشـــایەتی نەدەدا، بەوەی بڕێک لە باج بدەن. لە شارەکانیشـــدا بۆرجوازیەتی بچوکو کرێکارەکان، پەلەیان بوو بۆ باشترکردنی ئاستی

گوزەرانـــی ژیانیان. هەرچـــی چینی بۆرجوازیەتی مام ناوەندی بوو، چـــاوی بڕیبووە ئەوەی ڕۆڵێکی ســـەرەکیان هەبێت لە بەڕێوەبردنی وڵات، بۆیە بانگەشەی چاکســـازییەکی ڕیشەییان لە حکومەتدا دەکرد.

دەرکەوتنی کۆمەڵێ فەیلەســـوفو بیرمەنـــدی گەورەی وەک: «ڤۆڵتێر»، «ڕۆســـۆ»، «دیدرۆ»، «مۆنتســـیکیۆ» کە داوای جیاکردنەوەی دەســـەڵاتەکانیان دەکرد، ڕێگایان بۆ بەرپابونی شـــۆڕش خۆشـــکرد. بیرورای ئەو کەسە مەزنانە بیرورایەکی ڕیفۆرمخوازانەو ڕۆشـــنگەرانە بوو. بەتایبەتی ئـــەوان داوای ئازادی بیروراو ڕێزگرتن لە ئـــازادی بیرورای بەرامبەریان دەکرد، ڕەخنەیان لە هەژمونی کڵێســـا دەگرت. جگە لەوە شۆڕشی فەرەنسی سودی لە فیکری بیرمەندو فەیلەسوفانی ئینگلیزیش وەرگرت، لەوانە بانگەشـــەکەری لێکبوردن «جۆن لۆک»و «میلتۆن»ی شـــاعیر کە پاڵەوانی ئازادی بڵاوکردنەوەو ئازادی گوزارشـــتکردن بوو، لەگـــەڵ «تۆماس هۆک»و چەندانی دیکە. هەروەها هەردوو شۆڕشی «کرۆمێل»ی ئینگلیزی ساڵی ١٦٤٥و شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمریکا بە ڕابەرایەتی «جۆرج واشـــنتۆن» ســـاڵی ١٧٧٦-١٧٨٣، کاریگەریان لەســـەر فیکری ڕۆشـــنبیرانی فەرەنســـاو سیاسییە بۆرجوازییـــەکان هەبوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو فەرەنســـییەکان لەژێر ســـەرکردایەتی «لافایت»دا بۆ خۆیان بەشـــداربوون لە شۆڕشـــی ســـەربەخۆیی ئەمریکادا. هەرچی شۆڕشی «کرۆمێل» بوو کە لە ئینگلتەرە پاشـــای لەناوبردو لە شوێنیدا سیســـتمێکی کۆماری ڕاگەیاند، ئەویش کاریگەری بەسەر فەرەنسییەکانەوە هەبوو، فەرەنسییەکان کەوتبونە ژێر کاریگەری مەیلی ئازادانەو پەرلەمانخوازیانەی «کرۆمێل»ەوە، یاخود کەوتبونە ژێر بانگەشەی دامەزراندنی سیستمێکی کۆمارییەوە.

بەڵام لە فەرەنســـاو لە ســـاڵی یەکەمی بەرپابونی شۆڕشدا، سیستمی کۆماری نەهاتەدی، بەڵکو سیستمی پاشایەتی مایەوە، وەلێ پابەندبوو بە دەستورو بە ئەنجومەنی نیشتیمانییەوە، تا ئەوکاتەی ســـەری پاشا لێکرایەوەو لە نێوان ساڵانی ١٧٩٢-١٧٩٣ سیستمی کۆماری ڕاگەیەندرا. دواتر سیستمی کۆماری فەرەنسا، لە ساڵانی داهاتودا ڕوبەڕوی زنجیرەیەکی بەردەوام لە پەشێوی بووەوە. پاشایەتی زیاد لە جارێک گەڕایەوە، وەلێ دواجار سیســـتمی کۆماری فەرەنســـا توانی ڕەگ داکوتێو تاکو ڕۆژی ئەمڕۆمان بمێنێتەوە.

جیاوازیی نێوان فەرەنساو بەریتانیا ئەوەیە، سیستمی کۆماری «کرۆمێل» زۆر زوو بۆ هەتاهەتایە شکســـتی هێناو سیستمی پاشـــایەتی کە لە میللەتەوە نزیک بوو گەڕایەوەو جێگیربوو، بەڵام ئەم سیستمی پاشـــایەتییە پابەندی دەستورو سیســـتمی پەرلەمانی دیموکراتییە. جیاوازی نێوان ئەم دوو ئەزمونـــە، بریتییە لە جیـــاوازی نێوان بارودۆخی ئەم دوو کۆمەڵگایەو تێڕوانینی خەڵکەکەیانو دابونەریتیان.

سیاسەتمەدارە بۆرجوازییەکانی فەرەنسا، توانیان پێکهێنانی ئەنجومەنێکی نیشتیمانی بسەپێنن، ئەم ئەنجومەنە توانی لە قۆناغەکانی سەرەتای شۆڕشدا، واتە لە ١٧٨٩-١٧٩١ کۆمەڵێ بڕیار سەبارەت بە نەهێشـــتنی ئیمتیازاتی ئەرســـتۆکراتەکانو دەستبەســـەراگرتنی زەویوزاری کڵێساو لەناوبردنی هەژمونی کڵێســـاو جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت دەربکات. لـــە هەمانکاتدا جاڕنامە بەناوبانگەکەی مافەکانـــی مرۆڤو هاوڵاتیبوونی دەرکرد. جگە لەوە بـــۆ تازەکردنەوەو نۆژەنکردنەوەی وڵات، کۆمەڵێ هەنگاوی گرنگـــی نا، گەرچی لەلایەن هێزە کۆنزەرڤاتیڤەکانو جموجوڵی دەرەکیو ناوەکیی نەیارەوە

ڕکابەرایەتی دەکرا. هەر ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی لە ســـاڵی ١٧٩٢، فەرەنسا ڕووبەڕووی زنجیرەیەک بێتەوە جەنگ لەگەڵ نەمساو بروسیادا.

شۆڕشـــی فەرەنســـی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی، گرنگترینیان قۆناغی یەکەم بوو. دواتر چەند قۆناغێکی دیکە هاتن، تێیدا ملی پاشاو شاژنی بێتاوان»ماری ئەنتوانێت»و سەدانی دیکە لێکرایەوەو سیستمی کۆماری ڕاگەیەندرا. پاشان (حوکمی تیرۆر) دەستپێدەکات کە یەعقوبییەکان هێنایانەئاراو «ڕۆبســـپێر» بەخێرایی ئەوەی قۆستەوەو خستییە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. وەلێ «ڕۆبسپێر» دوای ئـــەوەی هاوڕێ هـــەرە نزیکەکانی خۆی ناردە ژێر ئەو ئامێرە دۆزەخییە (مەقســـەڵە)، خۆشـــی بە هەمان ئامێر کۆتایی بە ژیانی هات. (سەردەمی تیرۆر) تەنها یەک ساڵی خایاند، وەلێ ساڵێک بوو خوێنڕشتن تێدا وەک تاڤگە دەهاتەخوار.

«مـــاری ئەنتوانێت» بە ئاســـانی بووە قوربانی ئەوانەی بە تۆمەتـــی ناپاکی تۆمەتباریان کرد، کەچی دەرکەوت ئەو تۆمەتە تۆمەتێکی ناڕاســـتو نادروستە، لە ئێستادا فەرەنسییەکان پەشیمانن لەوەی بەرامبەر ئەو خانمە ڕوویداوە. جەماوەر لە ســـاڵی ٢٠٠٦ بە پەرۆشو خۆشحاڵییەوە پێشوازیان لەو فیلمە کرد کە دەربارەی «ماری ئەنتوانێت» بوو، «سۆفیا کۆبۆلا» ڕۆڵی «ماری ئەنتوانێت»ی بینی، لەو فیلمەدا «ماری ئەنتوانێت» وەک ئافرەتێکی سەردەمیانەو باشو بەسۆزو دڵنەرم بەرامبەر بـــە منداڵەکانی دەردەکەوێت. گۆڤاری (لن بوان)ی هەفتانە، ئەم ناونیشـــانەی خوارەوەی لەســـەر بەرگەکەی دانابوو: (ماری ئەنتوانێتو پەشیمانبونەوەی فەرەنسا).

شۆڕشی فەرەنسی بەوەی کۆمەڵێ دەستپێشخەری لە بواری پیشەسازیو بازرگانی تایبەتدا کرد، بەوەی هەســـتا بە تازەکردنەوەی کەرتی پیشەســـازیو ئاوەدانکردنەوە، شۆڕشـــێکی بۆرجوازی بوو، بەڵام ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتیشـــی وەرگرت، ئەویش لە ڕێگـــەی ئەوەی بووە نوێنەری داواکارییەکانی جوتیارانو بۆرجوازیەتی بچوکی شارەکان. هەروەها شۆڕشی فەرەنسی شۆڕشێکی عەلمانی بوو، وردە وردە بنەماکانی سیســـتمێکی عەلمانی چەسپاند، تا لە ســـاڵی ١٩٠٥ یاسای جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەتی دەرکرد. هەروەها شۆڕشـــێکی لیبرالیش بوو، بەو مانایـــەی باوەڕی بە ئازادی تاک هەبوو، ڕێزی لە موڵکیەتی تایبەت دەگرت.

لەمـــڕۆدا ناکرێت بڵێین هەموو سیاســـەتمەدارە فەرەنســـییەکان، بە شـــێوەیەکی ڕاســـتەقینە پرنســـیپەکانی شـــۆڕش جێبەجێ دەکەن. هەرچی چەپو ڕاســـتی توندڕەوە، ئەوا ڕقیان تەنانەت لە وشـــەی لیبرالیەت دەبێتەوە. هەندێکی دیکە پێیان وایە لە ئێستادا عەلمانییەتی فەرەنسا، لەلایەن فێندەمێنیتالیســـتی ئیســـلامییەوە، لەلایەن بانگەشـــەکەرانی بڵاوکردنەوەی پەچەو لەچک لەسەر خاکی فەرەنســـاو بردنی حیجـــاب بۆ ناو قوتابخانە گشـــتییەکانو دنەدانـــی کەمکردنەوەی ئازادی فیکرو بڵاوکردنەوە، هەڕەشـــەی لێدەکرێت. ئەوانە چ لە فەرەنساو چ لە تەواوی دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا، بەشێوەیەک هەڵسوکەوت دەکەن وەک ئەوەی خاکی ئەو وڵاتانە خاکی کافربێتو حەڵاڵیانە چی تێدا دەکەن بیکەن.

تاکی فەرەنسی شانازی بە شۆڕشـــی فەرەنسییەوە دەکات، چونکە سێ پرنسیپی جێگیرکرد کە هەنوکە کۆمەڵگای عەلمانی فەرەنســـای لەسەر بونیادنراوە، ئەوانیش بریتین لە: یەکسانی، برایەتی، ئازادی. «فیکتۆر هیگۆ» ئەو هەســـتی شـــانازیکردنەی تاکی فەرەنســـی بەم گوزارشتەی خوارەوە

کورتدەکاتەوە کە لە ڕۆمانە ناودارەکەیدا (بێ نەوایان) هاتووە: (مەترانی گەورەم.. دادپەروەری توڕەبونی هەیە .. توڕەبونی دادپەروەری ڕەگەزێکە لە ڕەگەزەکانی پێشکەوتن. شۆڕشی فەرەنسی، بەدەر لە هەموو ئەو شتانەی لەبارەیەوە وتراوە، لە ساتەوەختی هاتنی مەسیحەوە، گەورەترین هەنگاوە مرۆڤایەتی بەرەو پێشەوە ناویەتی. هەنگاوێکی ناتەواوە، با ناتەواوبێت! وەلێ هەنگاوێکی جوانە . هەموو شتە شاراوەکانی کۆمەڵگای خستە بەرچاو. عەقڵەکانی جوانکرد، هێمنیو ڕۆشنگەریو دڵنەوایی بڵاوکردەوە . وایکرد لێشاوێکی شارستانیەت بەڕوی زەویدا هەڵقوڵێت. شۆڕشێکی باش بوو. شۆڕشی فەرەنسی سەرکەوتنی مرۆڤایەتییە).

## سەرچاوە:

ئیلاف، سێشەممە ٢٠٠٩/٧/١٤

# "میشێل فۆکۆ" و ئارکیۆلۆژیای مۆدێرنە

هاشمساڵح
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## 1- چینە جیۆلۆجیەکانی فیکری مرۆڤایەتی:

کاتێـــک باس لە ئەقڵانیەتی خۆرئاواو نوێگـــەری خۆرئاوا دەکەین و تەنانەت پێشیان سەرسام دەبین، پێویستە ئەوەمان لە بیر نەچێت کە خۆرئاوا ماوەیەکی دوورو درێژ لە ناو سســـتمێکی میتۆلۆژی و ڕەمزیـــدا ژیاوە. ئەمەش لە هەموو شوێنێکدا ڕوودەدات، بەڵام تاکە جیاوازیەک لە نێوان خۆرئاواو ناوچەکانی دیکەی جیهانـــدا هەبێت، ئەوەیە کە خۆرئاوا توانی لە ســـەدەی حەڤدەهەمەوە (واتە لە ســـاتەوەختی دیکارتەوە)، خۆی لەو سستمە میتۆلۆژیە قوتار بکات. پاشان ئەم پرۆســـەیە زیاتر ڕەگی داکوتاو تاوای لێهات لە ســـەدەی هەژدەهەمدا (سەردەمی ڕۆشنگەری)، دابڕانێکی ڕاستەقینەی دروست کرد. لێرەوە ئیتر خۆرئاوا قەڵەمبازی گەورەی داو ئەو سســـتمە ئەقڵانی و زانستیەشی گەیاندە ئەو ئاستەی ئەمڕۆکە دەیبینین. بەمجۆرە ئەفســـون و میتۆلۆژیا لە جیهانی خۆرئاوادا کشـــانەوە، بۆ ئـــەوەی دیدگایەکی ئەقڵانی و ماتماتیکی ساردوســـڕ جێگەیـــان بگرنەوە. ئەم گۆڕانە بە چەشـــنێک ڕویدا، خۆرئاوای ئێســـتا ناتوانێت بیر لـــەوە بکاتەوە کە سســـتمی میتۆلۆژی کۆن، ڕۆژێـــک لە ڕۆژان هەبووە و لـــە چوارچێوەیدا بیری کردۆتەوە. لەبەرئەوەی سێ سەدەی لە پرۆسەی ئەقڵانیەتی سستماتیک لەسەری کەڵەکەبووە و بووە بە ژێرەوە. لێرەوە پێویستە لەسەر مێژوونوسی فیکر دەست بـــە پرۆســـەیەکی هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی بکات، بۆ ئەوەی دەســـتی بگاتە ئەو

سســـتمە کۆنە و نیشـــانی خەڵک و خوای بدات. ئەمە حاڵی خۆرئاوایە، بەڵام لای ئێمە مەسەلەکە تەواو جیاوازە.

هەر بۆیە ئێمە ناچارندین هەوڵێکی زۆر بە خەرج بدەین تا بگەینە ئەو سستمە ڕەمزی و میتۆلۆژیە بۆ ژیانکردن و بۆ ســـەیر کردنی جیهان، لەبەر ئەوەی ئەو سســـتمە تا ئێستا بەسەر- ئەگەر نەڵێم ڕۆشـــنبیران-، ئەوا بەســـەر بیرکردنەوەی زۆرێکی زۆری خەڵکی ئێمەدا زاڵە. نابێت ئەو تازەگەریە ڕوکەشـــەی خواستومانە فریومان بدات. ئەوانەی لای ئێمە لافی نوێخوازی لێدەدەن، ڕەنگە لە هەموو کەس زیاتر لە مۆدێرنە بێئاگابن. مۆدێرنە جلێک نییە کەی ویســـتمان بیپۆشـــین و کەی ویستمان فرێـــی بدەین، بەڵکو بەرەنجامی ململانێیەکی تاڵ و درێژی مرۆڤە لەگەڵ خودی خۆیدا بۆ ئەوەی لە ناخەوە بگۆڕێت. ئەگەر مۆدێرنە شتێکی حازر بەدەست بوایە و بخواستراییە، ئەوا لە چاو تروکانێکدا هەموو دنیا دەبووە مۆدێرن و نوێ دەبووەوە. ئەگەر مۆدێرنە هەروا بە ئاســـانی دەسگیر بوایە، ئەوا زوو بە زوو دەبوینە مۆدێرن و تازەگەر.

تازەگەری ڕاستەقینە لە ڕێی تیرۆرکردنی ڕابردوو و بازدان بەسەر واقیع و مێژوودا مەیسەر نابێت، یان بەوە نابینە مۆدێرن کە شەرم لە کەلەپوور و مێژووی ڕابردومان بکەین و خۆمان لە ناو مێژووی بێگانااندا بتوێنینەوە، بەڵکو بەوە دەکرێت کە شـــەڕێکی ڕاشکاوانە و ڕاستەقینانە لەگەڵ کەلەپوور و خودی مێژویی خۆماندا دەســـت پێبکەین. ئەمەش شـــەڕێکی سەخت و گرانە و ماوەی سێ سەدەی لـــە ئەوروپیـــەکان برد، ئیتر بۆچی دەبێت داوا لە ئێمە بکرێت کە لە ماوەی ســـێ دەیەدا ئەنجامی بدەین؟ بۆ لەم پرۆســـەیەدا پەلەمان لێدەکەن: تۆ بڵێی بیەناوێت بە فیعلی نوێمان بکەنەوە، یاخود ویســـتیان وایە سەرمان لێ بشـــێوێنن، بۆ ئەوەی نەزانین چۆن لەسەر ڕەوتی خۆمان بەردەوام بین و چ ڕێگایەک دەگرینە بەر؟

بەمجۆرە دەبینین پرســـی مۆدێرنە، لە هەلومەرجێکی زۆردژواردا یەخەمان دەگرێت. هەلومەرجی دژواری ناوخۆ و فشاری زۆری دەرەکی. هۆکارە دەرەکیەکان کاریگەری زۆریان لەسەر باروودۆخی ئێمە هەیە. من لێرەدا نامەوێت لەبەرپرســـیارێتی هۆکارە ناوەکیەکان کەم کەمەوەو هەموو خەتاکە بخەمە ئەستۆی دەرەوە، نەخێر، بەڵام ئەم کارە لە پێناو ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنەدا دەکەم، کە بڕێکی زۆر لە ئینسانیەت و بەهاکانی سەرەتای هاتنی لەدەستداوە. وەکی ئاشکراشە ئەمڕۆ لەسەر ئاستێکی بەرفراوان لەلایەن بیریارانی خۆرئاوا خۆشـــیانەوە (بەتایبەت بیریارە ڕۆشنگەر و لیبرالەکان)، ڕەخنەیەکی زۆر لە مۆدێرنە دەگیرێت. ڕەنگە لە ئێستادا بابەتی ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە، گرنگترین مەسەلەیەک بێت کە ناوەندە ڕوناکبیری و فیکریەکانی خۆرئاوا پێیەوە سەرقاڵ بن. وەک نمونەیەکیش دەتوانین باس لەمانـــە بکەین: (قوتابخانەی فرانکفۆرت و یۆرگن هاپرماس لە ئەڵەمانیا، میشـــێل فۆکۆ و ڕینێیە دیمۆن و کاستۆریادیس و ئالان تۆرین لە فەرەنسا، ڕیچارد ڕۆرتی و جۆن ڕۆڵس لە ئەمریکا).

ئێمـــە دەبێـــت بزانین مۆدێرنە هەمووی خێـــر و بێر نیە و بێ کەموکوڕی نییە. پێویســـتە ئەو دیدگا مێژوویی و بەپیرۆزکردنە بۆ مۆدێرنە کۆتایی بێت و دیدگایەکی ڕیالیتی و مێژویی شـــوێنی بگرێتەوە. من کە ئەم قســـانە دەکەم بۆ دژایەتیکردنی مۆدێرنە نیە و بۆ ئەوەش نییە لەو پرۆسەیە هەڵبێین و پشـــتی تێبکەین. مۆدێرنەش وەکی هەندێک لای ئێمە باســـی دەکەن مانای پاکتاوکردنی ئایین نییە، بەڵکو تەنها ڕاماڵینی تێگەیشـــتنی تایفەگەری و مەزهەبیانەیە بۆ ئایین. ئەمەش ئەوە

دەگەیەنێت کە پێویستە نوێبوونەوە، فیکری ئایینیش بگرێتەوە.

کەواتە ئێمە لێرەوە داخڵ بە پرۆسەیەک دەبین کە دەشێت ناوی بنێین (ئارکیۆلۆژیای مۆدێرنە)، بۆ ئەنجامدانی ئەوەش هەر لە سەرەتاوە ناچارین جیاکاری لە نێوان نوێگەری ئیسلامی و نوێگەری ئەوروپیدا بکەین، واتە لە نێوان هەڵکۆڵینی ئەپستمۆلۆژی لە فیکری ئیسلامی لەگەڵ هەڵکۆڵینی ئەپستمۆلۆژی بۆ فیکری ئەوروپی. هەڵکۆڵینی ئەپستمۆلۆژی جیاوازە لە هەڵکۆڵینی سیاسی و مێژوویی بۆ فیکر، چونکە ڕەنگە ڕۆژگار و بنەماڵە فەرمانڕەواو سستمە سیاسیەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەڵام فیکر وەکی خۆی بمێنێتەوەو نەگۆڕێت. لێرەوە دابەشکردنی سیاسی قۆناغە مێژوویەکانی وەک: (سەردەمی ئەمەوی و سەردەمی عەباسی و سەردەمی سەلجوقی و سەردەمی قەیران و تاریکی و..هتد)، ڕەنگە پێویستی بە چاو پێداخشانەوە هەبێت، لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەڵکۆڵینە ئەپستمۆلۆژیە تازەیەدا.

هزری ئێمە تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە لە فەزای بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست نەچوو بووە دەرێ، بیرکردنەوەیەک کە لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا باڵادەست بوو. من کە ئەمەش دەڵێم پێموایە ناونانی سەدەکانی ناوەڕاست جۆرێک ناهەقی تێدایە، بە تایبەت بۆ ماوەی ئەو شەش سەدەیەی سەرەتای تەمەنی شارستانیەتی ئیسلامی کە قۆناغی ئەفراندن و بەرهەم هێنان بوو، چونکە ناکرێت ئەم قۆناغە بە قۆناغی دواتر بەراورد بکرێت کە سەردەمی خۆ دوبارە کردنەوەو پاشە کشێ و کاوێژکردن بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو قۆناغە پڕ داهێنانە مەزنە، سەر بە ئەپستمۆلۆژیای ئەقڵی مۆدێنە، لەبەرئەوەی نە کیمیای «جابر بن حەیان» کیمیای ئەم سەردەمەیە و نە پزیشکیی «ئیبن سینا» پزیشکیی ئێستایە و نە فەلسەفەی «ئیبن ڕوشد» فەلسەفەی ئەمڕۆمانە، تەنانەت ئەو سۆسیۆلۆژیایەشی «ئیبن خەلدون» هێنایە ئارا، ناکرێت لە دوری دوریشەوە بە کۆمەڵناسی «دۆرکهایم» یان «ماکس ڤیبەر» یاخود «کارل مارکس» بەراورد بکرێت.

ئێمە کە ئەمە دەڵێین گومانمان لە مەزنی «ئیبن خەلدون» و «ئیبن ڕوشد» و گەورە بیریارانی دیکەی مێژوی ئیسلام نییە، بەڵام هەر بیریارێک چەندێ بلیمەت و مەزنیش بێت، ناتوانێت لەسەردەمەکەی و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و مەعریفی قۆناغی خۆی بەتەواوەتی داببڕێت. هاوکات ئامرازەکانی مەعریفە لە سەردەمی کلاسیکدا، بەراورد بە ئامرازەکانی مەعریفەی ئەمڕۆ، زۆر سەرەتایی دێنە پێش چاو.

بێگومان فەزای بیرکردنەوەی مۆدێرنە، تەواو جیاوازە لە فەزای بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست.. هەرچەندە هەڵوێستی «ئیبن ڕوشد» لە کاتی خۆیدا تازەگەرانە بوو، بەراورد بە هەڵوێستی پیاوە ئایینیە دۆگماکان، کتێبەکەشی (فصل المقال فيما بين الشريعة و الحكمة من الاتصال) چاکترین بەڵگەیە[1]. دەکرێت هەمان شتیش دەربارەی «الجاحظ و التوحيدي و المعري و الرازي»یش بڵێین.. بەڵام ئەمانە بۆ سەردەم و زەمانی خۆیان تازە بوون، نەک بۆ ئێمە. بۆ نمونە «الجاحظ» لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا ژیاوەو ئێمە ئێستا لە سەدەی بیست و یەکدا دەژین، واتە ماوەی نێوانمان هەزار و سەد ساڵێک دەبێت، ئەمەش بایەخی خۆی هەیە. واتە بیریارێکی مۆدێرن لە ئێستادا مەسافەیەکی زۆر لە «الجاحظ»ەوە دوورە.

ئێمە دەبێت بزانین مۆدێرن هەڵوێســـتە لە بوون و کرانەوەیە بەســـەر ژیاندا. لە هەموو سەردەم و ڕۆژگارێکیشـــدا، لە بیریارێکدا یان لە چەند بیریارێکدا بەرجەستە دەبێت. لێرەوە دەکرێت بڵێین «الجاحـــظ» لە کاتی خۆیدا مۆدێرن بووە، وەک «تەها حســـین»یش لە ســـەردەمی خۆیدا تازەگەر بووە، هەمان شـــت بە نیســـبەت «ڤۆڵتێر»یشەوە کە لە ڕۆژگاری خۆیدا بۆ فەرەنسیەکان مۆدێرن و نوێخوازبووە.

بەمجۆرە خۆمان لەبەردەم دابەشـــکاری و پۆلێنکردنێکی ئەپستمۆلۆژی جدیدا دەبینینەوە، نەک دابەشـــکردنێکی ڕوکەشانەی سیاســـی. وەکی ئاشـــکرایە ڕەنگە یەک قۆناغی ئەپستمۆلۆژی، چەند ســـەردەم و قۆناغێکی سیاســـی جیاجیا لە خۆ بگرێت. بۆ نمونە ســـەردەمی ئەمەوی و ســـەردەمی عەباســـی، لە ڕووی ئەپستمۆلۆژیەوە ســـەربە یەک قۆناغن، بەڵام لە ڕووی سیاسیەوە سەر بە دوو قۆناغی جیاوازن. هەر بۆیە دابڕانی سیاســـی مەرج نییە ببێتە مایەی دابڕانی ئەپستمۆلۆژی. ڕاستە ســـەردەمی عەباســـی لە ڕووی فەلسەفی و زانســـتی و ژیاریەوە کامڵتر و پێشکەوتوتر بووە، بەڵام ســـەرەتاکانی هەموو ئەوانە لە قۆناغی پێشوتردا هەبوون (زانست و وەرگێڕان چەکەرەیان کردبوو). ئێمە لێرە بەدواوە گرنگی بە باس و خواسی مێژوی فیکر دەدەین لە خۆرئاوا، بۆ ئەوەی سەرمان لێ تێکنەچێت و مەسەلەکان نەئاڵۆزکێن.

شایەنی باسە ئێمە گەر بتوانین بەشێوەیەکی دروست قۆناغە ئەپستمۆلۆژیەکانی فیکری خۆرئاوا دەست نیشان بکەین، ئەوا بەئاسانی دەتوانین پێگەی خۆمان دیاری بکەین. ڕەنگە ئەمە شتێک بێت بە دڵی کۆنسێرڤاتیڤە دەمارگیرەکانمان نەبێت، بەڵام هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، چونکە پێشوەخت و تا ماوەیەکی زۆری دیکەش هاوسەنگی هێز لە بەرژەوەندی خۆرئاوایە. لەوانەیە ئێمە لە سەردەمی کلاسیکدا واتە لە سەردەمی زێڕینی ژیاری ئیسلامیدا، بمانتوانیایە پێشکەوتنمان بەڕەوتی مێژوویی خۆمان و دەسکەوتە تایبەتیەکانمان بەراورد بکەین، تەنانەت ئەوانی دیکەش خۆیان بە ئێمە بەراورد دەکرد و لە زۆر بواردا بەســـەر مەشقیان دەزانین، بەڵام ئێستا شتەکان پێچەوانە بونەتەوەو ناتوانین باســـی هیچ بابەتێک بکەین، بەبێ لەبەرچاوگرتنی خۆرئاوا. لەسەردەمانی «الجاحظ و الفارابی و ابن ســـینا و الغزالی و ابن رشـــد»دا، دۆخەکە بەمجۆرە نەبوو. لەو سەردەمەدا خۆرئاوا ناچار بوو پێگەی خۆی بە بەراورد بە ئێمە دیاری بکات، (لەم ڕووەوە خوێنەر با بگەڕێتەوە ســـەر ئەم ســـەرچاوەیە: الفلسفة في العصور الوسطی)[٢]. ئەمە بریتیە لە لێکۆڵینەوەیەکی گرنگ کە لە نوسینی لێکۆڵیاری فەرەنسی «ئالان دۆ لیبێرا»یە. لەم کتێبەدا «دۆلیبێرا» باس لەوە دەکات چۆن خۆرئاوا لەو قۆناغەدا گرنگی بە ژیاری ئیسلامی داوەو سەرقاڵی ئەوە بوون زانست و فەلسەفەی ئیسلامی تەرجەمە بکەن. ئەم نوسینە نوسینێکی زانستی و بەرپرسانەیە، نەک شتێکی سەرپێی و بێویژدانانە بێت. ئێمەش لە ئێستادا پێویستمان بەم جۆرە ئیشکردنەیە[٣].

ئەمە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرەو دەبێت لێی بە ئاگا بین، نەک بۆ ئەوەی (وەکی هەندێ پێیان وایە) پاشـــکۆ بین و بە چۆکدا بێین، نەخێر بۆ ئەوەیە شـــێلگیرانە بیر بکەینەوە و بتوانین پێگەی خۆمان بزانین. ئەوەی نایەوێت ڕوی خۆی بێ ماسک و بێ ماکیاژی ئایدیۆلۆژی لە ئاوێنەدا ببینێت، دواتر ڕوی بەشـــتگەلێکدا دەتەقێت کە دوچاری شـــۆکی دەکەن. ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستی، چاکترە لە شـــاردنەوەی و خۆ گێلکردن لێی. پاشـــان ئێمە تاکەی دەتوانین ئەو ڕاستیانە بشارینەوە؟ تا ئەو

کاتـــەی وەک گرکانێک بەرومواندا دەتەقێت. لەلایەکـــی دیکەوە ئێمە دەبێت بەرلەوەی پێگەی خۆمان بەراورد خۆرئاوادا دیاری بکەین، پێویستە یەکەمجار پێگەی خۆمان بەرامبەر بە خۆمان دەستنیشان بکەین.

## 2-پاشەکشەی ئەفسانە و نائومێدی جیهان:

پێویســـتە ئەوە بزانین ئێمە و خۆرئاوا، تا کۆتاییەکانی ســـەدەی شـــانزەو سەرەتاکانی سەدەی حەڤدە (واتا تا ســـاتەوەختی دیکارت)، دەچوینەوە ســـەر هەمان چوارچێوەی عەقڵی. هەردووک لە هەمان کەش و هەوای فکریدا دەخولاینەوە، هەمان ئاسمانی سیمۆلۆژی یاخود ڕەمزی تەفرەی دەداین و چەواشـــەی دەکردین. پاش ئەوە خۆرئاوا گاف گاف لەو سســـتمە فکریەی پێشوو دوورکەوتەوە، هەنگاوە ژیاریەکانیشی بە گورتر بوون، تاوای لێهات دورایی نێوانمان گەورەتر بوو. بەمجۆرە خۆرئاوا چـــووە نێـــو پانتاییەکی عەقڵی دیکەوە، پانتاییـــەک کە لە دووری دوورەوە نەبێت هیچ چەشـــنە پەیوەندیەکی بە فەزایی عەقڵی پێشـــووترەوە نەما. ئێمەشـــی لە چوارچێوەی ئەو سستمە فکرییە کۆنەدا لە دوای خۆیەوە بەجێهێشـــت، تا وای لێهات هەر پێگەیشـــتنەوەیەکی جدی لەگەڵیدا، بێتە کارێکی نەشیاوو مەحاڵ. لێرەوە پێکدادان و پشت لەیەک کردن یان پێکەوە نەگونجان و ڕک و کین، بووە تاکە زمانێکی شیاو لە هەردولاوە. سەرەنجام جیاوازیی زۆر، ڕقی زۆر دروست دەکات.

ئەمەش بە تەنها وەک هەندێک مەزەندەی دەکەن، دەرەنجامی پێکدادانە سیاسیەکان نییە، بەڵکو بۆ شـــتێکی بنەڕەتی تر دەگەڕێتەوە کە پەیوەندی بە فیکـــرەوە هەیە لە قوڵاییە ئارکیۆلۆژیەکەیدا. دەگەڕێتەوە بۆئەوەی هەریەک لە ئێمە سەر بە دوو کایەی عەقڵی تەواو لێک جیاوازین، دوو پانتایی کە ناشێت بە یەکتری بگەن، لەبەرئەوەی بە دوو ئاراستەی تەریب بەیەک دێن و دەچن. بگرە پانتایی دووەم لەســـەر دارو پەردوی یەکەم دروســـت بووە، دوای ئەوەی جەنگێکی بێپەروای لە دژ بەرپاکرد تا لێی جیابێتەوە[٤].

بەو پێیەی ئێمە ئامانجمان لەم باســـە، دەست نیشانکردنی ڕەگ و ڕیشە سەرەتاییەکانی گورانی زانستە مرۆییەکان یان پێکهاتنی نوێگەریە، ئەوا بە باشی دەزانین هەڵوێستەیەک لەبەردەم قۆناغی بەر لە عەقڵانیەتی خۆرئاوادا بکەین، واتە لەو قۆناغەدا بووەســـتین کە بە فەزای عەقڵی سەدەکانی ناوەڕاست دەناسرێت. لێرەدا دەمەوێت کەمێک لای ئەو پرۆسە دژوارو ترسناکە بووەستم، کە خۆرئاوا توانی بە هۆیەوە لە خودی خۆی جیا بێتەوەو لە خودە تەقلیدی و قەیمیەکەی دابڕێ...

خەســـڵەتە سەرەکیەکانی ئەم کایە عەقڵیەیی سەدەکانی ناوەڕاست کامەیە؟ ئەو تایبەتمەندییە مەزنانە کامانەن کە خەڵکانی ئەوروپا بەر لە پێخستنە ناو قۆناغی نوێگەری و عەقڵانیەتەوە هەڵگری بوون؟ چۆن و کەی ئەم دابڕانە ڕویدا؟ ئەمانە هەندێکن لەو پرسیارانەی لێرەدا دەمانەوێت بیانکەین، بۆئەوەی برێک لەو خەیاڵ پڵاوە یان ئەو بەدحاڵی بوونە ناهەموارانەی هەیە برەوێنێتەوە.

لەبەرئەوەی خۆرئاوا لە ســـەرەتاوە تا دوایی هەر هەمووی عەقڵانی نەبووە، بۆیە پێویســـتە ئەو هێزەی ئێســـتاکێ یان ئەو نوێگەریە زەقـــەی کە هەیە، بەهەڵەماندا نەبات و چەواشـــەمان نەکات، بەوەی خۆرئاوا لە نەژادێکەو گەلانی تری سەرزەمین لە نەژادێکی ترن. خۆرئاوا لەبەرئەوە باڵادەست

و سەرکەوتوو نییە، چونکە خۆرئاوایە یان لەبەرئەوەی سپی پێست و زەردە پێستە، وەک هەندێک لە باڵی ڕەگەز پەرستی لە خۆبایی دەیانوست بەوانە تەفرەمان بدەن، بەڵکو هەموو ئەمانە دەگەڕێنەوە بۆ چەند هۆکارێکی مێژوویی و دەکرێت لەڕێی پەیڕەوکردنی میتۆدێکی مێژوویەوە دەست بخەینە سەری و ئاشکرای بکەین. وتم میتۆدێکی مێژوویی و دەمتوانی چەمکگەلێکی دیکەش بەکاربهێنم (بەتایبەت ئەو چەمکانەی تازەن)، وەک چەمکی هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی لە قولاییەکاندا، یان وەک میتۆدی ژینالۆژیا لەسەر ڕێبازی «نیچە»، یاخود میتۆدی شیکردنەوەی خود لەڕێی خودەوە بەشێوەی «فرۆید» و شیکردنەوەی دەرونی[٥]، چونکە سەرەڕای جیاوازی بەڕواڵەتی نێوان سەرجەم ئەم ئاقارو زاراوانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان لە سیفەتێکی سەرەکیدا تەبان، ئەویش ئەوەیە گەیشتن بە حەقیقەت ئەوەمان لێدەخوازێت، تا بە قولایی زەمەن یان خوددا (تاک یان کۆمەڵ) شۆڕببینەوە.

ئەم ڕۆچونە بە ناخی زەمەندا، ئەم هەڵکۆڵینە دەربارەی چینەکانی ژێرەوەی هۆشیاری (تاکەکەس یاخود کۆمەڵ)، ئەم کەلێنکردنە ناو ئەو چینە جیۆلۆجیانەی بە درێژایی ڕۆژگار لەسەر یەک کەڵەکە بوون، تەنها ڕێگە چارەیەکە- تەنها ئاقارو میتۆدێکە-، ڕێگای ئەوەمان پێبدات تا شتەکان لە تەڕو برِی سەرەتاییاندا ببینین، یاخود لە ڕووە بێگەرد و ئەسڵیەکەیاندا کەشف بکەین. ئەمەش ئەو کارە بوو کە «میشێل فۆکۆ» پێی هەستا، کاتێک ویستی ئارکیۆلۆژیانە بە ڕەگ و ڕیشەی خۆرئاوادا بچێتە خوار، بۆئەوەی سەرەڕای شکۆداری و جەبەروتی زۆری، ڕێژەیی بوونی ئەو ژیوارە بسەلمێنێ. ئەم کارەشی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وشەکان و شتەکان) و لەڕێی خەملاندنی تێرمێکی سەرەکیەوە کە (ئەبستیم)ەو دواتر دێینە سەر پێناسەکردن و ناساندنی، بە ئەنجام گەیاند.

کارێکی وا بەر لە «فۆکۆ»، سۆسیۆلۆژستی مەزنی ئەڵمانی «ماکس ڤیبەر» هەوڵی بۆداو دەستی بۆبرد، کاتێک ویستی هۆکاری سەرکەوتنی عەقڵانیەت لە خۆرئاوا لێکبداتەوە. ئەو پرسیارە سێنترالەشی «ڤیبەر» وروژاندی، بەمجۆرە بوو: (بۆچی تەنها لە ئەوروپادا نەبێت، گەشەی زانستی و هونەری و سیاسی و ئابوری بە شێوەیەکی عەقڵانیانە بەڕێوە نەچوو؟). «ماکس ڤیبەر» ڕاشکاوانە و بێ هیچ چاوو ڕاوێک، نوێگەری و عەقڵانیەتی خۆرئاوا پێکەوە گرێ دەدات[٦]، ئەمەش وای کرد هەندێک لە بیریارانی جیهانی سێیەم تۆمەتی نەژاد پەرستی و لایەنگیری ناوەند چێتی خۆرئاوای بدەنە پاڵ. هەمان تۆمەت کە درابووە پاڵ «مارکس»ی نەیارە گەورەی «ماکس ڤیبەر».

پاشان «ڤیبەر» عەقڵانیەتی دنیایی بە چەمکێکی بەناوبانگی دیەوە بەستەوە کە لە «شیللەر»ی شاعیری ئەڵمانی خواست بوو، ئەو چەمکەش بریتی بوو لە: (نائومێدی جیهان)... چەندە پرۆسەی عەقڵانیەت لە جیهاندا بەرەو پێش بچێت، هێندە شاڵاو دەکاتە سەر بوارەکانی تری ژیان و کۆنترۆڵیان دەکات، لە بەرامبەر پرۆسەیەکی واشدا چەمکی ئەفسوناوی- یان شیعری- لەسەر ڕوی جیهاندا دەست بە پاشەکشێ کردن دەکات، چونکە عەقڵانیەت یان نوێگەری یاخود تەکنەلۆژیا، جیهان لە جەوهەرو ناوەڕۆک بەتاڵ دەکاتەوەو تەڕو پاراوی شیعرو فانتازیاو خەون و خەیاڵ لەناودەبات. ئەمەش وادەکات دنیا پەست و ساردو سڕو زبر بێت. بەمجۆرە دەکرێت لە دوو گۆشە نیگاوە سەیری هەمان دیاردە بکەین، دیدگای مێژووناسی فیکر یاخود ئارکۆلۆژستی مەعریفە بەشێوەی «فۆکۆ»، یان لە ڕوانگەی سۆسیۆلۆژیەوە کە بایەخ بە بونگۆڕینە بەرچاوو هەست پێکراوەکان دەدات، وەکو «ماکس ڤیبەر». ڕەنگە لە دوایشدا ڕۆشنای بخەینە سەر ئاقارەکانی دیکەش وەک: (ئاقاری مێژوی تازە)

کە «فێرنان برۆدێل» پەیڕەوی دەکات، بۆوەسفکردنی باڵادەستی و سەرکەوتنی ژیواری خۆرئاوا لە ماوەی چوار سەدەی ڕابردوودا. ئەوەش لە دوو توێی کتێبە گەورەکەیدایە (ژیواری مادی، ئابوری و سەرمایەداری) کە لە سێ بەرگدا بە چاپی گەیاندووە[٧].

کەواتە با هەوڵ بدەین بە شێوەیەکی بابەتی لە بەرەی هزری ئەوروپیدا هاوشانی «میشیل فۆکۆ» بین، لەو سەفەری پشکنین و کەشفکردنە کەم وێنەیەیدا، لەمەڕ چینە بە ژێروە بووەکانی سەردەمە جیاجیاکان. لە ڕاستیشدا من وەک- توێژەرێکی عەرەبی- هیچ گرفتێک لەمەدا نابینم و چونە ناوەوەی ئەم جیهانەش بەو سوک و سانییەوە لێهاتووی خۆم نییە، چونکە من بۆ خۆم بەرلەوەی بچمە دنیای مۆدێرنەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیاوم. واتە ئاڕاستەی من تەواو پێچەوانەی هەر توێژەرێکی فەرەنسی یان ئەوروپییە لە هاوتەمەنانی خۆم، لە کاتێکدا ئەو (واتا توێژەرێکی فەرەنسی یان ئەوروپی)، بۆئەوەی بە ناخی زەمەندا ڕۆبچێ و بەو کەش و هەوا سەرسوڕهێنەرو دڵڕفێنەی سەدەکانی ناوەڕاست بگات، ناچارە لە خۆی جوێ بێتەوە- واتە لەو نوێگەریە داببڕێت کە تیایدا چاوی هەڵهێناوەو لە باوەشیدا گەورە بووە-، بەڵام من پێویستم بە هیچ جۆرە جیابونەوەیەک نییە تا دەستم بەو سەردەمانە بگات، لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژگارانەم لە ناخی خۆمدا هەڵگرتووە، پاشان کۆمەڵگاکەشم بە ڕادەیەکی زۆر لە کەش و هەوای ئەو سەردەمانەدا نقووم بووە. کەواتە با بەرەو دوا بگەڕێینەوەو بچینە ناو فەزای عەقڵی و دەرونی خەڵکانی سەدەکانی ناوەڕاست.

با گەر بۆ چەند ساتێکی کەمیش بووە چاو بەست لە خۆمان بکەین، وەک ئەوەی لە ساڵی ١٣٢٠ یان ١٥٧٠ تەنانەت ١٦١٩دا بژین (بەرواری گۆشەگیری ڕینیە دیکارت لە ژوورێکی گەرم و گوڕو لە ئەوجی زستانی ئەڵمانیادا). لەو ماوەیەدا «دیکارت» سێ خەونی تۆقێنەری بینی کە خەریک بوو عەقڵی لە دەست بدات، ئەو کاتەی خۆی بۆ دامەزراندنی عەقڵانیەتی خۆرئاوا لە ئایندەدا تەیار کردبوو. لەوێدا نیگای بۆ هات و گرێیەکی لە دەرونیدا بۆ کردەوەو کەوتە سەر ڕاستە ڕێگا، (لەو شەوی یەڵدایەدا هێندەی نەمابوو باجێکی قورسی ئەو کەشفکردنەی بدات). خەڵکانی ئەو سەردەمانە چۆن لە دنیایان دەڕوانی؟ چۆن مەزندەیان دەکرد؟ مانای چییە کە وێنەیەکی ئەفسانەیی بۆ جیهان باڵادەستی بەسەر عەقڵی ئادەمیزادا هەبێت؟ ئەم دیدگا ئەفسانەییە سەرسوڕهێنەرە چییەو جیاوازی لەگەڵ دیدی عەقڵانیدا بۆ جیهان چۆنە؟ لێرەدا دەگەینە جەوهەری بابەت و کرۆکی خواست و مەبەست. ئێستا بە ناچاری لە بەردەم ئەوەداین تا بچینە نێو گێرمەو کێشەی درێژەدان بە باسەکەمان.

پێویستە لەوە بە ئاگابین کە سەرجەم کلتورەکانی دنیا تا بەراییەکانی سەردەمی نوێگەری، بەپێی لۆژێکی بیری ڕەمزی (یان سەرەتایی، یان ئەفسانەیی، یاخود ئەفسوناوی یان- بەربەری - بە چەمکە شتراوسیەکەی بیریان دەکردەوە یاخود درکیان بە شتەکان دەکرد). بیری ڕەمزی کە وێنەیی خواستەیی بەکاردێنێت، پێچەوانەی فیکرە بەهۆی بەکارهێنانی نیشانە سازی یان ئەو ئاماژە وردانەوەی لە سەردەمی نوێگەریدا بووە باو. ئەوەشی بە شێوەیەکی ڕیشەیی سستمی ڕەمزی/ لە ئاماژەی ورد جوێ دەکاتەوە، ئەوەیە کە ڕەمز فرە ڕەهەندە، واتا ئاماژە بە ماناو دەلالەتی جیاجیا دەکات، لە کاتێکدا هێما تاک ڕەهەندە.

هەروەها بیرکردنەوەی ڕەمزی (ئەو بیرکردنەوەی بەر لە فیکری زانستی مۆدێرن دەکەوێت)،

بــڕوای بــە بوونی لێکچونی جەوهەری نێوان ڕەمزو واقیع یان نێوان وشـــەو شــت هەبوو، بەڵام ئەم پرۆسەیە لە بنەڕەتدا هەرەمەکییە و هیچ جۆرە پەیوەندیەکی لەیەکچوو یان سروشتی لەنیوان خۆی و ئـــەوەی ئاماژەی بۆ دەکات نییە، (بەپێی تێگەیشـــتنی نوێگەری، زمـــان زاراوەیە، واتە لەڕێی کۆ دەنگییەکەوە مانا دەبەخشــرێتە وشـــەکان، نەک- وقف- بێت، بەو مانایەی هێزێکی خواوەندی یان خواوەند خۆی بۆ هەموو شــتێک وشـــەیەکی دانا بێت). بۆ نمونە درەخت بەپێی جۆراو جۆری زمانە مرۆڤایەتیە جیاجیاکان، چەندین ناوی هەیە. گەر بهاتایە وشـــەکان لەو شتانە بچوایە کە ئاماژەیان بۆ دەکات، ئیتر ئەمە بەشێوەیەکی زۆرەملێی یان سروشتی بوایە، ئەوا درەخت لەناو سەرجەم زمانە جیهانییەکانـــدا تەنهـــا ناوێکی دەبوو. واتە زمان (یان هێما، یاخود وشـــە) هەڕەمەکییە، وەک چۆن زمانەوانی نوێ بێچەندو چون بڕیاری لێدەدات.

فیکری «ئەرستۆ» کە تا کۆتایی سەردەمی ڕێنیسانس بەسەر ئەوروپادا باڵادەست بوو، فیزیایەکی ڕەمزی بوو، لەبەرئەوەی لەسەر تیۆریای لێکچونی نێوان شتەکان دامەزرا بوو، بەهۆی بەشداریان لە چوار ڕەگەزەکەدا: (ئاو، هەوا، ئاگر، خۆڵ). ئێمە ئەوە دەزانین کە زانستی مۆدێرن لە «دیکارت»ەوە، تەنهـــا دژ بە «ئەرســـتۆ» و ئاقاری ســـکولائی نەهاتۆتە ئـــارا، بەڵکو لەبنەماداو بـــە پلەی یەکەم هەوڵدانێک بوو بۆ قوتار بوون لە مەعریفەی ڕەمزی، واتە لە مەعریفەی میتۆلۆژی، ئەو مەعریفەیەی لەســـەر کەشفکردنی لێکچونە ناکۆتاییەکانی نێوان ڕەگەزەکانی سروشت دامەزرابوو. بەمجۆرە لەبری مەعریفەی چۆنایەتی، مەعریفەی چەندایەتی پێوانەکاری لەسەر دەستی «دیکارت»هاتە ئارا.

ئیتر ئـــەو فیکرە ڕەمزییە یان میتۆلۆژییە کەبەر لە چاخی زانســـت جڵەوی خەڵکانی ئەوروپی بەدەســـت بوو، گاف گاف بەرەو پاشەکشەو بەر تەسکبوونەوە دەچوو. ئەمە بوو «میشێل فۆکۆ»لە پێشەکی کتێبی (وشەکان و شتەکان)داو لە یەکێک لە نەسکە هەرە جوانەکانیدا، بە ناوی پەخشانی جیهان[٨] (واتە جیهان وەک پەخشان و وەک کتێبێکی کراوە دەخوێنرێتەوە)، وەک چۆن هەر کتابێکی ئاسیایی تر دەخوێنرێتەوە، باسی کردبوو.

«فۆکۆ» دەڵێت: (لە ســـەرەتای سەدەی حەڤدەدا، ســـەردەمی پێچواندنی نێوان شتەکان دوایی هات، لە ڕێگای کەشـــفکردنی ئەو ئاماژانەی کۆیان دەکاتـــەوە. لێرەوە ئەو بیرە ڕەمزییە بە کۆتایی گەیشـــت کە لەســـەر بەدوادا چونی لێکچونە ناکۆتاییەکانی نێوان شـــتەکان ڕاوەســـتا بوو. فیکری ئەوروپیـــش بۆ یەکەمجار پێینایە قۆناغـــی پێوانەیی و جیاکاری و ژمێریاریەوە، واتە چووە قۆناغی عەقڵانیەتی زانســـتی. ئەو ئاســـمانە ڕەمزییەی پڕی بوو لە تارمایی و ڕۆح، بۆ خەڵکانی ئەوروپی ئاشـــکرابوو. لە بەرامبەردا ئاسمانێکی بێگەردو بێلایەن، ئاسمانێکی سروشتی یان فیزیایی جێگای گرتەوە. بەهەمان شـــێوەش پەردە لەسەر ڕەمزەکانی سەر ڕوی سروشتی زەمین هەڵماڵراو، درندەکان و ئەفسون و خەیاڵ و فانتازیاکان، سەرزەمینیان بەجێهێشت).

بە کورتیەکەی سروشت گەڕایەوە سەر ئەسڵی خۆی، واتە گەڕێندرایەوە سەر ژمارە و ڕەگەزە مادی و ڕواڵەتە هەســـتپێکراوەکانی، ئەو ڕواڵەتانەی لە هەموو ڕویەکـــەوە تاوتوێ دەکرێت و دەپێورێت. تەنانەت دارســـتانە چڕو ئەشـــکەوتە تاریک و چۆم و ڕوبارە قوڵ و شـــاخ و داخەکانیش، بونە چەند دیاردەیەکی سروشـــتی کە وەک خۆیان تاوتوێ دەکرێن و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە دەکرێت، لەپێناو بەدیارخســـتنی بونیادە بنەڕەتییەکانیان. پاش ئەوەی تارماییەکانیان لێدەرکراو لە فانتازیاو خەیاڵ

بەتاڵکرانەوە، ئەو وەهم و خەیاڵانەی مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاستی خستبووە ژێر باری خۆیەوە.

ئیتر لێرەوە زانستی ئەوروپی یان عەقڵیەتی ''دیکارت''ی، دەستی بە کەویکردنی کایە جیاجیاکان کردو تەنانەت دارستانە گەورەکانی لە وێنەی دارستانی (فۆنتنبلۆ)ش، لەم پرۆسەیە قوتاری نەبوو. بەمجۆرە درەختەکانیش وایان لێهات کۆدو شوناسی تایبەتی خۆیان هەبێت. ڕێگای گەورەو بچوک بەناو ئەو دارستانانەدا لێدران، نەک تەنها بۆئەوەی گەشتیاران فێر بکات چۆن چۆنی کاتێکی خۆش لەناو دارستانەکاندا بەسەر بەرن و بزر نەبن، بەڵکو بۆ ئەوەشی دارستانەکان کەوی بکرێن و هەموو ڕێکەوتە ترسناکەکان و ئەو تارماییانەشی لێوان ڕێژە لە بۆن و بەرامەی خەیاڵات لە ناخیدا دەربکرێت، چونکە ڕونی و ڕەوانی دیکارتی لە تاریکی و شەوەزەنگ سڵدەکات. نیذۆکی سروشت کرا، بەمەش دیسپلین هاتە ئاراو لە بەرامبەریشدا پاکی و بەرائەت لەدەستچوو. لێرەوە کۆنترۆڵکردن وەک یەکێک لە خاسیەتەکانی نوێگەری بەدیار کەوت، کۆنترۆڵکردنی سروشت و مرۆڤ و تەنانەت بەردیش... بە شێوەیەک زیادەڕۆیی لەم پرۆسەیەشدا کرا، تا بە نسکۆ گەیشت. ئەمەش نوێگەری ڕووبەڕوی ڕەخنەگرتن کردەوە. بۆیە دەبینین گەشتیارە ئەوروپیەکان بۆ سەفەر ڕوو لە دوورگە دوورەکان یان دارستانە پاکیزەکانی ئەفریقاو بگرە تەنانەت ڕوو لە وڵاتانی عەرەبیش دەکەن، بە مەبەستی گەڕان لە دیمەنێکی سروشتی ڕاستەقینە یان خۆرێکی پاک و بێگەرد، یاخود هەوایەکی ساف کە هێشتا پیس نەبووە.

ئەمە ئەو شتە بوو کە «ماکس ڤیبەر» ئاماژەی پێدا، کاتێک باسی لە (نائومێدی جیهان)[9] کرد، دوای بەگشتگیری کردنی عەقلانیەت و تەکنەلۆژیا. ئەم پرۆسەیە پەیوەندی بە شیعری ڕۆمانتیکیشەوە هەیە لە سەدەی نۆزدەدا کە بۆخۆی وەک کاردانەوەیەک وەها بوو، دژ بە هەژمونی بەرفراوانی ئامێرو ئەتکردن و پێشێلکردنی پاکیەتی سادەو ساکاری سروشت.

دەکرێت پارتە سەوزەکان ئەوانەی داکۆکی لە ژینگە دەکەن، وەک درێژکراوەیەکی ئەم ئاقارە بناسین. مەترسی گەورەی ئەمانەش لەوەدایە، تەکنەلۆژیا هەموو ڕووبەرە سەوزەکان لە وڵاتە ئەوروپیە پیشەسازی و پێشکەوتووەکاندا پاکتاو بکات و لەناویان بەرێت...

## 3-فۆرمەلاکردنی (ئەبستیم)ی تایبەت بە بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست:

لە دەستپێکی کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وشەکان و شتەکان)، «میشێل فۆکۆ» ئەم پرسیارە دەوروژێنێت: (دابڕان لە مێژوی فیکردا چۆن ڕودەدات؟ یانی چی ئینسانەکان دەستبەرداری جۆرە بیرکردنەوەیەک بن کە بە درێژایی سەدان ساڵ لەسەری ڕاهاتوون، پاشان دوای ئەوەو کتوپڕ بە ستایلێکی تەواو جیاواز بیربکەنەوە؟ کۆدێتای ئەپستمۆلۆژی لە مێژووی فیکردا یانی چی، واتە هەرەسهێنانی سستمێکی بیرکردنەوەی کۆن تا سستمێکی فیکری دیکە شوێنی بگرێتەوە، بە چ مانایەک دێت؟ یانی چی کە دیدگایان بۆ جیهان بگۆڕێت و دنیابینیەکی دیکە لە دایک بێت، جیاواز لەوانەی پێشتر لە ئارەدا بوون؟).

بەمجۆرە دەبینین کەم تا زۆر لە سستمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست نزیک بوینەتەوە، چونکە تا ئێستاش ئامانجی سەرەکیمان هەر ئەوەیە کە هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی بکەین بۆ سۆراخکردنی

ڕەگوڕیشـــەی مۆدێرنە، ئەمەش بۆ ئەوەی خەسڵەتە سەرەکیەکانی سەردەمی بەر لە مۆدێرنە دیاری بکەین و لەسەردەمی مۆدێرنەی جیا بکەینەوە.

«فۆکۆ» پێیوایە فیکر لە ســەرەتاکانی ســەدەی حەڤدەدا، وەکی پێشوتر لە دەریای لێکچونی ناکۆتایی نێوان شــتێک و شتێکی دی، یان لە نێوان وشەکان و شتەکاندا بە ئارامی ڕەوتی نەدەکرد، بەڵکو تیۆریای لێکچون (ئەو تیۆریایەی لێکچون لە نێوان شتەکاندا دەبینێت لە هەموو شوێنێکدا)، بوو بە مایە هەڵە و تێکەڵکردنی شــتەکان بەیەکتری. واتە فیکر کەوتە گومانکردن لەو تیۆریایەو وەک هەڕەشــەو مەترسیەک سەیری دەکرد بۆ ســەر مەعریفە، لە کاتێکدا تاماوەیەکی کەم بەر لەو مێژووە تیۆریای لێکچون پرانسیپ و بنەمای مەعریفە بوو.

ئیدی ســەردەمی فاڵگرتنەوەو جادوبازی و سەرسامی بەرامبەر گەردون کۆتایی هات و مرۆڤایەتی بــۆ یەکەمجــار پێینایە ناو دنیای ئەقڵانیەتی زانســتیەوە، شــایەدحاڵە گەورەکانــی ئەم کۆدێتا ئەپســتمۆلۆژیە چارەنوسســازە کەســانێک بوون لە وێنەی : «ڕینێیە دیکارت، فرانسیس بیکۆن، تۆماس هۆبز».

ئەڵبەت بەراوردکاری لە نێوان شتەکاندا وەک میتۆدێک بۆ تێگەیشتن و زانین کۆتایی پێنەهات، بەڵام بەشــێوەیەکی زانســتی بەردەوام بوو، لە کاتێکدا پێشــتر خەیاڵی و فەنتازی و ئەفســانەیی بــوو. لێــرە بەدواوە بەراوردکاری، لێکچون و جیاوازی نێوان شــتەکانی ئاشــکرا دەکرد، ئەویش لە ڕێی پێوانەی ورد و حســابکردنێکی کۆنکرێتیەوە. ئەمە لە کاتێکدا پێشــتر بەراوردکردن تەنها هەر خەریکی دەستنیشانکردنی ئەو لێکچونە ڕوکەشانەبوو کە لەسەر ڕوکاری شتەکان هەبوون، واتە ئەو لێکچونانەی خەسڵەتێکی کاتی و کورت خایەنیان هەبوو.

جیــاوازی نێوان بەراوردکاری و لێکچون، جیاوازیەکی قوڵە و پەیوەندی بە دیدگای ســەرەکیەوە هەیە بۆ گەردون و ئەو پەیوەندیە نیشــان دەدات کە لە نێوان ئاماژە و ئاماژە بۆ کراو، یان لە نێوان وشــەیەک و ئــەو ژێدەرە دەرەکیەی وشــەکە ناوی دەنێت، یاخود لە نێوان نــاو و ناولێنراودا هەیە. دوای ئەوەی بە درێژایی ســەدەکانی ناوەڕاســت کە تیایدا لێکچون تاکە ئامرازی زانین و تاکە دنیا بینی گەردون بوو، ئاماژە و ئاماژە بۆ کراو تێکەڵ بە یەکتری بووبوون، هێدی هێدی لە یەکتر جیا دەبوونەوە. واتە لە کاتێکدا هەردووکیان بووبوونە یەک شت و ئاوێتەی یەکتری بووبوون، بوون بە دوو جەســتەی جیاواز و تایبەت. لێرەوە ئەو ڕایەڵەی نێــوان ناو و ناولێنراو، نێوان مرۆڤ و جیهان پچڕاو ئەو سەرســامیە منداڵانەیەش لەســەر زەوی ئاوا بوو. بەمجۆرە و بۆ یەکەمجار وشــەکان لە شتەکان جیابوونەوەو سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت، لە کاتێکدا پێشتر تێکەڵ بە شتەکان بوو بوون. تەنها شتێک کە ئەو سەردەم و ڕۆژگارە میتۆلۆژی و قۆناغە منداڵیەی مرۆڤایەتیمان بیر بێنێتەوە، شاعیر و دێوانەیە (ئەڵبەت هەرکەسەیان بە شێوازی خۆی!). وەک ئەوەی ئەم دوو کارەکتەرە بڕێک لەو شتانەیان تێدامابێت و بەڵگەبن بۆ سەردەمانێک کە ڕۆشتن و بەسەرچوو، سەردەمی وێناکردنی دنیا بەشێوەیەکی ئەفسانەی، سەردەمی فانتازیا و ئەوق بوون و سەرسامبون کە هەموو پێودانگ و تخوبێکی دەبەزاند، بێ ئەوەی هەست بەوە بکات هیچ شتێک دەبەزێنێت و سنور شکێنی دەکات.

مرۆڤی دێوانە شتەکان وەک خۆیان نابینێت. لە کاتێکدا لێکچون لە نێوان شتەکاندا دەبینێت کە هیچ لێکچونێک لە نێوانیاندا نییە، هاوکات هەندێ جار هاوڕێکانی وێڵ دەکات و ئاشــنای کەســانی

غەریب و نەناس دەبێت (واتە بێگانە دەبێتە هاوڕێ و هاوڕێش دەبێتە بێگانە). مرۆڤی شێت هەرچی بەهـــاو پێـــوەر و پێودانگە هەڵدەگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی پێیوایە لە هەموو چرکە ســـاتێکدا ئاماژەی ســـیحری دەدۆزێتەوە. ئەوەی ئەو لە دنیـــادا دەیبینێت تەنها لێکچون و ئاماژە و ئاماژەی ڕەمزییە. کەواتـــە ئـــەو وێڵگەردی ناو جیهانێکی پڕ لێکچونی ناکۆتاییە. هەرچی شاعیریشـــە ئەوا بە گەڕانی بێ وچانی لە پەیوەندی تازەی نێوان شـــتێک و شـــتێکی دی، یاخود لە نێوان وشـــەکان و شتەکان، یان لە نێوان وشـــەیەک و وشـــەیەکی تردا، ناچارە زۆر بە زماندا ڕۆ بچێتە خوارەوە، تا دەســـتی بەو زمانـــە بگات کە کەوتۆتە ژێر زمانی دیـــار و باوەوە. ئەو بەم کارەی دەتوانێت گوێ لە نرکە و ناڵەی وشەکان بگرێت لە یەکەم چرکەساتی دروستبونیدا، بەمجۆرەش دەتوانێت ئەو مانایانە بدۆزێتەوە کە بیرچۆتەوەو کەســـانی ئاســـایی وەک ئێمە توانای ئەوەمان نییە بیهێنینەوە بیرمان. هەروەها شاعیر دەتوانێت پەیوەندی لێکچونی ســـەیر، لە نێوان کۆمەڵە شـــتێکدا بســـازێنێت کە هیچ پەیوەندیەکی ئاشـــکرا و لۆژیکی لە نێوانیاندا نییە. هەر ئەمەشـــە ئێمە توشـــی سەرســـامی دەکات و بڵێســـەی شیعری دادەگیرسێنێت. مەزنی شاعیریش لێرەدایە کە دەمانگێڕێتەوە بۆ سەردەم و زەمانی منداڵی مرۆڤایەتی، دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو زمانە سەرەتاییەی بووە بە ژێر دارو پەردوی سەردەمەکانەوە!..

بـــەڵام ئاخۆ تیۆریـــای لێکچون، ئەو تیۆریایەی بەســـەر بیرکردنـــەوەی مرۆڤایەتیدا زاڵ بوو تا کۆتاییەکانی ســـەدەی شازدە و سەرەتاکانی سەدەی حەڤدە، چی دەگەیەنێت و بە مانای چی دێت؟ ئێســـتا کاتی ئەوە هاتووە بە درێژی باس لەم مەســـەلەیە بکەین. «میشێل فۆکۆ» بە زمانە ئاست بەرزەکەی خۆی دەڵێت: (تا کۆتاییەکانی ســـەدەی شـــانزە، لێکچون ڕۆڵێکی ســـەرەکی هەبوو لە سســـتمی مەعریفەی خۆرئاوادا، چونکە تاڕادەیەکی زۆر باڵا دەست بوو بەسەر پرۆسەی شرۆڤەکردن و نێو — لێکدانەوەی تێکســـتەکاندا. ئەم لێکچونە گەمەی ســـیمبول و ئاماژەکانی ڕێک دەخســـت و ناسینی شتە دیار و نادیارەکانی فەراهەم دەکرد و هونەری وێناکردن و نیشاندانیشی ئاڕاستە دەکرد. جیهان تا ئەو قۆناغە بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە: زەوی لاســـایی ئاسمان دەکاتەوەو، دەموچاوەکان لە ئەستێرەکاندا دەردەکەون و ڕەگوڕیشەی گیا و سەوزایش هەڵگری ئەو نهێنیانەیە کە خزمەت بە مرڤ دەکەن)[١٠].

پاشان «فۆکۆ» باس لە چوار جۆری لێکچون دەکات: لێکچون لە ڕێی نزیکایەتیەوە، واتە نزیکی دوو شـــت لە یەکتری. هەروەها لێکچون لە ڕێی لاســـاییەوە، واتە لاسایکردنەوەی شتێک بۆ شتێکی دی. لەگـــەڵ لێکچـــون لە ڕێی لێکڕواندنەوە (بەرامبەر کێ)، بۆ نمونـــە وەک لێکڕواندنی (بەرامبەر کێ) شـــتێک لەســـەر زەوی لەگەڵ شـــتێک لە ئاســـماندا. دواجار لێکچون لە ڕێی گەمەی ویستن و نەویستنەوە، ئەو شتانەی لەناو سروشتدا هەن یان یەکتریان دەوێت و حەز بە یەکتری دەکەن، یان ڕقیان لەیەکە و یەکتریان ناوێت، وەک ئەوەی خەڵکانی ئەو سەردەمانە بڕوایان پێی هەبوو. تێکڕای ئەم چوار جۆرەی لێکچون، لەلایەن خەڵکانی ســـەدەکانی ناوەڕاستەوە بەکاردەهێنرا، بۆ لێکدانەوەی گەردون یاخود بۆ دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان شتەکاندا. هێندە بەس بوو دوو شت هاوتای یەک بن، تا لە چاوی خەڵکی ئەو ڕۆژگارەدا ببنە دوو شـــتی لێکچوو. پاشـــان شـــتی دووەم لەگەڵ شتی سێیەم و چوارەمدا لەیەک دەچوو. بەمجۆرە ئەم پرۆسەیە بێ کۆتایی بەردەوام دەبوو.

لێرەوە تەواوی شـــتەکان گەردون لەیەک دەچون و هاوشـــێوەی یەک بوون. شـــتەکانی سەرزەوی

بەرامبەر شـــتەکانی ئاســـمان بوو، کە هاوتاو هاوشـــێوەیان بوون. بۆ نمونە خەڵکی پێیوابوو چەند ئەســـتێرە بە ئاســـمانەوەیە، ئەوەندەش گوڵ لەســـەر زەوی هەیە! چەند ئاژەڵ لەسەر زەوی هەیە، هێندەش ماسی لە ناو دەریاکاندا هەیە.

لێکچونی دیکەش هەبوو لە ڕێی لاســـایی کردنەوە. هەر ئەوەندە بەس نەبوو دوو شـــت هاوتا و نزیکی یەکتر بن، تا لەیەک بچن، بەڵکو دەکرا ئەو شتانەشـــی دوور لەیەکن، لێکچون لە نێوانیاندا هەبێت. بۆ نمونە پێناچێت ڕووی مرۆڤ لە دوورەوە وەک ئەوە وا بێت کە لاسایی ئاسمان بکاتەوە؟ وەک چۆن ئەقڵی مرۆڤ بەشێوەیەکی نا تەواو ڕەنگدانەوەی حیکمەتی یەزدانە، ئاوەهاش چاوی مرۆڤ بەدرەوشـــاوەیی لە چاوانی ئاســـمان دەچێت، واتە لە خۆر و مانگ دەچێت کە تیشکی درەوشاوەیی خۆیان بەســـەر گەردوندا پەخش دەکەن. هەرچی دەمیشـــە ئەوا لە ڤینۆس دەچێت (ڤینۆسی خوای جوانـــی و خۆشەویســـتی لای ڕۆمانەکان)، لەبەرئەوەی دەم ئامرازی ستایشـــکردن و ڕاموســـانە. بە کورتیەکـــەی ڕوی مرۆڤ بەو بچوکیە کورتکراوەی ڕوی ئاســـمان بـــوو. مرۆڤیش هەموو گەردونی لە خۆیدا کورتدەکردەوە. بەمجۆرە و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەو وتەزا بەناوبانگە بڵاوبووەوە کە باس لە گەردونی گەورەو گەردونی بچوک دەکات. فەلسەفەی ئەفلاتۆنیزمی نوێش دەستی هەبوو لە ڕەواج پێدانی و تەشەنەســـەندنی، چ لە جیهانی ئیسلامی بێت یان لە جیهانی مەسیحیدا. لەلایەکی ترەوە لێکچون لە ڕێی سەیرکردنەوە ڕۆڵی خۆی بینی وەک ئامرازێک بۆ مەعریفەی میتۆلۆژی (ئێمە ئێستا پێی دەڵێین میتۆلۆژی، بەڵام بەلای خەڵکی ئەو سەردەمەوە لە حەقیقەت خۆی حەقیقی تر بووە.

مرۆڤی مۆدێرن کە ئەقڵانیەت بەسەریدا زاڵە، ئێستا لەوە تێناگات. بۆ تێگەیشتن لەوە پێویستی بەوەیە ســـەر لەبەر خۆی لە ســـەردەمەکەی و وتەزا زانستی و ئەقڵانیەکانی جیا بکاتەوەو بە ناخی سەردەمانی پێشودا شۆڕبێتەوە، تا بزانێت چۆن دەکرێت بەو شێوەیە سەیری جیهان بکرێت. دەبێت ئەو کەســـە لەگەڵ دۆخی ئەو سەردەمە بەســـەرچوانەدا ڕابێت، تا ئەو دیدگا میتۆلۆژیەی بۆ جیهان بەمێشکدا بچێت. واتە پێویســـتە لەسەری بەشێوەیەکی ئارکیۆلۆژیانە هەڵکۆڵین بکات، تا دەگاتە قوڵایی و دەســـتی دەگاتە چینی منداڵی مرۆڤایەتی). لێکچون لە ڕێی سەیرکردنەوە تێرمێکی کۆنە و پێشتر بەسەر بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست و پاشانیش بەسەر زانستی گریکیدا زاڵ بووە و دەســـەڵاتێکی گەورەی هەبووە. ئەم جۆرەی لێکچون پێویستی بەوە نەبووە بەراوردو لێکچونی دیار و گەورە و گران لە نێوان شـــتەکاندا بدۆزێتەوە، بەڵکو هێندەی بەس بووە کە یەک خاڵی هاوبەش بدۆزێتـــەوە تـــا ژمارەیەکی ناکۆتا لە لێکچون و نزیکایەتی لە نێوان ســـەرجەم ڕەگەزەکانی جیهاندا ئاشـــکرا بکات. واتە لێکچون لە ڕێی پەیوەندیەوە دروســـت دەکات. بۆ نمونـــە دەبینین پەیوەندی ئەســـتێرەکان بە ئاســـمانەوە کە دەدرەوشـــێنەوە، بە پەیوەندی گوڵ و گیا بەزەوییەوە دەچێت کە دەیڕازێنێتەوە. دواجار لێکچونێکی دیکەش هەیە، لە ڕێی گەمەی ڕاکێشان و دوور کەوتنەوەوە. ئەو شـــتانەی ڕوکاری سروشت داگیر دەکەن، یەکتریان خۆشـــدەوێت یان ڕقیان لە یەکترە، واتە ئەمانە لێک نزیک دەبنەوەو جیا دەبنەوە، ئاوێزانی یەک دەبن و لێک دادەبڕێن. یەکێک لە نوســـەرانی ئەو سەردەمە لە کتێبێکدا بە ناوی (جادوی سروشتی)یەوە، (ئەڵبەت کتێبەکە بە لاتینی نوسراوەو فۆکۆ کردوویەتی بە فەرەنســـی) دەڵێت: (وەکی دەزانرێت ڕوەکیش لە ڕق و ئیرەیی لە یەکتر خاڵی نین. ئەڵێن زەیتون و ترێ ڕقیان لە کەلەرمە و خەیاریش لە زەیتون هەڵدێت.. بەو پێیەی هەموو ئەمانە

لە ڕێی گەرمی خۆر و شێی زەویەوە گەورە دەبن، ئەوا ململانێی یەک دەکەن، بە تایبەت ئەگەر ڕەگ و ڕیشـــەیان زۆر درێژ بێت، واتە زۆرترین بڕی ئاویان بوێـــت)[11]. واتە ئەمانە بۆیە ڕقیان لەیەکە و هەڵناکەن، چونکە لە هەڵمژینی ئاودا ڕکابەرن. خەڵکی ئەو سەردەمانە قەناعەتیان وابووە و بڕوایان بەم شـــتە هەبووە. ئەی نەمانوت خەڵکی ئەو سەردەمە، تەمسیلی منداڵێتی مرۆڤایەتیان کردووە؟ بەڵام ئەم کتێبە کراوەیەی سروشـــت کە لە بەرچاوماندا ڕاخراوە، پێویســـتی بە نیشانە و واژۆیەکی بچوکە لەسەر ڕوی ئەو شتانە، تا مرۆڤ لە نهێنیەکەی بگات و بزانێت مەبەست لێی چییە. یەزدان هیچ شـــتێکی دروســـت نەکردووە بێئەوەی نیشانەیەکی لەســـەر جێبهێڵێت کە تەلیسمی ئەو شتە بکاتەوەو بە مرۆڤ بڵێت چۆن چۆنی سودی لێدەبینێت. کەواتە سروشت هەروا جێنەهێڵراوەو هەموو ئەو لێکچونە ســـەیر و ناکۆتاییانەشی ڕوکاریان داپۆشیووە، لە خۆڕا دروست نەکراون، بەڵکو تێکڕا دەچنە ناو ئەو سستمەی بۆ گەردون دانراوە و بۆ خاتری ئەوەیە مرۆڤ کەڵک و سودی لێ ببینێت. بۆ نمونە بۆ ئەوەی بزانین ڕووەکی (وەردێنە) بە ســـودە بۆ نەخۆشـــی چاو، ئەوا دەبینین لەســـەر شـــێوەی گیایەک دروست بووە کە گوڵی هەیە و هەر گوڵێکیش خاڵێکی ڕەش لە ناوەڕاستەکەیدایە، بە جۆرێک تا ڕادەیەکی زۆر لە ســـپیایی و ڕەشـــایی چاو دەچێت. ئەمە ئەو واژۆ و نیشـــانەیەیە کە یەزدان لەسەری جێهێشتووە، تا مرۆڤ لە نهێنیەکەی تێبگات و بزانێت چۆن سودی لێدەبینێت. گەر یەزدان ئەو نیشـــانە بچکۆلەیەی لەســـەر ڕوی شتەکان جێنەهێشتایە، ئەوا تا دنیا دنیایە بە نهێنی دەمایەوەو کەس بۆی هەڵنەدەهات.

بەمجۆرە مرۆڤی ئەو ســـەردەمانە، لە سروشـــتدا هەموو شـــتێکیان بەسەیر و موعجیزە دەزانی و وەک نیشـــانەیەکی هێز و توانای یەزدان و چاک ڕێکخســـتنی گەردون سەیر دەکرد. واتە پێیان وابوو لە پشـــت هەموو شتێکەوە، نهێنیەکی شـــاراوە هەیە. «کرۆلیۆس» دەڵێت: (ئایا ئەوە ڕاست نییە کە دەڵێن هەرچی گژوگیا و ڕووەک و دار و درەخت هەیە لە هەناوی زەویەوە ســـەر دەردێنێت، بەم پێیەش هەریەک لەوانە بریتین لە نیشـــانە و ئاماژەی ســـیحری و نیشـــانەن بۆ بونی شـــتگەلێکی دی؟)[12]. مرۆڤی ئەو ســـەردەمە بەمجۆرە ســـەیری سروشـــتیان کردووە، واتە وەک کتێبێکی کراوە، کتێبێک پێویستی بە چاوێک هەبووە بزانێت چۆن دەیخوێنێتەوەو چۆن چۆنی نهێنی و ئاماژەکانی لێک جیادەکاتەوە.

## دوو کتێب نەک یەک کتێب:

شـــایەنی باســـە لەو ســـەردەمانەدا، دوو کتێب هەبوو نەک کتێبێک: (کتێبی سروشت و کتێبی کەلەپـــوور). هەردووکیشـــیان بە هەمان شـــێواز و بەهەمان میتۆد دەخوێنرانـــەوە: لە هەردوولایان لاپەڕەگەلێکی ســـپی هەن کە بە ئاماژەی ڕەش (واتە بە وشـــەو ســـیمبول یان دیاردەی سروشـــتی داپۆشـــراون) و پێویســـتیان بە شـــرۆڤە و لێکدانەوە هەیە. لەمەشـــدا لاپەڕەی سروشت و لاپەڕەی کەلەپوور هاوتا و چونیەکن. سروشت وەکی وتمان بۆ خۆی کتێبێکی کراوەیە و چاوەڕێی یەکێکیکە بزانێت چۆنی بخوێنێتەوەو تەلیسم و ئاماژەکانی بکاتەوە. خودی زمانیش بەشێکی دانەبڕاو بووە لەو سســـتمە گشتی و سەرتاسەریەی مەعریفە، مەبەستم لەو مەعریفەیەیە کە سەرقاڵی گەڕان بووە لە

دۆزینەوەی لێکچون لە نێوان شــتەکاندا. مەعریفەیەک بوو نەیدەتوانی بە شتێک ئاشنا بێت تەنها لە ڕێی پێچواندن و بەراوردکردنیەوە نەبێت بە شــتێکی دی، پاشــانیش پێچواندنی ئەم شتەش بە شــتێکی تر و.. هتد. کەواتە پێویســت بوو وەک چۆن دەبوو لە دیاردەکانی سروشــت بکۆڵرێتەوە، دەبوو لێکۆڵینەوە لە زمانیشدا بکرایە. ئەو ڕەگەزانەی وەک پیت و وشە و ڕستە لە زماندا هەبوون، هاوشێوەی ڕەگەزەکانی سروشت بوون لە ئاژەڵ و ڕوەک و ئەستێرە.

مەبەســت لەمەش ئەوەیە کە پێشــینان میراتیەکی گەورە وبەنرخیان لە زانســت و زانیاری بۆ جێهێشتوین و تاوتوێکردنی کتێبەکانیان بە تاوتوێکردنی ئەو ئاماژانە دەچێت کە لەسەر شتەکانی سروشــت دانراون، لەبەرئەوەی جیاوازییەک نیە لە نێوان ئەو نیشــانانەی خوا لە ســەر ڕوی زەوی دایناون، بۆ ئەوەی پەی بە نهێنیە ناوەکیەکانی بەرین، لەگەڵ ئەو وشانەدا کە لە دوتوێی کتێبەکانی کەلەپوردا هەیە و تۆزیان لێنیشــتووە، واتە کتێبی یۆنان و ڕۆمان و کەلەپووری مەســیحی بەلای ئەوروپاییەکانەوە. بەمجۆرە میراتی پێشــینان وەک خودی سروشــتی لێهات، واتە بوو بە فەزایەکی بەرفراوان لە وشە کە پێویستی بە شرۆڤەکردن و لێکدانەوە هەبوو. ئەگەر سروشت کایەیەکی بەرفراوان بێــت و ڕوکاری درەخت و گــوڵ و گژوگیا و دارو بەردیش نیشــانە و ئاماژەکانی بێت، ئەوا کتێبی پێشــینانیش فەزایەکە سەرشــارە بە وشــە و ئاماژەکان. بگرە دەکرێت ئەو قسەیە هەڵبگێڕینەوەو بڵێین سروشــت لە چاوی خەڵکی ئەو ڕۆژگارانەدا، کتێبێکی کراوە بووەو وشەکانیشی بریتی بووە لــە گوڵ و درەخت و بەرد. بەم چەشــنە خوێندنەوەی کتێبی پێشــینان ئەو زانســتەی تێدا بوو، تێکەڵ بە مەعریفەی ئەفســانەیی شــتەکان بوو. ئاشنا بوون بە سروشت لە ڕێی گەمە لێکچونە نا کۆتاییەکانەوە، لە دوا جاردا هیچ نییە جگە لە ئاشنابونێکی میتۆلۆژیانە، کە لەسەر سەرسامبون و ئەوقبون بەرامبەر دروستکراوەکانی دنیا دامەزراوە. بەهەرحاڵ سەرەنجام دەگەینە ئەوەی، حەقیقەتی هەموو ئەو سیمبول و ئاماژە و نیشانانەی لە سروشتدا هەیە یاخود لە دووتوێی کتێبەکاندا هەیە یەک شتە، ئەویش ئەوەیە ئەم شتانە هێندەی کۆنی گەردون کۆنن. لێرەدا دەگەینە خاڵێکی سەرەکی کە (ئەبستیم)ی سەدەکانی ناوەڕاست لە (ئەبستیم)ی مۆدێرنە (واتە سستمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست لە سستمی بیرکردنەوەی مۆدێرن) جیا دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە زمان لە سروشت جیا نییە، بەڵکو بەشــێکە لە سروشــت و لێی جیا نابێتەوە. بە واتایەکی دی وشەکان لە شتەکان جیا نەبۆتەوە، بەڵکو هەردووکیان پێکەوە ئاوێتەن (ناونیشــانی کتێبەکەی فۆکۆ — وشەکان و شتەکان — لێرەوە دێت).

ئەو کاتە بە شــێوەیەکی فیعلی وشــەکان لە شــتەکان جیا دەبنەوە کە سستمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست دەڕمێت و سستمی بیرکردنەوەی مۆدێرن یان دروستربلێین سستمی بیرکردنەوەی سەردەمی کلاسیک شوێنی دەگرێتەوە. «میشێل فۆکۆ» لە کتێبی (وشەکان و شتەکان) دا دەڵێت: (زمانی ڕاســتەقینە لە ســەدەی شازدەدا بریتی نەبوو لە ڕســتێک ئاماژەی ئۆتۆنۆم کە تەعبیر لە شــتەکان بکات، بەڵکو شــتێکی ئەســتور و تاریک بوو کە لێوان لێو بوو لە نهێنی و تەلیسم. لەو قۆناغەدا زمان و سروشت بوو بوونەیەک سستم و یەک بەرگ کە تیایدا ئاماژە و سیمبول و وشەکان بەناویەکدا چووبوون. بە واتایەکی دی زمان لەســەدەی شازدەدا سستمێکی هەڕەمەکی یان زاراوەیی نەبوو بۆ ئاماژەکردن بە شــتەکان، بەڵکو نرابووە ســەر ڕووی جیهان و بوو بووە بەشێکی دانەبڕاو

لێی).. ئەویش لەبەر دوو هۆ:

یەکەم/ لەبەرئەوەی شـــتەکان خۆیان واتە دیاردە سروشتیەکان، لەسەر شێوەی زمان نهێنیەکانی دەشارێتەوەو ئاشکرای دەکات.

دووەم/ لەبەرئەوەی وشـــەکان لەسەر شێواز و ستایلی شتە سروشتیەکان، خۆیان نیشانی مرۆڤ دەدا کە پێویستیان بە کردنەوەی کۆدوتەلیسمەکانی هەبوو، لەبەرئەوەی زمان کاتێک کە بۆ یەکەمجار درا بە مرۆڤ، نیشانەیەک بوو لەسەر ڕوی شتەکان دانرابوو، واتە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و شەفاف تەعبیری لە شـــتەکان دەکرد. هیچ ناوەند و ڕوبەرێک لە نێوان وشـــەکان و شـــتەکاندا نەبوو. واتە وشەکان بەو شتانە دەچوو کە بە شێوەیەکی خۆڕسک و سروشتیانە گوزارشتی لێدەکردن[١٣]. ناوەکان خرابوونە سەر ڕووی ناو لێنراوەکان، وەک چۆن هێز دەخرێتە جەستەی شێر یان وەک چۆن دەسەڵات و جەبەروتی شـــاهانە لە چاوی هەڵۆدا دەبینرییێت، یاخود چۆن کاریگەری ئەستێرەکان لەسەر ڕوی مـــرۆڤ ڕەنگ دەداتەوە. هەموو ئەمانەش بەهۆی لێکچونەوە مەیســـەر دەبێت، بەڵام ئەم دۆخە گەرم و گوڕ و ئاوێتە بونە قوڵەی نێوان وشـــەکان و شـــتەکان، لە بابلدا وێران بوو کاتێک خوا ســـزای ئەو شـــارەی داو بە تۆفانێک نغرۆی کرد بەمجۆرە زمانی سروشـــتی (واتە زمانی ڕاســـتەقینە)، بۆ هەتا هەتایـــە ئاوا بوو. لێرەوە زمانی مرۆڤـــەکان دابەش بوو، واتە بوو بە چەندین زمانی جیاجیا و جۆراو جۆر، لە کاتێکدا پێشتر تەنها زمانێک لەسەر زەوی هەبوو. لێرە بەدواوە زمان لە شتەکان نەدەچوو، ئەو پەیوەندیە سروشتیەی بە شتەکانەوە نەما، مەگەر تەنها یەک زمان نەبێت کە وەک شایەدحاڵێک بۆمان مایەوە، تا شایەتیمان بۆ بدات لەسەر ئەو سەردەمە زێڕین و ئەفسانەییەی ئامێتەبونی نێوان وشـــەکان وشـــتەکان. ئەویش زمانی کتێبی پیرۆز بوو بەلای جولەکەو مەسیحیەکانەوە (واتە یەکەم زمانی عیبری و دووەمیشـــیان زمانی ئارامی). تەنانەت هەندێ لە بیریارانی ســـەدەکانی ناوەڕاســـت پێیان وایە، بەر لە تۆفان زمانێک هەبووە کە لە ئاماژەکانی سروشت خۆی پێکهاتووە. ئەم زمانە بە جۆرێک بووە پیتەکانی توانای ئەوەیان هەبووە، ڕاســـتەوخۆ کاریگەری لەسەر سروشت جێ بهێڵن. واتە هێندە بەس بووە مرۆڤ وشـــەیەک بدرکێنێت، بۆ ئەوەی ئەو شـــتەی هاوتا و بەرامبەریەتی لە جێی خۆی بجوڵێت بەم لایان بەولادا. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە وشـــە بریتی بووە لە شت و شتیش بریتی بووە لە وشە، بە واتایەکی دی سروشت زمان بووە و زمانیش سروشت. مەعریفەی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە لە گواستنەوە لە زمانەوە بۆ زمان، پەنهان بوو. بریتی بوو لە سەر لەنوێ ڕێکخستنەوەی ئەو پانتاییە گەورە و فراوانەی وشەکان و شتەکان[١٤].

## 4-وەڵام و ڕەخنەکان:

بەمجۆرە لە باسکردنی (ئەبستیم)ی سەدەکانی ناوەڕاست بوینەوە بە شێوازی «میشێل فۆکۆ»، بەڵام تا ئێستا وەک پێویست پێناسەی (ئەبستیم)مان نەکردووە. ئێمە ئەم زاراوەیەمان بە سستمی بیر وەرگێڕاوەتە ســـەر زمانی عەرەبی، دەشـــمان توانی بە پێکهاتەی مەعریفیش وەیبگێڕین کە بۆ ماوەیەک و لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا باڵا دەست دەبێت[١٥].

یەکەم شـــت پێویســـتە ئەوە بڵێین کە وشەی (ئەبســـتیم — episteme) لە ئەسڵدا وشەیەکی

گریکیە و مانای زانســـت دەگەیەنێت، بەڵام هەمیشە جیاوازی لە نێوان مانای ئەسڵی وشەکە و مانا زاراوەییەکەیدا هەیە. ئەڵبەت «میشێل فۆکۆ» مەبەستێکی تری لێی هەیە، ئەو کتێبێکی چوارسەد لاپەڕەیـــی تەواوی بۆ خاتری فۆرمەلاکردنی یەک زاراوە نوســـیوە! بەلای ئەوەوە (ئەبســـتیم) مانای زانســـت نییە، بەڵکو ئەو شـــتەیە کە وا دەکات لە قۆناغێکی تایبەتی و لە ژینگەیەکی دیاریکراودا زانســـت مومکین بێت. واتە ئەو ژێرخانە ئارکیۆلۆژیەیە وا دەکات لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوییدا، ئەگەری هاتنە ئارای زانســـت شـــیاو بێت. هەر کاتێکیش ئەم ژێرخانە پوکایەوەو لێک هەڵوەشـــا، ئیـــدی زەمینەیەکی تازە تر و سســـتمێکی بیرکردنەوەی نوێ جێگەی دەگرێتەوە. لە چرکەســـاتی دیکارتیزمیشـــدا ئەم پرۆســـەیە ڕوویدا، کاتێک سستمی ئەبستمۆلۆژی ســـەدەکانی ناوەڕاست داڕما و سســـتمی سەردەمی کلاســـیک (واتە ئەو پێکهاتە مەعریفیە شـــوێنی گرتەوە کە تایبەت بوو بە سەردەمی کلاسیکی بە درێژایی سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم).

لێرەدا دیدگای «فۆکۆ» لە دیدگای زۆربەی زۆری مێژونوســـانی فیکر لە ئەوروپا جیا دەبێتەوە، سەبارەت بەم خاڵە (واتە سەبارەت بە دابڕانی دیکارتی)، چونکە ئەوان پێیان وایە گرنگی «دیکارت» لەوەدایە کە توانی زانستی میکانیک و ماتماتیک بەسەر سروشتدا پراکتیزە بکات، تا بەشێوەیەکی زانســـتی تاوتوێی بکات و لێی بکۆڵێتەوە، لە کاتێکدا پێشـــتر بەشـــێوەیەکی چۆنایەتی و ڕەمزی و زەینی دەکرا. بێگومان «فۆکۆ» ئەم لایەنە فەرامۆش ناکات، بەڵام پێی وایە شـــتە سەرەکی و گرنگە کە لە جێگەیەکی ترە. لە هەرەســـهێنانی ئەو دنیا بینیە ئەفسانەییەدایە کە بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاســـت و تا کۆتایی ســـەدەی ڕێنیســـانس، بەســـەر بیرکردنەوەی ئەقڵی مرۆڤایەتیدا زاڵ بوو. ئـــەوەی «دیکارت» ڕەتی دەکاتەوە بەراوردکردنی شـــتەکان نییە بە یەکتری، بـــە پێچەوانەوە ئەو بەراوردکردن بەسەر تەواوی شتەکاندا ئەگشتێنێ بەڵام لەسەر دەستی ئەو ئەم بەراوردکردنە دەبێتە بەراوردکردنێکی چەندایەتی و ماتماتیکی، نەک بەراوردکاریەکی ئەفسانەیی و ڕەمزی. گرنگیدانیشی بـــە جەبر و ماتماتیک و هەوڵـــی دامەزراندنی فیزیایەکی نوێش لەگـــەڵ «کیبلەر» و «گالیلۆ»دا، لێرەوە سەرچاوە دەگرێت.

سستمی شـــتەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەدا، لەسەر دەستی «دیکارت» و «گالیلۆ» گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات. لەو مێژووە بەدواوە سستمێکی بیرکدنەوەی نوێ کە لەسەر جیاکردنەوەی دال و مەدلول، ئاماژە و ئاماژە بۆکراو، وشـــەکان و شـــتەکان دامەزرابوو، هاتە ئاراو شوێنی سستمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاســـتی گرتەوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو «فۆکۆ» دەیویست کتێبەکەی ناوبنێت (سستمی شتەکان)، بەڵام دواتر لەسەر (وشەکان و شتەکان) ساغ بووەوە.

ئەو پرسیارە سەرەکیەی «فۆکۆ» لەو کتێبەیدا ئەیوروژێنێت ئەوەیە کە: (چۆن چۆنی سستمی شتەکان لە ناخەوە دەگۆڕێن؟ چۆن وای لێدێت مرۆڤ لەماوەی چەند ساڵێکدا تێگەشتنی بۆ شتەکان دەگۆڕێت و بە شێوەیەکی تر بیریان لێدەکاتەوەو سەیریان دەکات؟). بێگومان مێژوی بیرکردنەوە لە خۆرئاوا بە ئاسانی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوەو دەڵێت: (ئەقڵانیەت بۆ یەکەمجار لە ئەوروپای سەدەی حەڤدەهەمدا سەرکەوت و ئەو بیرو باوەڕە کۆن و خورافیانەشی بۆ زیاد لە سەدەیەک خەڵک قەناعەتـــی پێیان هەبوو، پەراوێزکەوتن و ئاوابوون). بەڵام ئەم وەڵامە تینوێتی بیریارێکی ڕادیکاڵی وەک «میشێل فۆکۆ» ناشکێنێت، چونکە ئەو زیاد لە پێویست حەدییە و ویستی وایە ئارکیۆلۆژیای

زانســـتە مرۆڤایەتیەکان یاخود ئارکیۆلۆژیای مەعریفە دابمەزرێنێت، بەجۆرێک کە شـــوێنی مێژوی بیرکردنەوەی باوبگرێتەوە، لەبەرئەوەی بەبۆچونی ئەو بیرکردنەوەی باو زیاد لە پێویســـت ئاســـان و ڕوکەشە. مەسەلەکە هەر چۆنێک بێت کۆدەنگیەک لە نێوان سەرجەم زانایانی ئەوروپیدا هەیە لەسەر ئەوەی کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا دابڕانێک ڕویداوە[١٦]. بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەم دابڕانە لە بۆچونی «میشـــێل فۆکۆ»دا زیاد لە پێویست ڕادیکاڵ و پەڕگیرانەیە. ئەمەش سەرچاوەی ئەو ڕەخنانەیە کەلەکتێبە مەزنەکەی دەگیرێت (کتێبی وشەکان و شتەکان).

ئەوەی ڕاســـتی بێت کتێبی (وشەکان و شتەکان)ی «میشـــێل فۆکۆ»، لە ناو ناوەندە فەلسەفی و مەعریفیەکانی ئەمریکا و ئەوروپادا زۆری لەســـەر نوســـرا. بەجۆرێک ئەستەمە بتوانین بە ژمارە تێکڕای ئەو ڕەخنە و وەڵامانە دیاری بکەین کە ئاڕاستەی کتێبەکە و تێزە سەرەکیەکەی کران. وەکی دەشـــزانرێت «فۆکۆ» لە ســـاڵی ١٩٦٦ و دوای بڵاوبونەوەی ئەم کتێبە شۆڕەت و ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد. تەنانەت گەورە فەیلەسوفێکی وەک «یۆرگن هابرماس» سەرەڕای ڕەخنەی زۆری، کۆ لەوە ناکاتەوە کە کتێبەکە بە (سەیر و بلیمەت) ناونوس بکات[١٧].

«فۆکـــۆ» لەم کتێبـــەدا بۆمان ڕونناکاتەوە، چـــۆن چۆنی لە سســـتمێکی بیرکردنەوەی کۆنەوە دەچین بۆ سستمێکی بیرکردنەوەی تازەتر. ئەو تەنها ئەوەمان پێدەڵێت کە: (سستمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست دارماو ئاوا بوو، لە بەرامبەردا سستمی هزری کلاسیکی یاخود دیکارتی شوێنی گرتەوە، ئەمیش لەلای خۆیەوە دوای سەدەو نیوێک هەرەسی هێناو سستمی فیکری مۆدێرن شوێنی گرتەوە).

لەبەرئـــەوە «فۆکۆ» باس لەیەک دابـــڕان ناکات لە مێژوی فیکری ئەوروپیدا، بەڵکو باس لە دوو دابڕان دەکات: یەکەمیان، لە دەوروبەری ساڵی ١٦٣٧ ڕودەدات کە سەروەختی بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی «دیکارت»ە (وتارێک دەربارەی میتۆد) و چرکە ســـاتی کۆدێتای دیکارتیزمەبەســـەر «ئەرســـتۆ» و شوێنکەوتوانیدا. دووەمیان، لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەدایە کە ساتەوەختی سەرهەڵدانی زانســـتە مرۆڤایەتیەکانە لە ئەوروپا و بڵاوبونەوەی کتێبە سەرەکیەکانی «ئیمانوێل کانت»ە.

«فۆکۆ» هیچ ڕایەڵێک یان هیچ پردێک لە نێوان سســـتمی کۆن و ســـســـتمی بیرکردنەوەی تازەدا ناهێڵێتەوە. واتە ئەو بڕوای بەو پەیوەندی و بەردەوامێتیە نییە کە لە نێوان ســـەرجەم قۆناغەکانی بیری مرۆڤایەتیدا هەیە، بەڵکو تەنها گرنگی بە پرسی دابڕان دەدات کە زۆر جار خەسڵەتێکی ئاڵۆز و تەلیســـماوی هەیە. لەبەر ئەمەشـــە لە ڕووی ئەپســـتمۆلۆژیەوە «فۆکۆ» بە نائەقڵانیەت تاوانبار دەکرێت و تەنانەت وەک کەسێکی نیچەویی حساب دەکرێت کە دەیەوێت هەموو شتێک وێران بکات و ئاگر لە هەموو شتێک بەربدات. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو ستایلە ئاگرین و توندوتیژەیە کە هەیەتی. گومانی تێدانییە ئەو ســـتایلەی ئەو زۆر ســـەیر و ســـەرنج ڕاکێشـــە، بەڵام وەک نەیارەکانی دەڵێن، مەترســـیە بۆ سەر هاوسەنگی مەعریفە. ســـتایلی «فۆکۆ» زیاد لە پێویست شیعری و جوانە، بەم پێیەش وەک ئەو ڕەخنەگرە ئەقڵانیانە دەڵێن: (بۆ کتێبی فەلسەفی دەست نادات).

ڕەنگە ناوبانگی زۆری ئەو کتێبە بگەڕێتەوە بۆ قەشـــەنگی ئەو ستایلی نوسینەی پێی نوسراوە، لەگەڵ ئەو تێزە تازەیەی باسی لێکردووە. ئەوانەی ڕەخنە لە «فۆکۆ» دەگرن دوو ڕەخنەی سەرەکیان

هەیە:

یەکەم/ عەدەمیەتی دابڕان یان نەبونی هیچ پرد و ڕایەڵێک لە نێوان سســـتمی بیرکردنەوەی کۆن و تازە (پێش و پاشتر)دا.

دووەم/ سەراپاگیری (ئەبستیم) کە تێکڕای جۆرەکانی زانست دەگرێتەوە، لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوییدا. با لێرە بە دواوە کەمێک بە درێژی باس لەم دوو خاڵە بکەین:

## 1-دابڕانی ئەبستمۆلۆژی یەکەم (1637)، ساتەوەختی "دیکارت":

وەکی باســـمان کرد ئەمە ئەو دابڕانەیە کە کۆتایی بە ســـەردەمی ڕێنیســـانس دێنێت و دەرگا بە ڕووی ســـەردەمی کلاســـیکدا دەکاتەوە لە خۆرئاوا (واتە لە ســـەردەمی حەڤدە و هەژدەدا). وەکی ئاشـــکرایە سستمی بیرکردنەوە لە سەردەمی ڕێنیسانسدا لێکچون و سیحر و مەعریفەی گریمانەیی بەسەریدا زاڵ بوو، زیاد لەوەی پشت بە سەرنج و تێبینی ورد و سەلماندن ببەستێت. پێویستە ئەو هەوڵە زانســـتیانەی سەردەمی ڕێنیســـانس بۆ تێگەیشتن لە میراتی فیکری یۆنان و ڕۆمان فریومان نـــەدەن، چونکە مەعریفەیەکی کرچ و کاڵ بوو نەک ئەقڵانی، بەڵام ئەمە ئەوەش ناگەیەنێت کە هیچ ئەقڵانیەتێکی تێدا نەبووە. لە چرکەساتی «دیکارت»ەوە سستمی شتەکان دەستیان بە داڕمانکرد، تا سستمێکی تر کە پشتی بە جیاکاری ژمارەیی و ئەقڵانی دەبەست نەک لێکچون و سیحری نێوان شـــتەکان، جێگەی بگرێتەوە. لێرەوە ســـســـتمێکی نوێ بۆ شتەکان هاتە ئارا و نواندن بوو بە ڕۆحی (ئەبســـتیم)ی کلاســـیک یاخود سستمی بیری کلاسیکی. لێرەدا مەبەســـتمان لە نواندن ئەوەیە کە سروشـــت بوو بەوەی لە فیکردا ئەنوێنرێت و بەو جۆرە نەمایەوە کە لەگەڵ فیکردا ئاوێزانی یەکبن. واتە شتەکان لە وشەداو بە هۆی وشەوە ئەنوێنران، نەک ئاوێتەی وشەکان بن.

واتە ئەرکی ئاماژە و وشەکانی فیکر بوو بەوەی کە شتەکان بنوێنێت و گوزارشتیان لێبکات وەکو خۆیـــان چۆن هـــەن، دوای ئەوەی نێوانێکی لە نێوان خۆی و ئەواندا دروســـت کرد و جیابوونەوە لە نێوانیاندا ڕویدا. بەمجۆرە دەبینین سستمی شتەکان یاخود (سستمی گەردون) لە ناخەوە هەڵتەکی. دوای ئەوەی کە پێشتر ئاماژە لەگەڵ شتەکاندا ئاوێتەی یەکتری بوو بون و پێکەوە بوو بوونە یەک جەســـتە، لە قۆناغی تازەدا ڕۆڵی بوو بە نواندن و نوێنەرایەتیکردنی ئەو شتە، واتە گوزارشت کردن لێی بەو پەڕی بێلایەنیەوە.

ئەم سستمی نواندنە، (واتە نواندنی شتەکان و گوزارشتکردن لێی بە هۆی فیکرەوە)، پشتی بە دوو شتی سەرەکی دەبەست:

یەکەم/ زانستی ماتماتیک یان زانستی گەردونی بۆ پێوانەکردن و ڕێکخستن.

دووەم/ زانســـتی پۆلێنکردن، واتە پۆلێنکردنی شـــتەکان لە چەند خشـــتەیەکدا بە پێی جۆر و نزیکایەتیـــان لە یەکتر، (بۆ نمونە وەک پۆلێنکردنی ڕووەک و ئاژەڵ). بەمجۆرە ئەقڵی ئەوروپی بە جۆرێکی زۆر ڕادیکالانە تر و بەشێوەیەکی ئارکیۆلۆژیانە لە شتەکانی دەڕوانی. هەر بۆیە تێبینی ورد و پێوانەکاری و سەلماندن، بوون بە میتۆدی مەعریفە و زانین، نەک ئەو دیدگا میتۆلۆژیەی پشتی بە لێکچونی ڕوکەشانە دەبەست. لێرەوە و بۆ یەکەمین جار وەک «میشێل فۆکۆ» دەڵێت: (ئەقڵی ئەوروپـــی پێینایە قۆناغی کامڵی و بەرپرســـیارێتی فیکریەوە). ئەو ڕەخنەیـــە چیە کە لەم تێزە

سـەرەكیە دەگیرێت؟ هەندێ بیریار پێیان وایە «فۆكۆ» دابڕانێكی ڕەهای لە نێوان ئەبستیمیەتی سـەردەمی ڕێنیسانس و ئەبستمیەتی سەردەمی كلاسیک دا دروست كردووە. گومانی تێدا نییە لـە نێوان ئەو دوو قۆناغەدا دابڕان ڕویدا، بەڵام بەو ڕادەیە نەبوو كە «فۆكۆ» باسیدەكات، ئەوێک كە كوشتەی شـۆڕش و كۆدێتا و دابڕان بوو. ئەوانەی ڕەخنەی لێدەگرن دەڵێن: (گەر تیۆریاكەی فۆكۆ پەیڕەو بكەین، ناچار دەبین كۆپەرنیكۆس لە ڕیزی ئەبستیمی پێشـودا پۆلێن بكەین و ئەو كات نەماندەتوانی كارە زانستیە پێشـەنگەكانی لەگەڵ كارەكانی دواتری كیبلەر و گالیلۆدا بەیەک بگەیەنیـن، چونكـە بە پێی زەمەن بەندی فۆكۆ هەریەک لە كلیبەر و گالیلۆ سـەر بە سـەردەمی كلاسیكین، واتە سەر بە سستمێكی فیكری دیكەن). كەواتە دەبێت چی بكەین و چۆن ئەم كێشەیە چارەسـەر بكەین؟ ئایا ڕەوایە بۆ ئێمە «كۆپەرنیكۆس» فڕێدەینە ناو كایەی سستمی بیركردنەوەی كۆن، لە كاتێكدا ئەو بۆتە سـیمبولێک بۆ نوێكردنەوەی زانستی، تا ئەو ڕادەیەی خەڵک وا ڕاهاتون كە هەموو تازەكردنەوەیەكی گەورە بە (شۆڕشێكی كۆپەرنیكی) وەسف بكەن؟

بێگومان «كۆپەرنیكۆس» لە ژێرباری دیدگا میتافیزیكی و تیۆلۆژیەكانی سـەردەمەكەیدا بوو، بەڵام مێژونوسـانی زانست جەخت لەوە دەكەنەوە كە تەنها لە ڕێی ماتماتیكەوە گەیشت بە بیردۆزە گەردونیـە گەورەكـەی، بەبێ هیچ یارمەتـی و كۆمەک پێكردنێک لەلایەن ئـەو بیروڕایانەی خاوەن خەسـڵەتێكی سیحری و میتۆلۆژی بوون و لەو سەردەمەی ئەودا باوبوون. كەواتە «میشێل فۆكۆ» زوڵم لە «كۆپەرنیكۆس» دەكات، هەر لەبەرئەوەی لەسـەدەی شـازدەهەمدا ژیاوە نەک لە سـەدەی حەڤـدەدا. ئەی كەواتـە چی لەو ڕابەرو پێشـەنگانە بكەین كە پێش سـەردەم و ڕۆژگاری خۆیان دەكەون؟ ئایا ئەوانیش وەک تێكڕای خەڵكی تر دەچنە ژێر باری هەمان ئەبستمیەوە؟ ئایا نابێت (ئەبستیم) كەمەكێک شێلگیرانە تر بێت لەوەی «فۆكۆ» مەزەندەی دەكات؟

وەكی ئاشـكرایە «كۆپەرنیكۆس» یەكەم كەس بوو باسی لەوەكرد ئەوە زەوییە بە دەوری خۆردا دەسـوڕێتەوە نەک بە پێچەوانەوە، بەمەش ئەو بیروباوەڕەی توشـی شـۆک كرد كە لە سـەردەمی «ئەرستۆ»وە خەڵک قەناعەتیان پێهێنا بوو. بەم كارەش ژیانی كەوتە بەر مەترسی (ئەمە لە ساڵی ١٥٤٣ دا بوو، واتە لەناوجەرگەی سـەدەی شـازدەهەمدا بوو كە فۆكۆ پێیوایە بە گشتی ئەو سەدەیە ملكەچی سستـمی بیركردنەوەی كۆن بووە. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو بەم كارەی مرۆڤە بلیمەتەكانی فەراهـەم كردووەو لەگەڵ تەواوی خەڵكانی تردا كردونیەتیە یەک بەرەوە، هۆكارەكەشـی ئەوەیە كە باوەڕی بە دابڕانی ئەبسـتمۆلۆژی ڕەها هەبووە). لەلایەكی دیكەشەوە وەكی دەزانرێت «كیبلەر» كە سـەدەیەک دوای «كۆپەرنیكۆس» هات، دان بەوەدا دەنێت ئەو چ كاریگەریەكی لەسـەر دۆزینەوە زانسـتی و گەردونیەكانی هەبووە. دەكرێت هەمان شـتیش دەربارەی «گالیلۆ» بڵێین. فەرهەنگی (لارۆس)ی فەرەنسـی دەڵێت: (كیبلەر گەردونناسێكی ئەڵەمانیە و ساڵی ١٥٧١ هاتۆتە دنیاوەو لە ساڵی ١٦٣٠ كۆچی دوایی كردووە. یەكێک بووە لە لایەنگرە سەرسەختەكانی تیۆریاكەی كۆپەرنیكۆس كـە دەڵێت: خۆر سـەنتەری گەردونە نەک زەوی). ئەمەش ئـەوە دەگەیەنێت كە لە مێژوی فیكردا بەردەوامێتیـەک هەیە، نەک بە تەنها هـەر دابڕان هەبێت. «فۆكۆ»ش بە هەڵەدا چووە لەوەی تەنها گرنگی بە دابڕان دەدات و بەردەوامێتی فەرامۆش دەكات. چونكە وەک ئاقاری ئەبستمۆلۆژیای ئەقڵانی دەڵێت: (لە مێژوی زانسـتدا نمونەی زۆرمان هەیە دەیسـەلمێنێ زانست و زانیاری سەردەمانێک،

بونەتە سەرچاوەو ژێدەری سەردەمانی دوای خۆیان و یەکتریان تەواو کردووە).

## 2- دابڕانی ئەبستمۆلۆژی دووەم لە مێژوی فیکری ئەوروپیدا ( 1781)، چرکەساتی "ئیمانوێل کانت":

بە زمانێکی ئاگرین و بەشـێوازێکی ئەفسـوناوی سەرنج ڕاکێش، «میشـێل فۆکۆ» دەنوسێت: (لە دوا سـاڵەکانی سـەدەی هەژدەهەمدا دابڕانێک ڕویدا، وەک ئەو دابڕانەی لە بەرایییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا فیکری سەردەمی ڕێنیسانسی کەنارگیر کرد. لەو سەردەمەدا پرۆسەی لێکچون کۆتایی هات و خشتەی شوناسەکان و وێناکردنەکان دەستی پێکرد. ئەمێستاش ئەو قۆناغە خەریکە کۆتایی دێت و مەعریفەیەکی نوێ شـوێنی دەگرێتەوە. دابڕانێکی تر دروسـت دەبێت، چۆن ئەو دابڕانەی بازنەکانی باراسـیلس یان لە سستمی دیکارتی جیاکردەوە)[١٨]. ئێستا جارێکی تر خۆمان لە بەردەم دابڕانێکی دیکەدا دەبینینەوە، ئەمەش مەسـەلەیەکە «میشـێل فۆکۆ»ی تـا ئەو پەڕی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە. هەموو بیریارێکی مەزن، دڵخوازی شتێکە و بە پرسێکەوە سەرقاڵە.

ئەم دابڕانەی دووەم، زەمینە خۆش دەکات بۆ هاتنە ئارای زانستە مرۆڤایەتیەکان، یان بۆ هاتنە ئـارای مرۆڤ بۆ یەکەمجار لە کایەی فیکری ئەوروپیـدا. لەبەرئەوەی مرۆڤ وەک «فۆکۆ» دەڵێت: (داهێنراوێکـی تازەیـە، وەلێ زوو بە زوو پیـر دەبێت و ئاوا دەبێت...). هەموو ئەم شـتانە یانی چی؟ گەربێتو واز لە زمانی ئەبسـتراکتی فەلسـەفی بێنین، ئەو زمانەی لە ئاسـمانی فیکردا بەرز دەفرێـت و دابەزینە سـەرزەمینی واقیع، دەتوانین وتەزاکەی «فۆکۆ» بەم شـێوەیە وردبکەینەوە: (فۆکۆ پێیوایە مرۆڤ لەو کاتەوە بوو بە بابەتی مەعریفە کە لە سـەرەتای سـەدەی حەڤدەهەمدا کانت پرسیارە بەناوبانگەکەی خۆیکرد: مرۆڤ چییە؟). بەر لەوە باس لە سروشتی ئینسانی دەکرا، نەک باس لە مرۆڤ بکرێت وەک بونەوەرێکی بەرجەسـتە و هەسـت پێکراو. ئەوانە پێیان وابوو لە مرۆڤدا نهێنیەک و جەوهەرێکی پەنهان هەیە کە شـاعیران زۆریان بەسـەریدا خوێند و بیریارانیش لە ئاسـتیدا دەستەوسـتان بوون، بەڵام زانسـتی مرۆڤایەتی نوێ، بڕوای بەوە نییە نهێنیەک یان شتێکی لەو بابەتە لە مرۆڤدا هەبێت. مرۆڤ ئەو بونەوەرە بەرچاوەیە کە قسە دەکات (زانستی زمان یان فیلۆلۆگیا)، دەژی و زاووزێ دەکات (زانسـتی بیۆلۆگیا)، کار دەکات و بەرهەم دێنێت (زانستی ئابووری). لەڕێی ئەم سـێ زانستەوە دەتوانین بە حەقیقەتی مرۆڤ ئاشنا بین، نەک لە ڕێگای ئەو تێڕامانە میتافیزیکاییانەوە کە بەردەوام پرسـیار لە نهێنی و تەلیسـم و ناخ و جەوهەری سروشتی مرۆڤ دەکات.

بەمجۆرە مرۆڤ بۆ یەکەمجار هاتە سـەر شـانۆی مێژوو، ڕاستە مرۆڤ بەر لە سەدەی نۆزدەهەم خودێکی هۆشـیار بوو، هەروەها ئەوەش ڕاستەکە «دیکارت» مرۆڤی فەرامۆش نەکردبوو، بەڵام وەک خودێکی بە ئاگا و هۆشیار کە دەیەوێت شتەکان بە ئەقڵانی بکات و کۆنترۆڵی سروشت بکات، بیری لە مرۆڤ دەکردەوە. سـەردەمی کلاسیک هەرگیز وەک بابەتی مەعریفە بیری لە مرۆڤ نەکردۆتەوە. بۆ یەکەمجار لە مێژوودا، لە سـەدەی حەڤدەهەمدا لە یەککاتدا مرۆڤ بوو بە خودێکی هۆشـیار و بابەتێـک بۆ مەعریفە. هاوکات بۆ یەکەمجاریش مرۆڤ پرکێشـی ئـەوە دەکات خودی خۆی بکاتە بابەتێک بۆ توێکاری زانستی و لێکۆڵینەوەی ورد، وەک هەر بوونەوەرێکی دیکەی ناو گەردون.

مرۆڤ بەر لە سەدەی نۆزدەهەم شتێکی بیرلێنەکراوە بوو[١٩]، نەدەکرا نە بیری لێ بکرێتەوە و نە ڕوناکی بخرێتە سەر. ئەگەر ئەبستمیەتی سەردەمی کلاسیک یان سستمی بیری کلاسیک درزی نەبردایە و کەنار نەکەوتایە، ئەستەم بوو مرۆڤ بێتە ناو کایەی مەعریفەی ئەوروپی و ببێتە بابەتی قسە لەسەرکردن، چونکە لەگەڵ داڕمانی سستمی فیکری کۆندا، گۆڕەپانەکە چۆڵ دەبێت و بوار لەبەردەم دەرکەوتن و هاتنە ئارای بابەتی نوێی مەعریفەدا دەڕەخسێت. هەر کاتێک کایەکە لەلایەن گوتارێکەوە پاوانکرابێت و گوتارێکی تێدا باڵا دەست بێت، گوتارێکی دیکەی تازە بۆی نیە داخڵ بێت و خۆی ئیعلان بکات.

زانستە مرۆڤایەتیەکان دوای ئەوەی بە مرۆڤ ئاشنا دەبێت و پەی بە هەموو ڕەهەندەکانی دەبات، ئیتر مرۆڤ کۆتایی دێت. لێرەوە ئەو دەستەواژە بەناوبانگە سەرچاوە دەگرێت کە «فۆکۆ» کتێبەکەی پێ قوفڵ دەدات و باس لە (مردنی مرۆڤ) دەکات. ئەم قسەیە ناڕەزاییەکی زۆر و هەڵڵایەکی گەورەی لەناو ڕۆشنبیرانی فەرەنسادا نایەوە.

ئەڵبەتە «فۆکۆ» کە باس لە مەرگی مرۆڤ دەکات، مەبەستی مردنی ئاسایی نییە و ناڵێت مرۆڤایەتی بە تەواوەتی لە ناو دەچێت (وەک ئەوەی هەندێ لەمە تۆقیون)، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە مرۆڤ وەک بابەتێک بۆ زانین، لە کایەی فیکری ئەوروپیدا ئاوا دەبێت، بۆ ئەوەی بابەتێکی تازەی دیکە کە تا ئێستا نازانین چییە، جێگەی بگرێتەوە. بە واتایەکی دی ئەو ئەبستمیەی دەرفەتی بۆ لەدایکبونی مرۆڤ ڕەخساند تا ببێتە بابەتی سەرەکی مەعریفە، ڕۆژێک دێت هەرەسدێنێت و کۆتایی دێت، وەک چۆن ئەبستیمی سەردەمی کلاسیک هەرەسیهێنا. بەو پێیەی ئەو ئەبستمیەی ئێستا لە سەری دەژین و ئاڕاستەمان دەکات بریتییە لە ئەبستیمی مۆدێرنیزم، ئەوا ئەوەی دواتر دێت بریتی دەبێت لە ئەبستیمی پۆست مۆدێرنیزم Post modernisme. لێرەوە بیریارە ئەوروپاییەکان دەستیانکرد بە قسەکردن دەربارەی سەردەمی پۆست مۆدێرن، ئەویش بریتیە لەو سەردەمەی ئێستاکێ تێیدا دەژین، یان ورتر بڵێین ئەو سەردەمەیە کە ئەوروپاییەکان تێیدا دەژین (چونکە ئێمە تا هەنوکەش لە سەردەمی بەر لە مۆدێرنەدا دەژین). بەمجۆرە دەبینین زەمەنبەندی ئەبستمۆلۆژی بۆ مێژوی فیکر و دیاریکردنی پێگەکان بەوردی، زۆر کارێکی پێویستە بۆ ئەوەی شتەکان تێکەڵ بە یەکتر نەبن و توانای بینینی دیمەنەکەمان بە تەواوەتی نەبێت.

هەموو ئەم شتانە لەسەر ئاستی فەلسەفی یانی چی؟ هەندێک پێیان وایە فیکری «میشێل فۆکۆ» کە گەورەترین ڕەخنەی ئاڕاستەی مۆدێرنە و شارستانیەتی خۆرئاوا کرد، بەرچە کردارێک بوو لە بەرامبەر چەند ڕوداوگەلێکی سەرەکیدا:

یەکەم/ شارستانیەتی خۆرئاوا، ئەو شارستانیەتەی چەندێک بە باڵای پرانسیپەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و فەلسەفەی هیومانستی سەردەمی ڕێنسانسدا هەڵیدا، نەیتوانی لەسەر ئاستی ناوخۆ بەر بە دیاردەی فاشیزم و نازیزم بگرێت، لەسەر ئاستی دەرەکیش خۆی لە دیاردەی کۆلۆنیالیزم و داگیرکردن بەدور بگرێت. لە ناوەوەو دەرەوەی ئەوروپادا، بە ناوی مافەکانی مرۆڤەوە، بێڕێزی بەرامبەر بە مرۆڤ کرا! بۆیە دەبێت ژیاری خۆرئاوا کەمەکێک لەو فیز و لوت بەرزییەی کەم کاتەوە و دان بەوەدا بنێت کە لە پرانسیپەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و ئەقڵانیەتی «دیکارتی و ئیمانوێل کانت» لایداوە.

پێویستە دان بەوەدا بنێت کە باڵادەستی لە ئاستی مەعریفیدا گۆڕیوە بە هەژمونێکی دەسەڵاتخوازی، بە مەبەستی چەوسانەوەی چینی کرێکاران و پەراوێزکەوتەکان لە ناوخۆدا و پاشان بۆ ملکەچپێکردنی وڵاتانـــی کۆلۆنیالیزەکراو لە دەرەوە . دەبێت ئەوروپا دان بەوەدا بنێت کە دەســـتبەرداری هیومانیزم بـــووە و ژێرپێی خســـتووەو مافی ئەوەی نیە بـــاس لە مافەکانی مرۆڤ بکات. لێـــرەوە ئەو بابەتە دێتە ئارا کەجێ گرنگی پێدانی زۆری «فۆکۆ» دەبێت لەســـەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، ئـــەو بابەتەش پەیوەندی نێوان گوتار و دەســـەڵات یاخود نێـــوان مەعریفە و هەیمەنەیە . ئەم بابەتە جێی گرنگی پێدانی گەورە فەیلەســـوفانی ئەوروپا بووە، هەر لە پەنجاکانی ســـەدەی ڕابردووەوە تا ئەمڕۆ.

دووەم/ یەکەم کتێبی گەورەی «فۆکۆ» (مێژوی دێوانەیی لەسەردەمی کلاسیکدا)، لە ساڵی ١٩٦١ دا بڵاوبووەوە، واتە لە گەرمەی شەڕی جەزائیریدا بوو. ئەو کات کەس نەمابوو ئەوە نەزانێت کە قەتڵ و عامی ترسناک لە دژی شۆڕشگێڕە جەزائیریەکان ڕویداوە، ئەمەش بۆ خۆی پێچەوانەی سەرەتاکانی مافی مرۆڤ و بەهای مۆدێرنە و ئەقڵانیەتی سەردەمی ڕۆشنگەری بوو. ئێستاش کە چل ساڵ بەسەر ئەو مێژووەدا تێدەپەڕێت، ویژدانی فەرەنسا ناتوانێت ڕوبەڕوی ئەو ڕاستیە بێتەوە . بە واتایەکی دی ئەقڵی ئەوروپی لە ماوەی شـــەڕە کۆلۆنیالیزمیەکانیدا، ژێری لەدەســـت دابوو. «میشێل فۆکۆ» بەو هەڵکۆڵینە ئارکیۆلۆژیانەی دەیویست، لەڕەگوڕیشەی ئەقڵانیەتی خۆرئاوا بگەڕێت، بۆ ئەوەی ڕێژەیی بون و مێژویی بونی ئاشکرا بکات. لەبەر ئەمە «فۆکۆ»، زۆرێک لە بیریارە ڕاسترەوەکانی فەرەنسای جاڕســـکردو جۆرەهاناو و ناتۆرەیان لێنا، وەک: (ڕوخێنەر و تێکدەر و شـــاز و دەرچوو لە یاســـا و.. هتد)، بەڵام مێژوو دەیســـەلمێنێ کـــە تەنها بیریارە ڕەخنەگر و ســـەرەڕۆکان دەتوانن، کەموکوڕی ولادانەکان دەست نیشان بکەن و شارستانیەتەکان نوێ بکەنەوە .

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١-بڕوانە خوێندنەوەمان بۆ فیکری «ئیبن ڕوشد» لە کتێبی: (سەرەتایەک دەربارەی ڕۆشنگەری ئەوروپی)، لاپەڕە (٥٨) و لاپەڕەکانی دواتر.

2-Alann de Libera, La Philosophie Medieval, Paris, P.U.F, 2004.

٣-جگە لەو کتێبەی لە ئێستادا بۆتە بەرهەمێکی کلاسیکی، بڕوانە نوسینەکانی دیکەی دەربارەی «ئیبن ڕوشد»، بەتایبەت بەشداریکردنی لە کتێبێکی دەستەجەمعی قەوارە گەورەدا بەناوی: (فەرهەنگی سەدەکانی ناوەڕاست):

-Dictionnaire du moyen Age, paris, P.U.F, 2004.

٤- «ساموئیل هنتنگتۆن» بەر لە پەلامارەکانی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، بە چەند ساڵێکی کەم لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا باسی لە پێکدادانی شارستانیەتەکان کردبوو. شایەنی باسە «هنتنگتۆن» تەواو بە هەڵەدا نەچووە، سەرەڕای هەموو ئەو ڕەخنانەی ئاڕاستەی کتێبەکەی و تێزە سەرەکیەکەی دەکرێت.

٥- «نیچە» قوڵترین فەیلەسوفە لە مێژوی خۆرئاوادا و مامۆستای «فرۆید» و «فۆکۆ» و نمونەی زۆری وەک ئەوانە، بۆ ڕۆچون بە ناخی شتەکاندا و پەیبردن بە چاوگە سەرەکیەکانیان. ئەو بەر لە «فرۆید» پەی بە دەرونشیکاری بردووە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم سەرچاوەیە: فرۆید و نیچە کە لە نوسینی «لۆران ئۆسۆن»ە.

-paul –Laurent Assoun, Freud et Nietzsche, paris, P.U.F, 1998.

٦-بڕوانە کتێبە بەناوبانگەکەی «ماکس ڤیبەر»: مۆراڵی پرۆتستانتی و ڕۆحی سەرمایەداری (چاپە فەرەنسیەکەی):

-M.weber, LEthique protestante etLesprit du capitalisme, paris, 1964. P. 23.

7-Fernand Braudel, Civilisation materielle, economie et capitalisme, paris, Armand Colin, 1979.

8-michel Foucault, les mots et Les choses, paris, Gallimard, 1966, p. 32.

٩-ئەم چەمکە بە فەرەنسی: Le desenchantement du moude واتە جیهان یاخود گەردوون لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدا لێوان لێوبووە لە نهێنی و تەلیسم و ئەفسون و فانتازیا، وەلێ تەواوی ئەم شتانە دوای سەرهەڵدانی زانست و پیشەسازی و تەکنۆلۆژیا پاشەکشەیانکردوو، بەمەش گەردون بوو بە یاساگەلێکی فیزیکی و ماتماتیکی وشک و برنگ.

١٠-بڕوانە وشەکان و شتەکان (دەقە فەرەنسیەکەی):

-Michel Foucault, Les mots et Les choses, op. Cit., p. 32.

١١-وشەکان و شتەکان (دەقە فەرەنسیەکەی)، ل ٣٩.

12-Les mots et Les choses, op. cit., p. 42.

١٣- «زەکی ئەرسۆزی» ئەمەی دەوت، کاتێک باسی لە بلیمەتی و تایبەتمەندی زمانی عەرەبی دەکرد، بەشێوەیەکی وڕێنە ئامێز و بە دوور لە هەموو ئەقڵ و زانست و لۆژیکێک، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خەڵک وەک بەڵگەنەویستێک سەیری ئەو قسانەیان دەکرد.

٦٤-پێویســـتە ئینســـان خۆی تەواوی ئەم نەسکە لە کتێبەکەی «فۆکۆ» بخوێنێتەوە کە بە ستایلێکی زۆر بـــەرز و بلیمەتانە نوســـراوە، ئێمە لای خۆمانەوە بەپێـــی توانا هەوڵی وەرگێڕانی چەنـــد پەرەگرافێکمان داوە. ســـەبارەت بە دواین پەرەگرافی، بڕوانە لاپەڕەکانی ٥٠ و ٥١ و ٥٢. ئەوەی ڕاســـتی بێت ناونیشـــانی ئەو نەسکە بۆ خۆی (پەخشـــانی جیهان یان جیهان وەک پەخشـــانێک)، بە چامەیەکی شیعری دەچێت. شێوازی نوسینی «فۆکۆ» بە درێژایی کتێبەکە لە شیعریەت و قوڵبونەوەی زانستی دەگاتە ترۆپک، ئەمەش بۆ کەسێک کە خۆی بە خوێندکاری «فردریک نیچە» بزانێت ئاساییە و شتێکی سەیر نییە.

٦٥-هەندێک پێیان وایە هەر دنیا بینیەک ماوەیەک دەخایەنێت (ســـەدەیەک، دوو سەدە یان زیاتر)، پاشان پەراوێز دەکەوێت و لادەچێت، تا دنیا بینیەکی نوێ جێگەی بگرێتەوە. کاتێک دنیابینیەک پاشەکشەدەکات و دنیابینیەکی دی جێگەی دەگرێتەوە، دابڕانی ئەبستمۆلۆژی ڕودەدات.

٦٦-بە ئیعترافی تەواوی مێژونوســـان، شۆڕشی زانستی دروســـت لەو ماوەیەدا ڕویدا و گەورە زانایانی وەک: «کیبلەر»ی ئەڵەمانی (١٥٧١-١٦٣٠) و «گالیلۆ»ی ئیتاڵی (١٥٦٤-١٦٤٢) و «دیکارت»ی فەڕەنسی (١٥٩٦-١٦٥٠) دەرکەوتن. ئیتر لەو چرکەساتەوە باڵادەستی ئەوروپا بەسەر تەواوی کیشوەرەکانی دیکەی دنیادا بوو بەشتێکی حەتمی، لەبەرئەوەی هەرکەســـێک زانست و تەکنۆلۆژیای لەبەردەستدا بێت، دەتوانێت کۆنترۆڵی هەموو شتێک بکات.

٦٧-بڕوانە کتێبە قەوارە گەورەکەی «هابرماس» (گوتاری فەلسەفی مۆدێرنە)، (دەقە فەرەنسیەکەی):

-Jurgen Habermas: Le discourse philosophique de La modernite, paris. Gallimard. 1988, p.305.

٦٨- «باراسیلس» (١٤٩٣-١٥٤١)، زانایەکی بواری کیمیا و پزیشکێکی سویسری بوو.

-Les mots et Les choses, op. cit., p.229.

٦٩-تێرمی بیرلێنەکراوە، «ئەرکۆن» لە «فۆکۆ»ی دەخوازێت و بەســـەرکایەی فیکری ئیسلامیدا پراکتیزەی دەکات. ڕەنگە بیرۆکەی ئەم تێرمە لای «گاســـتۆن باشلار»یش هەبوو بێت. «باشلار» گەورەترین زانای کایەی ئەبستمۆلۆژیایە لە فەرەنسا و مامۆستای «فۆکۆ» و تەواوی نەوەی سەردەمی «فۆکۆ» بووە.

## سەرچاوە:

هاشم صالح: مخاضات الحداثة التنويرية، القطيعة الابستمولوجية في الفكر و الحياة — دار الطليعة، بيروت — الطبعة الاولى، ٢٠٠٨.

# ئایین و توندوتیژی

## چاوپێکەوتن لەگەڵ "د. عبدالکریم سروش"

لە ئینگلیزییەوە: د. هادی محمد

*حەز دەکەم یەکەم پرسـیارم لە بارەی ئەو قەیرانەوە بێت کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی کاریکاتێرە ناشـیرینەکانی پێغەمبەری ئیسـلامەوە لە دانیمارک دروست بوو. لە بیرمە زیاتر لە شەش ساڵ لەمەوپێش، تۆ و د. سامویل هنتنگتۆنم بینی (دانەری تێزی پێکدادانی شارسـتانیەتەکان) لە کۆبونەوەی روناکبیراندا لە نیقۆسیای پایتەختی قوبروس. لە کۆنفرانسەکەدا، جەنابت ڕەخنەی تیۆریای پێکدادانی شارسـتانیەتەکانت کرد. ئایا چەندان سـاڵ دوای ئەوە، دەکرێت ئەو قەیرانە ببینین کە لە ئەنجامی بڵاوبونەوەی کاریکاتێرە قێزەونەکانی پێغەمبەری خواوە دروسـت بوو وەکو سەرەتایەک بۆ هاتنەدی تیۆریاکەی هنتنگتۆن یاخود دەکرێت هیوادارببیت بەوەی کە دەتوانرێت تێگەیشتن و دیالۆگ هەبێت لە نێوان شارستانیەتی ڕۆژئاواو جیهانی ئیسلام؟

–هەروەکو ووتت، چەند سـاڵێک لەمەوپێش، لە سـەرەتاکانی سەرۆکایەتی محەمەد و خاتەمی دا، لە قوبروس کۆنفراسـێک سـازکرا کە ژمارەیەک لێکۆڵەر و سیاسـەتمەداری ئێرانی و سامویل هنتنگتۆن ئامادەبوون و منیش بەشداریم تیـا کرد. بابەتی گـەرم و جێی مشـتومڕ بریتی بوو لە تیۆریـای پێکدادانی شارستانیەتەکانی سـامویل هنتنگتون، ئەو کاتە و ئێستاشی لەگەڵدا بێت من دیدێکی ڕەخنەییم بۆی هەبوو.

دەکرێت ئەوەش بڵێم پێنج ساڵ لەمەوپێش واتە یانزدەی سێپتەمبەر کاتێک

هێرش کرایە سەر دوو تاوەری بازرگانی جیهانی، چەندین سمینار لە سەرتاسەری ئەمریکادا سازکران لەوانەش زانکۆی هارڤەرد و هنتنگتۆن وتارێکی پێشکەشکرد. لە هەندێک سمیناری تریشدا بەشداری کرد. بەڵام ئەوەی من تێبینیم کرد هنتنگتۆن نەیدەویست لەبارەی تیۆریای پێکدادانی شارستانییەتەکانەوە لە هیچ کام لە سمینارەکاندا قسە بکات یاخود ڕووداوە ترسناکەکە (هێرشەکە و بڵاوبونەوەی کاریکاتێرەکان) وەکو ڕاستێتی تیۆریاکەی بخاتە ڕوو. پێم وایە ئەگەر ئەو پرسیارەی لە منت کرد لە هنتنگتۆنت بکردایە، بە دڵنیاییەوە هێشتا وەڵامی نەدەدایتەوە ئاخۆ هێرش کردنە سەر کەسایەتی پێغەمبەر و ئەو کاردانەوانەی لە جیهانی ئیسلامدا دروستی کرد سەلماندنی ڕاستێتی تیۆریاکەیەتی یاخود نا.

بەڵام پێموایە تیۆریاکەی هنتنگتۆن لە یەکەم تێڕوانیندا لە دوو بەش پێکهاتووە. بەشێکی پەیوەندی بە زانست و لێکۆڵینەوەی دانیشتوانەوە هەیە. بەشی دووەمیشی کلتوری — چەمکییە. بەشی یەکەمی تیۆریاکەی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە گەشە و زیادبوونی دانیشتوانی جیهانی ئیسلام جا ئەو کەمینانەبن کە لە وڵاتە ئەوروپییەکان یاخود وڵاتە یەکگرتووەکاندا دەژین یاخود ئەو موسڵمانانەی کە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەژین زۆر لە زیادبون و بەرزبونەوەدایە. هنتنگتۆن باوەڕی وایە کە ڕۆژێک دێت ئەم گەشە و زیادبوونە زۆرەی ڕێژەی موسڵمانان دەبێتە کێشەیەکی سیاسی و کلتوری و ئاسایشی وڵاتە ئەوروپییەکان و ڕۆژئاوا بە گشتی و ژمارەی موسڵمانان لە ڕۆژئاواییەکان زیاتر دەبێت.

بەڵام بەشی دووەمی تیۆریاکە گرنگترە و ئەو جەخت کردنەوەیە کە هنتنگتۆن دەیکات لەسەر تایبەتمەندییە کلتورییەکانی خۆرئاوا. باوەڕی وایە کە هەندێک چەمکی وەکو ئازادی و مافەکانی مرۆڤ و جیایی دین و دەوڵەت چەمکگەلێکی کلتوری خۆرئاواییین و هیچ پێگەیەکیان لە کلتوری ئیسلامیدا نییە. مەحاڵیشە تۆوی ئەم چەمکانە لە کێڵگەی فکری ئیسلامیدا چەکەرە بکات. ئەم چەمکانە لە بنەڕەتدا نامۆن و نامۆش دەبن بە کلتوری ئیسلامی. لێرەوە باوەڕی وایە ڕۆژێک دێت ئەم شارستانییەتانە ڕووبەڕوی یەک دەبنەوە..

بەدەر لە ڕاستبوون یاخود هەڵەبوونی دوو بەشەکەی ئەم تیۆریایە (پێم وایە بەشی دووەمی قسە زۆر هەڵدەگرێ)، ئەم تیۆریایە لە ناوکۆی (سیاق) زانستی و سیاسی و کۆمەڵناسیدا، دەکرێت لە هەمانکاتدا ڕاستبوونی خۆی بسەلمێنێ و ببێتە واقع و ڕێگریش بۆ خۆی دروست بکات و لە واقعدا دەرنەکەوێت.

ئەوەی لە کۆنفراسەکەی قوبروسدا وتم ئەوە بوو کە تیۆریاکەی هنتنگتۆن دەتوانێت ڕێگری بۆ خۆی دروست بکات لەو ڕووەوە کە کاتێک بوترێت و بخرێت ڕوو، ئەوانی دیکە دەتوانن ڕێگەی لێبگرن — هەروەکو پێشبینییەکەی مارکس لەبارەی سەرهەڵدانی سۆشیالیزم و دواجاریش کۆمونیزم لە ئەوروپا، دەشتوانێت خۆی بسەلمێنێت لەو ڕووەوەی کە هەندێک خەڵک دەشێت هەوڵ بدەن بۆ گەشەپێدانی و بیهێننە بەرهەم. لە ڕاستیدا، پاش بڵاوبونەوەی کاریکاتێرەکان، بینیم هەندێک نووسەر هەوڵدەدەن ئەوە نیشان بدەن کە جەنگی شارستانییەتەکان (نێوان ئیسلام و خۆرئاوا) دەستی پێکردووەو ئەمە نیشانەکانیەتی. بەڵام ئەوەی لە جیهانی ئیسلامدا بینیمان، بەتایبەتی ئەو کاردانەوانەی کە بە شێوازێکی مەدەنیانە ئەنجامدران نیشانی دا کە ئەم جەنگە توانای ڕێلێگیرانی

هەیە و قسەکردن لەبارەی پێکدادانێکی حەتمی شارستانییەتەکان مەحاڵە. جەنابیشتان دەزانن هیچ شتێک لە مێژوودا حەتمی نییە و تەنها دەتوانین لەبارەی ئەگەرەکانەوە قسە بکەین. ئەم گەرانەش دەکرێت بەهێزتر یاخود لاوازتر بێت. ئەم بەهێزی و لاوازییەش پشت دەبەستێت لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردنی هەڵسوڕاوان و پارتە سیاسییەکان لەگەڵ شتەکان و ئەو دۆخە مێژوویی و کۆمەڵایەتییانەی کە دەیدەنە پاڵ ڕووداوێک و ئەو چارەنووسەی کە بە تیۆرییایەک یاخود پێشبینییەکەوە دەیبەستنەوە.

*ڕێکین لەسەر ئەوەی ئەم کاریکاتێرانە شایانی بەرگری کردن نین بەڵام خۆت ئاگاداریت کە بوو بەهۆی وروژاندنی توڕەیی و ڕقی مێژوویی موسڵمانان لە بەرامبەر ئەنجامدەران و پشتیوانانی ئەم کردەوە قێزەونە و ئیدانەکراوە. جەنابتان بۆ چەندین ساڵ ڕەخنەگری ئەنجامدەران و تیۆرسێنەکانی توندوتیژی بوویت، ئایا دەکرێت ئەم پەرچەکردارەی موسڵمانانیش وەکو توندوتیژییەکی قێزەون و ئیدانەکراو تەماشا بکرێت؟ حەزیش دەکەم لێرەدا ئاماژە بەوە بکەم کە دوای بڵاوبونەوەی نوسراوێکی جەنابت بۆ ئیدانەکردنی بڵاوبونەوەی ئەم کاریکاتێرانە، هەندێک کەس دژی ئەم هەڵوێستەی تۆ بوون بەوەی تۆ ئەم پێکدادانە وەکو (ئاگری ئازادی لە بەرامبەر ئاگری جۆش)[٢] ناوەزەند کردووە لە کاتێکدا ئەم پێکدادانەی ئاگری ئازادی و ئاگری جۆشی ئاینی بیرۆکەیەکی هەڵبەستراوەو پێکدادانی ناو جۆشی ئایینی خۆیەتی و جۆشی ئایینیش ڕەوتی مێژووی خوێناوی کردووە، مێژوو لێوانلێوە لە جەنگە ئاینییەکان بەتایبەتیش جەنگە ناو ئاینییەکان و زۆرینەی جاریش موسڵمانان لەلایەن موسڵمانان خۆیانەوە لەناوبراون؟

-بەڵێ، ئەو وەڵامەم خوێندۆتەوە کە ئاماژەت پێکرد و شتی سەیرم تێدابینی. لەو نووسینەی لەبارەی کاریکاتێرەکانەوە نووسیومە وتومە ئێمە شایەتی پێکدادانی دوو لایەنی بنەڕەتخوازین (فەندەمێنتالیزم): بنەڕەتخوازی سیکولار و بنەڕەتخوازی دینی. ئەم دوولایەنە بنەڕەتخوازین ئەم کارەساتە نەخوازراوەیان دروست کردووە. بە دەربڕینێکی دیکە، لەلایەکەوە، هەندێک کەس سێکولاریزمیان کردە گۆچانێک و لەوانی دیکەیان داو ناوەڕۆکەکەیان (مافی مرۆڤ و ئازادی)یان بەکارهێنا وەکو بەهانەیەک بۆ هێرشکردنە سەر پیرۆزییەکانی ئەوانی دیکە و سوکایەتی پێکردنیان و بێزارکردنی ئەو ئیماندارە موسڵمانانەی کە خۆیان بۆ پێغەمبەرەکەیان تەرخان کردووە و ئەم کردەوانەش وەکو مافی خۆیان سەیر دەکەن. لەلایەکی دیکەوە، کاتێک موسڵمانان توڕەدەبن، هەندێک جاریش سنور ناناسن و هەڕەمەکییانە پەرچەکرداری نابەجێ دەنوێنن وەکو سوتاندنی باڵیۆزخانەکان کە کارێکی نەخوازراوە. بەش بەحاڵی خۆم ڕەخنەی ئەمەم کردووەو وتومە سێکولاریزم دین نییە. نەموتووە سێکولاریزم دینە، ئەگەر واشم بگوتایە، شتێکی خراپ نەدەبوو چونکە دەبووە هۆی پیرۆزبوونی سێکولاریزم! من وتومە هەندێک کەس سێکولاریزم کتومت بە هەمان ئەو شێوەیە بەکاردەهێنن کە هەندێک کەسی بنەڕەتخواز و دەمارگیری دینی ئایین بەکاردەهێنن، واتە سێکولاریزم وەکو گۆچانێک بەکاردەهێنن بۆ لێدانی ئەوانی دیکە و دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی دەمارگیری بەبێ ڕەچاوکردنی پێودانگە ئەخلاقییەکان. کاتێکیش ئاماژەم بە ئاگری ئازادی، یاخود «ئاگری جۆش» داوە، ئەگەر ڕەخنەگرەکەم بە ئاگاییەوە نووسینەکەی بخوێندایەتەوە، دەیبینی نیشانەی

فاریزەم لە دەوری وشەکانی «ئازادی» و «جۆش» داناوە، واتە ئەوان «بە ئازادی» و جۆش» ناوی دەبەن. لێرەوە، جۆشێکی دینی خۆ وادەرخەر جۆشێکی ڕاستەقینە نییە، ئەم خراپ بەکارهێنانە سێکولارانەی ئازادیش وابەستەیەکی ڕاستەقینە نییە بۆ ئازادی. مەبەستی من ئەوە بووە کە هەندێک کەس «ئازادی ڕادەربڕین» خراپ بەکاردەهێنن بۆ جۆشدانی ئەوانی دیکە. ئەمڕۆ، ئەگەر کەسێک سوکایەتی بە باوکت بکات، قبوڵی ناکەیت و بە شتێکی دروستی نازانیت و وەکو دەرەنجامی ئازادی ڕادەربڕین تەماشای ناکەیت. کەواتە چۆن ڕەوایە هەندێک کەس بە مەبەستەوە بێت یاخود بێ مەبەست سووکایەتی بە باوکی مەعنەوی کۆمەڵێکی گەورەی مرۆڤەکان بکەن؟

ئەم ڕەخنەگرە سێکولارەی من هەوڵیشیداوە ئەم هەلە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی ئایین بسڕێتەوە بەو بیانووەی کە مێژوو پڕە لە جەنگە ئایینیەکان. نکوڵی لەمە ناکەم، بەڵام با بپرسم: ئایا جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم جەنگگەلێکی دینی بوون یاخود سێکولار کە هەموو جەنگەکانی دیکەی مێژووی شاردەوەو پەنجا ملیون کوژراوی لێکەوتەوە؟؟ قسەکردن بەم شێوازە بەرەو بنەڕەتخوازی Fundamentalism سێکولارمان دەبات کە ئاماژەم پێکرد. خاڵی گرنگ لێرەدا ئەمەیە: ئەگەر ئەم پرسیارەمان نەوەیەک پێش ئێستا بکردایە: ئەوا مارکسییەکان دەیانوت شتێک نییە بە ناوی جەنگە ئایینییەکانەوە لە مێژوودا، هەمووی ئەوەی هەبووە جەنگی چینەکانە!

هەموو ئەمانەشی دەبنە هۆی وەسواسکردنی خەڵکی و بە لاڕێیاندا دەبەن. ئێستا، با کەمێک سنوری گفتوگۆکەمان فراوان کەین و ئەو ڕەخنەیەی لە منیان گرتووە تێیپەڕێنین. وەکو لە هەندێک نووسینمدا وتوومە، پێموایە یەکێک لە کێشەکانی شارستانیەتی لیبراڵی ئەمڕۆ ئەوەیە بە وردی و قووڵی «پەیوەندی ماف — ئەخلاق» یان نەخوێندۆتەوەو نەیانپشکنیوە. تەنانەت ئەگەر ئەو کارەشیان کردبێت، هێشتا بابەتەکە باش نەگوتراوەتەوەو لای خەڵکە گشتییەکە بە نەزانراوی ماوەتەوە. ڕاستە ئێمە هەندێک مافمان (Rights) هەیە، بەڵام ئەخلاق Morality هەندێک سنور و کۆتی لەسەر مافەکانمان داناوە. واتە هەرچەندە مافی ئازادی ڕادەربڕینم هەیە بەڵام لە ڕووی ئەخلاقییەوە مافی ئەوەم نییە دەستدرێژی یاخود سوکایەتی بە خەڵکی بکەم یاخود یارمەتی بڵاوبونەوەی پۆرنۆگرافی بدەم. پێموایە ئەم پێکدادانەی نێوان ماف و ئەخلاق لە ڕۆژئاوا چارەسەر ناکرێت. ئێمە ئەمڕۆ شایەتی ئەوەین کە ماف ئەوەندە پەرەی سەندووە وەکو لافاوێکی لێهاتووە و هەندێک هەرێمی ناوچەی ئەخلاقی ڕاماڵیوە. ئەمەیە دەستدرێژی دەکاتە سەر کەسانی دیکە و هەندێک لە بەرژەوەندی مافدایە بەڵام بە زیانی ئەخلاق تەواو دەبێت و ڕق و توڕەیی و ناڕەزایی خەڵکی بەخەبەر دێنێت. پێموایە یەکێک لە گەورەترین پێویستییەکانی ئەمڕۆمان ڕێزگرتنە لە سنورەکانی ئەم دووانە و پاراستن و هێشتنەوەی هەریەکەیانە لە شوێنی خۆیان.

ڕەخنەی من لە ڕۆژئاوا ئەوە نییە کە ئەوان لیبراڵن، بەڵکو ئەوەیە کە ئەوان لیبراڵی تەواو نین. ڕەخنەی من لێیان ئەوە نییە ئەوان دیموکرات نین، بەڵکو ئەوەیە ئەوان تەواو دیموکرات نین. ڕەخنە و هەڵوێستی من لەم بابەتەدا جیاوازە لەو کەسانەی ناو ئێران کە بڵاوبوونەوەی ئەم کاریکاتێرانەیان قۆستەوە بۆ هێرش کردنە سەر لیبرالیزم و دیموکراسی ڕۆژئاوایی. گومانیشم نییە لەوەی شارستانیەتی رۆژئاوایی شایانی ڕەخنەگرتنە و پێویستیشە ڕەخنە بکرێ. نابێت وا وێنابکەین بڵاوبونەوەی ئەم کاریکاتێرە قێزەونانە بەرهەم و دەستکەوتی دیموکراسی یاخود ئازادی

ڕادەربڕینی ڕۆژئاوایە. لە ڕاســتیدا، ئەمانە نمونەگەلێکی خراپ بەکارهێنانن کە دەبێت دەستنیشان بکرێن و ڕێیان لێبگیرێت.

*بەڵام، هەر لەبارەی بابەتی ڕەخنەکردنی توندوتیژی، حەزدەکەم بۆ ئەم پرسیارەم بگەڕێمەوە بۆ مەسەلە ناوخۆییەکانی ئێران. لە چاوپێکەوتنێکی تازەدا لەبارەی ڕەخنەکردنی توندوتیژی Violence و لایەنگرانــی توندوتیــژی لە ئێران، تۆ پێت وایە ئیشــە تیۆرییەکانی ئەحمــەد فەردید هاندەری توندوتیــژی بووە لە ئێران لە دوای شۆڕشــەوە. ئایا پێت وانییە ئەمــە کەمێک زیادەڕۆیی تێدایە؟ پاشــانیش بە چاوپۆشــیکردن لەوەی کە فەردید کێ بووەو چی ووتــووە، ناکرێت پێمان وابێت کە بیــرو هزر و کارەکانی هێندە کاریگەر بووە، وا تێبگەین بیرۆکەکانی هاندەری ئەو هەموو چالاکی و هەڵوێستە توندوتیژانە بووە کە هەندێک لە چینەکانی حکومەت ئەنجامیان داوە. لێرەوە، پێتوانییە زیادەڕۆییت کردووە لە پێگە و پەیکەری فەردیدا؟.

-خۆت دەزانیت، دوو مانگ لەمەوپێش، ئەم شــتانەم بۆ یەکەم جار لە چاوپێکەوتنێکدا لەبارەی فەردید و هاوڕێکانییەوە گوتووە. هەرچەندە ئەوان لە یادەوەری مندا نەماون و لە ماوەی ٢٧ ســاڵی پاش شۆڕشــی ئیسلامی ئێران هەرگیز نە قسەم لەبارەی ئەم شــتانەوە کردووەو نە نووسیویشمە. ئەمەش لەبەرئەوەی دەبینم ئێســتاکە هەندێک لەم بیرۆکانە وردە وردە کورســییەکانی دەسەڵات بە ڕەســمی دەگرنە دەست و سنوری دەســەڵات تێدەپەڕێنن بۆ بەرپاکردنی توندوتیژی. لەبەرئەوەشە هەوڵم داوە هەندێک لە ســەرچاوەکانی توندوتیژی لە کۆمەڵگادا ئاشــکرا بکەم، ئەگەر بە وریاییەوە تێبینی بکەیت، دەبینیت ئەوەی لەبارەی فەردیدەوە وتومە بەشــێکی زۆر کەمی ئەوەیە کە دەبوایە بگوترێــت. نیەتی من ئەوە نەبــووە زیادەڕۆیی بکەم لە گرنگی بیرۆکەکانــی فەردیدا. هەروەک لە چاوپێکەوتنەکەدا وتوومە بیرۆکەکانی گرنگ نین. لە ڕاســتیدا من فەردیدم وەکو کەســێک تەماشا کردووە و تەماشــای دەکەم کە زەینێکی شێواو و تەنانەت شێوازێکی شێواوتری دەربڕینی هەبووە. بەڵام گرنگی و دەســەڵاتی لە چوارچێوەیەکی ســنورداری خەڵکیدا بەدەســت هێناو وردە وردە ئەم چوارچێوە سنورداره زیادی کردو تەنها بەناو — ڕۆشنبیرەکانی نەگرتەوە بەڵکو هەندێک لە قوتابیان و ئایەتوڵــڵا و بلاوکراوەشــی گرتەوە وەکو ڕۆژنامەی «کەیهــان» و گۆڤاری «صورة» و «حەوزەی ئەندێشە» و «هونەری ئیسلامی».

ئێســتا ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین لە چەند مانگی ڕابردوودا، زۆربەی ئەم کەسانە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەســت و دیوارەکانی دەسەڵاتیشــیان تێپەڕاندووە. بە درێژی لەبارەی ئەم بابەتەوە قسەم کــردووە چونکــە دەمبینی هەندێک کەس، بە ئاگاییەوە یاخود بێ ئاگایی، ئاماژەیان بە ئاڕاســتەی هەڵە دەکرد و هەموو شتێکیان دەگێڕایەوە بۆ کۆمەڵەی حوججەتییە. بێگومان خۆم بە داکۆکیکاری حوججەتییە نازانم. حوججەتیە کۆمەڵە کەســانێک بوون لە ڕاستیدا ئێستا نەماون و پوکاونەتەوە. کەسانێکیش کە من دەیانناسم و ئاشنام لەگەڵیاندا ئارەزووی چونە ناو کایەی سیاسییان نییە و لە بنەڕەتیشدا تیۆریای سیاسییان نییە. ئەوەی کە سەرۆک کۆماری ئێستا (ئەحمەدی نەژاد) بەردەوام باســی ئیمامی نادیار (ئیمامی دوانزەهەمی شــیعە) دەکات و پێیوایە گەڕانەوەی نزیکە و بنەمای هەندێک لە دۆخ و هەڵوێســتە سیاســییەکانی لەسەر ئەمەوە دادەڕێژێت، نابێت ئێمە بەوە چەواشە

بکات کە ئەندامانی حوججەتیە دزەیان کردۆتە سیاســەتەوەو لە ڕێگەی ســەرۆک و ئەوانی دیکەوە قســەکانی خۆیان دەکەن. ویستوومە ســەرچاوە ڕاستەقینەکانی ئەم قسە و تیۆری و هەڵوێستانە ئاشــکرا بکەم. حوججەتیە هەر کەسێک بن و لە هەرچیەک پێکهاتبێت، لایەنگرانی توندوتیژی نین، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە فەردیدەوە هەبێت بابەتێکی جیاوازە.

دوێنێ ســەرنجم دا کۆمەڵێک خوێندکاری ســەر بە هێزی خۆبەخشی گاردی ئنقلابی لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانیاندا ووتیان دیموکراسی «بەرجەستەکردنی نەفسانیەتە» یاخود هەوەس پەرستی. ئەمانە قسەی حوججەتیەنین، قسەی ئەحمەد و فەردیدن. ئەم جۆرە قسانە بەکاردێنن بۆ سوکایەتی پێکردن و تێکدانی هەموو ئەو دەستکەوتە باشانەی ڕۆژئاوا کە لە ڕاستیدا لەمڕۆدا ئێمە پێویستمان پێیانە لە کاتێکدا وڵاتەکەمان نوقمی توندوتیژییە.

ئەوان زاراوەگەلێکی وەکو نەفسانیەت Cornality، لووت بەرزی جیهانی، پەتای خۆرئاوایی بوون، ماســۆنیەت و بەرەڵڵایی یان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی بە ئاســانی و بەبــێ هیچ بەڵگە هێنانەوەیەک ئەندێشــە باشــەکانی ڕۆژئاوا پشــتگوێ بخەن و ئێمە لێیان بێ بەش بکەن، تاکە شتێکیشــە لە بەرامبــەر ئەمەدا خســتیانە ڕوو توندوتیژی بوو Violence. لەبەر ئەوەیە هێندەم جەخت لەســەر ئەم مەســەلەیە کردۆتەوە و هەوڵمداوە شوێنگەی تەواوی کێشــەکان نیشان بدەم. لە بیرتە ئەوەی قوتابییەکانی ئەو وەکو ڕەزا داوەری ووتیان و چەند ساڵێک لەمەوپێش لە بەرنامەی «هویت» (٣)ی تەلەفزیۆنی کۆماری ئیسلامی، پەخشکرا، مەبەستەکانی لە خزمەتی لایەنێکدا بوو و هەڵکوتانە سەر لایەنێکی دیکە بوو.

ئەوەشــت لە بیرە چەند ســاڵێک لەمەوپێش چۆن یەکێک لە ئیمامەکانــی نوێژی هەینی تاران تا ئەمڕۆش لە پۆســتەکەیدا مــاوەو لە ژیانی درێژی بێ بەرهەمی خۆیدا کە خودا پێی بەخشــیوە هیچی نەکردووە جگە لە هێرش کردنە ســەر ئەوانی دیکە، لە نوێژێکی هەینیدا هەڵیکوتایە ســەر کتێبــی «کۆمەڵگای کــراوە»ی کارڵ پۆپەر بەبێ ئەوەی قەت لاپەڕەیەکــی لێخوێندبێتەوە. باوەڕم وایــە ئەمە بەرهەمی ئــەو پەیوەندییەیە کە هەمان ئەو پیاوانە لەگەڵ ئەم ئیمامی نوێژی هەینییەدا هەیانە و وورده وورده پەیوەندییەکەیان لە ڕێگەی ئەم ئیمامەوە گەیاندۆتە ڕوحانییەکانی تر و بەم شــێوەیە توانیویانە بیرۆکەکانیان بڵاوبکەنەوە بەشێوەیەکی گشتی، ئەوەی لە وڵاتی ئێمەدا لە دژی و نەفرەتکردنی ڕۆژئاواو شارستانیەتی ڕۆژئاوایی و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ دەگوزەرێت کە لە شێوەی پاکەتێکی پڕ زاق و بریقدا دەخرێتە ڕوو، هەمووی بەرهەمی کارگەکەی هەمان ئەو پیاوانەن کە بە شــێوەیەک لە شــێوەکان پەیوەندییان بە ئەحمەد فەردیدەوە هەیە. ئەوەی جێی ســەرنجە، پــاش چاوپێکەوتنەکەم، دوو مانــگ لەمەوپێش، لەبارەی فەردیــد و ڕەزامەندییەکەی لە ئایەتوڵڵا خەڵخاڵییــەوە، نامەیەکی توڕەئامێزم لە کوڕی خەڵخاڵییەوە پێگەیشــت، تیایدا هاتبوو کە ئاغای خەڵخاڵی چەندین دانیشــتنی لەگەڵ فەردیدا ئەنجامداوە. ئەمە جەخت کردنەوەیەکی دیکەی ئەوەیە کە من گووتومە لە بارەی ئەوەی هەموو هەڵوێســتە توندوتیژخوازەکانی فەقیهەکان تەنها لە فقهەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو فەلسەفەی ئەم فەیلەسوفە فاشستییانە ڕۆڵی خۆی هەبووە.

بێگومان، ڕەخنەکردنی ڕۆژئاوا بابەتێکی دیکەیە و بە هیچ شێوەیەک دژی نیم. هەروەکو پێشتر ووتم، فەیلەسوف هەن لە خۆرئاوا خۆیدا ڕەخنەی خۆرئاوا دەکەن. ئێمەش دەبێت هیچ شتێک بەبێ

پرسیارکردن قبوڵ نەکەین.

بەڵام هەڵوێســتی توندوتیژانەی دژە ڕۆژئاواو بڵاوکردنــەوەی ڕق و کینە دژی ڕۆژئاوا میراتێکی ناچیزی هەڵگرانی فکری فەردید بووە و هێشتاش خۆیان بە سەربازی ئەو سەربازگەیە دەزانن.

پێم وایە ناسینەوەو ناساندنی ئەم نەخۆشی و خەڵکە نەخۆشانە ئەرکی سەرشانمانە بە تایبەتی ئێستا بە چاوی خۆمان دەبینین هەندێکیان دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست..

ئاگاداریشـــم ئەم جۆرە کەســانە نەک تەنها خۆیان نەخزاندۆتە کایەکانی چاپەمەنییەوە بەڵکو چوونەتە ناو ڕیزەکانی ســوپاوە: لەوێ ئەندێشــەکانیان بڵاودەکەنەوەو بەهۆیەوە زەینێکی شێواو و لاسەنگ بەرامبەر جیهانی دەرەوە تیاماندا دروست بووە. خراپترین ئەندێشەیەکیش دژە — یەهودییە. لە ڕاســتیدا ئەمــە دیاردەیەکی نامۆیە لە مێژووی وڵاتی ئێمــەدا. هەرگیز دژە — یەهودی لای ئێمە مەســەلەیەک نەبووە و هەرگیزیش لەگەڵ جوولەکەکاندا کێشەمان نەبووە. لە دەرەوەی وڵات کاتێک قسە بۆ هاوکاران و لێکۆڵەرانی ڕۆژئاوایی دەکەم و ئەوانیش پرسیارم لێدەکەن. کاتێک پێیان دەڵێم جوولەکەکان لە وڵاتی ئێمەدا لە پەرلەماندا نوێنەریان هەیە، هەموویان تووشــی سەرســوڕمان دەبن چونکە ئەوان وە دەزانن کە ئێرانییەکان بەکۆڵەمست لەسەرسەری جوولەکەکان ئامادەن و هەڵکوتنە ســەریان و لە وڵات دەریان پەڕێنن. بۆیان ڕوون دەکەمەوە کە دۆخەکە بەو شــێوەیە نییە. نە ئایین و نــە مرۆڤایەتــی ڕێگامان نادات بە کردنی کارەکانی لەو جۆرە. خۆشــبەختانە ئەو جولەکانەی کە هێشــتا لە ئێراندا ماون وەکو هەموو ئەوانی دیکە ســود لەو وڵاتە دەبەن. لە وڵاتێکی لەو شێوەیەدا کە هەرگیز کێشەی لەگەڵ جولەکە و یەهوودیەتتدا نەبووە و مێژوویەکی باش و ڕابردوویەکی پاکی هەیە لە ڕزگارکردنی جوولەکەکان لە نەهامەتی و ئەمەش مایەی شــانازییە بۆ ئێران. هەندێک کەس هەن دوژمنایەتی لە بەرامبەر جولەکەکاندا فێری منداڵان و قوتابیانی فەلســەفەی ئەم وڵاتە دەکەن و فەیلەســوفان لەسەر بنەمای ئەوە هەڵدەسەنگێنن ئاخۆ جولەکەبوون یاخود نا، ئەمەش هەمووی لەبەرئــەوەی کە کۆمەڵێک ئەندێشــەی هەڵە لەم یاخــود لەو بیریارە ئەڵمانییــە فێربوون یاخود لەبەرئەوەی لە کەشێکی تایبەتی ژەهراوی لە ئەڵمانیا لە کاتێک لە کاتەکاندا ژیاون.

ئەمە یەکێک لە ناخۆشــترین ئەو شتانەیە کە ئەنجامدەدرێن و ئێستاش لە وڵاتی ئێمەدا ئەنجام دەدرێن. تەنانەت وا دەزانم کە توندترین ووتارە داخهێنەرەکانی ســەرۆک کۆمار لە بارەی لەناوبردنی ئیســرائیلەوە تا ڕادەیەک لەم ئەندێشــانەوە ســەرچاوەی گرتووە. باوەڕم وایە کە ئێســتا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیــە ئەم ڕەهەندانەی وەرگرتووە، زیادەڕۆیش نییە بۆ ئێمە ئاماژە بە ســەرچاوەکانی ئەم ئەندێشــانە بکەین و کارێکی زۆر بکەین بۆ پڕکردنەوەی ئەو بیرە کە جگە لە مارودوپشــک هیچی دیکەی تێدا نییە، ئەو کاتە دەتوانین کەشێکی تەندروستترمان هەبێت.

ماوەیەک لەمەوپێش لە ئێران فیلمی «ڕزگاری» Salvation نیشاندرا، لە فیلمەکەدا، گەنجێکی ڕیش پان لە شــێوەی فەیلەســوفێکی بەختەوەردا دەیوویســت کۆمەڵگە لە ناپاکی پاک بکاتەوە. شــێوازی کارکردنیشی دوورخســتنەوە و کوشتنی خەڵکی بوو. لە شــوێنی خوێندنی گەنجەکەدا، وێنەیەکی هایدگەر بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو و کتێبێکیش لەسەر فەلسەفەی هایدگەر لە دەستیدا بوو. پێم وایە ئەم فلمســازە زیرەکە ئاماژە بە خاڵێکی هەســتیار و سەرچاوەی ڤایرۆسەکە دەکات. منیش پێمگوت «ئافەرین». «خوێندنەوەیەکی فاشســتییانەی ئایین»، باشترین ناونیشانە بدرێتە

پاڵ قوتابخانە فکریە نەخۆشــهێنەکەی فەردید کە بەداخەوە هەندێک لە ڕوحانیەکانیشـــی کردۆتە قوربانی.

*بەڵام، پاش هەڵوێســـتە تازەکانت و ڕەخنەکردنی ئەو توندوتیژییـــەی لە دیدەکانی فەردیدەوە دروست دەبێت، سایتێکی ئێرانی بانگەشەی کرد کە «ئەم کەسەی ئێستا بۆتە ڕەخنەگری ڕادیکالیزم و توندوتیژی، لە ســـاڵانی ســـەرەتای شۆڕشدا، حەزی لەم شـــێوازەی خۆی نەبووە»، بەشێوەیەکی سەرەکیش ئاماژە بە بوونی تۆ دەکەن لە بارەگاکانی شۆڕشی فەرهەنگیدا لەو ساڵانەدا کە زانکۆکان داخرابـــوون و شۆڕشـــی فەرهەنگی بـــووە هۆی پاکتاوکـــردن و وەدەرنانی زۆرێک لە پرۆفیســـۆر و قوتابیان؟

-ئەمـــە چیرۆکێکی کۆنە، چەندین جار ووتویانـــە و چەندین جار منیش وەڵامم داونەتەوە. ئەوەی لێرەدا ســـەیرە ئەوەیە کە نەک تەنها نەیارەکانم یاخود نەیارەکانی کۆماری ئیســـلامی ئەمە دەڵێن و بەمـــە تۆمەتبـــارم دەکەن. بەڵکو چەندیـــن جاریش ئەمە دووبارە کراوەتـــەوە لەناو وڵاتدا لەلایەن هەندێک بەرپرســـی باڵای دەوڵەتەوەو ئەو کەسانەوە کە شـــاگردی ئەو فەیلەسوفەن ناوەکەی هێنرا، بێگومان هەر لایەک لەلای خۆیەوەو لە دیدی تایبەتی خۆیەوەو لەسەر بنەمای مۆتیڤ و ئامانجەکانی خۆیەوە ئەم کارەی ئەنجامداوە. بەش بەحاڵی خۆم سوپاســـی خوا دەکەم کە ئێستاش و هەرگیزیش لایەنگری توندوتیژی نەبووم. نووسینەکانیشـــم هیچی وای تێدانییە وەکو پڕوپاگەندەی توندوتیژی لێکبدرێنەوە. هەموو تاوانی من بۆ ئەوەی شایانی ئەم هێرشکردنە سەرو باجدانەبم لە ئێران ئەوەبوو کە من هەمیشە پشتگیری لێبوردنم کردووەو دژی توندوتیژی بووم، بەڵام دیسانەوە چیرۆکی شۆڕشی فەرهەنگی ڕوون دەکەمەوەو سوپاسی جەنابیشت دەکەم بەم پرسیارە ئەم هەلەت پێبەخشیم.

ئێمە دەبێت دوو شـــتی تەواو لەیەکجیا لەیەکتر جیابکەینەوە: شۆڕشـــی فەرهەنگی و بارەگای شۆڕشـــی فەرهەنگی. شۆڕشـــی فەرهەنگی ئـــەو ڕووداوە خوێناوییە جار بە جارانـــە دەگرێتەوە لە سەرتاســـەری وڵاتدا و لە هەندێک زانکۆدا ڕوویان دەدا. هێرش دەکرانە سەر زانکۆکان University و پێکدادانی تاڕادەیەک توندوتیژیش ڕووی دەدا و دەبووە هۆی داخســـتنی زانکۆکان. پرسیاری ئەوەی هاندانی پشـــت ئەم پێکدادانە چی بوو و کێ بوو ئەو کەســـەی پشـــتگیری دەکردن و کام حیزبی سیاســـی هێرشبەرانی بەهێز دەکرد هێشـــتا تا ڕادەیەکی زۆر بێ وەڵامە. ڕاستییەکەی خۆم نازانم و لەوانەشـــە کەســـانێک هەبن و بیزانن، ڕۆژێک دێت ڕوناکی لە شتەکان دەدات و ڕاستییەکان ئاشکرا دەبن. هەرچەندە، دوو مانگ دوای ئەوە، ڕابەری شـــۆڕش، ئایەتووڵڵا خوومەینی بڕیاری دا زانکۆکان بداتە دەست کەسانێکی باوەڕپێکراو تاوەکو بتوانن بەرنامەی نوێ بۆ زانکۆکان دابنێن و سەرلەنوێ بکرێنەوە. گەیشتە ئەوەی حەوت کەسی دەستنیشان کرد و بڕیارێکی دەرکرد، داوای لێکردن بارەگای شۆڕشـــی فەرهەنگی دابمەزرێنـــن و هەوڵی کردنەوەی زانکۆکان بدەن. لێـــرەوە، دوو ڕووداوی تەواو جیاوازمـــان هەیە: یەکێکیان شۆڕشـــی فەرهەنگی توندوتیژ و داخســـتنی خوێناوییانەی زانکۆکان، دووەمیش: سەرلەنوێ کردنەوەی زانکۆکان بە دوور لە توندوتیژی و وەلانانی توندوتیژی بوو.

لەو داوەرییانەی کە دەکرێن، ئەم دوو مەســـەلەیە تێکەڵ بەیەکدی کراون، بە ئاگاوە بێت یاخود بێ ئاگایی، بەمەبەستەوە بێت یاخود بێ مەبەست. ئەوەی ئێمە ئەنجامامان دەدا لە بارەگای شۆڕشی

فەرهەنگی (پێم وایە مایەی شـــەرەف و ستایشـــە لەلایەن هەر کەســـێکەوە ئاگاداری ئەوەبێ ئێمە کردوومانـــە و لەلایەن ئەو قوتابییانەوە ئێســـتا لە زانکۆکاندا لێکۆڵینـــەوە دەکەن) هەوڵدان بوو بۆ خولْقاندنی کەشـــێکی ســـەلامەتی خوێندن و فێربـــوون لە زانکۆکاندا و ڕێگەگرتـــن لە ڕادیکالیزم. هەرکەسێک ڕۆژانی سەرەتای شۆڕشی بینیبێت دەزانێت هەموو شۆڕشەکان لەو قۆناغەدا هاوشێوەن، ئەگەر هەموویان بەدرێژایی ڕەوتی گەشـــەکردنیان، هاوشێوە نەبن، ئەوا لانی کەم لە سەرەتای چەند ساڵی یەکەمیاندا هاوشێوەن، بە تایبەتی ڕادیکالیزم لە لوتکەی خۆیدایە و عەقڵیش لە کەنارەوە.

ئەمـــە ئەو دۆخە بوو لە وڵاتدا ڕووبەڕوی بووینەوە. لەو کاتەدا، هەر کەســـێک ڕادیکاڵتر بوویایە و ڕادیکاڵترین و توندوتیژترین و شۆڕشـــگێڕترین و حیزبوڵاترین دروشـــمەکانی هەڵبگرتایەو هاواری بکردایە، ئەوە سەرکەوتووترین بووەو زۆرترین ژمارەی شوێنکەوتووانی دەبوو. چەندە قوورس بوو بۆ ئەو کەسانەی پشتگیری لێبوردەیی یان دەکرد و عەقڵ لەوەها دۆخێکدا کار پێبکەن.

زۆرینـــەی کارکردنی ووزەی ئێمە لە بارەگای شۆڕشـــی فەرهەنگی لە پێنـــاو لادان و لەباربردنی ئـــەم ڕەوتی ڕادیکالیزم و توندوتیژییە بوو لە زانکۆکاندا، بۆ ئەوەی بتوانین وورده وورده کەشـــێکی فێرکارییانەی ئارام لە زانکۆکاندا بخوڵقێنین. تا ئاســـتێک ســـەرکەوتنمان بە دەســـت هێنا کە ئەو کەش و فەزایە دەســـتەبەر بوو زانکۆکانمان کردەوە. لێرەوە، ئەو داوەرییە نا ڕاســـت و ژێرەو ژوورەی لەم مەســـەلەیەدا کراوە لەســـەر بنەمای نا ڕۆشـــنی ڕووداوەکانی پێش و پاش دامەزراندنی دەزگای شۆڕشی فەرهەنگی بووە، هەردوو جۆر ڕووداوەکە وەکو «شۆڕشی فەرهەنگی» وەسف کراون و لەسەر هەمان ئەم بنەمایە داوەرییان لە بارەوە کراوە. ئەم بنەمایە ناڕاستە. چەندین جار لەم بارەوە قسەم کردووە.

ئەوەی زۆر ســـەرنج ڕاکێش و جێگای سەرســـوڕمانە ئەو بۆچوونی هەندێک لە ڕاســـترەوەکان و کەســـانی ئاسایش و حیزبوڵاکان بوو بۆ کەنارخستنی یەکێک لە نەیار و ڕەخنەگرەکانیان، ئاماژەیان بە چیرۆکی شۆڕشـــی فەرهەنگی دەکرد و بابەتەکانی خۆیان دەشـــاردەوە. لە ڕاســـتیدا، ئەگەر لەو کاتانەدا، توندوتیژی هەبووبێت، من تاکە ئەندامی دەزگای شۆڕشی فەرهەنگی نەبووم بەڵکو شەش ئەندامـــی دیکەی هەبوو. ئەگەر بەرپرســـەکان ئەم تۆمەتە بدەنە پاڵ من، ئـــەوا دەبێت بیدەنە پاڵ ئەوانی دیکەش، بەدەر لەو ڕاســـتییە، کردنی کارێکی لەم شـــێوەیە، هێرش کردنە ســـەر یەکێک لە دەســـتکەوتەکانی شۆڕشـــە. بەڵام لەو کاتەدا ئەم لێکدانەوانە بۆ ئەوان گرنگ نین، گرنگ بۆ ئەوان ئەوەیە کەسێکی دیاریکراو سەرکوت کەن.

ئەمە ڕاستی مەسەلەکە بوو. خۆش بەختانە، دەزگای شۆڕشی فەرهەنگی تاڕادەیەک سەرکەوتوو بوو لە وەلانانی ئەو تەوژمە توندوتیژییەو تەنانەت ڕازی کردنی ئەو قوتابییانەی لە ڕاستیدا دەیانویست داخســـتنی زانکۆکان درێژە بکێشـــێت بۆ وازهێنان لەم بۆچوونە چونکە وڵات پێویســـتی بە زانکۆ و کەســـانی مەعریفەدار هەیە و دەبێت لەلایەن کەســـانی مەعریفەدارەوە نەک نەزانەوە بەڕێوە ببرێت. بێگومان، دەربڕین و ڕونکردنەوەی ئەم شـــتانە لە کاتی خۆیدا ڕێگری تایبەتی هاتە بەردەم و پاش ســـاڵ و نیوێک توانیمان زانکۆکان بکەینەوەو لێشـــاوێکی زۆری ئەو لاوانە گەڕانەوە زانکۆکان — کە بێ مەبەست لە شەقامەکاندا دەسوڕانەوە یاخود هەوڵی جێهێشتنی وڵاتیان دەدا، سەرلەنوێ کۆرسی خوێندنیان دەســـت پێکردەوە. ئەمە سەرجەمی چیرۆکی ئەو کاتە بوو کە لە دەزگاکە بووم. پاشان،

ئەنجومەنی شۆڕشی فەرهەنگی دامەزراو لە ڕۆژەکانی سەرەتای ئەنجومەندا بەجێمهێشت و زیاتر لە بیست ساڵیشە پەیوەندیم پێیانەوە نەماوە.

بێگومان، سکاڵام دژی ئەنجومەنەکەش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەم هەموو دەستەو تاقمە توندڕەوانە، هەندێک جار لە ژێر ناوی «ئەنساری حیزبوڵا یاخود پۆلیسی پۆشاک مەدەنی»، دەرکەوتن بە درێژایی بیست ساڵ لە کاتی دامەزراندنی ئەنجومەنی شۆڕشی فەرهەنگییەوە یەکێک بووم لە یەکەمین قوربانییەکانی ئەم دەستەو تاقمە توندڕەوانە لە زانکۆکانی ئەسفەهان و تاران و مەشهەد و لە قوم و خورەم ئاباد. لە هەموو ئەم شوێنانەدا یەکێک بووم لە قوربانییەکان. ئەنجومەنی شۆڕشی فەرهەنگیش هەموو ئەم کردە توندوتیژانەی بینی بەڵام هیچی نەووت و تا ئێستاش لەسەر ئەم شێوازە بەردەوامە. ئێستا بە ئاستێک گەیشتووە تەنانەت کۆمەڵە خوێندکارییە ئیسلامییەکان لە ناو زانکۆکاندا ڕووبەڕووی هەزاران ڕێگر دەبنەوە کاتێک دەیانەوێت دانیشتنێک سازبدەن و قسە لە ئیسلامێک بکەن کەمێک لە ئیسلامی دەسەڵات جیاوازە. بێگومان ئەمە لەمڕۆدا، ڕەخنەیەکی ڕەوایە لە ئەنجومەنی شۆڕشی ئیسلامی: ئەنجومەنێک تیایدا (دیسان دەگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکەی پێشوترت) چەندان قوتابی هەمان کاکەی فەیلەسوف بەشداربووی کاریگەر و بەردەوامن و بە چاوی کوێرەوە دەڕواننە ئەم کردە توندوتیژانە، ئەگەر نەڵێین ئاگرەکە خۆش دەکەن.

لەو ساتەوەی چوومە ناو دەزگای شۆڕشی فەرهەنگییەوە، زانیومە دەبێت چی بکەم و زۆرترین ڕەنجبدەم و کاروانەکە بەرەو کوێ ئاڕاستەکەم، ئەم جۆرە ڕەوشەی من دواتر دوو نازناوی لەلایەن دوو کەسەوە دایە پاڵ من یەکێکیان ئاغای مسباح یەزدی بوو، ئەوی دیکەیان هاوڕێی ئەو بوو واتە حوججەتولئیسلام ئاغای ئەحمەد ئەحمەدی بوو، ئێستا ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕشی فەرهەنگی و بریکاری مەجلیسە. لە بەشی فەلسەفەی زانکۆی تارانیش وانە دەڵێتەوە. ئاغای یەزدی ووشەی نەرمتری بەکاردەهێناو دەیگووت: خۆتێهەڵقورتێنەر هەیە لە دەزگای شۆڕشی فەرهەنگیدا مەبەستی من و ئەو ڕاستییە بوو کە دژی توندوتیژیم. بەڵام ئاغای ئەحمەدی — بە سروشتی دڵگیری خۆیەوە — ووشەی ڕەقتری بەکارهێناو ووتی لە دەزگای شۆڕشی فەرهەنگیدا دوو ڕوو (منافق Hypocrite) هەیە. بێگومان ئەم دوو نازناوەی بۆ ئیدانەکردنی من بەکاریان هێنا، وەکو شانازی وەریان دەگرم. لە ڕاستیدا، ئەوان لەبەر ئەوە ئەو ووشانەیان دایە پاڵ من چونکە من ڕێگەم نەدا بە پیادەکردنی هەندێک پێوەری ڕادیکاڵ لە دەزگاکەدا. ئەمە مایەی شانازییە بۆ من و لەبەرامبەردا سوپاس و ستایشی خودا دەکەم.

*لەبەرئەوەی باسی ئایەتوڵڵا میسباح یەزدیت کرد، ئەم پرسیارەم تایبەت ئەکەم بە ئەوەوە. لە دوایین بۆچوونەکانتدا، کەسانێکی وەکو فەردیدت شانبەشانی ئایەتوڵڵا میسباح یەزدی داناوە. پاشانیش، ماڵپەڕێکی ئێرانی لەم بارەیەوە پرسیاری لێکردیت: چۆن دەکرێت میسباح یەزدی کە شوێنکەوتەیەکی مەلا سەدرا و ئبن سینایە شانبەشانی فەردید و هاوشێوەکانی «ڕەزا دەوەری» دابنرێت؟ ئایا لەو کاتەدا، ڕوحانیەکی وەکو یەزدی پێویستی بە ئەفلاتون و هایدگەر بوو بۆ ئەوەی ڕێگربێت لەبەردەم خراپ بەکارهێنانی ئەم فەیلەسوفانە لەلایەن فەردید و هاوشێوەکانی «دەوەری»یەوە؟ بەهەرحاڵ چۆن دەکرێت فەردید وەکو شوێنکەوتەیەکی ڕاستەقینەی ئەفلاتون و

هایدگەر تەماشا بکرێت؟ لەوەش گرنگتر، چۆن دەکرێت ئەم کەسە، وەکو پسپۆڕێکی ناسراوی کایەی دیدناسی Theology، دەست لەم خولیا فەلسەفییە بەردات و بگاتە ئەوەی بڵێ هیچ شتێک جگە لە فاشیزم Fascism لە فەلسەفەی هایدگەرەوە هەڵناهێنجرێت؟

—سەرەتا با بڵێم هەرگیز باوەڕم بەوە نییە کە جگە لە فاشیزم لە فەلسەفەی هایدگەرەوە هەڵناهێنجرێت. بە دڵنیاییەوە، گومانی تێدا نییە هایدگەر هەندێک سەودای هەبووە لەگەڵ ناسیزمدا. چەند ڕۆژێک پێش ئێستا، لەگەڵ پرۆفیسۆرێکی فەلسەفە لە فەرەنسا قسەم دەکرد و پێی ووتم لە کۆتایی مانگی ئازاری (٢٠٠٦)دا، کتێبێکی زۆر قسەلێکراو لە بارەی پەیوەندی نێوان هایدگەر و ناسیزم بڵاوکرایەوە. زۆر کتێب و ووتار هەیە لەم بارەیەوە لە ڕۆژئاوا. بەڵام هەرگیز پێموانییە هایدگەر بانگەشەی ناسیزمی کردبێت یاخود تەنها بانگەشەی ناسیزمی کردبێت و بەس. لە ڕاستیدا، ئەوە گروپێکی دژە — سامییە لە وڵاتەکەماندا ئەم ناپاکی و بێ ڕێزیییە دەدەنە پاڵ هایدگەر. جگە لە هەندێک هەڵوێستی سیاسی نەشیاو کە هایدگەری بە ڕاستی لێی بەرپرسیارە و پێی تۆمەتبار دەکرێ، خاوەنی فەلسەفەیەکی پایەدارەو شایانی هەڵسەنگاندنە. دەکرێت خوێندنەوەی بۆ بکرێت و هەڵسەنگێنرێت وەکو هەر فەیلەسوفێکی دیکە. ناپاکییەکی دیکە لە وڵاتی ئێمەدا دراوەتە پاڵ هایدگەر ئەوە بووە کە فەلسەفەکەی هەرگیز شایانی هەڵسەنگاندن نەبووە. هایدگەر خوایەک یاخود پەیامبەرێک نەبووە، مرۆڤێک بووە بە بیرۆکەی مرۆڤانەوە، دەکرێت هەڵسەنگێنرێت و ڕەخنە بکرێ. ئەوەی لە وڵاتی ئێمەدا دەگوزەرێ ئەوەیە پشتیوانان و شوێنکەوتووانی هایدگەر هەوڵی گەیاندن و بڵاوکردنەوەی دڵسۆزیی و ملکەچی بێ پرسیاری خۆیان بۆ هایدگەر دەدەن. هەرگیز شتێکیان نەوتووەو نەنووسیوە لە پێناو هەڵسەنگاندنی هایدگەردا. بێگومان، ئەمیش دوو هۆکاری هەیە: یەکەمیان لاوازی خودی ڕۆشنبیران خۆیان کە توانای هەڵسەنگاندنی هیچ شتێکیان نییە، دووەمیش لە بنەڕەتدا باوەڕیان بە هەڵسەنگان نەبووە: ئەوەی ئەوان گەیاندیان ملکەچییەکی بێ پرسیارانە بوو، چونکە هایدگەر لەگەڵ هەڵوێست و بۆ چوونە سیاسی توندوتیژخوازانەکەیان زیاتر گونجاوتر بووە. بەهەر حاڵ، بۆچوونی من لەبارەی هایدگەرەوە ئەوەبوو، وەکو هەر فەیلەسوفێکی دیکە دەبێت بیخوێنینەوەو تێیبگەین و هەڵیسەنگێنین و دواجار تێیپەڕێنین و چەق نەبەستین.

بەڵام چیرۆکی ئاغا میسباح یەزدی و پەیوەندی بە فەردید و هاوشێوەکانییەوە پەیوەندییەکی فەلسەفی نەبووە. لێرەدا مەبەستم نییە وێنای جوگرافیای فەلسەفە بکەم لە وڵاتەکەماندا. ئەگەر مەبەستم بوویایە، دەبوویایە لە بارەی چەندین مەسەلەوە قسە بکەم، ئەمەش قسە زۆر هەڵدەگرێ. هیوادارم ڕۆژێک کاتم بۆ بڕەخسێ قسەی لەسەر بکەین.

بەڵێ ڕاستە ئاغا میسباح یەزدی کەم لە فەلسەفەی هایدگەر دەزانێ و بایەخێکی تایبەتی تیای نییە. زۆر باش ئاگاداری ئەمەم. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، هەرچەندە ئاغای یەزدی هەرگیز شەرمی لە ڕەخنەگرتنی کەس نەکردووە و حەز ناکات و هێرش ناکاتە سەر کەس بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێک، بەڵام هەرگیز نەمبیستووە ڕەخنەی ئەم کۆمەڵە کەسانە بکات. سەرەتا با بڵێم دانووستانی کەسیم لەگەڵ ئاغا یەزدی یاخود ئەوانی دیکەدا نەبووە. ئەوە پرسی هزر و کۆمەڵگایە و کاریگەری نەرێییان لەسەر لاوەکانمان و کۆمەڵگا وای لێکردم بە ئاشکرا و لێرەو لەوێ قسەیان لەسەر بکەم.

لە زۆربەی نوسینەکانمدا ووتومە ئاغای یەزدی لێکۆڵەرێکی گەورەیە لە کایەی فەلسەفەی

ئیســـلامیدا. تەنانەت لـــەم ڕووەوە بە پایەدارتری لە ئایەتوڵا جـــەوادی ئەمولی دەبینم. واتە تا ئەو شـــوێنەی ئاگادارم و لە نوســـینەکانی تێگەیشـــتبێتم، ئاغای یەزدی لێکۆڵەرێکی زۆر بە تواناتری فەلسەفەی ئیسلامییە لە چاو هاوکارەکانیدا. کاتێک یەکێک بووم لە هەڵسەنگێنەرانی کتێبی ساڵ، لەسەر ســـووربوونی من بوو یەکێک لە کتێبە فەلسەفییەکانی ئاغای یەزدی واتە «نهایە الحکمە» ئایەتوڵـــلا تەباتەبایی کە کتێبێکی بە نرخ و پڕ بەهایە و ئاغای یەزدی لێکۆڵینەوەی بۆ کردووە بە کتێبی ساڵ دەست نیشانکرا. لێرەوە هیوام وایە هیچ وا تێنەگات کە کێشەیەکی کەسیم لەگەڵ ئەودا هەبێت.

پێموایە تا ئەو جێگەیەی فکر و فەلسەفەی ئیسلامی لەناوباســـدا بێت، ئاغای یەزدی جێگای نرخاندنـــە. بـــەڵام بەداخەوە، کاتێک لەم کایە دەچێتە دەرەوە، شـــتە زبر و ناشـــیرینەکان خۆیان بەیاندەکەن، لە ڕاستیدا هیچ کەسم نەبینیوە هێندەی ئاغای یەزدی زبر قسە بکات کاتێک پێدەنێتە کایەی ئایین و سیاســـەتەوە. خۆت بڕیاربدە: ســـەردەمانێک بوو کەســـانێکی وەکو خوالێخۆش بوو ئایەتوڵڵا موتەهەهەری هەوڵیان دەدا بەشـــێوەیەک لە شـــێوەکان چیرۆکـــی کۆیلایەتی Slavery بۆ موسڵمانان شی بکەنەوە و تێیبگەیەنن بۆچی کۆیلایەتی بە ناچاری ڕووبەڕوی پێغەمبەری ئیسلام بوویـــەوەو چۆن دۆخە کۆمەڵایەتییەکان ناچاریان کرد بە ڕەســـمی دان بـــە کۆیلایەتیدا بنێت و بە یاســـا ڕێکی بخات، لە هەمان کاتیشـــدا، یاســـا بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان دابنێ — لە دۆخێکی لەم چەشـــنەدا، ئاغای یەزدی بە دەربڕینێکی زۆر تاڵ لە ووتارە جەماوەرییەکاندا پاڵپشـــتی کۆیلایەتی دەکات و دەڵێت: «ئەمڕۆش، لە نێوان ئێمە و کافراندا، جەنگێک هەیە، خەڵکیان لێ بەدیل و کۆیلە دەگرین. سەرداری کردنی کۆیلایەتی بەسەر نەچووە و شتێکی نەمرە. دیلەکان دەست بەسەردەکەین و دەیانهێنینە جیهانی ئیسلام و لەگەڵ موسڵماناندا دەمێننەوە. هیدایەتیان دەدەین و موسڵمانیان دەکەین و پاشانیش دەیانگێڕینەوە بۆ وڵاتانی خۆیان».

ئەم زمان زبرییە لە ڕاستیدا شتێکی نائاساییە. خۆم مشتومڕێکم بینی لە نێوان ئاغای یەزدی و محەمەد جەواد حوججەتی دا (ئەم نمونانەی دەیهێنمەوە، نمونەگەلێکن لە دەرەوەی گرنگی پێدانی من، ئەگینا ئەگـــەر بکرێتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ، نمونەی زیاتر بەردەســـت دەکەوێت)، ئاغای حوججەتی بە ئاغای یەزدی گوت لە کاتی ووتاردانی جەماوەری دا سووکایەتی بە ئامادەبووان دەکەیت ئەوە کارێکی باش نییە، لەبری ئەوەی شێوازی قسەکردنەکەی ڕاست بکاتەوە، ئاغای یەزدی ووتـــی «نەخێر، تۆ هەڵەی، ئێمە لە «نهج البلاغـــە»دا ووتارمان هەیە دەری دەخات ئیمامی عەلی سووکایەتی بە ئامادەبووانی دەکات لە کاتی ووتارداندا».

ئەو کاتەی تیرۆریزم بابەتێکی ســـەرەکی بوو و قســـە و باسی زۆر لەسەر دەکرا، زۆر بە ئاشکرا ئاغای یەزدی لە یەکێک لە وتارەکانی پێش — نوێژی هەینی دا ووتی «دەبێت ئەو شەرمە لە ڕووی خۆماندا لابەرین کە هەندێک کەس پێیان وایە توندوتیژی نییە لە ئیســـلامدا. بڕیارماندراوەو سوورین لەسەر ئەوەی ئارگیومێنت بکەین و بیسەلمێنین کە توندوتیژی لە دڵی ئیسلامدایە».

ئـــەم زمان زبری و تاڵییە وا لە کەســـانی ئازادیخواز دەکات بە ترســـەوە هـــاوار بکەن، هاوارێک لە قوڵایی مرۆڤدۆســـتی و ئیســـلامەوە ســـەرچاوەی گرتبێت. هەرگیز و بەهیچ شـــێوەیەک باوەڕم وا نییە ئاغای یەزدی زیاتر لە برادەرە چاکســـازەکانمان ئاگاداری ئیســـلام بێت. ئەم هەڵوێســـتانەی

من لە بەرامبەر ئاغای یەزدیدا بە ســادەیی لەوەوەیە کە لــەم ماوەیەدا گەورەترین ڕۆڵ دەبینێت لە پێشکەشــکردنی وێنەیەکی ناشــیرینی ئیسلام، ئەو ئیســلامەی منیش لێی ئاگادارم منیش وەکو زۆرینەی دروســتکراوەکانی خودا لەســەر ڕووی زەوی پابەندی ئەم دینەم و بــاوەڕم پێیەتی. ئەم ئیسلامە نابێت بشێوێنرێت.

ئیسلام هێندە گەورەو ئەزیزە بۆ ئێمە نابێت ڕاڤەکردنی بدەینە دەست ڕوحانییە توندوتیژخوازەکان بــە زمانێکی زبر. دەبێت ئەم پاشــخانە گــەورەو میراتە پیرۆزەی پێغەمبەری ئازیزی ئیســلام لە دەســتیان دەربێنین. ئەوان شــایانی پاراســتنی ئەم میراتە بەنرخە نین. ئەگەر بڕیاری بێ ووزە و تەمەنــم بە خەرج بدەم، ئەوا بــۆ کۆتایی هێنانە بەمە . لە هەمووی خراپتر ئەوەیە بە چاوی خۆمان هاوپەیمانیەکــی بەدبەخــت و ناچیز لە نێوان ئــەم ڕوحانییە زمان زبر و ئەو درۆزنە فەیلەســوفە توندوتیژخوازانەدا دەبینین. ئەمە گەورەترین ئازار دروست دەکات. دەکرێت ئەوە بینیت کە ئەو قسەو شیکار و ئارگیومێنت و چەمکانەی بەکاردەهێنن تەواو هەمان ئەوانەن کە درۆزنە — فەیلەسوفەکان بە ناوی ئۆپۆزسیۆنی خۆرئاواو دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤەوە دەریدەبڕن.

جارێکیان لە یەکێک لە قســەکانیدا، ووتی هەر کەســێک چەند مەترێکی کەم قوماشــی لەسەر ســەری دانا نابێتە ڕوحانی Cleric و پســپۆڕی ئایینی، خۆ لە بنەڕەتدا من لەگەڵیدا هاوڕام، بەڵام نازانم ئەو چەند مەتر قوماش لەســەر ســەریەتی. جارێک نەمانبینی ڕوحانییەکانمان ســمینارێک سازبکەن بۆ قسەکردن لەسەر ستەمکاری ئایینی، سەدان سمینارمان هەیە لەسەر ولایەتی موتڵەقی فەقیە[4]، بەڵام تەنها یەک سمینارمان نییە لەسەر گفتوگۆکردنی چیرۆکی ستەمکاری دینی. ئەمەش لەبەرئەوەی ڕوحی توندوتیژی چۆتە ناخیانەوە .

یەکێک لەو بەرەو پێشچوونە سەیر و سەمەرانەی ئێمە دەیبینین ئەوەیە کە هەمان ئاغای یەزدی زۆر دڕندانە هێرش بکاتە ســەر دکتۆر علی شــەریعەتی و بڵێ ئێستا شەریعەتی لە ئاگری دۆزەخدا دەســووتێت و بگاتە ئەوەی شــیکارە شۆڕشــگێڕی و درۆزنە — شۆڕشــگێرییەکانی شەریعەتی لە ووتارەکانیدا بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی هەســتە شــەڕانگێزییەکانی خۆی بە خەڵکی بفرۆشــێت. لەم نێوەندەدا، بێتاوانترین و بەهەڵە قوربانی: دینداری لێبوردەیی و دینداری عیرفانییە کە مافی خۆی پێنادرێ.

سەردەمانێک بوو، خوالێخۆشبوو شەریعەتی هەوڵی زۆری دا بۆ ئاشتکردنەوەی ئیسلام و شۆڕش. ئەمڕۆ، هەندێک ڕوحانی بە هاوکاری هەندێک درۆزنە فەیلەسوفی توندوتیژخواز هەوڵی ئاشتکردنەوەی ئیسلام و توندوتیژی دەدەن، تەنانەت دەیانهەوێت شەریعەتی وەکو ئەندامێکی ئەم کاروان و کۆمەڵەیە بناســێنن. بەڵام کۆمەڵەی ســێهەم هەیە دەیهەوێت ئیسلام و عەشــقی ئازادی و لێبوردەیی و نەرم و نیانی و بەزەیی ئاشــت بکاتەوەو نەهێڵێت توندوتیژخوازەکان ڕێگە بگرنەبەر. هەندێک لایەنگرانی ڕۆشنبیرە ئایینییەکانم بینی زۆر بە ووردی ئاماژەیان بەم خاڵەدا. بە من و کەسانی وەک من دەڵێن ئیســلامی ڕاستەقینە ئەو ئیســلامە نییە تۆ باسی دەکەیت، ئیسلامی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئاغای یەزدی و خازع علی و حەسانی و جەننەتی و هاوشێوەکانیان نیشانی دەدەن. ئەمە کێشەیەکی بچوک نییە . دەبێت ڕونی بکەینەوە و نیشــانی بدەین و هەندێک جار بە مەترســی گەورەشەوە بۆ خۆمان، بانگەشــەی ئەوە بکەین کە بەو شێوەیە نییە، بە هیچ شێوەیەک ئاغای یەزدی و توندوتیژخوازەکانی

هاوشـــێوەی ئەو قسەکەری ئەو ڕێبازە خۆشەویستە نین کە ئێرانییەکان و موسڵمانانی دیکە خۆیان بۆ تەرخان کردووە.

*حەزدەکەم بابەتی ئیســـلامی توندڕەو لێرەدا کۆتایی پێبێنم و پرســـیارت لە بارەی بزوتنەوەی چاکســـازەکانەوە ئاڕاســـتە بکەم. چەند مانگێک لەمەوپێش لە ئەڵمانیا وتارێکت پێشـــکەش کرد، دەربارەی شـــێوازی ڕەخنەگرتنی بزوتنەوەی چاکســـازی Reformist، هەندێک قسەت هەبوو لەسەر شـــێوازی ئیشـــکردنی ئاغای خاتەمی و ووتت هەڵبەزودابەزە کردارییەکەی بەرهەمی هەڵبەزودابەزە تیۆرییەکەیەتی. هەر لە هەمان دانیشتندا، بۆ وەڵامی پرسیارێک لە بارەی بۆچوونی ئەکبەر گەنجییەوە کە فکری دینی ناتوانێت بەرەو دیموکراسی هەنگاوبنێت، ووتت گەنجی بۆچوونەکانی لە خوێندنەوە توندەکانی ئایینەوە وەرگرتووە وەکو خوێندنەوەکانی مەسرس و یەزدی و غەزالی، بەڵام دەشێت ئەم ئامانجە لەسەر بنەمای خوێندنەوەکانی دیکەی ئایین بەدەست بێنین.

بەڵام لە دواین ئاڵوگۆڕە نامەییەکانتدا لەگەڵ یەکێک لە ڕەخنەگرەکانت قسەیەکت وتووە هاوشێوەی بۆچوونەکەی گەنجی: وتوتە درێژبوونەوەی بێگەردێتی پێغەمبەر بۆ ئیمامەکان لە فکری شـــیعیدا، ڕێگرێکە لەبەردەم پێگرتنی دیموکراســـیدا لە شـــیعەگەریدا. بینیشـــمان ئەم بۆچوونەت تاڕادەیەک هەندێک چاکسازی دڵتەنگ کردو د. محسین کەدیوەر وتی ئەو کەسانەی پشتگیری فرە خوێندنەوەی ئایین دەکەن چاوەڕێ دەکرێ ڕاهێنان لەسەر خۆکۆنترۆڵکردن بکات.

ئێســـتا دەکرێ بڵێین ئەم گۆڕینە وەک نیشـــانەی بەرزونزمییەک لە فکری تۆدا لێکبدرێتەوە؟ ئایا لەبەر ڕۆیشـــتوویی فکـــری تیۆری یاخود نەبوونـــی توندێتی لە فکردا لە جەوهەردا شـــایانی سەرزەنشـــتکردنە یاخود شایانی شانازی و پیاداهەڵدانە؟ ئایا دەبێت کۆتایی سەرۆکایەتی خاتەمی وەکو کۆتایی پرۆژەی چاکسازی لە ئێراندا سەیر بکرێ؟

-ئینـــکاری ئەوە ناکەم هەندێک قســـەی حـــەق و تاڕادەیەک ڕەقم لە بارەی ئاغـــای خاتەمییەوە کـــردووە. بەڵام ئەمانە بەدەر لە پەیوەندی هاوڕێیەتیمان بووە. ئەمەش لەبەرئەوەبوو ئاغای خاتەمی دەکرێت گفتوگۆی لەگەڵدا بکەیت. بەڵام لە ئێســـتادا و لەگەڵ سەرۆکی ئێستادا (ئەحمەد محمودی نەژاد) بە داخەوە ئەم دەرگایەمان لێداخرا. سەرەڕای ئەوەش، ئاغای خاتەمی نووسینگەی خۆی هەبوو لە پێگەیەکدا بوو کە تیایدا ڕەخنەکانی من وەکو لایەنی کەســـی لێکنەدەدرانەوە، ئەوەی دەمگووت ئاڕاستەی پێگەو پۆستەکەی دەکرا نەک خودی خۆی لەبەرئەوەبوو دەبوو هەموو شتێکمان بە ئاشکرا و ڕاستگۆیی بگووتایە لە پێناو ڕۆشنبیرکردنی نەوەکانی ئێستا و داهاتوو.

ئەم کێشەیەی پێشتر بە زاراوە زیاتر گشتییەکان لێیدوام، لە ئاغای خاتەمیدا تێبینیم کردووە: نەبوونی دیدگایەکی تیۆری دەبێتە هۆی نەبوونی جوامێری و دلێری لە کرداردا. ئەگەر بە ئاشـــکرا و بە شـــێوەیەکی یەکلایـــی پابەندی هێڵێکی بیرکردنـــەوە بوویت، ئەوا لە کرداریشـــدا ئازایەتی و دلێری وەدەســـت دەخەیت. بەڵام کاتێک بیرکردنەوە نا ڕۆشـــن و دیدگایەکی تیۆری نەبوو، لە کاتی کردار نواندنیشـــدا بە ئاشـــکرا دووچاری گومان و دڵەڕاوکێ و هەڵبەز و دابـــەز دەبێت. باوەڕم وایە جگـــە لەو ڕێگرە دەرەکییەکانی ڕێگربوون لەبـــەردەم جێبەجێکردنی بیرۆکە و بەرنامەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانی، گومانم نییە لە پاک ڕاســـتێتی ئـــەم ڕێگرانەدا، ئاغای خاتەمی دووچاری هەندێک

ڕێگــری ناوەکیش ببوو. واتا کاتێک باســی چەمکەکانی وەکو ئازادی و مافــی مرۆڤ و کۆمەڵگای مەدەنی دەکرد کە لە دروشــمە سەرەتاییەکانی بوون، بە ئاشکرا، سنور و مەودای ئەم چەمکانە بۆ ئەو ناڕۆشن بوون.

هەر جارە و لەســەر پەتێک یاری دەکات. بیرۆکەیەک دەوروژێنێت و کەســانی دیکەش شــوێنی دەکەون و لە پڕدا شڵەژانێک دروست دەکات، دواجاریش پاشەکشە دەکات و سست دەبێت و هەموو کەس دووچاری حەپەســان دەکات. ئەمەش لەســەر بابەتی کۆمەڵگەی مەدەنی زۆر ئاشکرایە. ئەو بیرۆکــەی کۆمەڵگــەی مەدەنی وورووژاند. بیرمە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر وتار نوســران و کۆمەڵگەی مەدەنیان Civil Society خســتە ژێر لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەوە. تیشــکێکی زۆرباش خرایە ســەر بابەتەکــە و ئــەم چەمکەش تا ئەو کاتە تا ڕادەیەک نامۆ بوو، بەڵام پاش ئەوە لای خەڵکی ناســرا. کۆمەڵە ئەکادیمییەکانمان و خەڵکە ڕۆشــنبیرەکانمان دیدێکی باشیان لە بارەیەوە پەیداکرد. بیرمە چەندین ووتارم لەم بارەیەوە پێشکەشکرد و چەندین نووسینم لە بارەیەوە بڵاوکردەوە. چەندان کەسی دیکەش تا ئەم جێگەیە لەسەریان نووسیوەو لێ دواون. بەڵام لە پڕدا بینیمان ئاغای خاتەمی گووتی: مەبەستم لە کۆمەڵگەی مەدەنی مەدینەی پێغەمبەر بوو. ئەمە هەموو کەسێکی دووچاری حەپەسان و ســاردبوونەوەیەکی ســەیر کرد. ئەمە یا ئەوەتا هەر لە ســەرەتاوە تێگەیشتنی ئەو بوو لە بارەی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە یاخود پاشــتر لەبەر هەندێ هۆکاری تایبەتی سیاسی و تیۆری زەینی خۆی گۆڕی و لە جێی کۆمەڵگەی مەدەنی، مەدینەی پێغەمبەری دانا. ئەمە هەڵبەز و دابەزێکی ئاشــکرا بــوو لە بیرکردنــەوەی ئەودا. هەمان هەڵبەزودابەزمان بینی کاتێک لــە بارەی ئازادییەوە Freedom قســەی کرد. بێ گومان، ئەگەر بێتوو بەراوردی ئاغای خاتەمی بکەم لەگەڵ پیاوانی دەوڵەت یاخود سیاسەتمەدارەکانمان ئەوا دەڵێم، بەراوورد ناکرێ.

بەهەرحاڵ، ئەم کێشــەیەم لە ئاغای خاتەمیدا بەدی کرد، کە دەکرێ پێیبووترێت هەڵبەزودابەز Vacillation و پێموایــە ســەرچاوەی هەندێک لە کێشــە کردەییەکانیەتی. بــاوەڕم وایە ئەمە بووە هۆی هەندێک شکســت ئێستا لەسەر ڕۆشــنبیرە دینییەکان و دیموکراسی ئیسلامی و هتد حیساب دەکرێت. لە وەڵامی بەشی دووەمی پرسیارەکەتدا، دەبێت بڵێم ئاغای خاتەمی نە نوێنەری ڕۆشنبیرە دینییەکانــەو نــە دامەزرێنەری تیۆری دیموکراســی ئایینییەو ئەو بەرهەمی بیرۆکەی ڕۆشــنبیرە دینییەکانە. لەبەر ئەوە ناکرێت بەرمەبنای شکستی یاخود هەڵبەزودابەزی ئەو، بگەینە ئەوەی کاری ڕۆشــنبیرە دینییەکان یاخود دیموکراسی ئایینی بە کۆتا گەیشتووە و بە ڕەهایی شکستی هێناوە. دۆخەکە بەو شــێوەیە نییە. باوەڕم وایە دیموکراســی دینی مانایەکی ڕۆشن و شێوازی کاری ڕۆشنی جێبەجــێ کردنی هەیە. ئەگەر نەیارەکانی و توندوتیژخوازەکان ڕێگە بدەن، دەکرێت کردەیی بکرێت و وەکو مۆدێلێکی باش بۆ تەواوی جیهانی ئیســلام خزمەت بکات، بە تایبەت لەبەرئەوەی ئێستا لە کۆمەڵگەی ئێمەدا گوتاری دیموکراسی بۆتە گوتاری زاڵ. واتە دیموکراسی خۆی بەهانە و پاساوە بۆ خۆی، پێویستی بە پاڵپشتی گفتوگۆکردن نییە. کتومت وەکو وشەی «ئنقلاب: شۆڕش revolution» لە ڕۆژانی ســەرەتای پاش ســەرکەوتنی شــۆڕش کاتێک «کرداری شۆڕشــگێڕانە» خۆی بەهانە و پاساوی خۆی هەڵگرتبوو چونکە زاراوەی «شۆڕش»ی تێدابوو. ئێستا ئەگەر ئاوەڵناوی «دیموکراتی Democratie» بدەیتە پاڵ هەر شتێک، ئەوا هەمان جۆر بەهانەو پاساوت پێداوە. بێگومان ئەمەش

پێشـــکەوتنێکی زۆر دڵخۆشـــکەرە دەبێت بینرخێنین. دیموکراسی دینی و کاری ڕۆشنبیری ئایینی هێشتا پاساوداره و شایانی بەرگری کردنە.

دەربـــارەی ئەو خاڵەش کە دەکرێت ئێمە خوێندنەوەی جیـــاوازی ئاینیمان هەبێت، گومانم نییە لەمە. هەروەکو خۆت وتت و ئەو قسـانەی هاوڕێ ی ئازیز و خۆشەویسـتم (د. محسـین کەدیوەر) کـه ئاماژەت پێدا. یەکێکم لەوانەی پەرەی بە بڵاوبونەوەی ئەم بیرۆکەیەدا (خوێندنەوەی جیاواز بۆ ئاییـن). بەڵام دەبێت ئەم خاڵە ئاگادارکەرەوەی خوارەوە ڕوونبکەمەوە: گەڕانەوە بۆ بیرۆکەی فرەیی خوێندنەوەکان مانای ئەوە نییە ئاژاوە Choos و پەرتەوازەیی لە کایەی خوێندنەوە ئاینییەکاندا باڵا دەست بێت و هەموو خوێندنەوەیەک شیاو و بەهانەدار بێت. لە نووسینەکانیشمدا، ئاماژەم بەم خاڵە داوە. ئەگەر هەر تێکستێک شیاوی ئەوە بوو هەر مانایەکی بت هەوێت لێهەڵێنجیت، مانای ئەوەیە ئەو تێکستە هیچ مانای نییە. بەڵام ئەگەر سنورێک هەبێت بۆ مانای تێکست، پێویستە هەوڵ بدەین ئەو سنورە بدۆزینەوە. بێگومان باوەڕم بەوە نییە کە تێکستێک تەنها یەک مانای هەبێت یاخود ئەو مانایە یەکسان بێت بە نیەتی قسەکەر هەرچەندە، من دەتوانم یەک خاڵ دەستنیشان بکەم و بەیانی کەم: تێکسـتێک (دەقێک) خۆی نابەسـتێتەوە بەهەر مانایەکەوە. باوەڕم وایە هیچ کەس ناتوانێت ڕۆژێک بێت و بانگەشـەی ئەوە بکات دەشێت فرە پەرسـتی Polytheism لە قورئانەوە دەربێنین. قورئان لەسەر ئەم بابەتە هێندە ڕۆشنە و جەخدی لەسەر دەکاتەوەو چەندین جار دووپاتی دەکاتەوە تا ئەوەی ئەم تێڕوانینە پوچەڵ دەکاتەوەو لە باری دەبات و یەکسانی دەکات بە کوێری.

بـــاوەڕم وایە ئەو بۆچوونەی کە دەکرێت ئیسـلام لەگەڵ دەوڵەتێکی دادپەروەری دیموکراسـیدا ئاشـت بکرێتـەوە بۆچوونێکی بەهانـەدارەو دەتوانرێت چەندین دەلیل بهێنرێتەوە بۆ پشـتگیری کردنـی. بێگومان ڕێگایەکـی درێژ هەیە دەبێت بیبڕین پێش ئەوەی بگەینە ئەم ئاشـتبوونەوەیە. هەرگیز لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم وەکو (فاضل الرحمن) و چەندین نووسەری دیکەی عەرەب، کە هەندێک توخم لە ناو ئاییندا هەن وەکو بەڵێنی هاوپەیمانێتی و ئەنجومەنی شـوراو هاوشێوەکانی، دەکرێت بەکاربهێنرێت وەکو سەرچاوەی جۆرێک لە دیموکراسی مۆدێرن. ئەمە بەلای منەوە کارێکی نەشیاوەو هەموو ئەو هەوڵانەی لەم پێناوەدا لە ڕابردوودا دراوە سـەرکەوتوو نەبوون. دەبێت تیۆریمان هەبێت لە بارەی سروشـەوە (وەحی Revelation)، لەبارەی پەیوەنـدی نێوان خوداو جیهان، پێگەی ئایین لە مێژوودا، پێگەی فیقە لە ئاییندا، لە بنەڕەتیشـدا لەبارەی مانای ئایین و گوتاری خوداو .. هتد. ئەگەر هەموو ئەم شـتانەمان بە دەسـت لێنەدراوی بەجێهێشـت و تەنها لە چوار چێوەی فیقهدا بیرمان کردەوە بە هەندێک زیادەو لێدەرکردنی سادەوە، لابردنی هەندێک ڕێساو ئەرک و هێنانە پێشی هەندێکی دیکە، ئەگەر بەبێ هیچ پاسـاو هێنانەوەیەک، بە شێوەیەکی دیاریکراو مامەڵەمان لەگەڵ وانە و ناوەڕۆکەکانی دیندا کرد، ئەوا دەرەنجامێکی باش بەدەسـت ناهێنین. دەرەنجامی بەدەسـت هێنراو هەرچییەک بێت، دەرەنجامێکی گوماناوی دەبێت. پێویستمان بە تیۆرییەی گشتگیر هەیە لە بارەی ئایینەوە. لە هەناوی ئەم تیۆرییەی ئاییندایە دەتوانین هەندێک بیرۆکەی مۆدێرن بخوێنینەوە یاخود شـێوازێکی ئایینیانەی بەکارهێنانیان بخەینە ڕوو. ئەگەر ئەمە دەرکەوت مەحاڵە، ئەو کاتە دەتوانین بڕیار بدەین لە چ ئاستێکداین و لە کوێدا وەستاوین.

کێشەی ئێمە ئەوە نییە هەوڵبدەین دیموکراسی لەگەڵ وانە ئاینییەکاندا بگونجێنین یاخود لەوانە

ئاینییەکان بیکەینە دەرەوە. دەبێت نیشـــانی بدەین چۆن کەسێک دەکرێت ئاینیی بێت لەسەردەمی ئێستاداو لە کۆمەڵگە و حوکمڕانییەکی دادپەروەریشدا بژی. مەبەستیشم لە دادپەروەری سەردەمی مۆدێرنەیە: لەلایەکەوە هاوتایە لەگەڵ دیموکراســـی و مافی مرۆڤـــدا، لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی بە ئازادی ڕادەربڕینەوە هەیە، لەلایەکی دیکەشـــەوە دەوڵەتێکی بڕیارلێدراوی بەرپرســـی ڕەخنەکراوە. دەبێت لەم پێناوەدا تێبکۆشـــین و ئەگەریش کارێکی لەو شـــێوەیەمان کرد، ئەو کات دەکرێت قسە لە دیموکراســـی ئاینیی بکەین. بەهەرحاڵ، هەموومان، موسڵمان یاخود نا موسڵمان، دادپەروەریمان Justice دەوێت و وازمان لێنەهێناوە. کاتێکیش ئەم دادپەروەرییە وەرگێڕدرایە سەر فۆرمە نوێکەی و لـــە کۆمەڵگەی ئاڵۆزی ئەمڕۆدا، ئەو کات ناکرێت تەنها پابەندی دادپەروەری فەرمانڕەوا بێت بەڵکو دەبێت دادپەروەرییەکی بونیادی و کۆمەڵایەتی و ئابوری بێت.

لێـــرەوە دووپاتی دەکەمەوە: تەنها هەموو خوێندنەوەیەک شـــیاو نییـــە. بڕوام وایە هەندێک لەو تێگەیشـــتنانەی لەمڕۆی کۆمەڵەی ئیمامەکاندا یاخود لە بارەی «مەهدەویەت» (بڕوای شـــیعی بە گەڕانـــەوەی ئیمامی داونزەیەم)، یاخود تەنانەت دەربارەی چەمکی خودا God هەیە بەشـــێوەیەکی تایبەتی گونجاو نییە لەگەڵ دەوڵەتێکی بەیاســـا ڕێکخراودا و ڕێگە نادات کۆمەڵگە گەشـــە بکات و پێش بکەوێت بە مانا مۆدێرنەکەی. ئەم تێگەیشـــتنانە پێگەیەکی گرنگ و زەق نادەنە چەمکی ماف right و ئازادی پێویســـتیش نادەنە خەڵکی. ئەمانە شـــتگەلێکن دەبێت لێیان بڕوانرێت. دەربارەی ئـــەوەی ئایا هەڵبـــەزو دابەز لە بۆچوون و دیـــدگای مندا هەیە یاخود نا، بـــا ئەوانی دیکە بڕیاری لێبدەن.

*لێرەوە با بچینە سەر ئەوەی بە کۆتایی هاتنی سەرۆکایەتی ئاغای خاتەمی، هەندێک لە ڕۆشنبیرە ســـێکولارەکان شکســـتی ریفۆرمســـتەکانیان لە هەڵبژاردنە ســـەرۆکایەتییەکەی مانگی حوزەیرانی ســـاڵی ٢٠٠٥ وەکو شکستی ڕۆشنبیرە دینییەکان نیشـــانیاندا. لە بنەڕەتدا بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ڕۆشـــنبیریەتی دینی religious intellectualism پرۆژەیەکی نا پێویســـت و ناپەیوەستە و لە جەوهەریدا بێ مانا و بێ بەرهەمە.

–ڕاســـتییەکەی ئەوەیە ئەم کەســـانە سیاســـیانە دەجووڵێنرێن، بەڵام بە بەکارهێنانی ئامرازی نەشـــیاو شوێن هاندەرە سیاســـییەکانیان دەکەون. بۆ دەبێت ڕۆشـــنبیری دینی لە ڕووی زاراوەوە دژیەکییەکی تێدابێت؟ کاری ڕۆشنبیر لقێکە لە بیرکردنەوە، ئەگەر باوەڕمان وانەبێ کە بیرکردنەوەو بوون بە بیریار گونجاو نەبێ لەگەڵ ئاییندی بووندا. ئێســـتا ئەگەر هەر کەســـێک بانگەشەیەکی لەو شێوەیەی کرد (بە ئاشکراش ئەمە جەوهەری ئەم بانگەشەکارانەو ئەم ڕەخنەگرانە بێت کە دەیڵێن، واتە باوەڕیان وابێ کەســـێکی دینی ناکرێت ببێتە بیریارێکی ڕاستەقینە)، دواجاریش دەکرێت ئێمە بەرمەبنای مانای ئەم چەمکانە و بەرمەبنای ئەزموون گفتوگۆ لەگەڵیاندا بسازێنین.

بەرمەبنـــای ئەزموون Experience، لانی کەم، دەکرێت ئەوە نیشـــان بدرێ کە بیریارە Thinker مەزنـــەکان لە مێـــژووی جیهاندا — نەک تەنها لە مێژووی دنیای ئیســـلامدا، لە ڕیـــزی باوەڕداران هاتوونەتـــە دەرەوە. کـــەس نکوڵی لەوە نـــاکات فارابی بیریار بووە یاخود ئبن ســـینا یاخود پیاوە مەزنەکانی وەکو حافز. یاخود لە خۆرئاوا، هیگڵ هەوڵێکی بێ ئەندازەی دا بۆ پێکەوە ســـازگارکردنی

فەلسـەفە و بیرکردنەوەی پرۆتسـتانتیزم. بینیشـمان ئەمانە هەمووی بیریار بوون و پەیوەستی ئیمان Faith و ئایین religion بوون. بێگومان ئەگەر کەسێکیش نکوڵی لەوە بکات ئەمانە بیریاری ڕاستەقینە بوون، دواجار ئێمەش گومان لە بارەی بیرکردنەوەی ئەم کەسەوە پەیدا دەکەین.

ئەگەر کەسـانێکیش هەبن بڵێن کاتێک ئێمە بیردەکەینـەوە، بەرژەوەندییە ئاینییەکانمان کار پێناکەین. ئەمە شـتێک نییە بکرێتە بابەتی ئارگیومێنت و ئەوە نەشـتەرێکی کولە. یەکەمین شت ئەوەیـە هیچ کـەس نابێت کار بە بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات لە ناوکۆی (سـیاق) داوەریکردندا دەگێڕنەوە لە پێغەمبەری ئیسـلامەوە کە سـێ شـت هەن دەبنە هۆی ڕزگاری مرۆڤ: یەکێکیان بەلاوەخستنی حەزو ئارەزوو و ڕق وقینەکانە لە کاتی داوەریکردن و بڕیاردان. هەر پەیوەست بوونێک بە ئایینەوە یاخود شـتەکانی دیکەوە تۆی کوێرکرد لە کاتی داوەریکردندا دەبێت بخرێتە لاوە. ئەمە تەنها تایبەت نییە بە ئایینەوە. بەڵکو کاتێک خۆشەویسـتی بۆ هەندێک کەس یاخود هەندێک شت یاخود حەز و کینە دێتە مەیدانی کارپێکردن، داوەری کردن و بڕیاردانەکان زۆر ئاشـکرا نا ڕۆشـن و لێڵ دەردەکەون. لەگەڵ ئەوەشـدا، کاتێک شـتێک پەیوەندیدار نییە بە کایەکەوە، بێگومان نابێت بەرژەوەندی خوازی تیا بکرێت. کاتێک من داوەرییەکی فەلسەفی دەکەم، بێگومان نابێت مەعریفەی کیمیاکەم[٥] کارپێبکەم، بە هەمان شـێوەش کاتێک کەسێک باس لە جووڵەی زەوی یاخود بوون و ماهیەت دەکات، نابێـت پابەندبوونە دینییەکانی یاخود هەر پابەندبوونێکی دیکە بهێنێتە ناوەوەو کاریان پێبکات.

حەزدەکەم خاڵی سـێهەمیش زیاد بکەم: بیرکردنـەوە لە بنەڕەتدا بابەتێکی تاکی (فردی) نییە بەڵکو بابەتێکی کۆییە (دەستەجەمعی)، هەروەکو ئەوەی مەعریفە Knowledge بابەتێکی کۆیی و لەبەر ڕۆیشتووە. تۆ ناتوانیت ڕێگەی بیرکردنەوە یاخود قسەکردن لە کەسانێک بگریت لەبەرئەوەی ئاینیین. کەسـێکی دینی وەکو کەسـێکی نادینییە: ئەوە دەڵێن کە دەبێت لە چوارچێوەی جڤاتی بیریاراندا بیڵێن و جڤاتیش community وەڵامی دەداتەوەو هەڵیدەسەنگێنێت. بەرهەمی ئەم پرۆسە کۆییە پێیدەڵێن مەعریفە.

فکرێک لـە قوژبنێکدا خۆی مەڵاسـداوە پێیناوترێـت بیرکردنەوەو مەعریفە. مەعریفەناسـی Epistemology مۆدێـرن پێمـان دەڵێـت مەعریفە بابەتێکـی کۆیی و لەبەررۆیشـتووە. ئەمەیە مەبەستی هەڵسەنگاندن یاخود ڕەخنەکردن. ئەوەی پێویستە بیڵێیت، تۆ دەیڵێیت و ئەوانی دیکەش هەڵیدەسـەنگێنن. ئەم بوونەی ئەوانی دیکە Others مەرجی بەرهـەم هێنانی مەعریفەیە. لێرەوە، پرسی ئەوەی ئاخۆ تۆ دینییت یاخود نا دینییت، سەر بەم مەزهەب یا ئەو مەزهەبی لە بنەڕەتدا نا پێویست و ناپەیوەندیدارە. تۆ دەبێت سەیری دوا دەرەنجامی بیروبۆچوونێک بکەیت و لە سیاقێکی کۆییدا بیروبۆچوونەکە دووچاری هەڵسـەنگاندن evaluation و دژە — بۆچوونی بیریارەکانی دیکە دەبێت.

ڕۆشنبیرە دینییەکان شان بە شانی ئیمانی دینی و عەقیدە و عەقڵکارییان بیروبۆچوونەکانیان بۆ کۆمەڵەی بیریاران دەخەنە ڕوو. پێشـوازیش لـە ڕەخنەگرتن دەکەن. دەرەنجامی هەموو ئەمەش دەبێتە مەعریفە. ئێمە بە هیچ شێوەیەک ناتوانین کەسێک کە دینییە ڕێگەی بیرکردنەوەو قسەکردنی لێبگرین و کەناری بخەین ئەم شێوازی کەنارخستنە کە هەندێک کەسی سێکولار هەڵیانبژاردووە تا

ســـەر ئێسقان شێوازێکی نادیموکراتی و نائەکادیمی و دژە ئەکادیمییە و زۆریش زیانبەخشە. بەدەر لەوەی سوودێکی نییە لە دۆخی ئێستاماندا، زۆر زیانبەخش دەبێت بە فەرهەنگ و مەعریفەمان.

چ سەختییەکە ڕۆشنبیرە دینییەکان ڕووبەڕوی بونەتەوە لە پێناو هێنانە کایەی دۆخێک هەموو کەس بتوانێت قسەی خۆی تیا بکات و ئێستا، کاتێک ئەوانی دیکە دەستیان بە قسەکردن کردووە، یەکەم شت دەیکەن بانگەسە کردنە بۆ پەراوێزخستنی ڕۆشنبیرە دینییەکان.

*بۆ دوایین پرســـیارم، حەزدەکەم لە کایەی فکر دوور بکەومەوەو دەربارەی کاروباری سیاســـییە گرنگەکان هەندێک شتت لێبپرسم. لە دوایین ڕۆژەکانی پێش هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکە، (ساڵی ٢٠٠٥)، بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی هەندێک پارتی سیاســـیی چاکساز (ریفۆرمخواز)، پێتوابوو حوججەتوئیسلام «کەڕووبی» کاندیدێکی گونجاوتر و باشتری سەرۆکایەتییە. ئایا ئەم هەڵبژاردنە نیشانە و ئاماژەی ناسین و شارەزای واقیعگەرایانەی تۆ بوو بە هەرەمیەتی دەسەڵات لە ئێران تیایدا کەسانی وەکو ئاغای کەڕووبی دەتوانن ڕۆڵێکی کاریگەرتر لەوانی دیکە بگێڕن؟

–گەر بمەوێ بە ئاشکرا قسان بکەم، دەڵێم هێشتا وا دەزانم ئاغای کەڕووبی سەرۆکی ئێران بێت چونکـــە دەنگەکان بۆ ئەو بـــوون. لەبەرئەوەبوو ناوی ئاغای کەڕووبی هێنا بەهۆی ئەو مەعریفەیەی لەســـەر کۆمەڵگای ئێرانی هەمە و خۆشحاڵیشـــم تێگەیشـــتنەکەم هەڵە نەبوو: چونکە ژمارەی ئەو دەنگانەی ڕوویان لە کەڕووبی کرد شایەتی ئەمەن.

پێشـــتر ڕوونم کردۆتەوە بۆچی ئاغای کەڕووبیم پێ شیاوترە بۆ سەرۆکایەتی لە دۆخی ئێستادا، بەبێ پرســـیار کردن لە شـــیاوێتی کەســـانی دیکە. هەروەکو خۆت دەزانیت، هەمیشە شیاوێتی لە چوارچێوەی ســـەرجەمی هەلومەرجەکاندا پێناسە دەکرێت و جێی خۆی دەگرێت. هاوڕێیەکی نزیکی ئاغای موعینم. ڕێزی بیرکردنەوەی دەگرم و ئەگەریش قســـە لەســـەر هەوڵەکانمان بێت، من و ئاغای موعین هەڵوێســـتی نزیکمان هەیە. بەڵام بەرمەبنای ئـــەوەی لە جوڵانەوەی کەڕووبیدا بینیوومە، بە تایبەت کاتێک ووتەبێژی مەجلیس بوو، وە پەیوەندییە ڕوحییەکانی و هەوڵە شاراوە ڕێکەوتییەکانی وەکـــو پیاو دەوڵەتێکی بە تەمەن، کەشـــێکی تاڕادەیەک ئازادی بۆ بیریـــاران و لێکۆڵەران و زانایان هێنایە کایەوە، ســـەرجەمی ئەم شـــتانە پێیان گووتم ئاغای کەڕووبی شـــیاوترە بۆ ســـەرۆکایەتی لەوانی دیکە لەم دۆخەی ئێســـتاماندا، شـــیاوترە بەو مانایەی لە ماوەی ســـەرۆکایەتی ئەودا، هەلی ئەوەمان دەبێت هەندێک لە تیۆریاکانمان بەبێ هەبوونی بەرپرسیاریەتی بەرز (پۆستی گەورە) تاقی بکەینەوە یاخود جێبەجێ بکەین.

پاشـــانیش، خۆشـــحاڵ بووم بینیم ئەوەندە هەڵە نەبووم و کۆمەڵگەکەمان بەو ئاڕاســـتەدا ڕۆی بەرمەبنـــای دەلیلەکانیـــان و بەبێ هیچ ووروژاندن و هاندانێک لە منەوە (لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی دوایین بۆچوونەکانمەوە).

لە ئێســـتادا ســـەرۆکێکی دیکەمان (ئەحمەدی نەژاد) هەیە و لە چوارچێوەی یاســـادا مامەڵەی لـــە تەکدا دەکەین. ئامۆژگاریشـــمان بۆی ئەوەیە دەبێت زیاتر حەکیمانە قســـە بـــکات. نابێت بە بۆچوونەکانی کێشەی نوێ بۆ کێشەکانی میللەتەکەمان زیاد بکات. ئەگەر لە جێگەی ئەو بوومایە، لە بری قســـەکردن لە بارەی ناردنی جوولەکەکان بۆ ئالاسکا (لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)،

دەعوەتی ئێرانم دەکردن و دەمگووت ئەوانەی بە سیاسەتی ئیسرائیل ناڕازین، دەتوانن ببنە میوانی ئێرانییەکان. هەروەکو پاشاسایروســـە . ئەگەر تەنها لە ئاستی قسەدابێت، خۆشحاڵترە . ئەگەریش ڕاستی دەربڕێ، ڕاستییەکی جوانترە .

ڕێزی هەموو کەسێک دەگرم کە خزمەتی نەتەوەو نیشتیمانمان دەکات و گوێ بۆ ڕەخنە دەگرێ و ئومێدم وایە خودای گەورە یارمەتییان بدات لەو ئەرکە قورسەدا گرتوویانەتەخۆ.

## پەراوێزەکان:

١-ئەمە دەقی چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی «هومایە» لەگەڵ د. عبدالکریم ســـروش لە بەرواری ٢٠٠٦/٣/٩ لەبارەی بڵاوبونەوەی کاریکاتێرەکانی دانیمارک لەسەر کەسایەتی پێغەمبەری ئیسلام. ئەم چاوپێکەوتنە لەلایەن داریوش سەجادییەوە سازکراوە .

٢-ناونیشـــانی نووســـینێکی د. سروشـــە لەبـــارەی ئیدانەکردنـــی کاریکاتێرەکانـــی نیۆرکەوە نووســـی و بڵاویکردەوە .

٣-«هەوییەت» Identity: بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بوو، لە چەند ئەڵقەیەکی یەک لە دوای یەکدا لە ساڵی ١٩٩٦ پەخشکرا، کە ناوی هەندێک ڕۆشنبیر و نووسەری ناسراوی بە ناشیرینی زڕاند و وەکو «ئێرانییە خۆرئاوا پەرستەکان و ستوون نووسە پێنجەمینییەکانی خۆرئاوا» نیشانیان دا کە شووناسی کلتوری خۆیان دۆڕاندووەو خیانەتیان کردووە .

٤-ولایەتی موتڵەقی فەقیە: تێزەکەی ئایەتوڵا خومەینییە کە دەستووری ئێران لەسەری دامەزراوە .

٥-د. ســـروش خاوەنی بڕوانامەیە لە زانستی دەرمانسازیدا بۆیە باســـی کیمیا دەکات چونکە شارەزاییەکی باشی لە مادە کیمیاییەکاندا هەیە .

## سەرچاوە:

www.drsoroush.com

# گفتوگۆ لەگەڵ "جۆرج لوکاچ"

لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

* رووداوەکانی ئەم دواییەی ئەوروپا جارێکی تر پرسی پێوەندی دیموکراسی و سۆسیالیزمی هێناوەتە ئاراوە، بەڕای ئێوە جیاوازی بنەڕەتی دیموکراسی بورژوایی و دیموکراسی سۆسیالیستی و شۆڕشگێڕانە لەچیدایە؟

– مێژووی دیموکراسی بورژوایی دەگەڕێتەوە بۆ یاسا و دەستوری ۱۷۹۳ فەرەنسا، کە بەشێوەیەکی قووڵ و رادیکاڵ ئەم چەمکەی باس کردووە. پرنسیپی سەرەکی ئەم دەستورە مرۆڤ وەک هاوڵاتی ژیانی گشتی و هاوڵاتی ژیانی تایبەتی پێناسە کردووە، یەکەم بە مانای کەسێکە کە خاوەن مافی سیاسی جیهانییەو دووهەم بە مانای کەسێکە کە خاوەن بەرژەوەندی تایبەت و ئیمتیازی ئابوورییە. وەها پۆلینێک لە دیموکراسی بورژواییدا وەک دیاردەیەکی تایبەتی مێژوویی، رۆڵی سەرەکی هەیە. دەکرێ رەنگدانەوەی فەلسەفی ئەم پرسە لای دوساد ببینین. ئەوە کە نوسەرێک وەک ئادورنۆ هێندە شەیدای دوسادە، ئێجگار سەرنجڕاکێشە، ئاخر دوساد هاوتای فەلسەفی دەستوری ۱۷۹۳ ە.

ئەندێشەی سەرەکی هەردووکیان ئەوە بوو کە مرۆڤ بۆ مرۆڤ بابەتە و خۆپەرستی ئەقڵانی سروشتی جڤاتی مرۆڤی پێکدێنێ. ئێستا ئاشکرایە کە هەر جۆرە کۆششێک بۆ بنیادنانەوەی ئەم فۆرمە بەپێی مێژووی کۆنی دیموکراسی لە سۆسیالیزمدا، کارێکی دواکەوتوانەیە. بەڵام ئەم پرسە بەو مانایە نییە کە خواستی خەڵک بۆ دیموکراسی سۆسیالیستی، دەبێ بەپێی مێتۆد و شێوازی ئیداری سازگار

بێت. کێشەی دیموکراسی سۆسیالیستی پرسێکی راستینەو تا ئێستا چارەسەرنەکراوە، چونکە دەبێ مۆدێلێکی دیموکراسی ماتریالیستی بێت، نەک ئایدیالیستی. رێم پێ بدە بۆ روونکردنەوەی ئەم مەبەستە نمونەیەک بێنمەوە. مرۆڤێک وەک چەگوارا نوێنەری حەماسی ئایدیالی ژاکوبنی بوو. چەگوارا شێوازی ژیانی خۆی بەپێی بیر و ئایدیاکانی دیاری کرد. لە نێو بزاڤی شۆڕشگێڕانەدا ئەو یەکەم کەس نەبوو، لوینە لە ئاڵمان و ئوتو کورڤین لە هەنگاریا کەسانی لەم چەشنە بوون. دەبێ بە قووڵترین هەستی ئینسانی رێز لەم جۆرە کەسانە بگرین. بەڵام ئایدیالیزمی ئەوان لە فۆرمی سۆسیالیستی ژیانی رۆژانە کە تەنیا دەتوانێ بنەمای مادی هەبێ و بناغەی ئابووری نوێ دابڕێژێ، دوور بوو. بەڵام لێرەدا دەبێ ئەوەش بێژم کە بە تەنیا گەشەی ئابووری سۆسیالیزم دروست ناکات. تیۆری خرۆشچۆڤ کە دەڵێ کاتێ سۆسیالیزم لە پانتایی جیهاندا سەردەکەوێ کە ستانداردی ژیان لە یەکێتی سۆڤیەت لە ستانداردی ژیان لە ئەمریکا پێشکەوێت، بەتەواوی هەڵەیە. ئەم پرسە دەبێ بەچەشنێکی تەواو جیاواز گەلاڵە بکرێت. دەکرێ بەمجۆرە فۆرمولەی بکەین: سۆسیالیزم یەکەم فۆرماسیۆنی ئابووری لە مێژوودایە کە بەشێوەی خۆڕسک «مرۆڤی ئابووری» بۆ سازگاری لەگەڵ خۆی بەرهەم ناهێنێ. ئێستا بەم هۆیەوە کە سۆسیالیزم (ی مۆدێلی سۆڤیەت) نەیتوانیوە بەشێوەی خۆڕسک مرۆڤی دڵخوازی، ئەو جۆرە کە جڤاتی سەرمایەداری کلاسیک بەشێوەی سروشتی لەساڵی ١٧٩٣ مرۆڤی ئابوری خۆی، بورژوا/ هاوڵاتی دابەشکراوی دوساد، بەرهەم دێنێ، بەرهەم بێنێتەوە. ئەرکی دیموکراسی سۆسیالیستی ئەوەیە کە ئەندامانی خۆی بە وردبینی بەرەو سۆسیالیزم پەروەردە بکات. ئەمە ئەرکێکی بێ وێنەیە و لەگەڵ هیچ شتێکی دیموکراسی بورژوایی بەراورد ناکرێ. ئاشکرایە کە ئەمڕۆ پێویستە سەرلەنوێ شوراکان بژێنینەوە، یانی هەمان سیستمی دیموکراسی چینی کرێکار کە هەرکات شۆڕشی کرێکاری بە سەرکەوتن گەیشتووە، دامەزراوە: ساڵی ١٨٧١ لە کۆمۆنی پاریس، ساڵی ١٩٠٥ لە روسیا و هەروەها لە شۆڕشی ئۆکتۆبەردا. بەڵام ئەم کارە بە شەوێک ناکرێت. کێشە لەمەدایە کە کرێکاران سەرەتا بڕوایان بە هیچ شتێک نییە، دەبێ سەرنجیان بۆ ئەم پرسە راکێشین.

## دابڕان لە مێژوودا:

لە دیالۆگی فەلسەفی ئەم دواییانەدا، لە هەنگاریا، بە زۆری باسی پرسی بەردەوامی و دابڕان لە مێژوودا دەکرێت. من بڕوام بە دابڕان هەیە. لە بەرهەمەکانی دوتۆکوڤیل و تینەدا ئەم بیرە کۆنسێرڤاتیڤە کۆنە دەبینین کە دەڵێ شۆڕشی فەرەنسا لە مێژووی فەرەنسادا ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی پێکنەهێناوە و تەنیا درێژەی بە نەریتی دەوڵەتی ناوەندی داوە، نەریتێک کە لە رژێمی کۆن و لە سەردەمی لویی شانزەهەمدا ئێجگار بەهێز بوو و پاشان بەهۆی ناپلیۆن و جێگرانی بەشێوەی بەهێزتر درێژەی پێدرا. لیڤین لە نێو بزاڤی شۆڕشگێڕانەدا ئەم بۆچوونەی لێبڕاوانە رەت کردەوە. لیڤین هەرگیز ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی و رەوت و بزاڤی تازەی تەنیا وەک درێژەی رەوتەکانی پێشوو نەدەزانی. بۆ وێنە کاتێ سیاسەتی مۆدێرنی ئابووری (نپ)ی راگەیاند، قەت نەیوت ئەم سیاسەتە «گەشە» بە کۆمۆنیزمی جەنگی دەدات و «کامڵی» دەکات. ئەو ڕاشکاوانە رایگەیاند کە کۆمۆنیزمی جەنگی

لەو دۆخەدا هەڵە بووە و ئێستا نپ دەیەوێ ئەو هەڵەیە قەرەبوو بکاتەوە و گۆڕانێکی هەمەلایەنەیە بەرپابکات. ســـتالینیزم ئەم مێتۆدەی لینینی پەراوێز خست. ستالینیزم بەردەوام تێدەکۆشا گۆڕان لە سیاســـەتدا، تەنانەت گۆڕانی ئێجگار قووڵ، وەک ئاکامی لۆژیکی و چاکســـازی خەتی سیاســـی پێشـــوو پیشان بدات. ستالینیزم هەموو مێژووی سۆسیالیزم وەک گەشەی بەردەوام و دروست باس دەکرد و هەرگیز دابڕانی قەبوڵ نەدەکرد. ئەمڕۆ لە ئاســـت مەترســـی سەرهەڵدانەوەی ستالینیزمدا، دەبێ زیاتر لە هەر کاتێ لەمەڕ ئەم پرســـە وریا بین. ئایا دەبێ لەپێناو ئاسۆی پێشکەوتن، گرنگی بە بەردەوامی رابردوو بدەین، یان دەبێ لێبڕاوانە لە ستالینیزم داببڕین؟ من پێم وایە کە دابڕانێکی قووڵ پێویستە. هۆی ئەمەیە کە دابڕان لە مێژوودا بۆ ئێمە هێندە گرنگە.

* ئایا ئێوە ئەم پرسەتان لە تیۆری فەلسەفی خۆتاندا گونجاندووە؟ ئەمڕۆ بەرهەمەکانی خۆتان لە دەیەی ١٩٢٠ دا چۆن راڤە دەکەن؟ چ پەیوەندییەکیان لەگەڵ کارەکانی ئێستاتاندا هەیە؟

– لە دەیەی ١٩٢٠ دا من، کارڵ کورش و گرامشی هەر کاممان بەشێوەی خۆمان تێکۆشاین لەپێناو پرســـی پێویســـتی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی کە رەوتی زاڵ بەهۆی کاریگەری ئێنترناسیۆناڵی دووهەم بەشـــێوەی میکانیکی راڤەی دەکرد، دژایەتی بکەین. ئێمە مۆرکی خۆمان لەم پرســـە دا، بەڵام هیچ کەســـمان-تەنانەت گرامشی کە رەنگە لە هەرسێکمان باشتر بووبێ- نەیتوانی ئەم پرسە چارەسەر بکات. ئێمە هەموومان بە هەڵەدا چووین و ئەگەر ئێستاش بۆ ئەو بەرهەمانە بگەڕێینەوە دیسانەوە هەڵـــە دەکەین. لە رۆژئاوا دەیانەوێ ئەم کتێبانە وەک بەرهەمی کلاســـیکی لادان [لە مارکســـیزم] بناســـێنن. بەڵام ئێمە ئێســـتا پێویســـتمان پێی نییە. تازە دەیەی ١٩٢٠ بەسەرچووە. ئەمڕۆ دەبێ گرنگی بە پرسی فەلسەفی دەیەی ١٩٦٠ بدەین. من ئێستا لەسەر کتێبێک بەناوی ئانتۆلۆژی وجودی کۆمەڵایەتی کار دەکەم، هیوادارم ئەو پرســـانە کە بەشێوەی نادروست لە بەرهەمەکانمدا و بەتایبەت لە مێژوو و وشیاری چینایەتیدا باسکراون، ساغ بکەمەوە. ئەم کتێبەم بەپێی پرسی پێوەندی نێوان ئازادی و پێویســـتی، یان ئەو جۆرە کە خۆم پێم باشـــە، پێوەندی نێوان جەبرگەرایی و تیلیۆلۆژی (ئەنجامناســـی) نوسراوە. بیرمەندان بەگشتی سیستمی فیکری خۆیان بەپێی یەکێ لەم دوو بلوکە دارشـــتووە، یانی یان حاشایان لە پێویســـتی کردووە یان ئازادی. ئامانجی من ئەوەیە کە پێوەندی دیالەکتیکی و ئانتۆلۆژیکی ئەم دوو چەمکە پیشـــان بدەم و دیدگای یەکلایەنەی هەر کام لەم دوو رەوتە رەت بکەمەوە. چەمکی کار بنەمای ســـەرەکی شـــرۆڤەکەی مـــن پێکدێنێ. ناکرێ کار بەپێی بایۆلۆژی دیاری بکەین. ئەگەر شـــێرێک هێرش بۆ مامزێک ببات، رەفتاری ئەم شـــێرە تەنیا بەپێی پێویســـتی بایۆلۆژی راڤە دەکرێت. بەڵام کاتێ مرۆڤی ســـەرەتایی لەگەڵ کۆمەڵێک بەرد بەرەوڕوو دەبێ و ناچارە لەم نێوەدا باشـــترین بەرد وەک ئامێری کار هەڵبژێرێت، ئەو بەردەی هەڵیدەبژێرێ، بۆ کارەکەی ئەو خەسڵەتی تیلیۆلۆژیک و گرنگی حەیاتی هەیە. ئەو بەم کارەی ئامانجێک بۆ خۆی دیـــاری دەکات کە ئاکامی هەڵبژاردنێکە. لە ئاکامدا بەمجۆرە ئازادی مرۆڤ بەیان دەکات. بەڵام ئەم ئازادییـــە تەنیا بەهۆی دیاریکردنی هێزی بەرهەســـت و فیزیکی ئەکتیڤ لەئارادایە کە یاســـاکانی جەبـــری جیهانی مادیی پێڕەوی دەکەن. لەئاکامدا ئەنجامناســـی کار، لەگەڵ جەبری فیزیکیدایە و لەڕاســـتیدا ئاکامی هەر کارێکی تاکی، ســـاتێک لە جەبری فیزیکی کاری تاکێکی تر بە ئاراستەی

تیلیۆلۆژیکدا دیاری دەکات. ئەم بڕوایە لە ئەنجامناسـی سروشتدا، بریتی بوو لە خوداناسی، بەڵام ئەم بڕوایە لە ئەنجامناسـی گشـتگیری مێژوودا بێ بناغە بوو. بەڵام تیلیۆلۆژی لە تێکڕای کاری مرۆڤیدا ڕۆڵی هەیەو بەشـێوەیەکی بێ چارەسـەر لە ناخی جەبری جیهانی فیزیکیدا جێی گرتووە. ئەم دۆخە کە بناغەی ئەم کتێبەم پێکدێنێ، لەئاسـت ناکۆکی کۆنی ئازادی و پێویسـتی زاڵ دەبێ. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە من نامەوێ سیسـتمێکی گشـتگیر بسازم. ناوی ئەم کتێبەم کە تەواوم کردووە و ئێسـتا خەریکم پێیدا دەچمەوە ئەمەیە Zur ontologie des Gesellschaftlichen Seins ، نەک ئەمە Ontologie des Gesellschaftlichen Seins . بەمجۆرە جیاوازی ئەم دوو شـتە دەبینین. کارێک کە من دەسـتم پێکردووە، بۆ ئەوەی بە سەرکەوتن بگات پێویستی بە کاری گرووپی زۆرێک لە بیرمەندان هەیە. بەڵام هیوادارم کە ئەم بەرهەمە بناغەی ئانتۆلۆژیکی سۆسـیالیزمی ڕاستەقینە کە پێشتر باسمان کرد، پێکبێنێ.

## فەرهەنگی رادیکاڵی بەریتانیا:

* بەریتانیا تاقە وڵاتی گرنگی ئەوروپایە کە خاوەن نەریتێکی فەلسەفی مارکسیستی نەتەوەیی نییە، ئێوە بەدرێژی لەمەڕ ساتێکی مێژوویی کتێبێکی ڤاڵتر سکات نوسیوتانە. ئەی ئێوە گەشەی فراوانتری مێژووی فیکری و سیاسـی بەریتانیا لە پێوەندی لەگەڵ فەرهەنگی ئەوروپایی سەردەمی ڕۆشنگەری چۆن دەبینن؟

– بەریتانیا بوو بە قوربانی ئەو شـتە کە مارکس بە یاسـای گەشەی لاسەنگ پێناسەی کردووە. رادیکاڵیزمی قووڵی شۆڕشـی کراموال و پاشـان شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ و سـەرکەوتنی ئەم ڕەوتانە سیسـتمی بورژوازی لە شار و گوندەکاندا مسۆگەر کرد و بوو بە هۆی دواکەوتنی دواتری بەریتانیا. من پێم وایە پێداگرتنی ئێوە لەسەر گرنگی مێژوویی کشتوکاڵی بەریتانیا و ئاکامی پارادۆکساڵی بۆ گەشەی دواتر ، زۆر ڕاستە. دەکرێ ئەم پرسە لە گەشەی فەرهەنگی بەریتانیادا بە ئاشکرا ببینین. سـەرکەوتنی ئەزموونگەری وەک ئایدیۆلۆژی بورژوایی تەنیا لە پاش ١٦٨٨ دەسـت پێدەکات، بەڵام دواتر هێزێکی مەزن بەدەست دێنێ و بەتەواوی تێکڕای پێشینەی کۆنی هونەر و فەلسەفەی بەریتانیا چەواشە دەکات. بۆ نمونە چاو لە باکۆن بکە. ئەو بیرمەندێکی ئێجگار گەورە بوو، ئێجگار گەورەتر لـە جان لاک کە دواتر بـورژوازی پەروەردەی کرد. بەڵام ئێمپریزمـی بەریتانی گرنگی و کاریگەری ئەوی شـاردەوە. ئەمـڕۆ ئەگەر بتەوێ ڕوانگـەی باکۆن لەمەڕ ئێمپریزم بزانیت، دەبێ لە پێشـدا ڕوانگەی ئیمپریزم لەمەڕ باکۆن بناسـیت، کە تەواو جیاواز پیشانی داوە. وەک دەزانین مارکس زۆر باکۆنی ستایش کردووە. ئەم پرسە لەمەڕ بیرمەندێکی مەزنی دیکەی بەریتانیا، ماندوێل، ڕوویداوە. ئـەو جێگری مەزنی هابز بوو. بەڵام بورژوازی بەریتانیا ئەویشـی فەرامـۆش کرد. بەڵام مارکس لە تیۆری زێدەباییدا چەندین جار وتەکانی ئەو دێنێتەوە. وەک دەبینین فەرهەنگی رادیکاڵی پێشووی بەریتانیا بەشاراوەیی مایەوە و پشتگوێ خرا. ئلیۆت و کەسانی تر لەجیاتی ئەم فەرهەنگە، گرنگی زۆریان بە شاعیرانێکی متافیزیکی وەک دۆن دا کە لە مێژووی پێشکەوتنی فەرهەنگی مرۆڤدا ڕۆڵی لاوەکی دەگێڕن. ڕوداوێکی تر کە ڕاسـتییەکان ئاشـکرا دەکات، چارەنوسـی ڤاڵتر سکات بوو. من

لە کتێبی ڕۆمانی مێژووییدا باســی گرنگی ســکاتم کردووە. وەک دەزانین سکات یەکەم ڕۆماننوس بوو کە هەســتی بەم ڕاســتییە کرد کە مێژوو مرۆڤەکان دەگۆڕێ. ئەمە دەسکەوتێکی مەزن بوو و بەخێرایی ســەرنجی نوسەرانی مەزنی ئەوروپا، پوشــکین لە ڕوسیا، مانزۆنی لە ئیتالیا، باڵزاک لە فەرەنسای ڕاکێشا. کەوابوو دابڕانێک لە تێکڕای فەرهەنگی بەریتانیادا بەدی دەکەین کە لە نوسەرانی ڕادیکاڵی دواتری وەک شــاو دا بەرچاوترە. شــاو هیچ ڕیشەیەکی لە فەرهەنگی پێشووی بەریتانیادا نییە. ئاخر فەرهەنگی بەریتانیا لە ســەدەی نۆزدەهەمدا لە پێش مێژووی خۆی دابڕاوە. ئاشــکرایە کە ئەم پرسە وەک جۆرێک لاوازی قووڵ لە شاو دا دەبینرێ.

ئەمڕۆ نابێ ڕۆشــنبیرانی بەریتانیا بۆ ئەندێشەی مارکسیستی هانا بۆ دەرەوە ببەن. ئەوان دەبێ مێژوویەکی نوێ لە کولتوری خۆیاندا بخوڵقێنن. من لەمەڕ سکات شتم نوسیوە و ئاگنس هلێر لەمەڕ شکســپێر. بەڵام پێویستە کە خەڵکی بەریتانی ســەرلەنوێ بەریتانیا بناسن. ئێمەش لە هەنگاریا وەک ئێوە لە بەریتانیا زۆر کێشــەمان لەمەڕ «ئەخلاقی نەتەوەی» خۆمان هەیە. بەڵام من پێم وایە کە مێژووی ڕاســتەقینەی فەرهەنگی بەریتانیا دەتوانێ کێشــەکان لەنێو ببات. ڕەنگە لەم بوارەدا قەیرانی قووڵی ئابووری و سیاســی بەریتانیا کە بەهۆی گەشــەی لاسەنگ پێکهاتووە، یارمەتیتان بدا. بێگومان ڤێلسن یەکێکە لە زۆڵترین و هەلپەرستترین سیاسەتمەدارانی بورژوازی ئەم سەردەمە، ســەرەڕای ئەمەش دەوڵەتی ئەو تووشی قووڵترین و سامناکترین شکست هاتووە. ئەمەش نیشانەی قەیرانی قووڵی جڤاتی بەریتانیایە.

* ئێوە ئێستا یەکەم کتێبی تیۆری ئەدەبی خۆتان «تیۆری ڕۆمان» چۆن دەبینن؟ چ مانایەکی مێژوویی هەبوو؟

– تیۆری ڕۆمان ڕەشــبینی و نائومێدی من لە مەودای جەنگی جیهانی یەکەمدا دەردەخات. کاتێ کە جەنگ دەستی پێکرد گوتم ڕەنگە ئاڵمان و ئوتریش- هەنگاریا، ڕوسیا تێکبشکێنن و حکومەتی تێزاری نابووت بکەن: ئەمە شــتێکی باش بوو. ڕەنگە فەرەنســا و بەریتانیــا، ئاڵمان و ئوتریش- هەنگاریا تێکبشــکێنن و بنەماڵەی هوهنزولێرن و هابزبورگ لەنێو ببەن: ئەمەش باشــە. بەڵام ئەو کات لە بەرانبەر فەرهەنگی فەرەنسا و بەریتانیا کێ داکۆکی لە ئێمە دەکا؟ ڕەشبینی من وەڵامێکی بۆ ئەم پرسیارە پێ شک نەبوو. ئەمە پشتخانی تیۆری ڕۆمان بوو. ئەڵبەت شۆڕشی ئۆکتۆبر وەڵامی ئەم پرســەی دایەوە. شۆڕشی ڕوسیا لە بەرانبەر ئەم پرسەی مندا ڕێگەچارەیەکی جیهانی کردەوە. من لە ســەرکەوتنی بورژوازی فەرەنســا و بەریتانیا دەترســام، ئەم شۆڕشە پێشی بەم کارە گرت. بەڵام دەبێ بڵێم کە تیۆری ڕۆمان ســەرەڕای هەموو هەڵەکانی، بانگەواز بۆ ڕوخاندنی جیهانێک بوو کە فەرهەنگی بورژوایی بەرهەم دێنا. ئەم کتێبە هەســتی بە پێویســتی ئاڵوگۆڕێکی شۆڕشگێڕانە کردبوو.

* ئێوە لەو سەردەمەدا دۆستی ماکس وێبر بوون، ئێستا چۆن لەمەڕ وێبر داوەری دەکەی؟ وەک دەزانین ســومبارتی هاوکاری دواتر بوو بە فاشیســت، ئایا پێت وایە ئەگەر وێبر مابا حیزبی نازی قەبوڵ دەکرد؟

– نا، هەرگیز. پێویستە بزانین کە وێبر کەسێکی ئێجگار ڕاستگۆ بوو. بۆ وێنە ئەو زۆر سوکایەتی بــە ئمپراتۆر دەکرد. ئەو زۆر جار لە خەڵوەتدا بە ئێمەی دەوت: بەدبەختی ئاڵمانی گەورە لەوەدایە کە بەپێچەوانەی ستوارت و بوربۆنەکان، هیچ هوهنزۆلینێک لە گیۆتین نەدرا. دەتوانین تێبگەین کە مرۆڤێک لە ســاڵی ١٩١٢ دا دەیتوانی ئەم شــتە بڵێت، مامۆســتایەکی ئاڵمانی ئاسایی نەبوو. وێبر تەواو پێچەوانەی سومبارت بوو. ئەو هەرگیز هیچ ئیمتیازێکی بە دوژمنانی خەڵکی یەهوود نەدا. با داستانێکت بۆ بگێڕمەوە کە خەسڵەتی بەرزی وێبر پیشان دەدات. زانکۆیەکی ئاڵمان داوای لێکردبوو کە نامەیەک بۆ هەمان زانکۆ بنوســێ و مامۆســتایەکیان پێ بناســێنێ– دەیانویست بوارێکی نوێ بکەنەوە. ئەو بەپێی توانا و لێوەشــاوەیی، ناوی سێ کەســی بۆ ناردن، پاشان نوسیبووی هەر کام لەمانە کەســانێکی شیاون. هەرســێکیان ئێجگار بەتوانان، بەڵام دڵنیام ئێوە کەسیان هەڵنابژێرن، چونکە جوولەکەن. کەوابوو من ســێ ناوی دیکەشــتان بۆ دەنێرم، کە هیچیان وەک ئەوان شایستە نین، بەڵام دڵنیام ئێوە یەکێکیان هەڵدەبژێرن، چونکە جوولەکە نین. سەرەڕای ئەمە دەبێ لەبیرمان بێــت کە وێبر بەقووڵی ئێمپریالیســت بوو، بۆیە بــڕوای بە لیبراڵیزم هەبــوو چونکە پێی وابوو پێویســتمان بە ئێمپریالیزمێکی کارا هەیە و تەنیا لیبرالیزم دەتوانێ ئەم کارە مسۆگەر بکات. ئەو دوژمنی سەرســەختی هەردوو شۆڕشی نۆڤەمبەر و ئۆکتۆبەر بوو. ئەو هەم توێژەرێکی دەگمەن بوو، هەم کەســێکی تەواو کونســێرڤاتیڤ بوو. ڕەوتێکی نائەقڵانی کە بە شێلینگ و شوپنهاوەر دەستی پێکردبوو، گرنگترین بەیانی خۆی لە وێبردا بەدی کرد.

* کاتێ ئێوە ڕووتان لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر کرد هەڵوێستی وێبر چۆن بوو؟

– دەڵێن وتویەتی «بیر و ئەندێشــەی لوکاچ بەقووڵی گۆڕاوە، بەڵام تولێر هەســت و ئێحســاس دایگرتووە.» بەڵام من ئیتر پەیوەندیم لەگەڵی نەبوو.

* پاش جەنگ ئێوە لە کۆمۆنی هەنگاریادا وەک بەرپرســی پەروەردە کارتان دەکرد، ئێستا پاش پەنجا ساڵ ئەزمونی کۆمۆن چۆن دەنرخێنی؟

– کۆششی ویکس نۆت و ستراتیژی ئەنتەنتێ لە هەنگاریا کۆمۆنی پێکهێنا. وەک چۆن پرسی کۆتایی هێنان بە جەنگ، ڕۆڵی گرنگی لە ســەرکەوتنی شۆڕشــی ئۆکتۆبەردا گێڕا، لە کۆمۆنی هەنگاریاشدا ڕۆڵی ســەرەکی هەبوو. دواتر بەهۆی دامەزراندنی کۆمۆن، ڕەوتی سۆســیال دیموکرات هێرشی کردە ســەرمان، بەڵام لەو کاتە و لەپاش جەنگ، ئیتر مانەوە لە قاڵبی سیاســی بەرتەســکی بورژوازیدا ئیمکانی نەبوو، دەبوو ئەو قاڵبە تێکبشکێنین.

## ڕێبەرانی بەلشەفیک:

* پاش شکســتی کۆمۆن، لە کونگرەی ســێهەمی کۆمینتێرن یان کۆبونــەوەی جیهانیی پارتە کۆمۆنیســتەکان لە مۆســکۆ تۆ نوێنەر بووی. ئایا لەوێ ڕێبەرانی بەلشەفیکت بینی؟ چ هەستێکت لەئاست ئەواندا هەبوو؟

– پێویســـتە بزانن کە من ئەندامێکی بچوکی گرووپێکی بچووک بووم. من ئەو کات کەســـێکی بەناوبانگ نەبووم، کەوابوو هیچ باســـێکی دوور و درێژم لەگەڵ رێبەرانی بەلشـــەفیک نەبوو، بەڵام لوناچارســـکی منی بە لینین ناســـاندبوو، ئەو بەتەواوی منی ئەفسوون کرد. من دەمتوانی لە کاتی کارکردن لە کۆمۆســـیۆنەکاندا ببینم. دەبێ ئەوەش بڵێم رێبەرانی تری بەلشەفیکم پێ باش نەبوو. بەخێرایی رقم لە ترۆتسکی هەستا. وەک کەسێکی دووڕوو هاتە پێش چاوم. وەک دەزانین گۆرکی لە بیرەوەریەکانیدا پەرەگرافێکی لە زمان لینینەوە هێناوەتەوە کە لەودا لینین لە پاش شۆڕش سەرەڕای ئەوەی دەسکەوتەکانی گرووپی تروتسکی قەبووڵ دەکات، دەڵێ تروتسکی زۆر خەسڵەتی لە لاسال وەرگرتووە. زینۆیۆڤ کە دواتر رۆڵی ئەومان لە کۆمینتێرندا ناســـی، تەنیا رێکخەرێکی سیاسی بوو. لە ساڵی ١٩٢٥ لە وتارێکدا بۆچوونی خۆم لەمەڕ بۆخارین نووسیوە و رەخنەم لێگرتووە. ئەوکات ئەو لە پاش ســـتالین لە پرسی تیۆریکدا دووهەم کەسی رووسی بوو. لەو کۆنگرەیەدا قەت ستالینم بیر نایەتەوە. منیش وەک زۆر کەسی تر نەمدەزانی ستالین لە پارتی رووسیدا رۆڵی گرنگی هەیە یان نا. لەگەڵ رادک پێکەوە قســـەو باسمان کرد. ئەو پێی وتم وتارەکەت لەمەڕ چالاکی مارس باشترین وتار بووە کە ئەو روداوەی راڤە کردووە. بەڵام دواتر کاتێ پارتی بۆلشـــڤیک تێکۆشـــانی مارسی پرۆتستۆ کرد، ئەویش بۆچوونی خۆی گۆڕی و بە ئاشکرا پاشگەز بۆوە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم شتانەش، لینین بەقووڵی کاری تێکردم.

* کاتێ لینین وتارەکەی تۆی لەمەڕ پەرلەمانتاریزم رەت کردەوە، چ هەستێکت هەبوو؟

– وتارەکـــەی من بەتەواوی نادروســـت بوو و من بێ ڕاڕایی ئـــەو تێزانەم رەت کردەوە. بەڵام دەبێ ئـــەوەش بڵێم کە من پێشـــتر چەپڕەوی: نەخۆشـــی منداڵانەم دیبـــوو و بۆچوونەکانی لینین لەمەڕ بەشـــداری لە پەرلەماندا منی ڕازی کردبوو. کەوابوو من لە پێشـــدا زانیبووم کە بۆچوونی من هەڵە بووە. وەک دەزانین لینین لەو وتارەدا دەڵێ: پەرلەمانەکانی بورژوازی بە مانای مێژوویی– جیهانی، بە سەرهەڵدانی ئۆرگانی رادیکاڵی کرێکاری، یانی شوراکان، دەوریان نەماوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییـــە کە لەڕووی سیاســـیەوە دەوریان نەمـــاوە بەتایبەت بەم هۆیە کە خەڵکـــی رۆژاوا بڕوایان بە شوراکان نییە. کەوابوو دەبێ کۆمۆنیستەکان لە پەرلەمانەکانیشدا تێبکۆشن.

* ساڵی ١٩٢٩ لە تێزەکانی بلۆم لە سێهەمین کونگرەی پارتی کۆمۆنیستی هەنگاریا، تۆ چەمکی دیکتاتـــۆری دیموکراتیکی کرێکاران و جوتیارانت وەک ســـتراتیژی حیـــزب گەڵاڵە کرد. حیزب ئەم تێزانەی بە هەلپەرســـتانە زانی و رەتی کردەوە و تۆش لە کۆمیتەی ناوەندی دەرکرای، ئێســـتا ئەو کارە چۆن دەنرخێنیت؟

– من بەم تێزانە لەئاست رەوتی سێکتاریستی لە ئەنتێرناسیۆناڵی سێهەم دژایەتیم دەکرد کە پێی وابوو فاشیزم و سۆسیال دیموکراسی وەکوو یەکن. وەک دەزانین ئەم بیرە سامناکە لەگەڵ دروشمی چین لەدژی چین و خواستی پێکهێنانی خێرای دیکتاتۆری پرۆلیتاریا هاوکات بوو. من دەمویست بە زیندووکردنەوەی دروشمی ساڵی ١٩٠٥ ی لینین، واتە دیکتاتۆری دیموکراتیکی کرێکاران و جوتیاران، رێگایەک لە بەرانبەر هێڵی کۆنگرەی شەشـــی کۆمینتـــرن بدۆزمەوە، واتە بەمجۆرە دەمتوانی پارتی

هەنگاریا بەرەو سیاسەتێکی ریالیستی ببەم. من لەم کارەدا سەرنەکەوتم. حیزب تێزەکانی بلومی مەحکوم کرد و بلاکون و باڵەکەی منیان لە کومیتەی ناوەندی دەرکرد. من ئەو کات لە حیزبدا تەواو تەنیا بووم. تەنانەت نەمتوانی ئەو کەسانە کە دژی سکتاریزمی بلاکون بوون رازی بکەم. کەوابوو رەخنەم لە روانگەی خۆم گرت. هەڵبەتە بارودۆخ ئەم شتەی بەسەر مندا سەپاند، ئەگینا من بیروڕای خۆم نەگۆڕی و ئێستاش دڵنیام کە هەڵوێستی ئەو کاتەم بەتەواوی دروست بووە . بەدرێژایی ساڵانی ١٩٤٥ تا ٤٨ دیکتاتۆری دیموکراتیکی کرێکاران و جوتیاران لە هەنگاریا پێڕەو کرا کە من ساڵی ١٩٢٩ باسم کردبوو. هەڵبەت لە ١٩٤٨ بەملاوە ستالینیزم رێگایەکی تەواو جیاوازی گرتەبەر.

* لە دەیەی ١٩٣٠ و پاشان لە دوای جەنگ پێوەندیت لەگەڵ برێشت چۆن بوو؟ پێگەی ئەدەبی ئەو چۆن دەبینی؟

– برێشت شاعێرێکی ئێجگار گەورە بوو، شانۆنامەکانی دایکی دلێر و ژنی سێزچو ئان و هتد ئێجگار بەرزن. هەڵبەت تیۆرییەکانی لەمەڕ درام و جوانناسی بەتەواوی چەواشە و نادروستن. من ئەم پرسەم لە «مانای ریالیزمی هاوچەرخ»دا راڤە کردووە، بەڵام ئەم شتە لە گرنگی شانۆنامەکانی کەم ناکاتەوە . ساڵانی ١٩٣١- تا ١٩٣٣ من لە بەرلین بووم و لەگەڵ یەکێتی نوسەران کارم دەکرد. پێم وایە هەر لەو کاتەدا بوو کە برێشت وتارێکی لە دژی من نووسی و داکۆکی لە ئێکسپرسیۆنیزم کرد. بەڵام دواتر کاتێ لە مۆسکۆ بووم، برێشت لە سەفەری خۆیدا بۆ سکاندیناوی هاتە مۆسکۆ و هات بۆ لای منیش. لەم سەفەرەدا پێی وتم هەندێ کەس هەن تێدەکۆشن من لە دژی تۆ هان بدەن و کەسانێکیش هەن هەوڵ دەدەن تۆ لە دژی من هان بدەن. وەرە با ئیتر بە قسەی ئەوانە نەکەین. ئیتر لەوە بەدوا پێوەندیمان باش بوو. لە پاش جەنگ هەر کات من دەچووم بۆ بەرلین، هەمیشە برێشتم دەبینی و زۆر باس و دیالۆگمان دەکرد و لەئەنجامدا بۆچوونەکانمان زۆر نزیک بوونەوە . وەک دەزانن من یەکێک بووم لەو کەسانەی کە ژنەکەی بۆ ئاهەنگی بەخاکسپاردنی وەک وتاربێژ بانگی کردم. من هەمیشە رێزم بۆ برێشت هەبووە، ئەو ئێجگار زیرەک بوو و دەرکێکی قووڵی لە بارودۆخ هەبوو. لەم بابەتەوە ئەو تەواو پێچەوانەی کارل. کورش بوو... کاتێ کورش پارتی ئەڵمانی بەجێهێشت، پەیوەندی خۆی لەگەڵ سۆسیالیزم پچراند. من لەم کێشەیە تێدەگەم، چونکە ئیتر نەیدەتوانی لەگەڵ یەکێتی نوسەران لە دژی فاشیزم لە بەرلین خەبات بکات، حیزب نەیدەهێشت. برێشت تەواو پێچەوانە بوو. ئەو دەیزانی کە نابێ لە دژی سۆڤیەت کار بکات، بەدرێژایی هەموو تەمەنی ئەم پرنسیپەی پاراست.

* ئایا تۆ والتێر. بنیامینت دەناسی؟ ئایا پێت وایە ئەگەر زیندوو بمایە بەرەو پابەندی شۆڕشگێڕانە و مارکسیزم دەهات؟

– نا، بەهۆی زۆر شت من قەت بنیامینم نەبینی. هەرچەند ساڵی ١٩٣٠ کاتێ دەڕۆشتم بۆ سۆڤیەت ئادورنۆم بینی. بنیامین خاوەن توانایەکی لەڕادەبەدەر بوو، زۆر پرسی تەواو مۆدێرنی چاودێری دەکرد، ئەو ئەم پرسانەی بە چەندین شێوازی جیاواز ناسی، بەڵام قەت رێگایەکی بۆ چارەسەرکردنیان نەبینیەوە . من پێم وایە سەرەڕای هاورێیەتی بنیامین لەگەڵ برێشت، دیار نییە کە

ئەگەر زیندوو بمایە، تا چ ئاستێک سەرکەوتبایە. دەبێ لەبیرمان بێت کە ئەوکات دۆخێکی ئێجگار تاڵ بوو، پاکتاوەکانی دەیەی ١٩٣٠ و پاشان جەنگی سارد. لەم دۆخەدا ئادورنۆ وەک نوێنەری جۆرێک «سازگاری جیاواز» دەرکەوت.

* پاش سەرکەوتنی فاشیزم لە ئەڵمان، تۆ لە روسیا لەگەڵ ریازانۆف لە سەنتەری مارکس لێنین کارت دەکرد، دەکرێ باسی چالاکی ئەو کاتە بکەن؟

– ســاڵی ١٩٣٠ لە مۆسکۆ ریازانۆف دەستنوسە ئابووری و فەلسەفییەکانی مارکسی پیشان دام، رەنگــە نەتوانم تامەزرۆیی ئەو کاتەم بگێڕمەوە: خوێندنــەوەی ئەم بەرهەمە، پێوەندی منی لەگەڵ مارکسیزم بەقووڵی گۆڕی و دیدگای فەلسەفی منی ژێراوژوور کرد. توێژەرێکی ئەڵمانی لە سۆڤیەت لەســەر دەستنوســەکان کاری دەکرد و بۆ چاپ ئامادەی دەکرد، چەند بەشێکی مشک خواردبووی و هەندێ وشەی لێنەمابوو. من بەهۆی شارەزایی فەلسەفی لەگەڵ ئەو توێژەرە کارم دەکرد و پێم دەوت کە دەبێ کام پیت و وشــە دابنرێت. من پێم وایە ئەو بەرهەمە کە بە شــێنەیی ئامادە کرا، بەباشی تەواو کرا... ریازانۆڤ لە کاری خۆیدا هەستی بە لێپرسراوی دەکرد. هەروەها وشەناسێکی زۆر گەورە بوو. تیۆریســاز نەبوو، بەڵام وشەناســێکی مەزن بوو. پاش ئەوەی کە پاکتاو کرا، کارەکانی سەنتەر بەتەواوی لەنگ بوو. لەبیرمە پێی وتم لێرەدا دە بەرگ لە دەستنوسەکانی کاپیتاڵی دوو و سێ هەیە کە قەت چاپ و بڵاونەبۆتەوە. ئەنگڵس لە پێشــەکی بەرگی دووهەم و ســێهەمی کاپیتاڵدا دەنوسێ ئەمە تەنیا بژاردەیەک لە دەستنووســەکانی مارکســە کە بە ناوی کاپیتاڵ نووســیبووی. ریازانۆف دەیویست هەموو ئەو دەستنوسانە بڵاو بکاتەوە. بەڵام تا ئێستاش پەیدا نەبوون.

هەڵبەت لە ســەرەتای دەیەی ١٩٣٠ دا لە ســۆڤیەت باس و دیالۆگی فەلســەفی دەکرا، بەڵام من بەشــداریم نەدەکرد. ئەو باسانە زیاتر رەخنەیان لە دێبۆرین دەگرت، بەڵام زیاتر دەیانویست پێگەی ستالین وەک بیرمەندێک پیشان بدەن.

* بەڵام ئێوە لە باس و دیالۆگی ئەدەبی دەیەی ١٩٣٠ لە سۆڤیەتدا بەشدار بوون.

– من ماوەی شەش حەوت ساڵ لەگەڵ گۆڤاری نرخاندنی ئەدەبی (literary kritik) هاوکاریم کرد. هەڵوێســتی ئێمە لەو ســاڵانەدا لە دژی دۆگماتیزم زۆر بەهێز بوو. فادیف و کەســانی تر لە روسیا لە دژی RAPP خەباتیان کرد و تێکشــکان، بەڵام تەنیا بەم هۆیەی کە ئاورباخ و کەســانی تر لە RAPP تروتسکیست بوون. ئەوان پاش سەرکەوتن پەرەیان بە رەپیزمی خۆیان دا. گۆڤاری نرخاندنی ئەدەبیی بەردەوام لە دژی ئەم رەوتانە بوو. من زۆر وتارم بۆ ئەم گۆڤارە نووسی، کە لە هەموویاندا بەڵگەم لە ســتالین هێنابۆوە، ئەم کارەش ئەو ســەردەمە زۆرەملێ بوو، بەڵام هەموو ئەو وتارانە لە دژی تێگەیشــتنی ستالینیستی بۆ ئەدەب بوون. ناوەرۆکیان هەمیشە لە دژی دۆگماتیزمی ستالین بوو.

* تۆ ماوەی دە ســاڵ لە ١٩١٩ تا ١٩٢٩ تێکۆشــەرێکی سیاسی بووی، پاشان بەتەواوی لە کاری سیاسی دابڕای، بۆ هەر کەسێکی مارکسیست ئەمە گۆڕانێکی گرنگە. ئایا تۆ لە ساڵی ١٩٣٠ دا پاش

ئەم دابڕانە هەستت بە ئاستەنگ دەکرد؟ (یان بە پێچەوانەوە هەستت بە ئازادی دەکرد؟) ئەم قۆناغە لە ژیانت چۆن لەگەڵ قۆناغی لاوی دەبەستیتەوە؟ ئەو کات لە ژێر کاریگەری کێدا بووی؟

-من بەداخەوە نیم بۆئەوەی کە لە سیاسەت دابڕام. پێویستە بزانن کە من دڵنیا بووبووم کە لە کێشەکانی ١٩٢٨- ٢٩ دا هەڵوێستی من بەتەواوی دروست بووە. هیچ شتێ نەیتوانی لەم بابەتەوە بیروڕام بگۆڕێ. بەڵام من لەلایەنی سیاسیەوە نەمتوانی حیزب رازی بکەم و شکستم هێنا. لە ئاکامدا بەخۆم گوت ئەگەر هەڵوێستی من تەواو رەوایە و کەچی بەتەواوی شکستم هێناوە، ئەمە دەریدەخات کە من لە سیاسەتدا زۆر بەتوانا نیم. لەدواییدا چالاکی سیاسیم بەتەواوی بەجێهێشت. سەرەڕای دەرکران لە کۆمیتەی ناوەندی پارتی هەنگاریا و زاڵبوونی سیاسەتی سامناکی سکتاریستی، من پێم وابوو تەنیا لە رێکخستنی کۆمۆنیستیدا دەتوانم دژی فاشیزم خەبات بکەم. ئێستاش هەر لەسەر ئەم بڕوایەم. من هەمیشە پێم وابووە کە ژیان لە خراپترین سیستەمی سۆسیالیستیدا باشترە لە ژیان لە چاکترین سیستەمی بورژوازیدا.

کاتێ ساڵی ١٩٥٦ لە دەوڵەتی ئیمرە ناگیدا بەشداریم کرد، ئەم کارەم لەگەڵ هەڵوێستی پێشووم ناکۆک نەبوو. من لەگەڵ هەڵوێستی گشتی ناگی نەبووم. لە پێش مانگی ئۆکتۆبەری ئەو ساڵەدا ویستیان من و ناگی لێک نزیک بکەنەوە، من لە وەڵامدا وتم: «ئەو مەودایە کە من دەبێ بەرەو لای ناگی بیپێوم زیاتر لەو مەودایە نییە کە ناگی دەبێ بەرەو من بیپێوێت». کاتێ لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٦ دا داوایان لێکردم پۆستی وەزارەتی فەرهەنگ قەبوڵ بکەم، ئەم پرسە بۆ من پرسێکی ئەخلاقی بوو، نەک سیاسی، نەمدەتوانی ئەو داوایە رەت بکەمەوە. کاتێ کە گیراین و بەرەو رۆمانی نێردراین، هاوڕێیانی حیزبی هەنگاری و رۆمانی سۆراخی مندیان گرت و ویستیان بۆچوونی من لەمەڕ سیاسەتەکانی ناگی بزانن، دەیانزانی لەگەڵ ئەو ناکۆکم. من لە وڵامدا وتم: «ئەگەر من ئازاد بام و لە شەقامەکانی بوداپێست بام و ئەویش ئازادبایە، ئەوجار راشکاوانە روانگەی خۆم دەربارەی ئەو باس دەکرد، بەڵام تا کاتێ کە لە زیندانداییە، من تەنیا دەتوانم داکۆکی لێبکەم».

ئێوە پرسیتان کاتێ لە ژیانی سیاسی دابڕایت چ هەستێکت هەبوو. رەنگە دەبێ بڵێم کە هێندە لە مرۆڤی هاوچەرخ ناچم. دەتوانم بڵێم کە قەت لە ژیانمدا هەستم بە نائومێدی و گرێی دەروونی نەکردووە. هەڵبەتە بەهۆی ناسینی ئەدەبیاتی سەدەی بیستەم و خوێندنەوەی بەرهەمەکانی فرۆید، دەزانم ئەم وتەیە چ مانایەکی هەیە. بەڵام خۆم ئەم شتانەم ئەزموون نەکردووە. من کاتێ کە هەستم بە هەڵەکانم کردووە، بەردەوام دانم پێدا ناون... کاتێ ١٦ ساڵە بووم توانیم چەند شانۆنامەیەکی مۆدێرنی وەک ئیبسن و هاپتمەن بنوسم، لە ١٨ ساڵاندا سەرلەنوێ خوێندمنەوە و زانیم بێ بایەخن. لەو کاتەوە زانیم کە قەت نابم بە نوسەر. کەوابوو ئەو دوو بەرهەمەم سوتاند و قەت پەشیمان نەبوومەوە. ئەم ئەزمونە بۆ کارەکانی دواترم زۆر بەسود بوو. ئاخر وەک رەخنەگر ئەوە یەکەم ئەزمونی من بوو. کاتێ خوێندکار بووم چاوێکم لە کاپیتاڵ کرد و لەڕووی سیاسیەوە کاری تێکردم، بەڵام خوێندنەوەی شیعرەکانی شاعیری گەورەی هەنگاری، ئەدی، زۆر کاری تێکردم. لە کاتی لاویدا کەسێکی زۆر گۆشەگیر بووم و ئەدی بەقووڵی کاری تێکردم. ئەو کەسێکی شۆڕشگێڕ و شەیدای هێگل بوو. هەڵبەتە ئەویش وەک من هەرگیز ئەم چەمکەی هێگل «Versohnung der Wirklichkeit» (واتە گونجان لەگەڵ دۆخی هەبوو)ی قەبووڵ نەکرد. لاوازی سەرەکی فەرهەنگی

بەریتانیا لەوەدایە کە هێگلی نەناسیوە. من تا ئەمڕۆش هێگل ستایش دەکەم. پێم وایە ئەو کارەی کە مارکس دەستی پێکرد، واتە مادی کردنی فەلسەفەی هێگل، دەبێ ئەمڕۆ واوەتر لە مارکس درێژە بدرێت. من هەوڵمداوە لە چەند بەشێک لە کتێبی ئانتۆلۆژیدا ئەم کارە بکەم. کاتێ کە هەموو شتێ باســـکراوە و ئەنجام دراوە، لە ڕۆژاوادا تەنیا ســـێ بیرمەندی بەڕاستی مەزن هەیە، کە ناکرێ لەگەڵ کەسانی تر بەراورد بکرێن: ئەرستۆ، هێگل و مارکس.

-گۆڤاری NEW LEFT ئۆگەست ١٩٧١-

### سەرچاوە:

سایتی ئینتەرنێتی ئارت کاڵت:

http://www.mindmotor.org/mind/?cat=7

# وتووێژ لەگەڵ "پۆل ئاستێر"ی نووسەری ئەمریکایی
## -وشە نەبایە ئێمە ئینسان نەبووین-

سازدانی: سەعید کەمالی دهقان
لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

* رەنگە تا رادەیەک دووبارە بێــت، بەڵام «رووداوە کوتووپڕەکان» ئەوەندە لە چیرۆکەکانی ئێوەدا گرنگن کە ناکرێ بۆ جاری چەندەم دەربارەیان پرســیار نەکرێ، چونکە هەموو جارێ وەڵامێکی جیاوازتان هەیە بۆ ئەم پرســیارە، بۆچی ئەوەندە رووداوەکانتان کتوپڕن؟

-من لام وانیە رێکەوت گرنگترین شتی دونیا بێت، بەڵام بەهەرحاڵ بەشێکە لە بوون. مەبەستم ئەوەیە دەزانین رووداوەکان لە رووی شانس و بەختەوە روودەدەن و بەشــێکن لەو شتەی من ناوم ناوە سازوکاری بوون. ئێمە بۆ بڕیاردان، ئیرادە، ئاوات و توانایــی هەڵبژاردنمان هەیە، بەڵام هەرچەند ماوە جارێک و هەڵبەت بە بــاوەڕی من زۆربەی کات، هەر ئەم شــتانەن کە بەرنامەکانمان لێ تێک دەدەن، ئەمە هەر ئەو شــتەیە من ناوم ناوە بەخت. خۆ غەیبمان پێ نییە، زۆر جاریش بەخت بەکەڵک و بەسوود دەبێت بۆمان، هەڵبەت هەندێ جار بە پێچەوانەوەیە و خراپە بۆمان.

*بەڕای ئێوە جیاوازییەک هەیە لە نێوان بەخت و رێکەوتدا؟

-بەڵێ، بەخت رووداوێکە ئەمە لە حاڵێکدایە رێکەوت دوو رووداوە کە هاوکات پێکــەوە روو دەدەن. لام وایە ئەمە هەمان ئەو مانایە کە «رێکەوت» راســت لە زمانــی ئینگلیزییــدا هەیەتی، دوو شــت کە چاوەڕوان نیت لە یەک شــوێندا و

هاوکات بیانبینی، پێکەوە دەردەکەون.

* «رووداوە ڕێکەوتـــەکان» لە چیرۆکەکانتاندا بە فراوانی دەبیندرێن، لەوە ناترســـیت خوێنەر بێزار بێت یان ئەوەیە چیرۆکەکانتان دوور لە باوەڕ بێنە بەرچاو؟

–نـــە لام وا نییـــە، چونکە لام وایە خودی ژیانیش جێگای باوەڕ نییـــە. منیش هەوڵم ئەوەیە ئەم جیهانە تا ئەو جێگەیەی بۆم دەکرێ راستەقینە بیخەمە روو.

* لە ژیانی تایبەتیتاندا چۆن، زۆر «رووداوی ڕێکەوت» روودەدات؟

–بەڵێ، کتێبێکی تەواویشم لەو بارەیەوە نووسیوە بە ناوی «دەفتەری سوور» کە هەڵبەت نازانم خوێندووتانەتەوە یان نا، کتێبێکی بچووکە کە هەڵگری ســـەرجەم چیرۆکە راســـتەقینەو دوور لە باوەڕەکانە کە لە ژیانمدا روویانداوە.

* «شـــار» لـــە زۆربەی چیرۆکەکانتانـــدا توخمێکی پڕ رەنگە، بەتایبـــەت نیویۆرک و هەڵبەت برۆکلین. بۆچی ئەوەندە گرنگی دەدەن بە نووسینی رۆمانەکانتان لە فەزایەکی شاریدا؟

–بەڵێ، زۆربەی کتێبەکانم وەک وتتان باس لە شـــار دەکەن، بەڵام هەندێکیشـــیان لە نیۆیۆرکدا روونادەن، بۆ وێنە زۆربەی رووداوەکانی «ئاغای سەرەگێژە» لە ناوەندی رۆژئاوای کانزاسدا روودەدەن یان بۆ نموونە نیۆیۆرک تەنیا جارێ لە سەرجەم کتێبی «مۆسیقای بەخت»دا دەبیندرێ نەک زیاتر، لـــە زۆربەیاندا نیۆیۆرک ئامادەیـــی هەیە بەڵام نەک لە هەموویاندا. دەربـــارەی نیۆیۆرک و برۆکلین دەنووســـم چونکە جێگایەکە کە لێی دەژیم و باشـــتر لە هەر شوێنێکی تر دەیناسم. لە وڵاتەکەمدام و چێژ لەوە وەردەگرم کە لەوێ دەژیم. ئەم زیندووبوونەو ئەم ئەکتیڤ بوونەم پێ خۆشـــە کە ژیانی مرۆڤەکانـــی گرتۆتـــەوە. دەبێ بێن و خۆتان لـــە نزیکەوە بیبینن. کە دەیبینن بـــاوەڕ ناکەن چەند فرەچەشـــنی لێرەدا هەیە، هەموو جیهان دەبینن لە شەقامەکانی نیۆیۆرکدا پیاسە دەکەن، بەڕاست دلڕفێنە.

* هەڵبەت من زیاتر مەبەستم خودی چەمکی «شار» و بونیادی «شارییە» ، ئەوەی کە دەڵێم نووسەرێکی «شارین».

–بەڵێ، کتێبی «وڵاتی دواییەکان» ڕاست دەربارەی شارە وەک ئۆرگانیزمێک. شارەکان مرۆڤەکان، شارســـتانیەتەکان و هیوا جیاوازەکان لەخۆدەگرن، بەڵام رەنگە شـــار بۆ بەشێکی زۆر لە مرۆڤەکان بێ جووڵە، بە لارێدابەر، ترســـێنەر و بێ رۆح بێت. من پەرژاومەتە ســـەر هەردوو بەشی پۆزەتیڤ و نیگەتیڤی شار، شوێنێکی تەنگەبەر کە شوێنی دانیشتنی میلیۆنێک کەسە.

* هەستێکی نۆستالۆژیتان بەرامبەر بە نیۆیۆرک هەیە؟

–نا، بەڕاستی نا، من نیۆیۆرک بەم شێوەیە پێناس دەکەم، شارێکە بۆ هەموو دانیشتوانی جیهان. چونکە ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان دێن بۆ ئێرە و دەکرێ بڵێین بەگشتی نیۆیۆرک بەشێک نییە لە

ویلایەتە یەکگرتووەکان، من هەست دەکەم ئێرە بەتەواوی وەک وڵاتێکی بیانی وایە.

* لەبیرمە لە وتووێژێکدا وتووتانە ئێوە نیویۆرکین و کەسێکی ئەمریکایی نین. دەکرێ زیاتر لەم بارەوە قسە بکەی؟

-چونکە بەڕاست هەستێکی وام هەیە. لەبیرمە چەند ساڵێک لەمەوبەر گۆڤارێکی شیعر بڵاوبۆوە کە بەرگێکی زۆر سەیر و جوانی هەبوو. لە سەر بەرگەکەی نووسرابوو: «ئەمریکا، لەبەرچاوم ون بە» (پۆل ئاستەر بەرز پێدەکەنێت) بەڕاست بەرگێکی سەیر و جوان بوو، هەروەها نیویۆرک تەنها باشییەکانی ئەمریکا دەخاتە روو. نیویۆرک شوێنێکە کە مرۆڤی جیاواز و فراوان بە هەستێکی هەڵکردنەوە پێکەوە دەژین. لام وایە «هەڵکردن» (tolerant) باشترین وشەیە کە دەکرێ نیویۆرکی پێ وەسف بکرێ. راستە لێرە زۆر کیشە هەیە، رەگەزپەرستی هەیە، لێرە توندوتیژی و تاوان هەیە، هەموو ئەو شتانەی لە شارە گەورەکان روودەدا، لێرەش روو دەدات، بەڵام کاتێ ئەوە دێننەوە بەرچاوی خۆتان کە چەندە مرۆڤ لێرە دەژین و چەند پێکەوە کێشەیان هەیە، سەرتان سووڕ دەمێنێ کە دەبینن زۆربەیان دەتوانن پێکەوە و لە تەنیشت یەکدا بژین و پێکەوە هەڵبکەن. بەشێک لە شارەکانی جیهان هەن کە بۆ ساڵانێکی زۆر تراژیدیای دڵتەزێن تێیاندا روویداوە، وەک بۆلفاست و سارایۆڤۆ، خەڵکەکانی یەکتریان لەناوبردوە، لە حاڵێکدا نیویۆرک وا نییە.

* کە وایە چ هەستێکتان هەبوو بەرامبەر بەو رووداوەی لە ١١ی سێپتامبەردا روویدا؟

-وێران بووم، هەستم بە بەدبەختی دەکرد و بێزار بووم. ئەو رووداوە بۆ خەڵکی نیویۆرک وەک تراژیدیایەکی خێزانی وابوو. زۆر بە ئەستەم دەکرێ وەسفی بکرێت، سیاسەت، تیرۆریزمی جیهانی و هەموو شتەکانی تر کەوتنە پلەی دووهەمی گرنگ بوونەوە، چونکە دەکرێ بڵێین هەموو ئەوانەی لە نیویۆرک دەژیان، یان لانیکەم ئەوانەی من دەمناسین، کەسێکی دەناسی کە کوژرابوو. من کەسێکم دەناسی کە کوژرابوو، یان ئەوەی کەسێکم دەناسی کە کەسێکی تری دەناسی کە کوژرابوو. تێدەگەی چی دەڵێم؟ ملیۆنەها کەس لێرە بەشێوەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ زیانیان پێگەیشت. گریمان کەسێک تەلەفۆنتان بۆ دەکا و لەناکاو پێتان دەڵێ، ببوورن، بنەماڵەی ئێوە، دایکت، باوکت و سەرجەم براو خوشکەکانت لە رووداوێکدا ئەمڕۆ کوژراون، بۆ من ڕاست بەم شێوەیە بوو.

* لەو رووەوە کە ١١ی سێپتامبەر کارەساتێکی زۆر گەورە بوو بۆ نیویۆرک، بڕیارتان نەداوە لەم بارەوە چیرۆک بنووسن؟

-لەبارەیەوە قسەم کردوە، لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا، وەک هاوڵاتیەک لەبارەیەوە بابەتی کورتم نووسیوە، بەڵام تا ئێستا وەک چیرۆک و لە چوارچێوەی چیرۆکدا هیچ شتێکم نەنووسیوە، جگە لە بەشە کۆتاییەکانی «شێتێتی لە برۆکلین». هێشتا ناتوانم ئەم کارە بکەم، بە ئاسانی ناتوانم بیری لێ بکەمەوەو قسە بکەم.

* لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا کە بە نووسەرێکی پۆست مۆدێرن بانگتان دەکەن، پەرچە کردارت

نواندوەو رازی نەبووی بە نووسەرێکی پۆست مۆدێرنت بزانن، بۆچی؟

–کێشە لێرەدایە من خۆم نازانم کێم. لەوانە نیم کە ناو و نازناو بخەمە پاڵ خۆم و پێم خۆش نیە لە چوارچێوەی ئەم چەمکانەدا پێناسە بکرێم. ئەگەر ئەوانی تر پێیان خۆشە بەم شێوەی بمناسێن زۆر باشـــە، ســـکاڵایەکم نییە. کە پیاسە دەکەم تەنها بیر لەو شتە دەکەمەوە کە بەڕاست هەم نەک هیچ شتێکی تر.

* بەمانەشـــەوە، توخمگەلێکـــی وەک «رێکەوت» چەمکگەلێکـــی وەک «بان چیرۆکی» (meta fiction)و نێوان دەقێتی (Intertextuality) و خستنە لاوەوەی فۆرمە نەریتییەکانی چیرۆک نووسین و بەکارهێنانی چیرۆک لەناو چیرۆکداو گێڕانەوەی و تەنانەت تێکەڵکردنی چیرۆکی پۆلیســـی لەگەڵ رۆمانی نوێ، ئەمانە هەموو ئەو تایبەتمەندیانەیە کە نووســـەرێکی پۆســـت مۆدێرن هەیەتی و ئەم تایبەتمەندیانەش لە چیرۆکەکانی ئێوەدا بە فراوانی دەبیندرێ. وا نییە؟

–رەنگە وا بێت. من هەمیشـــە لام وابووە پۆست مۆدێرنیزم جۆرێک هەڵاواردنی چینایەتییە.(پێدە کەنێت) چونکە نووســـەرانێکی وەک جیمز جۆیس، مارسل پرۆست، فرانتس کافکا، ویلیان ڤاگنەر و هەموو ئەو نووســـەرە سەرکەوتوانەی تر لە سەردەمی مۆدێرندا رەوتیان سازکردوە، بەڵام من تێناگەم جیاوازییەکانـــی مۆدێرنیزم و پۆســـت مۆدێرنیزم لەچیدایە. مـــن وەک حەکایەتبێژێک چاو لە خۆم دەکەم، ئەمە ڕاســـت ئەو هەســـتەیە کە من هەمە. من چیرۆک دەنووســـم و هەر شێوەیەکیش لەبار بێت بۆ دەربڕین بەکاری دەهێنم. لە هەر کتێبێکدا بە شـــێوەیەک ئەم کارەم کردوە. هەندێکجار لە رووی ناچارییەوە گێڕانەوە، دەبێ بە گێڕانەوەیەکی نەریتی، هەندێکجاریش ئاڵۆز دەبێ و رەنگە تۆ بە پۆســـت مۆدێرن ناوی ببەی، بەڵام بەلای منەوە کێشـــەکە گرنگترە لە فۆرم و خودی چیرۆکەکە فۆرمەکەی خۆی ساز دەکات.

* لام وایە ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی بە نووســـەرێکی پۆســـت مۆدێـــرن ناوتان لێ ببەن زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین کتێبەکانتان بەتایبەت «تریلۆژی نیویۆرک» ، لە حاڵێکدا لە بەرهەمەکانی دواتردا وەک «کتێبی وەهمەکان» زیاتر لە واقیع نزیک بوویتەتەوە، وا نییە؟

–بەڵێ منیش وا بیر دەکەمەوە. لە تریلۆژی نیویۆرکدا، دوو کتێبی یەکەم جۆرێ ئەفســـانەیە لە حاڵێکدا کتێبی ســـێهەم «ژووری داخراو» بە تەواوی راســـتەقینە دێتە بەرچاو و کتێبێکە کە دوو کتێبەکەی تر دەگرێتەوە. لە «کتێبی وەهمەکان»یش هەڵبەت زۆر رووداوی گاڵتەجاڕانە روویداوە، بەڵام کتێب لە سەر بنەمای راستی دەروونناسی روودەدات.

* کەوابوو دان بەوەدا دەنێن کە لەم دواییانەدا لە واقیع نزیکتر بوونەتەوە؟

–من هەردەم هەوڵم داوە لە واقیع نزیک بم، جیاوازی لێرەدایە چۆن ئەم کارە بکەی، کە خەریکی چیرۆکێکی فەنتازی و خەیاڵی دەنووســـی، بەو مانایە نییە باس لە واقیع ناکەی، تەنها رێگایەکی ترت هەیە بۆ نزیک بوونەوە لە واقیع. بە باوەڕی من بەشـــێک لە بەرهەمەکانی قووڵی ژیانی مرۆڤ چیرۆکە خەیاڵیەکانن، کە لە هیندییەکانەوە بە ئێمە گەیشـــتوون. سەرەتا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

بڵاوبوونەتـــەوەو دواتر بەرەبەرە هاتوونەتە رۆژئاوا. هەموو ئەم چیرۆکـــە بەتام و چێژانە دەربارەی پرســـە ئینســـانییەکانن. جادووگەری، ئەو مرۆڤانەی کە دەبن بە شـــتی سەیر و سەمەر و سەرجەم ئەدەبی فانتزی، هەموو ئەمانە کاریگەرییان لەسەر ئێمە هەیە چونکە دەربارەی شتێکی واقیع قسە دەکەن، ئەویش ئەوەیە ئێمە کێین، بەڵام بە زمانی خوازە.

* لە زۆربەی کتێبەکانتدا چیرۆکی کورت و سەرەنج راکێش دەبینین کە بە ژمارەیەکی زۆر لەناو چیرۆکی ســـەرەکیدا گونجێندراون، واتە زۆر لەگەڵ پرسی چیرۆک لەناو چیرۆکدا رووبەڕووین، کاتی نووسینی چیرۆک ناترسی چیرۆکی سەرەکی لەبیر بکەیت و لەدەستتان دەرچێت؟

–ئەم کارە لە هەستێکەوە سەرچاوە دەگرێ کە ناتوانم ناوێکی لێ بنێم. من زۆر حەزم لە بیرۆکەی کۆلاژە لە شێوەکاریدا. کاتێک لەسەر تابلۆیەک دوو یان سێ شت پێکەوە ئاوێتە دەبن، پەیوەندییەک ســـاز دەبێ لەناویاندا. توخمە جیـــاوازەکان و پەیوەندییەکانیان وزە دەدەن بەیەکتر کە ئەگەر بڕیار بـــوو تەنهـــا دیمەنێک لەوێ بوایە، ئەو وزەیەی نەدەبوو. چیرۆکیش بۆ من بەم شـــێوەیەیە، کاتێک چیرۆکێک لەگەڵ چیرۆکێکی تر دێنی، شـــتێکی ســـێهەم دروســـت دەبێت کە سەیرە و هەمان ئەو وزەیەی کە باسم لێ کرد بەرهەم دێت.

* لات وا نییـــە کـــە هەر کام لەو چیرۆکانە توانای ئەوەیان هەیـــە ببن بە رۆمان؟ هیچکات پێت خۆش نەبووە هەر کامەیان بە شێوەیەکی جیا بکەی بە رۆمان؟

–مەبەستت ئەوەیە هەڵیانگرم و بیانکەم بە رۆمان؟

* بەڵێ

–جارێـــک ئـــەم کارەم کـــرد. کتێبێکی کورتە کـــە دڵنیا نیم لـــەوێ وەرگێڕدرابێتـــەوە. بەناوی «ئیمبۆکتۆ».

* وەرگێڕدراوەتەوە.

–ئەو دوو کەسایەتییە، شاعیری بێ ماڵ و حاڵ و سەگەکەم مەبەستە، ئەو دووانە بڕیار بوو ببن بە کەسایەتییەکانی رۆمانێکی دوورو درێژتر، کەسایەتییە بچووکەکانی چیرۆکێکی گەورە. بەڵام کە دەستم کرد بە نووسین، عاشقی هەردووکیان بووم و بڕیارم دا لە کتێبێکی جیادا بیانهێنم. هەڵبەت ئەم کتێبە خەیاڵییە کە زۆر جێگای مانۆڕی نییە، تەنها کتێبێکی بچووکی خەیاڵییە.

* چەند ســـاڵ لەمەوپێش وتوێژێکی ئێوەم لە «مەگەزین لیتەرر» خوێندەوە کە لەو وتووێژەدا دەڵێی: «من بەرلەوەی رۆماننووس بم حەکایەت بێژم. هەســـت بە نزیکایەتی دەکەم لەگەڵ نەریتی زارەکی حەکایەت بێژیدا، شتێک کە لەگەڵ رۆمان بە مانای ئەمرۆیی هیچ پەیوەندییەکی نییە.» لات وا نییە ئەو هەموو کورتە چیرۆکەی لە چیرۆکەکانی ئێوەدا هەیە بەم بۆنەوەیە؟

–رەنگـــە وابێـــت. خەریکم لەســـەر کتێبێکی نوێ کار دەکـــەم کە هەموو چیرۆکەکانی لەســـەر

پیرەمێردێکە لەســـەر قەرەوێڵەیەک ڕاکشاوەو ناتوانێ بخەوێ و بۆ خۆی چیرۆک دەگێڕێتەوە تا بیر لەو شتانە نەکاتەوە کە لە ژیانیدا لێیان هەڵدێ. بەڵێ، ئێوە ڕاست دەکەن، هەمدیسان خەریکم ئەم کارە دەکەم، چیرۆک لە ناو چیرۆکدا دێنم.

* دەکـــرێ زیاتـــر دەربارەی نەریتـــی حەکایەت بێژی قســـە بکەی، بۆچی بەلاتـــەوە لە ڕۆمان گرنگترە؟

–کە دەربارەی چیرۆکە خەیاڵییەکان قسە دەکەین، دەزانین زۆر لەمە پێشتر هەموویان چیرۆکی زارەکی بوون و ئەمانە هەمان ئەو چیرۆکانەن بۆ هەمیشە لەیادماندا دەمێننەوە. ئەمانە چیرۆکەکانی دەســـتپێکی ئەدەبیاتن، ئەو خەڵکانەی ســـاڵانێک لەمەوپێش لە دەوری یەکتـــر کۆدەبوونەوەو بۆ ســـەرقاڵ کـــردن و فێرکردنی یەکتر حەکایەتیـــان دەگێڕایەوە. کە دەبینم منداڵانـــی بچووک هەر لە ســـاڵەکانی سەرەتای ژیانیانەوە، دوو ساڵە و یەک ساڵ و نیوەیەوە بێ ئۆقرەن بەوەی حەکایەتییان بۆ بگێڕنەوەو پێیان خۆشـــە بەردەوام حەکایەتیان بۆ بگێڕنەوە، سەرم سووڕ دەمێنێ، لام وایە ئەمە یەکێکە لە پێویستییە سەرەتاییەکانی مرۆڤ. پرسیار ئەوەیە بۆچی؟ بۆچی؟ هەندێک جار حەکایەتە خەیاڵییەکان کە باوک و دایکەکان بۆ منداڵەکانیان دەگێڕنەوە ترسناکن و پێیان دەڵێن ئەمانە تەنها حەکایەتن، بەڵام چونکە منداڵان بە پێچەوانەی ئەوەی دەزانن ئەمانە تەنها حەکایەتن، هەستی ترس و دڵەڕاوکە بەهۆی حەکایەتەوە ئەزموون دەکەن، کاتێک باوک و دایکیان حەکایەتییان بۆ دەگێڕنەوە، دەترسن. لام وایە گوێدان بە چیرۆک، بووە بە بەشێک لە قۆناغی مرۆڤایەتی. وڵاتی ئێوەش (ئێران) مێژوویەکی کۆنی ئەدەبی هەیە، واتە زۆر بەر لە مێژووی نووسین.

* هەست دەکەم وشە لە زاتی خۆیدا گرنگی تایبەتی هەیە لەلای ئێوە. زۆر جار لە چیرۆکەکانتاندا ئاماژەتان بە گرنگی وشە داوە. بۆ وێنە لە «شەوی پێشبینی»دا دەنووسی: «وشەکان دەتوانن واقع بگۆڕن.» وشە بە لای ئێوەوە چ مانایەکی هەیە؟

–وشەکان لە پلەی یەکەمدا ئامرازی کاری منن. وشە هەموو شتێکی منە. هەموو کارێکم بە وشە دەکرێ، ئەوەی کە وشـــەکان لەسەر لاپەڕەکانی کاغەز بە تەنیشـــت یەکەوە دانێم. بەڵام لە دیدێکی جیدیتـــرەوە، زمانە جیهانمان بۆ دەخولقێنێ. ئەگەر زمانێک نەبوایـــە نەماندەتوانی بیر بکەینەوەو ئەگەر زمانێک نەبایە، بیرکردنەوەکانمان بێ بیچم دەهاتنە زەینمانەوەو نەماندەتوانی شـــتەکان لێک جیابکەینەوە. ئێمە ناو لە شـــتەکان دەنێین و بەم شێوەیە ئەو شتە لە شتێکی تر جیادەکەینەوە. ئێســـتا خەریکم چاو لە کورسییەک دەکەم بەڵام ئەگەر وشـــەی «کورسی» نەبوایە نەمدەزانی ئەو شـــتە چییە. کەوابـــوو لە ڕێگای وشـــەکانەوەیە زانیاریمان بیچم دەگرێ. بێ وشـــە ئێمەش مرۆڤ نەدەبووین.

* گرنگی وشـــە بۆ ئێوە، مرۆڤ دەخاتەوە یـــادی ژاک لاکان و ئەم چەمکە کە «ئێمە جیهان بە وشـــەکان ســـاز دەکەین.» لات وایە کەوتویتەتە ژێر کاریگەری تیۆرییەکانی لاکان و «لێکدانەوەی دەروونشیکاری» ئەو؟

–بەڕاســـت تیۆرییەکانی لاکان بەلامەوە دژوار بوو و لێی تێنەدەگەیشـــتم. هاوســـەرەکەم، سیری هۆستیش نووسەرەو هۆگری لێکدانەوەی دەروونشیکاری و ژاک لاکانەو هەموو ئەو شتانەی لە لاکان دەیزانم لە ڕێگای ئەوەوەیە. من بۆ خۆم تیۆری «قۆناغی ئاوینەیی» (MirrorStage)ی لاکانم بەدڵە و لاموایە تیۆرییەکی تەواو دروستە. ئەوەی کە ئێوە لە چاوی ئەویدیدا خۆتان گەورە دەکەن و دواتر خۆتـــان لـــە ڕەنگدانەوەی چاوی بۆ وێنە باوک یان دایک یان هەر کەســـێکی تر کە لە منداڵیدا لێی نزیـــک بوون، دەبیننەوە. ئـــەوەی کە ئێمە بە تەنهایی خۆمان ناخولقێنین، بەڵکو لە ڕێگای ئەوانی ترەوە خۆمان دەخولقێنین.

* ئەی ژیانی تایبەتیتان؟ ئاخۆ وشەکان توانیویانە ئەوەندە کاریگەر بن و شتێک بگۆڕن؟

–نا، لام وانییە بەم شـــێوەیە بێت. ئەگەر بەڕاســـت کەســـێک پەیدا بێت کە بە شێوەیەک بتوانێ کێشـــەکانی من چارەســـەر بکات، ئیتر پێویستم بە نووسین نابێت، کێشـــە لەوەدایە من وەڵامێک نادۆزمەوە. هەمیشە کارم بۆتە پرسیار کردن.

* دەمەوێ تۆزێ لەو ســـەردەمە پرســـیار بکەم کە چوون بۆ فەرەنسا، هەمووان دەزانن فەرەنسا بەتایبـــەت پاریـــس کاریگەریی زۆری بووە لە ژیانی نووســـەرانی ئەمریکاییدا بۆ وێنە، ئەرنێســـت هەمەنگوای و ویلیام فاکنەر و ...، پاریس ژیانی ئێوەی چۆن گۆڕیوە؟

–بەڕاســـت فەرەنســـام بۆ گرنگ بوو. ئەو کاتەی لەوێ بووم تەمەنم بیست و چوار ساڵ بوو، زۆر گەنج بووم. ئەو ســـەردەمە لە ئەمریکا سەردەمی شـــەڕی ڤیەتنام بوو، سەرەتای ١٩٧١ هەوڵم دەدا بنووســـم و تاڕادەیەکیش ســـەرکەوتوو بووم، بەڵام بەڕاســـت لە خۆم دڵنیا نەبووم کە دەمەوێ ببم بە نووســـەر یان نا. ئەو سەردەمە بوو هەســـتم بەو پێویستییە کرد لە خۆمدا کە دەبێ لە ئەمریکا دوور کەومـــەوەو ماوەیەک تەنها بم و خۆم تاقی بکەمەوە. گرنگترین دەســـکەوتی بوون لەوێ ئەوە بوو کە سێ ساڵ و نیو دواتر ئەو کاتەی گەڕامەوە ماڵەوە، دڵنیا بووم دەبم بە نووسەر، جا لە هەر ڕێگایەکەوە کرابێت. لەگەڵ ئەمەش بەڕاســـت جێگای ســـەرنجە لە دوورەوە چاو لەو وڵاتە بکەی کە لێی لەدایک بوویت و ڕوانگەت دەگۆڕی. بوون لە پاریس ئەم هەلەی بۆ من ڕەخساند. کە لە پاریس بووم تۆزێ لە ئێوە بەتەمەنتر بووم.

* هەڵەم نەکردبێت هەمەنگوایش لە تەمەنی ئێوەدا بوو چووە پاریس.

–بەڵێ، ڕاســـت دەکەی. لەوێ هاوڕێی نزیکم هەبوو، لەگەڵ شاعیران و نووسەرانێکدا ئاشنا بووم کە ئێستاش پەیوەندیمان هەیە پێکەوە. جۆرێک هەستی نزیکایەتی لە نێوان شاعیران و نووسەرانی ئێوەدا هەبوو کـــە من لەناو ئەمریکاییەکاندا نەمدیوە. جۆرێک هەســـتی یارمەتیدان. مرۆڤگەلێکی بێ فیز بوون و زۆریان هەوڵدەدا. هەموو ئەمانە فێری کردم چۆن ئێنســـان و لە قۆناغی دووهەمدا هونەرمەند بم. بەڕاســـت پێم خۆشـــە بڕۆمە پاریس، پاریس ماڵی دووهەمی منە. من لەوێ زۆر زۆر خۆشحاڵ بووم.

* ئەمڕۆکە دەڵێن فەرەنسا زۆر بووە بە ئەمریکایی، بە تایبەت دوای بوونی سارکۆزی بە سەرۆک کۆمار. بە هەموو ئەمانەشەوە ئەدەبی ئەمریکا زۆر قەرزاری فەرەنسایە، وا نییە؟

–هەر وایە کە دەڵێی. ئێستا بەشێکی گەورە لە جیهان دەیانەوێ ببن بە ئەمریکایی. بەتایبەت جیهانی رۆژئاوا، بەڵام بە هەموو ئەم هەلومەرجەوە، فەرەنسا هەردەم فەرەنسا دەمێنێتەوە. خەڵکی ئەوێ بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی ئەمریکا جۆرێکی تر بیردەکەنەوە، جۆرێکی تر ژیان دەکەن و سەرقاڵییەکانی ژیانیان جیاوازە لەگەڵ یەکتر. کاریگەری وەرگرتنی دوو لایەنەی ئەدەبی هەر لە مێژەوە لە نێوان فەرەنساو ئەمریکادا بوونی بووە. بەشێکی زۆر لە شیعری ئینگلیزی و ئەمریکایی سەدەی بیستەم لەژێر کاریگەری شیعری فەرەنسادا بوەو نووسەرێکی وەک جەیمز جۆیس زۆر لەژێر کاریگەری نووسەرێکی وەک فلۆبەردا بوە. لە بەرامبەردا، لام وایە نووسەرانێکی ئەمریکایی هەبوون کە کاریگەریان لەسەر فەرەنسیەکان داناوە. چەند ساڵ لەمەوپێش، نازانم ئاگادارن یان نا، گوڵچنێک لە شیعری فەرەنسای سەدەی بیستەمم کۆکردەوە، شیعری فەرەنسایی ناو کتێبەکەش لەلایەن شاعیرانێکی بەناوبانگەوە وەرگێڕدرابۆوە سەر زمان ئینگلیزی.

* هەڵبەت دەمزانی بەشێک لە شیعرەکانی مالارمەت وەرگێڕاوەتەوە، بەڵام ئاگاداری ئەم گوڵچنی شیعرانە نەبووم.

–کەسانێکی تر هەبوون جگە لە مالارمە کە کارەکانیان وەربگێڕدرێتەوە سەر زمانی ئینگلیزی. کە گەنج بووم، ڕاست هاوتەمەنی ئێوە، سەرقاڵی ئەم کارە بووم. کتێبێکی سەرنج ڕاکێش بوو. ئەو وەرگێڕانەی کە ئەو شیعرانەیان بە ئینگلیزی وەرگێڕابوو خۆیان لە شاعیرە ناودارەکانی سەدەی بیستەم بوون و سەیر ئەوە بوو کە هەموویان عاشقی شیعری فەرەنسی بوون. کەسانێکی وەک سامۆئێل بێکت، تی.ئێس.ئیلیوت، ویلیام کارلۆس ویلیامز، والاس ستیۆنز.

* بە لەبەرچاوگرتنی مانەوەو هۆگریتان بە فەرەنسا، بەشێکی زۆر لە رەخنەگرەکانتان ئێوە بە یەکێک لە ئەوروپاییترین نووسەرەکانی ئەمریکا دەزانن. ڕای خۆت لەم بارەوە چییە؟

–ڕاستی ئەوەیە هەمدیسان نازانم لەم بارەوە چ بڵێم. ئەو کاتەی خەڵک نازناوێک دەخەنە پاڵت، نازانی چۆن وەڵامیان بدەیتەوە. خۆم، خۆم بە نووسەرێکی ئەمریکایی دەزانم، نووسەرێک کە لەگەڵ دڵەڕاوکەکانی جیهانی ئەمریکایی و کەسایەتییەکانی ئەمریکاییدا دەژی و لەگەڵیان رووبەڕوو دەبێتەوە. کەوابوو ئیتر بەڕاست لە مەبەستەکەیان تێناگەم، لام وایە ئەم بۆچوونە لەبەرئەوەیە کە بیستوویانە لە فەرەنسا ژیاوم و چەند کارێکم لە زمانی فەرەنسییەوە کردوە بە ئینگلیزی. رەنگە لەبەر ئەمە بێت.

* هەڵە نەکەم سەرەتاکانی دەیەی ٧٠ بوو کە رۆشتیتە فەرەنسا.

–سەرەتای ساڵی هەفتا و یەک. فێبروەری هەفتا و یەک بوو رۆشتم.

ئەو سەردەمە، گۆڤاری « کایە دوو سینما» لە فەرەنسا زۆر ناودار بوو و کاریگەریی زۆر هەبوو. ئەزموونی دەرهێنانی ئێوە هیچ پەیوەندییەکی هەیە بە فەرەنساو بەتایبەت «کایە دوو

سینەماوە»؟

-نـــا، هیچ پەیوەندییەکی بە «کایە دوو ســـینما»ەوە نییە. بەڵام هەردەم عاشـــقی فیلم بینین بووم. ئەو کاتەی تەمەنم کەم بوو، ئەو کاتەی لە نیویۆرک خوێندکار بووم، زۆربەی کات دەڕۆشتمە ســـینەماو ســـەیر ئەوە بوو لەو ســـاڵانەدا ســـینەمای زۆر باش لە نیویۆرک هەبوو و دەتوانی لەوێ فیلمە بیانییەکان، لە ئەوروپاو ژاپۆن و هیند و شـــوێنەکانی تری جیهان ببینی. لە نیویۆرک زۆر شـــت لە جیهانی ســـینەما فێر بووم. دواتر کە چوومە پاریس، ســـینەماگەلێک هەبوون کە فیلمە کۆنە ئەمریکییەکانیان بڵاودەکردەوە، بەم شـــێوەیە لە پاریس ئەو فیلمە ئەمریکیانەم بینی کە لە خودی ئەمریکا نەمدیبوو، زۆر ســـەیرە، بەڵام هەردەم پێم خۆش بوو لە جیهانی سینەماو فیلمیشدا کار بکەم، ســـەرەنجام بە ئاواتەکەم گەیشـــتم و زۆر چێژم لێ وەرگرت، هـــەر ماوەیەک لەمەو پێش وێنەگرتنی یەکێک لە فیلمەکانم تەواو بوو.

* بەڕاست، کەوابوو کەی نیشان دەدرێ؟

-لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ٧ی ســـێپتامبەر نیشـــان دەدرێ. واتە دوو مانگ دواتر. (ئەم وتووێژە رێکەوتی ٨ی ژانیوەری ٢٠٠٧ ســـازدراوە) کۆتاییەکانی سێپتامبەریش دەڕۆم بۆ فێستیڤاڵی سێن سباستیەن.

* بەڵێ، ڕاســـتە، هەواڵەکەشـــی لێرەدا بڵاوبۆتەوە، ئەوەی کە سێ نووسەر لێژنەی داوەرانی ئەم فێستیڤاڵەن، ئێوە، بارگاس یۆسا و ساراماگۆ.

-بەڕاســـت؟ ئەوانیش هەن؟ من نەمدەزانی ئەوانیش دێن. زۆر باشـــە. سوپاست دەکەم ئاگادارت کردمەوە. (پێدەکەنێ) بەهەر حاڵ بڕیار وایە فیلمەکە لە دەرەوەی بەرنامەی پێشبڕکێ نیشان بدرێ و یەکەمین نیشاندانی ئەوروپایی ئەو فیلمە لەوێ و هەر لەو کاتەدا دەبێت.

* ئەگەر بڕیاربێت جارێکی تر لەنێوان نووســـەر بـــوون و دەرهێنەربووندا یەکێکیان هەڵبژێری کامیان هەڵدەبژێری؟

-نازانم. لام وایە نووســـەربوون گرنگترین شـــتە کە بە لامەوە گرنگە. لە دڵەوە فیلمم پێ خۆشەو عاشـــقی فیلمم، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ نووسەربووندا بژاردەی دووهەمە. جیاوازییەکی زۆر نییە لە نێوانیاندا. گرنگ حەکایەت گێڕانەوەیە، بەڵام لە فیلمدا بە فۆرم و جۆرێکی تر چیرۆک دەگێڕدرێتەوە، زۆریش ســـەرنج راکێشـــە کە وادەکات بمانخاتە گومانەوە، بەڵام من هەر ئەو کارە دەکەم کە بەڕاست خوازیارم ئەنجامی بدەم، ئەویش نووسینی رۆمانە.

* دەمەوێ دەربارەی پەیوەندی ژیانت و رۆمانەکانت لێت بپرسم، چیرۆکەکانت تا چەند لە ژیانت نزیکن؟

-زۆر کـــەم لـــە یەک دەچن. لە بەر ئەوەیە من پێشـــتر دوو، ســـێ کتێب بیۆگرافیم نووســـیوە، «داهێنانی تەنیایی»، « دەســـتی دەم» و چیرۆکە راســـتەقینەکانی «دەفتەری سوور» کە هەموو

زانیارییەکانی ژیانی تایبەتیم لەوانەدا هاتووە . رۆمانەکانم تەواو خەیاڵین، جگە لە هەندێک جار کە کتوپڕ ئاماژەیەک دەکەم کە ڕاســـت گرێ دەدرێتەوە بە ژیانی تایبەتیمەوە . لە تریلۆژی نیویۆرکدا، نازانم لەبیرتانە یان نا، کە کەسایەتی فێنشاو لە پاریس دەژی، ئاماژەیەکە بۆ ژیانی تایبەتیم.

* بەڵێ، لە بیرمە، دواتر دەڕواتە پاریس و لە کافتریایادا کەسێک دەبینێ.

–بەڵێ هاوڕێیەکی رووســـی هەیە کە ئاهەنگ سازە . سەلاجەیەک دەدا بە پیاوی پیر. لەبیرت دێ باسی کوێ دەکەم؟

* بەڵێ، زۆر باش لەبیرمە . سەلاجەیەک دەدا بەو پیرە پیاوە . ئیوان ویشنگرادسکی، سەلاجە بۆ ئەو شتێکی گرنگ بوو.

–بەڵێ، ئیوان ویشنگرادسکی کەسایەتییەکی راستەقینەیە، بەڕاست هاوڕێم بوو و لەڕاستییدا من سەلاجەیەکم پێی دا، بەسەرهاتەکە هەر بەو شێوە روویدا کە لە کتێبەکەدا هاتووە و منیش بەڕاست ماوەیەک ئامارگر بووم و هەموو ئەمانە لە ژیانی تایبەتیمەوە هاتوونەتە دەر و لەم چەشنە رووداوانە زۆر روودەدات، ئەوەی کە بەشێک لە ژیانم لە کتێبەکاندا بێنم، هەندێک جار لەم کارانە دەکەم.

* بۆ نموونە جارێکیش کەســـایەتی چیرۆکەکانت راست ئەو کاتە لەدایک بووە کە خۆت لەدایک بووی.

–بەڵـــێ، جارێـــک رووی داوە، لە کتێبـــی «رۆحەکاندا» تەنها جارێک ئـــەم کارەم کردوە لەوێدا بووە .

* دەمەوێ هەندێ دەربارەی «تریلۆژی نیویۆرک» شـــتت لێ بپرسم، لە یەکێک لە وتوێژەکانتدا دەڵێی رۆمانی تریلۆژی نیویۆرک رۆمانێکی پۆلیسی نییە چونکە هیچ تاوانێک لەو رۆمانەدا روونادات، بەڵام راز و کۆدی تاوان و هەروەها ئەگەری رووداتی تاوان بوونی هەیە، بۆچی بە هەموو ئەمانەوە بە رۆمانێکی پۆلیسی نازانی؟

–چونکە لە چیرۆکێکی پۆلیســـی راستەقینەدا ئێوە بە وەڵام دەگەن و کێشەکە چارەسەر دەکرێ، بـــەڵام لە کتێبەکانی مندا تەنها پرســـیارەکانتان زۆر و زۆرتر دەبێـــت و هیچ وەڵامێک وەرناگرنەوە . بەڵێ، لە باری فۆڕمەوە هیچ قسەیەک لەوەدا نییە کە پۆلیسییە، بەڵام لە کەڵک وەرگرتن لە فۆڕمی رۆمانی پۆلیســـی بەم شێوەیە، ئیتر لام وانییە بکرێ ناوی لێ بنرێ چیرۆکی پۆلیسی یان چیرۆکی جینایی.

* بە لەبەرچاو گرتنی ئەو شـــتانەی کە باســـتان کرد و هەڵبەت داهێنان و لە نەریت لادانی ئێوە لە کەڵک وەرگرتن لە فۆڕمی پۆلیســـی لە «شاری شووشەیی»دا کە لە کۆتاییدا ئێمە بەو قەناعەتە دەگەین بەوەی کە چیرۆکەکان پۆلیســـی نین، لام وایە مەبەســـتتان لە بەکارهێنانی فۆڕمی پۆلیسی گاڵتەکردن و توانج دانە لە رۆمانی پۆلیسی. بەتایبەت کە ناوی کتێبی سێهەمی تریلۆژی نیویۆرک

«ژووری داخراوە» و ئاماژەیە بە چەمکی نەریتی ژووری داخراو لە رۆمانی پۆلیسیدا. راتان چییە لەم بارەوە؟

–بەڵێ، بەتەواوی بەو شێوەیەیە کە باست کرد. هیچ جێگای مشتومڕ نییە. وەک دەزانن بۆ نموونە لە «شاری شووشەیی»دا چیرۆکەکە بە تەواوی پڕنهێنی و تەماوی تەواو دەبێت. کووینێک کە لە هەموو چیرۆکەکەدا بە شوێنیەوە بووین، کتوپڕ دەبێ بە هەڵم و دەتوێتەوەو ئێوە نازانن بۆ کوێ چووەو چی لێهاتووە. هەموو جارێکیش خۆم بیر دەکەمەوە بێ سەروو شوێن بووە بەڵام نازانم چۆن؟ رەنگە لە پەنجەرەوە بازی داوەو هەڵهاتووە. بە کورتی چیرۆکەکە کۆتایی دێ و ئەو بێ سەرو شوێن دەبێت. بۆ نموونە بێننەوە بەرچاوی خۆتان و لە خۆتان بپرسن، بەڕاست کێ خواردنی داوە بە کویین؟ کێ سەرەداوێکی لە دوای خۆی لەوێ جێدەهێشت؟ پرسیاری سەرەکی ئەمەیە. من لام وایە هەموو ئەم کارانە نووسەر، واتە من ئەنجامم داوە. من بووم کە خولقاندوومە هەتا بژی (پێدەکەنێت)

* لە کتێبەکانتدا کۆمەڵێک زانیارییت داوە بە دەستەوە، ئاخۆ هەموو ئەم زانیارییانەش خەیاڵین یان ڕاستن؟

–هەموویان ڕاستن. هەموو شتێک ڕاست و دروستەو هیچم لە خۆمەوە ساز نەکردوە. بۆ وێنە لە «مۆن پاڵاس» یەک دنیا دەربارەی مێژووی ئەمریکا قسەم کردوەو هەموو ئەو قسانەم واقیع و ڕاستن.

* لە چیرۆکەکانتدا کتوپڕ مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ، بۆ وێنە ئانا گرامێک کە لە ناوی «جان ترۆز»دا هەیە یان ئەو کاتەی دەیڤید زیمیری «کتێبی وەهمەکان» لە «مۆن پاڵاس»دا دەبینین کە دەڕواتە زانکۆ، یان ئەو کاتەی کەسایەتییەکانی «شاری شووشەیی» و «رۆحەکان» لە «ژووری داخراو»دا دەبینین، ئەم کارانە رێکارێکی تایبەتە بە لای ئێوەوە یان تەنها کایەیەکە و بەس؟

–نا کایە نیە، رێکارێکی تایبەتەو ئێستا باسی دەکەم بۆت. زیمیر کەسایەتییەکە کە من بە درێژایی سالانێک زۆر خۆشم ویستووە، لە کتێبی «مۆن پاڵاس»دا کەسایەتییەکی پەراوێز کەوتووەو دواتر لە «کتێبی وەهمەکاندا» بوو بە یەکێک لە کەسایەتییە سەرەکییەکان و هەروەها لەم کتێبە تازەشمدا کە بەم زوانە بڵاوم کردۆتەوە،» سەفەر بۆ ژووری نووسین» جارێکی تر دەردەکەوێتەوە، کەوابوو بەشێک لە کەسایەتییەکانی من لە دووتوێ و لە ناو چیرۆکەکانی منەوە دێن. هۆی هێنانی ئاناگرام لە «جان ترۆز» دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پێم خۆش بوو خۆم بە شێوەیەک لە چیرۆکدا ئامادە بم. «شەوی پێشبینی» بە شێوەیەک دەربارەی زۆر شتە، بەڵام یەکێک لەو شتانەی دەربارەی قسە دەکەم نووسەری گەنج و نووسەری پیرە. وا دیارە ویستوومە خۆم لە هەردووکیاندا ببینمەوە، وەک ئەوەی هەردووکیان نیوەیەک بن، ترۆز نیوەی پیریمە و ئۆر نیوەی گەنجیم. بەڵام بەڕاست مەبەستم گاڵتە و شتی لەم چەشنە نەبووە.

* لە «کتێبی وەهمەکاندا» لە شوێنێکدا کلێر مارتین لەگەڵ ماترین فراست دەربارەی کتێبێک

بەناوی «ســەفەر بۆ ژووری نووسین» قســە دەکەن، ئەو کاتەی « کتێبی وەهمەکان»ت نووسی، بەڕاست بیرت لە نووسینی ڕۆمانی «سەفەر بۆ ژووری نووسین» کردبۆوە؟

–نە، لە پێشدا بە هیچ شێوەیەک نەمدەزانی کە دەمەوێ وەها کتێبێک بنووسم، بەڵام دواتر ئەم بڕیارەم دا و ئەو ناوەم پێ خۆش بوو، هەر لەبەر ئەوە بوو پاراســتم، بەڵام لەو ســەردەمدا بەڕاســت نەمدەزانی لە داهاتوودا وەها بڕیارێک دەدەم.

* زۆربەی کەســایەتی چیرۆکەکانت هەژار و بێ چارەن. یان ئەوەیە بنەماڵەکەیان لە ڕووداوێکی ئاسمانیدا لەدەست داوە یان بەڵایەکی تریان بەسەر هاتووە؟

–من گرفتی «لەدەستدان»م پێخۆشەو دەمەوێ بزانم خەڵک چۆن لەگەڵ ئەم کێشەدا هەڵدەکەن. چونکە ئەو کاتەی کەســێک لەدەســت دەدەی هەموو شــت دەگۆڕێ، ئەو کاتەی کەســێک عاشقی بووی، یان بەهەر هۆیەک خۆشــت ویســتوە، ڕووداوێکی بۆ پێش دێت، ناچاری کتوپڕ جۆرێکی تر لەگــەڵ ژیان ڕووبەڕوو بیتەوە. ناچاری خۆت ســەرلەنوێ و بە شــێوەیەکی تایبەت و قووڵ بنیات بنێیتەوەو ســەرلەنوێ خۆت بدۆزیتەوە. من کۆمیدیا کۆمەڵایەتییەکانم پێ خۆش نییە و پێم خۆشە کەســایەتییەکانم لەگەڵ ئەم پرســە بنەڕەتیانەدا ڕووبەڕوو ببنەوە، پێم خۆشــە باس لە کێشــە ئینســانییەکان بکەم و ئینسانی بنووسم و لام وایە تا لەگەڵ کێشەی لەدەستدانی خۆشەویستێکدا ڕووبەڕوو نەبینەوە، بە باشی نازانین ئێمە کێین. ژیانی بە باشی دەڕواتە پێش و دەکرێ چێژی لێ وەربگرین، بەڵام بۆ نووسین بابەتی گرنگتریش بوونی هەیە.

* لــە تریلۆژی نیویۆرک و بەتایبەت لە «شــاری شووشــەیی»دا هەموو کات کەســێک هەیە کەســێکی تری خستۆتە ژێر چاودێری خۆیەوە. «چاودێری کردن»ی ئەوانی تر چ گرنگییەکی هەیە بەلاتانەوە؟

–ئەم بابەتە زیاتر لە تریلۆژی نیویۆرکدا هاتۆتە پێش و پرسیاری سەرەکی تریلۆژی نیویۆرک ئەوەیە کێ بەکێیە. یەک سات تەماشای کەسێک دەکەی و کتوپڕ بە بوونی ئەو شوناس وەردەگری.

* لەڕاستیدا هەمان «پرسی شوناس».

–بەڵێ، ئێوە بە کەســێکی ترەوە شوناس پەیدا دەکەن و بەم شێوەیە شتێک لە خۆتان لەدەست دەدەن و شتێک لە ئێوە لە کەسێکی تردا ڕەنگ دەداتەوە، جۆرێک دۆخی دەرونشیکارییانە.

* ئەگەر ئیزن بدەی دەمەوێ چەند پرسیارێکت لێ بکەم دەربارەی ژیانی تایبەتیت.

–با بزانین چەندە تایبەتییە (پێدەکەنێت).

* گەورەترین خواست و ئاوات لە ژیانتاندا چی بووە؟

–ئاوات و خۆزگەکانم شــتگەلێکی ئاساین. ڕاست وەک ئینســانەکانی تر. گەورەترین خواست و ئارەزووم ســاغی و خۆشــی بنەماڵەکەمە، ئەوەی کە هاوسەر و منداڵەکانم ساغ و سەلامەت بن، ئەمە

گرنگترینیانەو خواستی یەکەممە. دووهەمین خواستم ئەوەیە کە ژیانێکی شەرافەتمەندانەم ببێت، بەڕاست بۆم گرنگە. دەمەوێ تا ئەو جێگەی بۆم دەکرێ لە دونیادا کەسێکی باش بم و دوای ئەوە پێم خۆشە لە کارەمدا تا ئەو جێگەی بۆم دەکرێ باشترین کەس بم و درێژەی پێ بدەم. هەر ئەمانە. ئاواتی پارەو ناو دەرکردنم نییە، تەنها دەمەوێ درێژە بە کارێک بدەم و ئاگام لەو کەسانە بێت کە خۆشم دەوێن.

* لە دنیادا چ نیگەرانییەکت هەیەو لە چی دەترسی؟

–بە دڵنیاییەوە کاتێک ئەو شتانەی کە ناوم بردن بەدی نەیەن نیگەران دەبم. کاتێک کەسێک نەخۆش دەکەوێ یا دەمرێ یان ئەو کاتەی ناتوانم کارێک ئەنجام بدەم، یان شتێک روو دەدات کە دەبێ بە هۆی ئەوەی شەرم بمگرێ. ئەوانەن کە دەبن بەهۆی نیگەرانیمان. لەوانە دەترسم.

* لە خەودا چ خەوگەلێکی ناخۆش دەبینی؟

–خەوی ناخۆشی من بۆ ساڵانێکی درێژ ئەوە بوو کە بەشوێنمەوەن و هەڵبەت خۆشم نازانم بۆچی وا بوو. هیچ کارێکم نەکردوە بەڵام ئینسانەکان بەدوامەوەن.

* یانی خەڵک دەکەونە دوات؟

–جگە لەوەی دەکەونە دوام بەشوێن ئەوەوەن بمخەنە دوا. لە خەودا هەردەم لە ترس هەڵدێم.

* لە کەیەوە ئەم خەونە ناخۆشە دەبینی؟

–لە منداڵیەوە. لام وایە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جەنگی دووهەمی جیهانی. من ڕاست دوای جەنگی دووهەمی جیهانی لەدایک بووم. لە هەموو شوێن باس باسی جەنگ بوو و هەموو بە شوێن یەکترەوە بوون و ئینسانەکان لە ئەوروپا بەردەوام خۆیان دەشاردەوە. ئەم بەسەرهاتە لە مندا رەگی داکوتاوەو لە وێنە زەینییەکانمداو لە خەونە ناخۆشەکانمدا کەسانێکی قوربانیم دەدی کە لە دەست مرۆڤە خراپەکان هەڵدەهاتن.

*باستان لە جەنگی دووهەمی جیهانی کرد و ئەو دەفتەر تەلەفۆنانەی کە لە «شەوی پێشبینی»دا باسیان لێوە دەکەی، خستەوە یادم.

–بەسەرهاتێکی سەیر هەیە لەم بارەوە. ئەو دەفتەر تەلەفۆنەی ساڵەکانی ١٩٣٨ و ١٩٣٩ شتێکی راستەقینەیە، من لێرە لە ماڵەوە ئەو دەفتەرەم هەیە. ئەو بڵاوکراوە پۆڵەندیەی کە شتەکانم بڵاودەکاتەوە، ساڵی ١٩٩٨ لە وارشۆ پێی دام. پێی وتم دیاریەکی سەیرم هەیە بۆت و ئەو دەفتەرەی پێدام. چونکە لەو دەفتەرەدا کەسێک هەبوو هاوناوی من: پۆل ئاستێر.

* بەڕاست؟

–بەڵێ، یەکێک لە خزمەکانم بووە. بەشێکی زۆر لە ئەندامانی بنەماڵەی ئێمە پێشتر لە پۆلەندا دادەنیشتن و ئەو کەسەی لە دەفتەرەکەدا ناوی هاتووە خزممان بوو. ئەمەش نموونەیەکی سەیرە لە

«رووداوە ڕێکەوتەکان». کە «شــەوی پێشبینی» بڵاوبۆوە ڕۆژنامەنووسێکی پۆڵەندایی هاتە ئێرە لەگەڵم وتوێژ بکات. لە نیگەرانی و دڵەڕاوکەدا بەردەوام عارەقەی دەڕشـــت. بەڕاست کەسێکی باش و وریا بوو. پێی وتم ئەو کەسانەی لە کتێبەکەتدا ناوت بردوون ئەوانە بەڕاست باوەگەورەو دایەگەورەی راســـتەقینەی منن. لەو لاپەڕەی دەفتەر تەلەفۆنەدا کە لە کۆتایی کتێبی «شـــەوی پێشـــبینی»دا بڵاوبۆتەوە، ناوی باوەگەورە و دایەگەورەی من هاتووە. بەســـەرهاتێکی ســـەیرا! خۆم زۆرم پێ سەیر بوو.

* ئێستاش نووسەرێک هەیە چاوەڕوان بیت کتێبی دواتری چاپ بێت؟

–بەڵێ، زۆرن ئەو نووسەرانەی چاوەڕوانم کتێبی تازەیان چاپ بێت، پرسیارێکی زۆر باشت پرسی و بە باشترین شێوە پرسیارەکەت پرسی. کەسێکیش هەیە کە تازە مردوەو من هەموو بەرهەمەکانیم خوێندۆتەوە.

* کێ؟

–کاپۆشینســـکی، ئەو نووسەرەی کە رۆژنامەنووس بوو. هەر شـــتێکی دەنووسی دەمخوێندەوە. هەموو کتێبەکانی «دۆن دلیلۆ» نووســـەری ئەمەریکیم خوێندۆتـــەوە. هەموو کتێبەکانی «پیتەر کێری» نووســـەری ئۆسترالیم خوێندۆتەوەو هەموو کتێبەکانی «ج.م.کۆئیتزە» نووسەری ئەفریقای باشـــوورم خوێندۆتەوە، هەر ئەو کەســـەی کە نۆبێلی ٢٠٠٣ی وەرگرت. زۆر جوان دەنووســـێت، زۆر وریایـــەو زۆرم حەز لە خوێندنەوەی کتێبەکانیەتی. کتێبێکی نووســـیوە بەنـــاوی «لە چاوەڕوانی بەربەرەکاندا» شـــاکارێکی تەواوەو پێشـــنیار دەکەم هەموو کەس بیخوێنێتەوە. بەڕاســـت شاکارە، یەکێکە لە باشترین ئەو رۆمانانەی لە هەموو تەمەنمدا خوێندوومەتەوە.

* چ فیلمگەلێک دەبینی و زۆرتر بەرهەمی چ دەرهێنەرێک تەماشا دەکەی؟

–زۆر فیلم هەن کە خۆشم دەوێن. وەک چۆن لە «کتێبی وەهمەکاندا» دەردەکەوێ، عاشقی فیلمە بێدەنگەکانم. زۆر رێزم هەیە بۆ چارلی چاپلین و باســـتر کیتن، لە دەرهێنەرەکانی ئێستایش «ژان رنوار»ی دەرهێنەری فەرەنســـیم بەدڵە، فیلمەکانـــی «ئۆزۆ» ( Yasujiro Ozu) دەرهێنەری ژاپۆنیم خۆشـــدەوێ و هەروەها کارەکانی دەرهێنـــەری هیندی «ســـاتیاجیت رای» (Satyajit Ray) م پێ جوانە، «رای» ئینســـانێکی تەواو داهێنەرو بەتوانایەو بەم دواییانەش تریلۆژییەکی بەرهەم هێناوە کە بەڕاســـت شاکارە. کارەکانی «فرانسوا ترۆفۆ»شـــم پێ جوانە، بەشێک لە کارەکانی دەرهێنەری پۆڵەندیی «کریستۆف کیشلۆفسکی»شم پێ جوانەو چێژ لە بینینیان دەبینم.

* تریلۆژی « شین، سپی، سوور» ؟

–بەڵێ و بەتایبەت سوور، دوایین فیلم «تریلۆژی»، بەڕاست شاکارێکی هونەرییە.

* ئەی «ژیانی دووانەی ورۆنیک»؟

–ئەو فیلمەشـــم پێ خۆشـــە. ئەکتەری ژنی ئـــەو فیلمەی کە تازە بەرهەمم هێنـــاوە، هەمان ژنە ئەکتەری فیلمی «ژیانی دووانەی ورۆنیک»ە، واتە «ئیرێن ژاکۆب». بەڕاســـت ژنێکی لێهاتووەو زۆر بـــاش لە بەرامبەر کامێرادا دەردەکەوێ، زۆر ســـەرکەوتووەو پێکـــەوە زۆر باش کارمان کرد. لە باری کەسایەتییشەوە ژنێکی زۆر سەرکەوتووە. با لەبیرم نەچێ چەند دەرهێنەرێکی ئەمریکایش هەن کە خۆشم دەوێن، «بیلی وایلدێر»، «جان هۆستۆن» و « «هوارد هاکس « دەبێ ناوی چەند فیلمێکی ئێرانیش ببەم، عاشقی کارەکانی «کیارۆستەمی»م و رەنگە بزانن ئەو ساڵەی کیارۆستەمی خەڵاتی وەرگرت من ئەندامی لێژنەی داوەری خەڵاتەکان بووم. ئەو فیلمەشیم زۆر پێ خۆش بوو.

* «ژان پییەر ژنە» دەرهێنەی فیلمی «ئێمێلی» دەڵێت پۆل ئاستێر کاریگەریی هەبووە لەسەر ئەدەبی ســـینەمایی فەرەنسا. زۆر سەیرە سەردەمێک فەرەنسا کاریگەری لەسەر ئێوە بووەو ئێستا ئێوە کاریگەریتان هەیە لەسەر فەرەنسا.

–بەڕاست؟ نەمدەزانی وەها شتێکی وتووە. من «ژان پییەر ژنە» دەناسم و لەگەڵی ئاشنام و دەزانم کە فیلمی «ئێمێلی»ســـازکردوە. جارێ پێکەوە قسەمان کردو وتی کە لە بیرۆکەی چیرۆکەکانی من کەڵکی وەرگرتووەو هیوادار بوو پێم ناخۆش نەبێت. من بەڕاســـت فیلمەکەی ئەوم پێ خۆش بوو و لە چەند بەشـــێک لە فیلمەکەدا زانیم لە کارەکانی من کەڵکی وەرگرتووە، زۆر باشـــە، بەڕاست ئەو کارەشم پێ خۆش بوو.

* مەبەستتان زیاتر کەڵک وەرگرتنە لە «رووداوە رێکەوتەکان»؟ ئەوەی کە سەرجەم بەسەرهاتەکە بە رێکەوت بووەو ئێوە ناتوانن بپرسن بۆچی، ڕاست وەک کتێبەکەی خۆتان؟

–بەڵێ، جگە لەمەش لە شوێنێک لە فیلمەکەدا «ئێمێلی» خەریکە شتگەلێک بۆ پیاوێکی کوێر شیدەکاتەوە، کوت و مت ئەم بەسەرهاتە لە «مۆن پالاس»دا رووی داوە، شتێک لەو جۆرە.

* لام وایە ماوەیەکی زۆر لە رۆژدا لە شەقامەکانی نیویۆرک و بەتایبەت برۆکلین پیاسە دەکەی، وایە؟

–پیاســـە دەکەم، هەندێک جار هەڵبەت بەم شـــێوەیە ماندوێتی زەینیم دەردەکەم. عاشقی ئەوەم لە شـــەقامەکاندا چاو لە خەڵک بکەم و گوێ لە وتووێژەکانیان بگرم. مرۆڤ بە جۆرێک رادەکێشرێ بـــۆ ئـــەم کارە. ئەوەی کە بڕواتە دەرەوەو پیاســـە بکات. نازانی خەڵک دەربارەی چی قســـە دەکەن بەڵام ئەم کارە لە خۆیدا هەســـتێکی پڕ نهێنی هەیە. هەر دوێنێ، پیاوێکم دیت خەریکی خواردنی هەمبەرگرێکی گەورە بوو و زۆر جیدی لەگەڵ ژنێکدا قسەی دەکرد، منیش زەق زەق تەماشام دەکردن، دڵم نەدەهات دەستبەرداریان بم و بڕۆم، پیاوەکە قەپێکی تری لە هەمبەرگرەکەی گرت و هەموو شت تەواو بوو (پێ دەکەنێت).

* خوو و عادەتێکی تایبەتتان هەیە لە کاتی نووسیندا؟ ئەوەی کە ژوورەکەتان جۆرێکی تایبەت بێت؟ یان رووناکی کەم بێت یان زۆر بێت؟

-من لە ماڵەوە کار ناکەم. ئاپارتمانێکی بچووکم لەم نزیکانە هەیە کە هەموو ڕۆژێ دەچمە ئەوێ. جێگایەکــی زۆر بێدەنگە. کەس تەلەفۆنەکەمی نییەو بە ئارامــی بیر دەکەمەوە. لێرە نزیکە بەڵام بەهەرحاڵ شوێنێکی ترە.

* هەموو چیرۆکەکانت لە دەفتەردا دەنووسی؟

-بەڵێ. لە دەفتەردا دەینووسم و ئەو کتێبە بچووکەم «دەفتەری سوور» کە پێشتر باسم کرد لە ڕاستییدا لە دەفتەرێکی سووردا نووسراوە. چیرۆکەکانم بەدەست لە دەفتەردا دەنووسم، هەندێ جار بە قەڵەم و هەندێ جار بە قەڵەم جاف. نووســیدنم زۆر وردەو زۆر جار خەتیان پێدا دێنم و زۆریان دەگۆڕم. کە پەڕەگرافێک تەواو بوو بە ماشــینی تایپەکەم تایپی دەکەمو دواتر بە قەڵەم دەچمەوە سەر پەڕەگرافی دواتر.

* کاتی نووســین دەبێ بێدەنگیەکی تەواو زاڵ بێت یان گوێ لە مۆسیقاش دەگری یان کارێکی تر دەکەی؟

-بێدەنگ، بێدەنگ، هیچکات لە کاتی نووسیندا گوێ نادەمە مۆسیقا. ئەگەر لە دەرەوەی ماڵەوەش دەنگە دەنگ بێت دەڕۆم و پەنجەرەکە دادەخەم. تا ئەو شــوێنەی دەکرێ دەبێ شــوێنەکە بێدەنگ بێت.

* گوێ بە چ جۆرە مۆسیقایەک دەدەی؟

-مۆســیقای دڵخوازم زۆر و فرە چەشــنن. عاشقی مۆســیقام. بە تایبەت مۆسیقای کلاسیکم لە هەموو ژیانمدا خۆشویستوە، بەڵام مۆسیقای پاپ و جاز و فۆلکلۆری وڵاتە جیاوازەکانیشم پێخۆشە. مۆسیقا زمانێکی جیهانییە. وا نییە؟ هەمووان دەتوانن لە مۆسیقا بگەن، هەمووان دەتوانن بە زمانی مۆسیقا پێکەوە قسە بکەن.

* ســاڵی پار خەڵاتی «پرێنس ئۆســتریاس»ت بردەوە، خەڵاتە ئەدەبییــەکان چەند بەلاتەوە گرنگن؟ ئاواتتە خەڵاتی نۆبڵ ببەیتەوە؟

-نا، هیچ وا نییە. قەت بیری لێ ناکەمەوە. بۆم گرنگ نییە، بەڵام کە ئینسان خەڵاتێک دەباتەوە بە دڵنیاییەوە خۆشــحاڵ دەبێت و هەســت بە غــروور دەکات. بە شــێوەیەکیش دەبێتە هۆی ناو دەرکردنی، بەڵام لەڕاســتیدا هیچ شــتێک ناگۆڕێ. نابێ بەهۆی ئەوەی بتوانی ســادەتر بنووسیت. بەڵام ڕاســتگۆیانە و بێ درۆ بیڵێم، ئەوەیە کە خەڵاتەکەم بردەوە شڵەژامو و سوپاسم کردن و من و خێزانەکەم ڕۆشتین بۆ ئەوێ (ئیسپانیا) و زۆر خۆشمان بەسەربرد.

* نازانــم تــا چەند زانیاریت ســەبارەت بە ئێــران هەیە. ئەگەر بانگهێشــت بکرێیت دێیت بۆ ئەوێ؟

-زانیــاری زۆرم ســەبارەت بە ئێران نییە. لە ڕێــگای ڕۆژنامەکانەوە ئــاگاداری ئێران و دڵنیام

راگەیاندنەکانــی ئەمریکا بــە تەواوی باس لە ئێران ناکەن و هەواڵەکانــی بڵاو ناکەنەوە، بەڵام جار ناجارێ وتاری باش بڵاودەبێتەوەو لە ســووچێک لــە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئەوێ دەگەم، هەڵبەت فیلمــە ئێرانییەکانیش زۆریان کاریگەریی هەبووە لە ســەرم. بەڵام بەڕاســتی بە تەواوی ئاگاداری ئێران نیم. دەربارەی سەفەر، ئەگەری ئەوە هەیە ئەگەر بانگهێشت بکرێم بێم. بەڵام تا ئێستا کەس بانگهێشت و دەعوەتی نەکردووم. منیش لەو مرۆڤانە نیم کە دەسەڵاتەکان خۆشیان بوێم، کە وابوو چاوەڕوانی ئەوە نیم بەم زوانە لەو نزیکانەوە دەرکەوم.

* سوپاست دەکەم بەوەی ئامادە بووی بۆ ئەم وتووێژە و وەڵامی پرسیارەکانت دامەوە .

–منیش سوپاسی ئێوە دەکەم بۆ هۆگریتان بە کارەکانی من.

## سەرچاوە:

http://sibegazzade.com/main/?p=145

# گفتوگۆ لەگەڵ "چارلز تایلەر"

**لە ئینگلیزییەوە: کارزان کاوسێن**

چارلز تایلەر یەکێکە لەو فەیلەسوفە پێشەنگانەی کە لە ژیاندایە.

ئەمەی خوارەوە گفتوگۆیەکە کە کریس بلور(*)، لەبارەی فەلسەفە و کۆمەڵگاوە لەگەڵیدا سازیداوە. گەشتی رووناکبیریی چارلز تایلەر، ئەوی لە زانکۆی مکگیل لە مۆنتریال-ەوە گەیاندە کۆلێجی باڵیلۆل لە ئۆکسفۆرد، پاشان گەڕاندیەوە بۆ مکگیل. لەوێ، وانەی فەلسەفە و سیاسەتی وتەوە لەکاتێکدا کە زنجیرەیەک وتاری کاریگەری دەنوسی لەبارەی چەمکەکانی ئازادی و سروشتی روونکردنەوە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، چەند بەرهەمێک لەسەر هیگڵ، هەروەها سەرچاوەکانی خود: دروستکردنی شوناسی مۆدێرن. تازەترین کتێبی بریتییە لە سەردەمێکی عەلمانی کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا چاپکراوە. لە ساڵی ٢٠٠٧دا تایلەر خەڵاتی تێمپلێتن Templetonی پێبەخشرا لە بەرانبەر کارەکانی لەماوەی ژیانیدا. ئەم خەڵاتە بڕەکەی ١,٥ ملیۆن دۆلارە. ئەمساڵیش خەڵاتی کیۆتۆ Kyotoی وەرگرت کە بریتییە لە ٥٠ ملیۆن یەن (٥٠٠,٠٠٠) دۆلار.

* پرۆفیسۆر تایلەر، ئێوە سەرسام بوون بە بردنەوەی خەڵاتی کیۆتۆ؟

-لەڕاستیدا بەڵێ. چونکە ئەمە رێزلێنانێکی دەگمەنە. بەهیچ شێوەیەک چاوەڕوانی نەبووم. ئێستا زیاتر لێی تێدەگەم کە چوومەتە ئەوێ و قسەم لەگەڵ دادوەرەکان کردووە. ئەوان سۆراخی کەسێک ناکەن کە لە رووی رووناکبیرییەوە شتێکی گرنگی کردووە، بەڵکو زیاتر گرنگی بە تێڕوانینەکەت دەدەن- ئاخۆ

هەوڵەکەت بۆ یارمەتیدانی مرۆڤایەتی و هیتره. رووکردنە جیهانی سیاسـیی بیرۆکەی یارمەتیدانی مرۆڤایەتیش لە هەوڵەکانی مندا زۆر گرنگ بوو.

* بەرلەوە خەڵاتی تێمپلێتن بردبۆوە؟

–ڕاسـتە. ئەمە تەنانەت بـە مانایەک زۆرتر سەرسـوڕهێنەر بوو، چونکە لە سـاڵانی رابردوودا خەڵاتەکەیان دەدا بەو زانا سروشتییانەی کە گرنگییان بە پرسە رۆحییەکان دەدا، بەڵام بۆ کەسانی وەک مـن... بەهیچ شـێوەیەک! پێم وایە من کەوتوومەتە شـوێنێک لەنێوان زانـای کۆمەڵایەتی و پسپۆڕی مرۆیی.

* نیازت وایە پارەکە لە چیدا خەرج بکەیت؟

–بەشـێکی زۆری ئـەوە کە من لە فەلسـەفەدا پێیـەوە خەریکم، لە کارەکەمدا بە گشـتی، لە نێتوێرکـەکان (networks)دا دەردەکەوێت. کەسـانێکی دیاریکراو کە من کاریـان لەگەڵدا دەکەم، پێویسـتە بەیەکەوە کۆببینەوە و ناتوانین هەروا چاوەڕوان بین تا ئەو کاتەی بۆ سـیمپۆزیەمێک لە لەندەن یا شـوێنی تر بانگهێشت دەکرێین. ئەمە یارمەتیدەرێکی گەورەیە کە بتوانیت هەڵسوڕێیت و خەڵکانـی تر بجوڵێنیت و لە گروپی بچوکدا کۆیان بکەیتەوە جا لە نیویۆرک بێت یان شـیکاگۆ یان ئەوروپا و تەنانەت دەلهی–یش کە یەکێک بووە لەو شـوێنانەی تیایدا کۆبووینەتەوە. شـتێکی جەوهەرییە بۆ هەموو کەسـێک لەم جۆرە کارەدا، مەگەر ئەمەی کە تۆ گۆشـەگیرێکی تەواو بیت و بەهیچ شـێوەیەک بیر لە دۆخێکی وەها نەکەیتەوە، کە مـن هەرگیز ناتوانم بیکەم. دەبێت من بەم شـێوەیە کار بکەم. من شـتگەلێک لەودیو سنوورە دیسـپلینکراوەکانەوە ئەنجام دەدەم، لەوانەشە گەلێک هەڵە بکەم کاتێک لەو سـنوورانە دەپەڕمەوە و دزە دەکەمە ناو قەڵەمڕەوی مێژووناسـەکان یان زانا سیاسـییەکان یان کۆمەڵناسـەکانەوە. تۆ هەڵەیەکی کەمتر دەکەیت ئەگەر تۆ لەگەڵ زانا کۆمەڵایەتی، مێژوونووسە داماوەکان و هیتردا کار بکەیت.

* تۆ بۆت دەرکەوت کە فەلسـەفەی شـیکاری لە کۆلێجی بالیۆل وشک و سەختە. ئامۆژگاریت هەیە بۆ ئەو خوێندکارانەی کە لەوانەیە فەلسـەفە بە شتێکی قورس یان پێچەوانەی چاوەڕوانییان، ببینن؟

–بەڕاسـتی، ئەمە دۆخی (DIY)یە، بەمانای خۆت بیکە (do it yourself)! ئەوەندەش ئەسـتەم نییە. مەبەسـتم نییە بڵێم بەتەنیا خۆت بیکە. پێم وایە لە سـۆنگەی ئۆتۆبایۆگرافییەوە باشـتر دەتوانم باسـی بکەم. کاتێک من لە ئۆکسـفۆرد هەسـتم بەمە کرد، هەندێ لە دەرچووانم ناسی کە هەمان بیرکردنەوەیان هەبوو و ئێمە زۆر بەخێرایی هەندێ نوسـەری سەرنجڕاکێشـمان دۆزیەوە، بۆ نمونە مێرلۆ–پۆنتی، بۆیە بەیەکەوە خوێندنمانەوە. ئەمە شتێکە کە تۆ هەندێ جار دەبێت ئەنجامی بدەیـت ئەگەر لەو کارەدا نەهاتبێت کە تۆ ئەنجامی دەدەیت. لەسـەر ئینتەرنێتیش ئاسـانترە کە لەسـەر شتی سەرنجراکێش هەڵوەستە بکەیت و مشتومڕی لەسەر بکەیت بە بەراورد لەگەڵ حاڵەتی ساڵانی پەنجای ئێمە.

* دیـــوی بەهەندوەرنەگیـــراوی ئەمە، ئەوەیە کە هەندێ لە خوێنـــدکاران، بەتایبەت ئەوانەی لە کۆرســـی فرەلایەندان، فەلسەفە بە شتێکی سەرنجڕاکێش بەڵام سەخت دەبینن. ئەوان دەپرژێنەسەر تێکستگەلێکی وەکو بوون و کات-ی هایدگەر یان شتێکی فۆکۆ، بەڵام ناتوانن لێیان تێبگەن، پێیان وایە شتێکی بزریان تێدایە. ئامۆژگاریت چییە بۆ ئەو خوێندکارانە؟

-بەڵێ، ئەمەش شـــتێکی زۆر ســـەختە، چونکە تۆ ڕاســـت دەکەیت، هەندێک جـــار هەروەکو لە کارەکانی فۆکۆدا دیارە، لەوانەیە کاتێکی زۆری بوێت، بەتایبەت ئەو کاتەی تەنها تۆ و تێکستەکەیت و تۆ بۆ دەیەمین جار دەیخوێنیتەوە، پرسیار دەکەیت «ئەوە چییە؟» بەڵام هەندێ نووسینی باش هەن لەسەر ئەم کارانە. هیوبەرت درایفوس وتارێکی لەسەر بەشی یەکەم-ی بوون و کات نوسیووە کە من پێم وایە بەڕاستی کەلێنی نێوان هایدگەر و هەر کەسێک لە جیهانی ئینگلیزی-زاندا کە هەندێ زانیاری لەســـەر فەلســـەفە هەبێت، پڕدەکاتەوە. بەڵام بەدڵنیاییەوە ڕاستە کە دەبێت بۆ هایدگەر و فۆکۆ مێشـــکت نۆژەن بکەیتەوە (پێدەکەنێت). ڕاســـتەوخۆ هیچیان لێوەرناگریت، چونکە ئەوان بەو پێوەرانە نانووسن کە ڕاستەوخۆ پەیوەستن بەوانەی تۆ لەسەریان ڕاهاتوویت.

* پێت وایە کێشـــەیەک هەیـــە لە هەوڵدان بۆ گونجاندنی بیرمەندانـــی وەها تایبەت و ئاڵۆز لە مەنهەجێکی پەیوەندیداری زانکۆدا؟

-لە هەر چرکەســـاتێکی دیاریکراودا، لە هەر بارودۆخێکی دیاریکراودا کە تیایدا خەڵکی لەســـەر شـــتگەلێک مشتومڕ دەکەن، گریمانەگەلێک هەن ئەوەندە قووڵن کە ئەوان تەنانەت وەکو گریمانەش نایبینـــن، چونکـــە زۆر روون دیارن- وەکو ئەوە دیارن کـــە «دوو کۆ دوو دەکاتە چوار». نموونەی هەرە گەورە کە من بە درێژایی ژیانم لەگەڵیدا لە شـــەڕدابووم، نەریتی ئەپســـتمۆلۆژیی دیکارت-ە. دیـــکارت لە یەکێک لە نامەکانیـــدا دەڵێت، ئێمە هەموو بیرۆکەکانمان لـــەو کاریگەرییەی جیهانی دەرەوە کە دەبێتەهۆی دروســـتبوونی نیشانەگەلێک لە هۆشماندا، بەدەستدەهێنین. کاتێک ئەمەی دەوت، مەبەستی بوو بڵێت «دوو کۆ دوو دەکاتە چوار» -کە شتێکی ئاشکرایە- لەڕاستیدا لە زۆر ڕووەوە تەواو هەڵەیە ( پێدەکەنێت). بەڵام خەڵکی ئەمە نابینن: ئەوان وەها دەچنەناو ئەو شـــێوازە «روون»ەی بیرکردنەوە کە هەرگیز ئەگەری هەڵەبوونیان بۆ دەرناکەوێت.

* کاتێک تۆ لەبەردەم کەســـانێکدایت کە لەودیو روونییەوە بیر دەکەنەوە، یەکەم جار ســـەرت لـــێ تێکدەچێـــت کە چی دەڵێن- پێدەچێت قســـەی بێ مانـــا بکەن: دوو کـــۆ دوو دەکاتە پێنج! «نۆژەنکردنەوەی ئەقڵت» واتە ئەمەی کە تۆ بتوانیت زەمینە تەواو ئاشـــکراکان بهێنیتە بەرچاو و ئەوە ببینیت کە مەرج نییە وەها بن؛ یان لەوانەیە لە کۆتاییدا بە شـــێوەیەک لە شێوەکان وەها بن، بەڵام دەبێت تۆ لەبەر ڕۆشـــنایی ئەگەرەکانی تـــردا بەڵگەی بۆ بهێنیتەوە. ئەمە گۆڕانێکی گەورەیە و بەرلەوەی کە ســـەرەنجام تێبگەیت، دەشـــێت بەهۆی تێکســـتێکەوە کە تیایدا کەسێک تەحەدای گریمانە بنچینەییەکانت دەکات بەتەواوی ســـەرت لێ تێکبچێت. وەک بڵێی کەسێک لاری دەکات لە ڕاستییە روونەکانی پەیوەست بە جیهان یان ئەقڵ.

* تۆ زۆرجار لە کارەکانتدا هەوڵتداوە جۆرە شکســـتێکی تێگەیشـــتنی خۆیی کەلتوورەکەمان

ڕاست بکەیتەوە. بۆ نموونە تۆ سەرچاوەکانی خود-ت بە «وتارێک لەبارەی گەڕاندنەوە» ناو بردووە. بە مانایەک لە ماناکان ئێمە سەرمان لە شتێک دەرناچێت کە دەبێت لەم خاڵەی مێژوومانداگەیشتبێت، بۆیە کارەکانی تۆ هەوڵێکن بۆ ڕوونکردنەوەی کەلتووری خۆرئاوا لە سەدەی بیست و یەکەمدا بۆ خودی خۆی.

-پێم وایە ئەمە ڕاستە. من هەوڵدەدەم ئەمە لە ڕێگەی گەڕان و سۆراخکردنەوە لە مێژوودا ئەنجام بدەم. ئەگەر تۆ لەناو وەرچەرخانێکدا ژیایت ئەوا لە شتێکی وەکو ئەمەی کە چۆن گەیشتوویتە ئەو شوێنەی کە ئێستا لێیت، تێدەگەیت. بەڵام لەوانەیە نەوەکانی دواتر بینایییان بۆ مێژوو لەدەست بدەن و ڕووبکەنە ئەو دیمەنە ئەقڵییەی وەکو بوویێکی تەواو سروشتی، تیایدان. بۆیە ئەوان درک بە شتێک لەبارەی سروشتی ئەو دیمەنەوە، لەبارەی سروشتی پێوەرەکانی شوناسیانەوە، ناکەن. ئەوان ئەمانە نەک وەکو پێوەرگەلێکی مومکینی پەسەندکراو، بەڵکو وەکو پێوەرگەلێکی ڕوون کە ناتوانیت خۆتیان لێ لابدەیت، وێنا دەکەن. بۆیە ئەوان شوناسی خۆیان دەژین، بەڵام بە شێوەیەک کە تایبەتمەندی و ڕەهەندە زۆر گرنگەکانی دەشارێتەوە. کەواتە ئەمە بابەتێکە پەیوەندی بە گەڕاندنەوە هەیە- گەڕاندنەوەی ئەو ڕەوگەیەی تۆی بۆ ئەم شوێنەی ئێستات هێنا. پێم وایە دەبێت ئەمە بەشێکی زۆر گرنگی کاری فەلسەفی بێت.

* چۆن دەشێت ئەمە بەدی بێت؟

-پێم وایە هەندێ چرکەسات هەن لە مێژووی زانکۆدا تیایاندا ئەم جۆرە گەڕاندنەوەیە بەشێوەیەکی بەرچاو زەمینەی بۆ خۆشکراوە. لە سەردەمی «ماکس وێبەر»ەوە- لەوانەیە ئێمە بەشێوەیەکی نۆستالجی ئەمە گەورە بکەین- و تەنانەت کەمێک دواتر، بۆت دەردەکەوێت کە خوێندکارانی فەلسەفە لە ئەڵمانیا کۆرسێکی تەواو بەرفراوانی فەلسەفەی یۆنانی و مێژووی فەلسەفە، کانت و ئایدیالیزمی ئەڵمانی-یان پێدراوە، بەڵام ئەوان بەهەمان شێوە وێبەر، دورکهایم، ترۆیلش و دێلتای دەخوێندنەوە. بۆیە ئەوان تێگەیشتنێکی فراوانیان هەیە لەوەی کە چۆن ئەو پرسیارانەی ئەو کاتە گفتوگۆیان لەسەر دەکرا گەیشتنە ئەو قۆناغە.

ئەمە یەکێک بوو لەو شتانەی بە خەیاڵمدا هات کاتێک کە پەرژامەسەر بینینی کۆتاییەکانی- چونکە پێم وایە لە مردندایە، تەنانەت لە ئەڵمانیاش. کاتێک سەردانی «هابرماس»م کرد ئەو جۆرە خوێندنەی بۆ خوێندکارەکانی شرۆڤە دەکرد هەرچەندە ئەوەندە لەگەڵ بەشێکی زۆری ئەو شتانە کۆک نەبوو کە بۆ ئەوانی باس دەکرد. هەر ئەمە بوو بێزاری کردم کاتێک چوومە ئۆکسفۆرد- ئەوان زۆر تەسکبین بوون، ئەو کەسانە: ئەوان تەنانەت یەک لەسەر دەی ئەو نەریتەیان نەدەخوێندەوە کە گەیاندبوونیە ئەو شوێنەی تیایدان.

* ویستم لەبارەی سەرچاوەکانی خودەوە پرسیارت لێبکەم. ئەمساڵ بیستەمینساڵیادی یەکەمین چاپییەتی؟

-ڕاستە، بووە بیستەمین! ئەوە زۆر خێرایە، دەڵێی دوێنێ بوو! ئەمە یەکەمین کتێب بوو کە من بەشێوەیەکی سیستماتیکی ئەوەم تیادا خستەڕوو کە ویستم بیڵێم. پێشتر، چەند کتێبێکم لەسەر هیگڵ و ژمارەیەکی زۆر وتارم لەسەر لایەنەکانی زانستی کۆمەڵایەتی نووسیبوو. زۆر ئارەزوومەندی

ئەوە بووم کە نەک تەنیا لە بەرانبەر هەندێ هەڵوێست لە زانستی کۆمەڵایەتی، دەروونناسی و هیتردا مشتومڕ بکەم، بەڵکو ئەمویست لەوە تێبگەم کە بۆچی خەڵکی بەرگرییان لەو هەڵوێستانە دەکرد کە من پێم هەڵەو نادروست بوون. بەڵام بۆئەوەی لەوە تێبگەیت بۆچی، پێویستە تۆ لە گەشەسەندنی چەمکی مۆدێرنی خود تێبگەیت. بۆیە ئەوە یەکەم هەوڵی من بوو بۆ کردنەوەی ئەو بوارە نەک تەنیا بۆ مشـــتومڕکردن لەدژی چەند هەڵەیەک، بگرە هەوڵم دا روونی بکەمەوە کە چۆن دەشیا ئەو دۆخە دەربکەوێت کە تیایدا ئەو هەڵانە بەلای خەڵکەوە بەجێ بن. من هێشتا هەست دەکەم ئەوە خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە کارەکانمدا، چونکە لەو کاتەوە توانیم ئەو بوارەی کێشەکان فراوان بکەم و کاری لەســـەر بکەم- چۆن گەیشتینە ئەو خاڵەی تیادا ئەو شتانەی مشتومڕیان لەبارەوە دەکەین «X» و «Y»ین وەکو دژێکی «Y» و «Z» یان «Z» و «Q»- بۆچی پێدەچێت ئەلتەرناتیڤە روونەکان ئەمانە بن نەک شـــتێکی تر. ئەوەش تەقەلایەکی راستەقینەی گەڕاندنەوەیە، هەوڵێک بۆ تێگەیشتن لەوەی کە چۆن گەیشتووینە ئێرە و هەوڵدان بۆ لێتێگەیشتنی بەشێوەیەکی جیاواز.

* ئێوە بانگەشەی زۆر بەهێز دەخەنەڕوو لەبارەی شوناسی مۆدێرن کە نەک تەنیا لە فەلسەفە، بەڵکـــو لە مێـــژووی ئایین، ئەدەب و هونەر و هیترەوە هاتوون. قورســـە بۆ کەســـێک کە ئەوەندە ماریفەتی نییە، وەکو پێویست بانگەشەکانت هەڵبسەنگێنێت؟

-بەڵێ. زۆر باشە (پێدەکەنێت)- کەواتە لەوانەیە خەڵکی بچن شتێک بخوێننەوە! ئەمە پەیوەست دەبێتـــەوە بەوەی کە لەبـــارەی وێنەی ئایدیاڵمەوە لەمەڕ زانکۆ ئەڵمانیەکە لە ســـەروبەندی ١٩٢٠دا دەموت: ئەمەی کە بەڕاســـتی پێویســـتە جۆرێک لە فراوانی هەبێت لە سیســـتەمی خوێندنماندا بۆ مێـــژووی زانســـتە مرۆییەکان، زانســـتە کۆمەڵایەتییەکان و هیتر. بۆیە من بەو جـــۆرە کاردانەوەیە دڵتەنـــگ نیم. ئەگەر خەڵک بەڕاســـتی دەیانەوێت بزانن ئاخۆ بیرۆکەیەک ڕاســـتە، دەبێت بڕۆن و شـــتێک بخوێننەوە و ئەمـــە توانایان پێدەدات تێڕوانینی خۆیانیان هەبێـــت لەمەڕ ئەوەی کە چۆن گەیشتووینەتە ئەو شوێنەی تیایداین.

* کتێبەکە وتەیەکی کورتی لەگەڵدایە کە پوختەی رەخنەکانی تۆیە لە بەرانبەر لایەنە کزەکانی کەلتوورمان: «هیچ شتێک وەکو دەسکەوتێک لەقەڵەممان نادات لە جیهانێکدا کە هیچ شتێک گرنگ نییە جگە لە رەزامەندبوون»؟

-باشە، «ئەوەی کە لەدواجاردا گرنگی بە شتەکان دەبەخشێت» ناتوانێت هەروا بکەوێتە رازیکردنی خـــود. ئەوە تۆ دەخاتە جۆرێک لە دواکەوتن: باشـــە! بەڵام ئـــەوە چییە کە خەریکە ڕازیم دەکات؟» پێویســـتە تۆ دواجار ئاماژە بە ئامانجێک بکەیت لە شـــتێکدا لە ســـەروو خۆتەوە، بۆ نموونە بەو شـــێوەیەی کە شتەکان هەن، یان بەو شێوەیەی کە گەردوون هەیە، یان بەو شێوەیەی کە مرۆڤەکان هەن یان بەو ئاراســـتەیەی مێژووی مرۆڤایەتی دەڕوات بەڕێوە . ئەو شـــتانەی کە خەڵکی بە قووڵی دەزانن، قەناعەتێکی قووڵ لە هەموویاندا ئەو تایبەتمەندییەی هەیە . کەســـێک دەڵێت « دەمەوێت لەگەڵ پزیشکانی بێسنوور لە کۆنگۆ کار بکەم» و کەسێکی تر دەڵێت « دەمەوێت رۆمانی کەنەدییە مەزنەکە بنووســـم». پێویســـتە روون بێت کە هەموو ئەم فۆرمانەی رەزامەندییە قووڵە ئاماژەیە بە شتێک کە دەگاتە سەروو تۆ. بۆیە ئەمە وتەیەکی کورتە، بەڵام راستییەکی گرنگی تێدایە .

* ئـــەم بەیانییـــە من بیرم لە کتێبـــە هەرە تازەکەت (ســـەردەمێکی عەلمانـــی) دەکردەوە کە پاسێک بە بەردەممدا تێپەڕی کە دروشـــمێکی بێباوەڕگەرایانە (atheist) یان راستتر، نازانمگەرایانە (agnosti)ی پێوە بوو «لەوانەیە خوا نەبێت: ئێستا چیتر مەشڵەژێ و چێژ لە ژیانت وەربگرە»؟

-ئەمـــەم بیســـتووە! زۆر مایەی پێکەنینە. زۆر ســـەیرە، وانییە؟ من دەمەوێـــت لەوە بگەم کە بۆچی لە ســـەردەمی ئێمەدا ئەوە روودەدات. ئەم دیاردە نوێیە مەتەڵئامێزە- ئەو بێباوەڕگەرایانەی دەیانەوێـــت «وتەی پیـــرۆز» بڵاوبکەنەوە و هەندێ جار زۆر توڕەن. پێم وایە ئەمە وەکو کاردانەوەی هەندێ ئوســـقوف وایە لە بەرانبەر داروین لە ســـەدەی نۆزدەدا. ئوســـقوفەکان پێیان وابوو جیهان بـــە ئاراســـتەیەکی دیاریکراودا گـــوزەر دەکات- وەرگۆڕانێکی زیاتر و زیاتر و هیتر- پاشـــان بۆیان دەردەکەوێت کە لەناکاو نیگەرانن لە پێشـــبینییەکەیان و تووشی راچڵەکینێکی گەورەو زۆر پەست دەبن. بە هەمان شـــێوە، ئێمە لە ئێستادا ئەمە لەناو ئەو ئینتێلجێنسیا روو لە بەعەلمانی بوونەدا دەبینین-ئەو لیبراڵانەی هەستیان کرد جیهان بە ئاراستەیەکی دیاریکراودا دەڕوات، هەمووی بەگوێرەی پلانێک دەچێت بەڕێوە- پاشان کاتێک پێدەچێت وانەبێت، تووشی راچڵەکین دێن. کەواتە تۆ زیاتر دیاردەیەکی شـــیاوی بەزەیی دەبینیت. شـــتگەلێک بە پاســـەکانەوە هەڵدەواسن وەک بڵێی ئەمە بە جۆرێـــک لە جـــۆرەکان وا لە خەڵکی دەکات روانینیان بەرانبەر خوا، گـــەردوون، واتای ژیان و هیتر بگۆڕن. دروشمی پاسێک! پێناچێت شتێکی ئەوەندە بنچینەیی لە کەسدا هەڵگۆزێت.

* پێدەچێـــت ئەمە نیشـــانەیەک بێت کە دەڵێیـــت خەڵکی مۆدێرن لەنێوان دوو هەڵوێســـتی بەجەمســـەربوودا گیریـــان خـــواردووە- وەکو خۆت دەڵێیـــت، بێباوەڕگەرایی بەهێـــز لەلایەکەوە و ئایینگەراییەکی بەهێز لەلایەکیترەوە. بەڵام ئەمە نزیکەی هەر کەسێک لە ڕاڕایی نێوان هەردووکیاندا بەجێ دەهێڵێت، نەک ئەمەی بکەوێتەســـەر جەمسەرێک یان ئەویتریان بەڵکو لە ناوەڕاستدا دێت و دەچێت؟

-ڕاستە. دەشێت بشـــبێتە هۆی شڵەژان یان ببێتەهۆی کۆلاجکارییەک bricolage- پێکەوەنانی هەڵوێســـتی خۆت. لە سەردەمێکی عەلمانیدا ناوی کەســـانێکی زۆر دێنم کە کارێکی وەها دەکەن. ڤیکتۆر هوگۆ فەرەنسییەکی زۆر باشی سەدەی نۆزدەهەمە. نموونەیەکە لەو کەسانەی کە هەڵوێستی میانگیرانە پێکدەهێنن و پێم وایە ئەمە دیاردەیەکی زۆر زۆر بەربڵاوی ئەمڕۆیە- بەو حاڵەتانەشەوە کـــە تیایاندا کۆلاجکارییەکی دو فاکتۆ هەیە، بەڵام پێناچێـــت خۆیان ئەوەیان پێکەوەنابێت. ئینجا حاڵەتگەلێک هەن کە تیایاندا خەڵکی بەشـــێوەیەکی خودئاگایانە پێکیدەهێنن. مەبەستی خەڵکی هەرئەوەیە کە زۆرجار دەڵێن، «من رۆحانیم، بەڵام دینی نیم. 'ئایینی نەبوون' واتە من سەر بە هیچ نەریتێک نیم کە فۆرمیولایەکی لەپێشـــدا دروستبووی هەبێت و پێویست بکات من بچمەپاڵی؛ بەڵام من «رۆحانیم» بەو مانایەیە کە من تەواوی بوارەکە دەپشکنم».

بە بڕوای من ئەم دیمەنەی ئەو ژمارە گەورەیەی هەڵوێســـتە جیاوازەکان- رۆحانی، دژە رۆحانی و ئـــەوەی کـــە لە یـــەک کات و کۆمەڵگەدا تۆی تیایت- لە مێژوودا پێشـــینەی نەبـــووە و ژمارەی هەڵوێســـتەکان چەندەها جار لە زیادبووندان. هەندێ هەڵوێســـت هەن کە ســـەد ساڵێک لەمەوبەر بەهیچ شـــێوەیەک بیریشـــیان لێنەدەکرایەوە. ئەو ڕێرەوەی دوو ئاراستەکە کە خەڵکی کاردانەوەیان

لەبەرانبەردا هەیە هەوڵی من بوو بۆئەوەی بڕوانمە بەشێکی دینامیکە بەرچاوەکە.

* تۆ لە بەرهەمەکەتدا دەڵێیت لیبراڵ دیموکراســـی شڵەژاوە لەکاتێکدا کە خۆی وەکو بێ لایەن دەخاتەڕوو. تۆ دەڵێیت، لە راســـتیدا «لیبراڵ دیموکراسی» خۆی بەهایەکە کە هەندێ جار دێتەناو ململانێوە لەگەڵ بەهاکانی تردا، وەکو ئەوەی کە پێویســـتە و دەبێت ئێمەش ئەوە بزانین کە ئەمە حەتمییە؟

-بەڵێ. باوەڕم وایە کە شـــتێک نییە بەناوی بێ لایەنیی تەواو، بەتایبەت لە سۆنگەی ئەمەوە کە ژیانی باش چییە. بۆ نموونە، بیرۆکەی بەشـــداریکردن، هاولاتیبوون، بەشداریکردن لە دیاریکردنی ئایندەی خۆت و کۆمەڵگاکەت-پێم وایە ئەمە «فەزیلەتێکی ئیختیاری» نییە وەکو ئەوەی کە بوو (پێدەکەنێت): ئەمە زۆر نزیکە لە تەندروستی و شادەماری کۆمەڵگەی دیموکراتی لیبراڵەوە.

* تۆ پێشـــنیار دەکەیت کە لەکاتی ڕامان لە بانگەشـــەکانی روانگـــە کەلتوورییە جیاجیاکان، شـــتێکی باشـــە کە «زمانێکی بەراوردی روون» بگریتەبەر- هەوڵبدەیت بۆ شـــێوەیەکی گوتار کە رۆشنایی دەخاتەســـەر جیاوازییەکانی نێوان ئەو کەلتوورانە نەک هەوڵدان بۆ تێکدانی بەینیان یان ئاشتکردنەوەیان؟

-پێم وایە ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ئێمە مەبەستمانە ئەگەر بمانەوێت ئەم جیاوازییانە بهێنینەناو فەزایەکەوە کە تیایدا بتوانرێت مشـــتومڕێکی ئەقڵانی و هێمن لەســـەر چۆنێتی پێکەوەژیان لەگەڵ نەیاریـــی نێـــوان گروپە جیاوازەکان بکرێـــت. تەنیا لە رێگەی گرتنەبەری ئـــەو زمانەوەیە کە ئێمە دەتوانین مشـــتومڕێکمان هەبێت کە دانابەزێتە ئاستی بێزرخکردنی ئەوی تر. ئەمە تەنیا لەناو پۆل یان لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژیدا گرنگ نییە، ئەمە لە مشـــتومڕی گشـــتیماندا بێ سنوور گرنگە. ئێمە لە کۆمەڵگا هەمەڕەنگەکانماندا پێویســـتییەکی زۆرمان بەوە هەیە. من زۆر دڵخۆشم بەرانبەر ئەوەی کە لە مشـــتومڕێکی گشـــتیدا لە هەرێمی کیوبێک روویدا لەسەر توندڕەویی ئایینی. خەڵکی دەســـتیانکرد بە وتنی شـــتی وەها کە زینۆفۆبیـــای پێوە دیارە، بەڵام پاشـــان ئەوانیتر، بەتایبەت موسڵمانان، هاتنەپێش و وتیان «ئەمە هەڵەیە». مشتومڕەکە شێوازی نا-کاریکاتۆری خستنەڕووی جیاوازییەکانی گرتەخۆ. پێم وایە ئەمە شتێکە کە دەبێت هەمیشە هەوڵبدەین بیکەین.

* لـــە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ برایان ماگی لە ســـاڵی ١٩٧٨دا، تۆ وتت وانەیەک لە مارکس-ەوە ئەوەیە کە « لەو چرکەســـاتەدا کە پیاوان توانایەکی گەورەیان خستەڕوو بۆ کۆنترۆڵکردنی ژیانیان و بۆئـــەوەی ببنە هەر شـــتێک کـــە دەیانەوێت، ئەم هێـــزە، هەروەکو وەها بوو، بەهـــۆی ناکۆکییە ناوەکییەکانی خۆیانەوە لەدەســـتیان دەرهێنرا.» بەهەمان شـــێوە، لە ئێتیکی رەســـەنایەتیدا، تۆ لەبارەی خەباتی نەپســـاوە' La Lotta Continua ' نوســـیووتە، دەستەواژەیەک کە لە لیوای سوری ئیتاڵییە وە وەرتگرتووە. ئایا پەیامی تۆ لێرەدا ئەوەیە کە ئاســـتێکی خەبات و هەڵکشان حەتمییە لە کۆمەڵگەی خۆرئاوادا؟

-هیوادارم لەگەڵ ئەم ئاستەی پشێویی لە ئابووریماندا رانەیەین! بەڵام بەڵێ، بە واتایەکی گشتی هیچ چارەســـەرێکی کۆتایی، یەکلاییەکەرەوە بوونی نییە. تەنگژەی قووڵ هەن و ئێمە لە ئاراستەی

جیاجیاوە کێش دەکرێین و دەمانەوێت بێ زیانترین ڕێگا بدۆزینەوە بۆ چاککردنەوەی شتەکان. پێم وایە ئەمە بۆ قەیرانی هەنوکەییش ڕاستە، لەلایەکەوە بازاڕ و ئاستێکی دیاری ئاژانسی ئازاد تیایاندا پێویستە و لەلایەکی ترەوە لابردنی ئەو دەرەنجامە کارەساتبارانە پێویستە کە دەشێت بازاڕەکان لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن ئەگەر بە کۆنترۆڵنەکراوی هێڵرانەوە. چارەسەرەکە قورس دەبێت.

هەمان شت بۆ ئەو دوو ئارەزووانە ڕاستە کە من بە «تەکنۆلۆژیست» و «ئێکسپرێسیڤیست» ناویان دەبەم. پێم وایە زۆربەمان هەردوو ئارەزوومان هەیە، بەڵام بە ئاشکرا خەڵکانێک هەن کە زیاتر لە یەکێک یان ئەویتریاندا خۆیان گرتووەتەوە و خۆیان لە بەرانبەر یەکتریدا مەڵاس داوە. ئێمە هەرگیز ناگەینە چارەسەرێکی کۆتایی و یەکلاییەکەرەوە. مەبەستم لە خەباتی بێ وچان هەر ئەوەیە. هەمیشە خەریکە کێشەی پێکەوەلکاندنی ڕوانگەکان بێتەئارا. هەمیشە خەڵکانێک دەبن کە زۆر بە توندی دەخزێنە ئاراستەیەکەوە و گوێ نادەنە پێویستییەکانی تر. ئێمە هەمیشە خەریکە پێویستمان بە پێکەوەنانی چارەسەرێک بێت کە بۆ ماوەیەک لەنێوان ئارەزووەکاندا خۆدەگرێ.

* هەروا ئەو هیوایەش خەیاڵپڵاوییە کە ئێمە دەتوانین بەرەو ئەو ئاستە باڵاترە کۆشش بکەین کە تیایدا ململانێ بنەڕەتییەکانی کەلتوور چارەسەرکراون؟

–بەڵێ. ئەوە خەیاڵپڵاوییە. ئەمە خەونێکی جوانە، بەڵام ئەمە شتێک نییە کە ئێمە بشێت هیوای بۆ بخوازین. ئەمە خەیاڵپڵاوییە بەو واتایەی کە مارکسیزم لە فۆرمە ڕەسەنەکەیدا گرتوویەتەخۆ. ئەمە بەو مانایەیە کە فەلسەفەی مارکسیزم بێ سنوور سەرنجڕاکێشە بۆ خوێندنەوە، چونکە ناساندنێکی گرنگ بۆ هاودژییە کەلتوورییە سەرەکییەکە گەڵاڵە دەکات– لە بەرانبەر ئەو هەڵەیەیدا کە پێی وایە دەتوانین چارەسەری بکەین. ئەمە تەنانەت ئەوەندەی نەبینینی هاودژییەکە خراپە – بۆ ئەوەی ئەو تێڕوانینە نیۆ–لیبراڵە لاوازە بگرێتەخۆ کە هیچ هاودژییەکی کەلتووریی گەورە لەئارادا نییە و هەموو شتەکان بە هێمنی بەڕێوەدەچن، ئەمەی کە هەموومان بەجیهانی دەبین. ئەمە خراپترین چرکەساتی نابینناییە. پێویستە ئەو نیۆ–لیبراڵانە پێشنیاریان بۆ بکرێت کە مارکس بخوێننەوە–و ئەگەر بەتەواوی بوون بە مارکسی، ئەو کاتە لەوانەیە پێویست بکات بە کەمێک لە واقیع ڕاستبکرێنەوە!

(*) کریس بلور خوێندکاری چارلز تایلەر بووە و ئێستا لە لەندەن تاووتوێی فەلسەفە دەکات.

## سەرچاوە:

Philosophy Now, a magazine of ideas issue 74
Jul/Aug 2009

# گفتوگۆ لەگەڵ "کریستیان دولاکامپانی"
# دەبێت لە دابونەریت زیاتر گرنگی بە ئەقڵ بدەین

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

**ئاماژە:**

پرۆفیسۆر (کریستیان دلاکامپانی) لە ساڵی (١٩٤٩) لە (دەکار) لەئەفریقا لەدایک بووە. ناوبراو دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی لە زانستگای باڵای پاریس، لە تاقیکردنەوەی دژواری ئەگرەگاسیۆنی فەلسەفە وەرگیرا. دکتۆراکەی خۆی لە زانکۆی سۆربۆنی پاریس وەرگرت. ئەو دوای ساڵانێک وانەوتنەوە لە بەشەکانی فەلسەفە و ئەدەبیاتی زانکۆ جۆراوجۆرەکانی پاریس، بۆ وتنەوەی فەلسەفە چووە ئەمریکا و لە کۆلیژی کۆنکتیکات لە نیوزلەندا سەرقاڵی وانەوتنەوە بوو. ئەو تائێستاش لە بەشەکانی ئەدەبیات و زمانە رۆمانتیکییەکانی زانکۆی جۆن هاپکینزی ئەمریکا لە بواری فەلسەفە و ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمی فەرەنسا، سەرقاڵی وانەوتنەوەیە. حەزو ئارەزووە تایبەتییەکانی ئەو، بریتییە لە فەلسەفەی سیاسی، فیلم و شرۆڤەی میدیاکان، هونەرە شێوەکارییەکان و مامەڵەی نێوان مێژوو و ئەدەبیات و سیاسەت. ئەو زیاتر لە (٢٠) بیست کتێبی نوسیوەو چەندین کتێبیشی ئامادە کردووە.

* جەنابی پرۆفیسۆر، تۆ لە کتێبە بەنرخەکەی (مێژووی فەلسەفە لە سەدەی بیستەمدا) ئەو کتێبەی کە تایبەتە بە ڕەوتە فکرییە گرنگەکان و بیرمەندانی ناوداری سەدەی بیستەم، هیچ جۆرە ئاماژەیەک بۆ بیرمەندان و

فەیلەسوفانی خۆرهەڵات ناکەیت. ئایا ئەم کارە هۆکارەکەی ئەمەیە کە لەبنەڕەتەوە تۆ فەلسەفەی خۆرهەڵات بەفەلسەفە نازانیت، هەروەک چۆن فەلسەفەی مەزهەبی بە فەلسەفە هەژمار ناکەیت، یاخود ئەوەیە کە بیرمەندان و فەلسەفەی خۆرهەڵات لە فۆرمەڵەکردنی پێکهاتەی ئەو دنیایەدا کە ئێمە تیایدا دەژین، بە کاریگەر نازانیت؟

–فەلسەفە بەپێی مانا گشتی و باوەکەی ئەم وشەیە، پرۆسەیەکی بیرکردنەوەی رەخنەگرانە بە سودوەرگرتن لە ئەقڵانییەتە کە بە یۆنانی پێی دەوترێ (لۆگۆس). هەروەکچۆن ئەو وشەیە لە نزیکەی سەدەی شەشەمی بەر لە زایین لە یۆنان هاتەدنیاوە، پاشان لە هەموو ئەوروپادا پەرەیسەند و تا کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، درێژەی بە پەرەپێدانی خۆی دا و هەروەها وەک زنجیرەیەکی سەرەکی لە خۆرئاوادا دەناسرا. لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە کتێبەکەی مندا ناوی فەلسەفەی خۆرهەڵات نەهێنراوە. هەرچەندە لەوانەیە لە هەندێ لە کلتورەکاندا، بیرکردنەوەی لۆژیکی و عەقڵانی بۆ شرۆڤەکردنی باسە فەلسەفییەکان هەبووبێت کە لەمبارەیەوە دەتوانین ئاماژە بۆ فەلسەفەی ئیسلامی یاخود هیندۆس بکەین، ئامانجی کتێبەکەی منیش شرۆڤەکردنی باسوخواسەکانی مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا بووە لە سەدەی بیستەمدا. نەریتە مەزهەبییەکان و فەیلەسوفە مەزهەبییەکان لە دەرەوەی بازنەی کارکردنی مندان یاخود بەلایەنی کەمەوە ئەم کتێبە بەم چەشنەیە.

* تۆ بەدروستی وتوتە کە مێژووی فەلسەفە لە خودی خۆیدا، جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو مێژووە سیاسییەدا نییە کە پێکهاتەکەی لە نەبەردیی و رەنجە مرۆییەکانەوە دروستبووە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەی کە نەک تەنها مێژووی سیاسی و مێژووی فەلسەفە بەڵکو مێژووی کلتورەکان، شارستانییەتەکان، مەزهەبەکان، هونەر و ئەدەبیات و تەنانەت زانستیش لێوانلێوە لە جەنگ. جەنگی تیۆرێکە دژ بە تیۆرێکی تر، سەلیقەیەکە دژ بە سەلیقەیەکی تر، پڕوپاگەندەیەکە دژ بە پڕوپاگەندەیەکی تر و خاوەن هێزێکە دژ بە خاوەن هێزێکی تر، ئایا ناتوانین جەنگ بە بەشێک لە هەقیقەت دابنێین کە لەهەناوی ژیان و بووندا هەیە، بەڵام بەپێی پێویست لەلایەن فەلسەفەوە بایەخی پێنەدراوە؟ جەنگەکان هەقیقەتێکن لە ژیاندا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەش کە گەڕان بەدوای هەقیقەتدا پرۆسەیەکی هەمیشەیی فەلسەفە و فەیلەسوفانە، رێژەی بایەخدانی فەیلەسوفەکان بەو مەسەلەیە تا چ ئەندازەیەک بووە؟

–لە مانای فەلسەفەی خۆرئاوادا، جەنگ و کێشمەکێش ئەو دۆخە گشتییە بوو کە فەیلەسوفەکان بەهێزێکی ئەهریمەنی ناوزەدیان دەکرد (بە مانایەکی تر شەیتانێک کە شەیتانی کۆمەڵایەتی یاخود مەعنەوییە، نەک ئەو شەیتانەی کە لە باسوخواسە ئاینییەکاندا دەخرێتەڕوو)، لەڕاستیدا زۆربەی فەیلەسوفە خۆرئاواییەکان لە لایبنتس و کانتەوە بگرە تا هایدگەر و سارتەر کۆمەڵێک ئاماژەیان لەبارەی بوونی ئەهریمەن و شەیتان لە ژیانی رۆژانەی خەڵکدا کردووە و کۆمەڵێک کاردانەوەیان نیشان داوەو هەندێکیان بەتایبەتی لەبارەی جەنگەوە نوسیویانە.

بەداخەوە نیشاندانی کاردانەوە لەهەمبەر جەنگدا، ناتوانێ ئەو جەنگە رابوەستێنێت یاخود لەناوی ببات. ئێستاش لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بۆ دەقێکی کانت بکەم کە ئاماژەی بۆ نەمرێتی ئاشتی کردووە (ساڵی ١٧٩٥). دەقەکەی کانت لەسەر بنەمای ئایدیای نوسەرێکی فەرەنسی بەناوی (ئیمانۆئیل

ئەبە دوو سنت پییەر) نوسراوە کە لە ساڵی (١٧١٣)دا ژیاوە و یەکەمین ئایدیای بۆ پێکهێنانی یەکێتی ئەوروپا لەپێناو راوەستاندنی جەنگ بە سودوەرگرتن لە یاساکانی ئەم قارەیە، خستۆتەڕوو. ئەو شتەی کە هەمووومان وەک یەک ئایدیای سەرنجڕاکێش و سەرتاپاگیر چاوەڕوانی بووین.

* تۆ لە کتێبەکەی خۆتدا هەوڵتداوە ئەو راڤە تایبەتە بپارێزیت کە ئەوروپییەکان بۆ چالاکییە فەلسەفییەکان هەیانە. لەمڕووەوە باست لە ڕەوتی فیمینیزم نەکردووە، دەمەوێ راڤە تایبەتییەکەی ئەوروپییەکان بۆ چالاکییە فەلسەفییەکان ڕوون بکەیتەوە؟

–فیمینیزم لەڕاستیدا مەسەلەیەکی گرنگە، هەروەک چۆن ناسیۆنالیزم و کۆیلایەتی لە سەردەمی خۆیاندا کۆمەڵە مەسەلەیەکی گرنگ بوون. هەڵبەتە من لەبارەی ئەم بابەتانەشەوە کتێبگەلێکم هەیە. ئەم مەسەلەیە ڕەهەندێکی فەلسەفیانەشی هەیە. تەنانەت لەم کتێبەی دواییمدا، هەر بەو شێوەیەی کە لە ڕابردووشدا هەوڵم بۆ داوە قەوارەیەکی بەرفراوان لە نوسەران و وتارەکانیان بگرێتەخۆ، هەوڵمداوە کە بنەما بنچینەییەکانی فەلسەفە وەک: عەقڵ، زانست، فەزا و کات، توانستەکانی زمانی راستی و درۆ، ئازادیی، ڕێککەوتنامە کۆمەڵایەتییەکان...چڕ بکەمەوە. لەبەر ئەم هۆیە هەندێ لەو بابەتانەی زیاتر کۆمەڵایەتین وەک فیمینیزم یاخود هەندێکی تر وەک کێشەی هونەر لە کۆمەڵگا هونەرییە هاوچەرخەکاندا، لەم کتێبەدا جێگەیان نەدەبۆوە. تەنانەت لە چەند بەرگێکدا کتێبێکی (٤٠٠) لاپەڕەییم نوسی، بەڵام ئاماژەم بۆ ئەم بابەتانە نەکردووە.

* بیست سەدەی فەلسەفەی خۆرئاوایی لەسەر بنەمای دوالیزم (Dualism) بنیاتنراوە، من نامەوێ باس لە سەلماندنی ئەم خاڵە بکەم کە ئەگەر ئەم بینایە مادده بەراییەکەی لە واقیعیەتی جیهانیبووندا وەرنەگرتبێ، نەیدەتوانی بۆ ماوەی (٢٠) سەدە بەردەوام بێت و ڕەنگە لە ئایندەشدا درێژە بەمانەوەی خۆی بدات. بەڵام دەمەوێ بڵێم ئەم بینا مەزن و کۆنە بە بانگەشەی یەک یاخود چەند فەیلەسوفێک (رۆرتی و ...) کە دەڵێن: «مەسەلەکانی فەلسەفەی کلاسیک چیتر مەسەلەی ئێمە نین» بەم ئاسانی و سادەییە هەرەس ناهێنێت و لە بوونییەتی ژیانی مرۆڤدا ناچێتە دەرەوە. لە ڕیزی ئەم دوالیزمانەدا، ژنایەتی و پیاوەتییە. هەڵبەتە منیش وەک تۆ فیمینیزم بە ڕەوتێکی فەلسەفی هەژمار ناکەم و وەک تۆ لەو بڕوایەدام نابێ ئەم ڕەوتە لە کتێبێکی وەک مێژووی فەلسەفە لە سەدەی بیستەمدا، باسی لێوەبکرێت. بەڵام دەمەوێ بزانم ڕەوتە فەلسەفییەکان لە سەدەی بیستەمدا تا چ ئەندازەیەک لەژێر کاریگەریی ناوەڕۆکی جیهانی ژنایەتیدا بووە؟ لە بنچینەدا تۆ کێشەکانی ژنان تا چ ئەندازەیەک بە مەسەلەیەکی فەلسەفی هەژمار دەکەیت هەروەک مەسەلەکانی وەک: ئازادی، مافی مرۆڤ، هێزی سیاسیو...؟

–من پێموایە کە ناتوانم لەگەڵ تۆدا هاوڕابم، لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیە واتا بڕوابوون بە بوونی دوو چەمکی بنچینەیی و بنەڕەتی کە لە ڕووی عەقڵ و ماددەوە جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا نییە، هەرچەندە لە فەلسەفەی خۆرئاوایی زۆر بۆتە جێگەی بایەخ، بەڵام کارەکە هەر لێرەدا کۆتایی نایەت. مەزهەبی زانستی تیۆلۆجیا یاخود ڕەسەنایەتی دەروونی واتا باوەڕبوون بە بوونی تەنها تاکە ماناو تاکە رۆحێک کە لەڕاستیدا دەتوانێ بە تیۆلۆژیا ناوببرێت و لە بەرامبەریشدا ماتریالیزم واتا باوەڕبوون بە بوونی تاکە شتێک یاخود ماددەیەکی وەک ماتریالیزم، هەمیشە گرنگ و جێبایەخ بووە.

لە فەزای فکری خۆرئاوادا، ماتریالیزم بەشێوەیەکی ڕیشەیی گرێدراوە بە لێکدانەوەی مەعنەویی و زانستی بۆ پێگەی مرۆڤ لەنێو بوونەوەرەکانی تردا. لەڕاستیدا ئەگەر بمانەوێ لایەنی ویژدان لەبەرچاو بگرین، ئێمە دەتوانین بڵێین مرۆڤبوون بە مانا راستەقینەکەی زاڵکردنی پیاو لەهەمبەر ژن یاخود ژن لەهەمبەر پیاودا نییە.

* تۆ لە کتێبی (مێژووی فەلسەفە لە سەدەی بیستەمدا) وتوتە کە باسی عەقڵگەرایی و ڕێژەگەرایی باسێکی سەرەکییە بۆ فەلسەفە و باسەکەش لەسەر ئەمەیە کە ئایا دەتوانرێ بونیادێکی پتەو بۆ عەقڵ دەستەبەر بکرێت. دەمەوێ بڵێم بەرلە دەستەبەرکردنی بونیادێکی پتەو بۆ عەقڵ، رەنگە ناچار بین کە جارێکی تر لای خۆمانەوە سەرلەنوێ مانا و چەمکی زاراوەی بونیاد پێناس بکەینەوە. تۆ چ پێناسێک بۆ زاراوەی بونیاد دەخەیتەڕوو؟

–ئەمە راستە کە کێشەی چەمکە بونیادییەکان بەلای بەشێکی سەرەکی لە فەلسەفەی خۆرئاوا لە ماوەی سەدە یەک لەدوای یەکەکاندا، مەسەلەیەکی گرنگ و ژیاریانە بووە، بەڵام فەیلەسوفی پراگماتیزمی نوێی ئەمریکی (ریچارد رۆرتی) کە ئێستا لە زانکۆی ستانفۆرد وانە دەڵێتەوە و هاوبیروڕاکانی ئەویش، لەو بڕوایەدان کە نابێ ئەمڕۆ فەلسەفە بە زانستێکی بونیادیانە ناوبنێین، بەڵکو دەتوانێ یاریدەی ژیانی ئەمڕۆ بدات یاخود سەنجڕاکێش بێت. بۆ نمونە ناسیۆنالیستەکان، سیاسەت و سیاسەتمەداران ناتوانن بەئاسانی چەمکە بونیادییەکان قبوڵ بکەن، ئێستا ئەمە ئەرکی ئێمە نییە کە لەبارەی ئەو چەشنە مەسەلانەوە هەروەک سیاسەت و ناسیۆنالیزم بیربکەینەوە تەنانەت ئەگەر پێگەو بیرکردنەوەو وتەکانمان بە هەمانشێوەی بیرکردنەوەو لێکدانەوەکانمان لەبارەی ماتماتیک و فیزیاشەوە نەبێت.

* پرسیاری دواتریشم هەر دەربارەی ماناو چەمکی زاراوەی بونیادە، ئایا قسەکردن لە بونیادێکی پتەو بۆ ئەقڵ، یەک پارادۆکس نییە؟ مەبەستم لەمەیە کە عەقڵ چەمکێکی وابەستەیە بە چەرخی دانایی و چەرخی مۆدێرن، لەکاتێکدا کە چەمکە بونیادییەکان پەیوەستن بە چەرخی کلاسیکەوە. کاتێک قسە لە چەمکێکی بونیادیانە دەکەین، واتا چەمکێک کە هەمیشەیی و ئەزەلی بێت، واتا بۆ هەموو سەردەم و هەموو شوێنێک، لێرەدا ڕەنگە ناچار بین دووبارە چەمکی کات و شوێن پێناس بکەینەوە. ئایا کاتەکان و شوێنەکان خاوەنی یەکسانی و هەماهەنگییەکی هەمیشەیی و ئەزەلین کە تا بمانەوێ بۆ ئەم زاراوانە، بەدوای چەمکێکی بونیادیدا بگەڕێین؟

–لەبارەی فەلسەفەی خۆرئاواوە، تەنها بنەما تیۆرییەکان لەگەڵ چەمکە زانستییەکاندا هاوتان. ئەگەر تۆ بەدوای ئەو بونیادانەدا دەگەڕێیت کە زانستی نەبن، نابێ سۆراغی فەلسەفە بکەیت، بەڵام لەبارەی باسە کلتورییەکانەوە دەبێ سەرنج لەوە بدرێت کە کلتور هەمیشە پەیوەندی لەگەڵ نەرێتدا هەیە، لەبەرئەوەی لەبەردەم گۆڕان و وەرچەرخانی (کات)دایە، هەموو شتێکی تر گۆڕانی بەسەردا دێت بەدەر لەو کۆمەڵە زانستەی کە توانراوە لە دامەزراوە زانستییەکاندا پۆلێنبەندی بکرێن.

* من دەمەوێ ئاماژە بۆ چەند خاڵێکی تر بکەم کە لەبارەی چەمکە بونیادییەکانەوەیە، چونکە بونیادەکان گرنگییەکی فراوانیان لە باسوخواسە فەلسەفییەکاندا هەیە. دۆزینەوەی ڕێگای هەقیقەت،

بنەمای باسوخواس و گەڕانە فەلسەفییەکان پێکدەهێنێت. مەعریفەکانیش ئەگەر خاوەنی رەهەند و ئەندازەیەک نەبن، بەلای مرۆڤەکانەوە شیاوی پەیبردن و تێگەیشتنیش نابن. ئەو مەعریفەیەی کە سەرێکی لە (ئەزەلییەت) بێت و سەرەکەی تری لای (ئەبەدییەت)، شیاوی پەیبردن و تێگەیشتن نییە. بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لەو مەعریفەیە تێبگەین، بە ناچاریی دەبێ لە رەهەند و چەمکە سنوردارەکاندا بگونجێندرێت. چەمکە بونیادییەکان شتێک نین جگە لە جوڵانێکی هەمیشەیی بەرەو چەمکە ئاسانەکان، ئەو چەمکانەی هەمیشە داواکراو و ئاسانن وەک: ئاشتی، دادپەروەریی، جوانی و...

–جارێکیتر دەبێ بڵێم کە لەم مەیدانەشدا لەگەڵ تۆ هاوڕا نیم، راستە زانستێکی (ئەبەدی) شیاوی تێگەیشتن نییە، هەروەکچۆن کە زانستە ئەبستراکتەکان بەو چەشنەن. بەداخەوە (لێرەدا پێموایە ئێمە هەردووکمان هاوڕاین) تەنها ماتماتیک و فیزیا و کیمیا و هەندێ لە زانستەکانی تر شیاوی تێگەیشتنن.

* کێشەکانی مرۆڤی ئەمڕۆ لەوە زیاترن کە مرۆڤەکان بیانەوێ خۆیان لە فەلسەفە دووربخەنەوە، هەروەک کێشە بونیادییەکانی وەک ژینگە، مەترسی جەنگی ناوەکی، سیستەمی نوێی جیهانی و... ئەنتۆنی گیدنز لە کتێبی (سۆسیۆلۆجیا)دا خاڵێکی سەرنجڕاکێشی خستۆتەڕوو. ئەو دەڵێت: ئێمە یەکەمین وەچەی مرۆڤین لە مێژوودا کە لەگەڵ هەڕەشەی لەناوچووندا دەژین. پیشەسازیبوونی جەنگ بۆتە مایەی ئەم هەلومەرجە. لەکاتی روودانی جەنگێکی ناوەکیدا، لەوانەیە وەچەی مرۆڤ و هەموو گیانلەبەران و بوونەوەرانی جیهان بۆ هەمیشە لەناوبچن. ئێمە بۆئەوەی وابەستە نەبین بەم چەمکە ئەبەدییەی کاتەوە واتا نەبوون و لەناوچوونی هەمیشەیی، دەبێ رێگاچارەسەرێک بدۆزینەوە، چونکە لەکاتی وابەستەبوون بەم چەمکە بونیادییەوە، ئیدی هیچ کاتێ پەی بە مەترسییەکەی نابەین؟

–ئامانجی فەلسەفە یارمەتیدانی خەڵکە بۆ بیرکردنەوە لەبارەی کێشەکانییەوە، چونکە مرۆڤی زیندوو لە ژینگەیەکی پڕ لە کێشەی ئاڵۆز و هەندێکجاریش لە کاتگەلێکی بێ مانادا دەژی و بەشێوەیەکی سروشتی و کۆمەڵایەتیانەش دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بکات. لەمبارەیەوە من بڕوام وایە کە فەلسەفە لە هەر شوێنێکی دنیادا، دەبێ زیاتر لە پێشووی خۆی، بە سیستەماتیکتر بخرێتە ژێر شرۆڤەوەو تەنانەت لە قۆناغی سەرەتایی یاخود ناوەندیدا دەست بە وتنەوەشی بە لاوان بکرێت. تەنانەت لە فەرەنسا ئێمە وانەیەکی فەلسەفی سەخت و بەهێزمان هەیەو بەئاسانی ناگەینە ئەم ئامانجە، لەبەرئەوەی تەنها هەندێ لە خوێندکاران، توانا و چانسیان بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفە هەیە و ئەمەش لە سالانی کۆتایی خوێندنەکەیاندا وانەکەیان پێدەخوێندرێت.

## سەرچاوە:

سایتی (روشنگری)، مرداد ١٣٨٦

# کاتێك دەنوسم، مرۆڤێکی شادمانم

## هەڵگری خەلاّتی نۆبڵی ئەدەبی، ئۆرهان پامۆك لە دیدارێکدا لەگەڵ ڕوبینا مۆرین.

لە ئەڵمانییەوە: پێشەوا فەتاح

شاعیرو هەڵگری نۆبڵی ئەدەبی، ئۆرهان پامۆک لە سالتسبورگ لە وڵاتی ئەڵمانیا، لە خانوەکەی ئەوسای ماکس ڕاینهارتسدا میوان بووە. قەڵای لیۆپۆڵدسکرۆن ئەمڕۆ دانیشگای سێمیناری جیهانیساڵتسبورگ (Salzburg Global Seminars) ە لەهەمان کاتیشدا „مۆزەخانەی دەربەدەرێکە". لەوێ ڕوبینا مۆرین چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئۆرهان پامۆکدا سازکرد. سەبارەت بە کتێبێکی نوێی، لەسەر پەیوەندی تورکیا لەگەڵ ئەوروپا و ئازادی ڕۆژنامەگەری گفتوگۆیان کرد.

### دەقی چاوپێکەوتنەکە:

* «مۆزەخانەی پاکژی» ناونیشانی کتێبە نوێیەکەتانە، چ جۆرە پاکژییەک؟

– «چیرۆکێکی خۆشەویستییە، چیرۆکی خۆشەویستی پیاوێکی دەوڵەمەندی سەر بە توێژی نەجیبزادەی شاری ئیستانبوڵ بۆ ئافرەتێکی خزمی خۆی. سەرتاسەری ڕووداوەکان لە ساڵەکانی ١٩٧٥ هەتا ١٩٨٥ ەو تەنانەت هەتا ڕۆژی ئەمڕۆن. چیرۆکێکی چینی باڵای ئیستانبوڵەو لە هەمانکاتیشدا پانۆرامایەکی کلتوری شارەکەیە لە ساڵی ١٩٧٥ ەوە».

* ئەو چین و توێژە ئەوسا ڕێبازی لە ڕۆژئاواوە، لە ئەوروپاوە، لە ڕۆژئاوای ئەوروپاوە وەردەگرت. ئێستاش هەروایە؟

– من پێم وایە، ئەو هەڵوێسـتە گۆڕانی بەسـەردا نەهاتووە. تورکیا لە بیست بۆ بیست و پێنج سـاڵی ڕابردوودا لە ئەوروپاوە زۆر نزیکتر بووەتەوە. بیسـت و پێنج سـاڵ بەر لە ئێسـتا هێشتا وتووێژی جدی لەگەڵ شـتێکی وەک یەکێتی ئەوروپادا لەئارادا نەبوو. بە پێچەوانەوە ئەمڕۆ سەرەک وەزیرانێکی کۆنسـێرڤاتیڤی، کۆنە ئیسلامیمان هەیە، کە لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا لە وتوێژدایە. من لەو باوەڕەدا نیم، تورکیا بە ئاڕاسـتەی ڕۆژهەڵات بجوڵێت یاخود سیاسـەتی بە شێوازێکی بەهێزتر لەسـەر ڕێبازی دنیای ئیسـلامی بێت. وەکو من دەیبینم، کۆمەڵگاکەی خۆی دەکاتەوە. خۆنمایش کردنێکی گەورە لە مابەینی کۆنسـێرڤاتیڤە تەقلیدیەکانماندا هەیە– چ کۆنسـێرڤاتیڤە ئاینییەکان بن، یان کۆنسـێرڤاتیڤە جیهانییەکان یاخود ئەوانەی وەک ئەتاتورک دواڕۆژی تورکیا لە ئەوروپادا دەبینن. ناکۆکی و دووبەرەکی ئێستا لەوەدایە.

* یەکێک لە دۆگماکانی ئەتاتورک ...

– نەخێر، نەخێر، نەخێر، ئیدی بەسە. سوپاس بۆ چاوپێکەوتنەکە.

* نا، نا، نا. ئێوە بەشـێکی ژیانتان لە ئەمریکاو بەشێکیشی لە ئیستانبوڵ بەسەردەبەن، ژیان لە نێوەندی ئەو دونیایانەدا چۆنە؟

– هەموو کلتورەکان جیاوازن، بەڵام بەر لە هەر شـتێک حەزدەکەم بڵێم، پێچەوانەی یەکدی نین. سـەرتاپای ژیانم لە ئیستانبوڵ ئەوەی نیشان داوم، کە پێچەوانەییەکان لە خودی کلتورەکاندا نین. ئەوە سیاسـەتمەدارەکانن دەیانەوێت کلتورەکان یاخود یەکە نەتەوەییەکان، شوناسـە جیاوازەکان لەیەک نامۆ بن. ئیدی ئەوەی ئاخۆ من لە ئیستانبوڵ یان لە نیویۆرک دەژیم، هیچ جیاوازییەکی بۆ من نییە. دەڕۆمە دەرێ شت دەکڕم، دەگەڕێمەوە ماڵێ و دەنووسم. مرۆڤایەتی و کلتور لەم ئان و ساتەدا مەودایەکی زۆر کەمتر لێکەوە دوورن. ئەوە سیاسـەتمەدارەکانن، ئەو سیاسەتمەدارە بەهەڵەبراوانە کە دەڵێن، بۆ هەردوولا، بۆ ئەوروپاو بۆ تورکیاش دەکرێت بۆ هەریەکەی تەنها یەک شوناس بوونی هەبێت– بۆ ئەوروپا شوناسێکی زاف لە مەسیحی و بۆ تورکیاش شوناسێکی زاف لە ئیسلامییەت. بەناوی زافی کلتورەکانەوە شوناسـی دیاریکراو بەسـەر نەتەوەکاندا دەسـەپێنن. دەرئەنجامەکەی: ئەگەر سیاسەتمەدارە ڕاسیستەکان وڵاتەکانیان بەو پێیە لەقاڵب بدەن، ئەوا پێکدادانی کلتورەکانی لێدەکەوێتەوە.

* لـە کتێبە نوێیەکەتانـدا باس لە نەوەیەک دەکەن کە لەناو یـادەوەری نەریتە کۆنەکانداو لە هەمانکاتیشدا لە ئەمڕۆدا دەژی؟

– نەخێر، ڕۆمانێکی مێژوویی نییە. ئەم کتێبە بەڕاستی باس لە ڕووداوی بەینی ١٩٧٥ و ئەمڕۆدا دەکات. بـەڵام بێگومان ئێمەش، وەک هەموو کلتورەکان، لە قاڵبی ڕابردوو دراوین، بەڵام پێویسـتە هەمیشە ئەوەمان لەیاد بێت، کە ئێمە کۆیلەی کلتورو شوناسی کلتوری نین. هێزی ڕابردوو، لەسەر دیاریکردنی دواڕۆژ، سـنوردارە. هەمووومان خاوەنی ئەو سەربەستیەین، خۆمان بڕیاری لەسەر بدەین

و بەو واتایەش مەبەستم لە لەیەکچوویی تورکیایە لەگەڵ وڵاتان و کلتوری تردا. ڕابردوو، کاتێک بەسەردەچێت، پێویستە مشتومڕی لەسەر بکرێت. بەڵێ، بێشک ڕابردوو و نەریت خاوەنی هێزی خۆیانن، بەڵام من نووسەرم. من باوەڕم بە ئازادی مرۆڤەکان هەیەو لە چاوی مندا کۆمەڵگاکان بە ڕابردووی نەریتبارکراو لەقاڵب نادرێن.

* ئازادی مرۆڤەکان و مافەکانی مرۆڤ، ڕوخساری ئەمڕۆی ئازادی ڕۆژنامەگەری و بیروڕا دەربڕین لە تورکیادا چۆنە؟

- بێگومان ئازادی قسەکردن لە تورکیادا وەک هەمیشە کەمێک سنوردارە، بە بەراورد لەگەڵ ئەوروپادا. ئەوەی خۆم لە پێنج ساڵی ڕابردوودا بینیومەو تووشم بووە بۆ ئەم بابەتە نمونەیەکی بچکۆلەیە، بەڵام نامەوێت خۆم سەبارەت بەوە بدوێم. من وەک نوسەرەکانی نەوەی ئەوسا بەند نەکرام، وەک ئەوان ئەشکەنجەم نەچێشتووە، بەڵام بێگومان کەمێک ترسنۆکم و دەمەوێت گوێ لە بارودۆخەکەی خۆم کەڕ بکەم. وتووێژەکانی لەگەڵ ئەوروپا کۆمەکێکەو لەوەدا بەشدارن، ئازادی بیروڕا دەربڕین جێگیر ببێت، چونکە وڵاتەکە، ئابووری، مرۆڤە زیرەکەکان لە تورکیا پەی بەوە دەبەن، کە بۆ تورکیا باشە، ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا. لە لایەکی ترەوە ئازادی بیروڕا دەربڕین لە ئەوروپا تەنها پرسیارێکی یەکخستنی سیاسی نییە، پتر لەوەش ئازادی بیروڕا دەربڕین پرسیارێکی نەتەوەییە.

* ئێوە جارێک بەرگریتان لە سەلمان ڕوشدیش کرد؟

- ئێوە ئەو هەموو پرسیارانە دەکەن.

* تەنها دواهەمین پرسیار؟

- نەخێر، سەبارەت بە سیاسەت کەم نەدواین.

* ئەمە بەڕاستی دواهەمین پرسیارە. ئێوە جارێک وتتان، پتر حەز دەکەن لە خەڵوەتدا بژین و نووسین بۆ ئێوە واتای هەڵهاتنیش لە ژیانی ئاسایی دەگەیەنێت؟

- بەڵێ، ئەوە ڕاستە. کتێب نووسین بۆ من وەک دۆزینەوەی جیهانێکی دووهەم وایە، کە حەزدەکەم تیادا لە ماڵەوە بم. ئەوە شتێک نییە بتوانم خۆمی دوور لێ ڕاگرم، چونکە نووسین بۆ من هەرگیز کار نەبووە. من لە کاتی نووسیندا هەستم وەک منداڵێکی بچووکە. بەوەدا من کاتێک دەنووسم، مرۆڤێکی شادمانم و لێرە، لە ساڵتسبورگیش شادمانم، لەبەرئەوەی جێیەکی هێند دڵڕفێنم هەیە. لێرە دەتوانم باش بنووسم.

**سەرچاوە:**

http://www.3sat.de/kulturzeit/themen/125062/index.html

# چاوپێکەوتن لەگەڵ "ئەدۆنیس"

سازدانی: ولید شمیط
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ئەو یەکێکە لەو شاعیرە عەرەبە دەگمەنانەی کە بە قوڵیی لە ڕابردوو، داهاتوو، کەلتور، مۆدێرنە، پێشـــکەوتن، فاکتەرەکانی نوچـــدان، پەیوەندی عەرەب بەوانی دیکەوە، بە مێژووەوە، بە ســـەردەمو بە شـــوناسو بە ڕۆشـــنبیریو ڕێنیسانسو شارســـتانی عەرەبی دەڕوانن. ئەو یەکێکە لەو کەسە دەگمەنانەی دەوێرێ ئەوەی شـــاراوەیە ئاشکرای بکات و لەبەرامبەر مەســـەلە جێگیرو باوەکاندا ڕاوەستێت و گفتوگۆ لەسەر (ستاتیکو دینامیک) بکەن و دنەی هەژمونگەرایی بدەن.

«ئەدۆنیس» کەســـێکی ئیســـتیفزازییە، وشـــەکانی لە هەمـــوو حاڵەتێکدا لە قامچـــی دەچێت: (عەرەب هیچیان نییە پێشکەشـــی جیهانـــی بکەن، وەک شارســـتانییەت پوکاوینەتەوە، ئێمە تەنها وەک میللەتێک بونمان هەیە، بەڵام لە نەخشەی جیهانی ئەمڕۆدا ئامادەیمان نییە، شارستانیەتی عەرەبی لەناوچووە). ئەمە تەنها ســـمپڵێکە لە قسەکانی کە بەم دوایانە قسەگەلێکی زۆری وروژاندو کاردانەوەی توندی لێکەوتەوە.

گەر وەک بیرمەندی فەرەنسی دەڵێت: (مرۆڤ بریتییە لە شێواز)، ئەوا ئەمە «ئەدۆنیس»ەو ئەوەش شێوازیەتی. پرسیارکەرە، وروژێنەرە، تەحەدیکەرە، یاخییە، ڕەخنەگرە، قسە لەگەڵ عەقڵدا دەکات، ڕێنیسانسخوازە. ئەوەی زۆرینەی خەڵک بە نهێنی دەیڵێن، ئەو بەئاشکرا دەیڵێت. هەم لە زمانو هەم لە شیعردا داهێنەرە، بەناو فەلسەفەو فیکردا گوزەردەکات، ڕقی لە ئایدۆلۆژیایەو مێژووی خۆشدەوێت،

ماندونابێــت لە گەڕان بەداوی ئازادیدا. ڕۆشــنبیرییەکی ئینســایکلۆپیدیایی هەیە، پرۆژەکەشــی پرۆژەیەکی گەورەیە، پرۆژەیەکە بەشێوەیەکی هەمەلایەنو گشتگیر لە کۆمەڵگای عەرەبی دەڕوانێت. ئــەم پرۆژەیە لە هەمــوو کارەکانیدا ڕەنگیداوەتەوە، بەتایبەتی لە کتێبی (ســتاتیکو دایندامیک)، (گۆڕانییەکانــی مهیاری دیمەشــقی)، (دیوانی شــیعری عەرەبی)، (کتێب)، (تەماشــاکردنەکەی ئۆرفیۆس)، ئەمەی دواییان لە دەزگای (فایار) لە پاریس بە زمانی فەرەنسی چاپکراوە، لەم کتێبەدا خانم «حوریە عبدالواحد» کە مامۆســتای زانکۆی پاریســەو زانای دەروونناسییە، چاوپێکەوتنێکی دووردرێژی قووڵی فیکریو فەلسەفی، لەگەڵ «ئەدۆنیس»دا سازداوە. ئەو خانمە پێشتریش کتێبی (الکتــاب)ی وەرگێڕاوەتە ســەر زمانی فەرەنســی. «حوریە» لەم کتێبەدا هەوڵیــداوە توێکاری بۆ جیهانی «ئەدۆنیس» بکات، لێرەوە یاوەری گەشــتێکی فیکری دووردرێژی «ئەدۆنیس»ی کردووە، گەشــتێک تێیدا شاعیرو بیرمەند قسەی لەسەر مەسەلەی شیعر کردووە، بەتایبەتی شیعری خۆی. دواجار وەک پیشــەی هەمیشــەیی، لەلای خەمو ئازاری مرۆڤی عەرەبی ڕاوەستاوە کە تابڵێی خەمو ئازارێکی زۆرە. هەروەها «ئەدۆنیس» لەو کتێبەدا قســە لەســەر فەلســەفە، کەلتور، ڕێنیسانس، مۆدێرنە، ڕۆژهەڵاتناســیو ڕۆژهەڵاتناســان، ئافرەتو جەســتەو ئیرۆتیک کە پێیدەڵێت (شەبەق)، مەنفا، شارستانیو دواکەوتن دەکات. باسی (ئێمەو ئەوان) ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، دەکات.

«حوریە عبدالواحد» لە پێشــەکی کتێبەکەدا دەڵێ: (شــاعیرێکی بەهەڵوێســتم دۆزییەوە)، هەروەها دەڵێ: (وشــە بەهێزەکانی، ناترســن لەوەی ببنە هــۆکاری هەڵکردنی گەردەلولی خۆڵاوی. ئەدۆنیس دەســتکەوتە تیۆرییەکان دەلەقێنێتو سســتمە فیکرییەکان لێکهەڵدەوەشێنێتەوە. ئەو شاعیری جوڵەو بزوتنە).

* هەرچەندە بچیتە ساڵەوە، چالاکیو جووڵەو یاخیبونت زیاتر دەبێت؟
-سوپاس بۆ ئەو هەستەی لەبەرامبەرمدا دەرتبڕی.

* لە ماوەیەکی تاڕادەیەک کورتدا، لە پاریس کتێبەکەت(ســەرنجی ئۆرفیۆس) بڵاوکرایەوە. ئەو کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێ چاوپێکەوتنی دورودرێژ کە «حوریە عبدالواحد» لەگەڵتا ســازیکردووە. هەروەهــا لە گەلەری پاریس کە گەلەرییەکی ناســراوە، هەندێ لــە کارە کۆلاجکراوەکانت کە پێیان دەڵێیت (ڕەقائم) نمایشــکران. لەســەر داوایەکی شارەوانی میلانۆ، شــانۆگەرییەکت لەسەر میلانۆ نوسیو لە حاڵی حازردا لەسەر یەکێک لە هۆڵە شانۆییەکانی ئەو شارە پێشکەش دەکرێت. سەفەرت کرد بۆ براگو خەڵاتی (ئازادی بیروڕا-حرية التعبير)ت وەرگرت. تۆ لە سەفەرکردن ماندونابیت. باس لە سیاسەت دەکەیت، باس لە پوکانەوەو لەناوچونی شارستانیەتی عەرەبی دەکەیت. ئەمەش دەبێتە هۆی وروژاندنی قســەگەلێکی زۆرو کاردانەوەی توندی لێدەکەوێتەوە. ئەم هەموو جووڵەیە بۆ؟ ئایا هەستدەکەیت کات دەڕواو تۆش هێشتا قسەی خۆت نەوتووە؟

-نا، نەخێر مەسەلەکە ئەوە نییە کات دەڕواو من هێشتا قسەی خۆمم نەکردووە. لە ڕاستیدا کات دەڕواو مرۆڤ دواهەمین قسەی خۆی ناکات، مرۆڤ هەمیشە قسەی ئەوەی هەیە بیکات، ئەوە تەنها مردنە قسەکردن لە مرۆڤ حەرامدەکات. بەڵام ئەمە هۆکاری چالاکی و قسەکردنەکانم نییە، هۆکارەکە

بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە من ڕۆچومەتە ناو ژیانی عەرەبییەوە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە من گرنگیو بایەخ بە چارەنوسی عەرەب دەدەم کە خۆم یەکێکم لەوانو نیگەرانم لەسەر ئەو چارەنوسە. ئەمەیە وادەکات بەردەوام هەستو سۆزی خۆم لەبەرامبەر بارودۆخی عەرەبی دەرببڕم. بەداخەوە من دوای پەنجا ساڵ کارکردنم لەم مەیدانەدا، بەشێوەیەک لە شێوەکانو لەسەر چەندین ئاست، ئەو یەقینەم لا زیاتر بووە کە عەرەب وەک وزەیەکی داهێنان بونیان نییە. وزەیەک ئیش لەسەر بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مۆدرێن بکاتو بەشداربێت لە بونیادنانی جیهانو بەشداربێت لە جوانترکردنی نەخشەی دواڕۆژی مرۆڤایەتی. بەم مانایەیە دەڵێم وزەی داهێنان لەلای عەرەب بونی نییەو بەم مانایەیە عەرەب بەرەو لەناوچون دەڕوات.

* دواتر قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکەین، بەڵام پێش ئەوە، ڕێگام بدە پرسیارێکت لێ بکەم کە تۆ خۆت لە ساڵی ١٩٩٨، هەمان ئەم پرسیارەت لە هونەرمەندی سوری کۆچکردو «فاتح المدرس» کردووە: ئایا لەو بڕوایەدایت پیریەتی جۆرێکە لە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە، بۆ منداڵی؟ ئەمە لەگەڵ ئەوەی جووڵەو چالاکی لای تۆ ڕووی لە کەمیو سستبوون نەکردووە، بگرە بە پێچەوانەوە؟

–منداڵی، وەک دیاردەیەکی لەدایکبوونو گەشەکردنو وەک دیاردەیەکی ژیانی، مەحاڵە بۆی بگەڕێینەوە. مانای گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی ئەو مانایەی سەرەوە ناگەیەنێت. بەڵکو مەبەست لە مانای گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی، بریتییە لەوەی سەردەمی منداڵی وەک ڕەمزێک وەربگرین، ڕەمزێک بۆ یەکەمجار تێدا ڕوبەڕوی جیهان دەبینەوەو تێدا بەرائەتو پاکژی ڕۆڵێکی گەورەیان هەیەو عەقڵ هێشتا بە فیکری پێشوەخت پڕنەکراوەتەوەو بەشێوەیەکی عەقڵانی بەڕووی جیهاندا دەکرێتەوە. کەواتە منداڵی هەمیشە بریتییە لە سەرەتایەک بۆ دەستپێکردنو من وەک ڕەمزێک بەکاریدەهێنم. بەم مانایە پیریەتی، پیریەتییەکی داهێنەرانە بریتییە لە منداڵی. کەواتە مەسەلەکە مەسەلەی گەڕانەوە نییە، داهێنەر منداڵێکی هەمیشەییە.

* با نمونەیەک وەربگرین، کارە کۆلاجکراوەکان کە پێیدەڵێیت (ڕەقائم)و، پێموابێت ماوەیەکی زۆر نییە ئیشیان تێدادەکەیت، ئەم کارە کۆلاجکراوانە دەتگەڕێننەوە بۆ کوێ؟

–ئەم کارانە بەسەرهاتێکیان هەیە، ئەم کارانە بۆ؟ ئالەم شوێنە تەسکو تەنگەدا کە هەنووکە ئێمە لێی دانیشتوین، دەخوێنمەوەو دەنوسم، هەندێ سات هەیە نە دەتوانم بخوێنمەوەو نەدەتوانم بنوسم. ئاوا بەبێ ئیش دادەنیشم، وەلێ گوێ لە مۆسیقا دەگرم. لەبەر ئەوەی من هاوڕێی هونەرمەندە مەزنەکانی عەرەب بوومو لەسەر ژمارەیەکی زۆریانم نوسیوە، لێرەوە مەعریفەیەکی هونەریم لە داهێنانەکانیانەوە وەرگرتووە کە سنوری هاوڕێیەتی تێپەڕاندووە. ئیدی بێ ئەوەی پێشتر پلانی بۆ داڕێژم، بە خەیاڵمدا هات، لە چوارچێوەی هونەری شێوەکاریدا کارێک ئەنجامبدەم. لە دڵی خۆمدا وتم لەوانەیە ئەمە هەم ئاسۆیەکی دیکەم بۆ بکاتەوەو هەم لەم ڕێگایەوە چیتر کاتی خۆم بەفیڕۆ نەڕوات. بەڵێ تاقیمکردەوە، بەڵام ڕەنگی زەیتی بەکارناهێنم، بەڵکو بە هەندێ ڕەنگی دیکە قەرەبوی دەکەمەوە، ڕەنگێک کە پێشتر لەناو هەندێ شتی بچوکی فڕێدراوی پشتگوێخراودا هەیە، وەک پارچە پەڕۆیەک، بەردێک، کاغەزێک. پاشان ئەو شتانە ڕێکدەخەمو نوسینیان بۆ زیاد دەکەم.

لە ماوەی ساڵێکدا کۆمەڵێ شتم ئەنجامدا. دواتر تەماشای ئەو شتانەم کردو پێم باش نەبوون، بۆیە هەر هەموویانم فرێدایە ناو سەبەتەی خۆڵەکەوە . پاشان بڕیارمدا بەردەوام بم، بەردەوامبووم‌و ژمارەیەکی زۆر کۆلاجم دروستکرد، بەبێ ئەوەی پیشانی هیچ کەسێکی بدەم. ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی فەرەنسیم کە شاعیرە، هات بۆ ئەم نوسینگەیەم‌و کۆمەڵێ لە کارەکانی بینی‌و لەبارەیانەوە پرسیاری لێکردم. منیش پێم وت ئەوە کاری هونەرمەندێکی هاوڕێمەو لێرە لای من دایناون. هاوڕێ فەرەنسییەکەم سەرسامی خۆی بە کارەکان دەربڕی‌و وتی جوان‌و تازەن‌و هیوادارە ئەو (هونەرمەندەی هاوڕێم) بناسێت. دوای چەند ڕۆژێکی کەم بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم‌و هەواڵی ئەو (هونەرمەندەی هاوڕێمی) پرسی کە دەیویست بیناسێت. من پێم وت: کاکە گیان من گاڵتەم کرد، ئەو هاوڕێ هونەرمەندە، خۆمم. زۆر سەرسامبوو، وتی ئەو کارانە شایەنی ئەوەن نمایشبکرێن‌و ئێمە پێویستە پێشانگایەکی بۆ ئامادەبکەین. لە ڕاستیدا ئەو هاوڕێ فەرەنسییەم زۆر هانیدام، هەروەها دەنگدانەوەیەکی باشیشی هەبوو لای هەموو ئەو کەسانەی ئەم کارانەیان بینی. ئابەم شێوەیە چوومە ناو ئەم جیهانەوەو وتم ئەوەی ناتوانم لە ڕێگەی وشەکانەوە گوزارشتی لێبکەم، ئەوا دەتوانم لە ڕێگەی ئەم شێوانەوە یان لە ڕێگەی ئەم کۆلاجانەوە گوزارشتی لێبکەم.

* واتە جگە لە شیعرو فیکر، ئێمە لەبەردەم ئەدۆنیس-ی هونەرمەندی شێوەکاریداین؟

-لە ڕاستیدا من خۆم وەک هونەرمەندێکی شێوەکاری دانانێم.

* ئەوەی ئەو کارە داهێنانانە بکات، چ ناوێکی لێدەنێیت؟

-نازانم، بەلای منەوە ئەو کارانە بریتییە لە هەمەڕەنگکردنی نوسینە شیعرییەکانم، بەڵام هەمەڕەنگێک بە شتومەک. نوسینە شعرییەکانم بە وشە دەنوسم، وەلێ لەگەڵ ئەم کۆلاجانەدا هەوڵدەدەم لە ڕێگەی شتومەکەوە هەمان شیعر بنوسم. لەبەر ئەوەیە من ئەم کۆلاجانە بە شیعر ناودەبەم، بەڵام بە زمانێکی مادیی، بە زمانی خودی شتومەکەکان.

* جگە لە شتومەک، هەندێ دەقی شیعری‌و پەخشانی کۆنی عەرەبیش بەکاردەهێنیت؟

-من قەرزاری شاعیرە کۆنەکانی عەرەبم‌و هەمووومان قەرزاری ئەوانین، بۆیە لەسەر من پێویستە هەندێ لەو قەرزانەیان بدەمەوە، ئەوەش لە ڕێگەی ئەوەی زیندوویان بکەمەوەو هەندێ تێکستیان لە کارە شێوەکارییەکانمدا بەکاربێنم.

* بۆچی تێکستەکانی خۆت لەو کارانەدا بەکارناهێنیت؟

-ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە . بیرم لێکردەوە، بەڵام بەکارهێنانی تێکستەکانی خۆم، لەسەرم فەرزدەکات ئیلتیزامێکی توندترو زیاترم هەبێت. لەو بڕوایەدام ئەمەش وادەکات هەم شێوەی کارکردنەکە بگۆڕێت‌و هەم پەیوەندیشم بە کارەکانەوە بگۆڕێت، لەوانەیە شتێکی لەو بابەتە ئەنجامبدەم. بۆ زانین من پەنام بۆ هەندێ تێکستی خۆم بردووە لە سەروبەندی نوسیندایە، واتە هێشتا دەستنوسی شیعرین‌و تا هەنووکە لە دوتوێی کتێبە تایبەتیەکانمدا هەڵمگرتوون. گەر بمەوێت تێکستەکانی

خۆم لە کارە کۆلاجکراوەکاندا بەکاربێنم، پێویستە مەسەلەکە لێکبدەمەوە، چونکە ئەوکات بابەتەکە ڕەهەندێکی دیکە لەخۆدەگرێت.

* دەگەڕێینەوە بۆ دوا کتێبت (سەرنجی ئۆرفیوس)، بۆچی ئەم ناونیشانەت هەڵبژارد، ئایا لەبەرئەوەیە، وەک دەڵێیت، ئۆرفیۆس ڕەمزی ئەو مرۆڤەیە کە بەسەر ناخۆشیو ناڕەحەتییەکاندا سەردەکەوێتو تێیاندەپەڕێنێت؟ ئایا خۆت لە ئەفسانەی ئۆرفیۆسدا دەبینیتەوە؟

–ئەفسانەکە دەڵێت «ئۆریدیس» خۆشەویستی شاعیرو هونەرمەندی یۆنانی «ئۆرفیۆس» بووە، کۆچی دوایی کردووەو ڕۆشتووە بۆ جیهانەکەی دیکە. وەلێ ئەوان وا بەخەیاڵیاندا هاتووە جیهانەکەی دیکە دەکەوێتە ژێر زەویو ناکەوێتە ئاسمان. «ئۆرفیۆس» حەزیکردووە خۆشەویستەکەی ببینێ، بۆ ئەوەی بیبینێ، شەرتێکیان بۆ داناوە، ئەویش ئەمەیە: بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەی لەکاتی هاتنەدەرەوەیدا نەمرێت، نابێت بۆجاری دووەم تەماشای بکات. گەر بیەوێت خۆشەویستەکەی بە زیندوویی بمێنێتەوە، ئەوا پێویستە لەکاتی تێپەڕینیدا تەماشای نەکات. بەڵام «ئۆرفیۆس» نەیتوانی تەماشای نەکات. پرسیارەکە ئەمەیە تۆبڵێی «ئۆرفیۆس» لە قوڵایی دڵیەوە ویستبێتی خۆشەویستەکەی بمرێت؟ یاخود خۆشەویستییەکەی ئەوەندە گەورەبووە، نەیتوانیوە تەماشای نەکات؟ بەم مانایە تەماشاکردنی بۆ خۆشەویستەکەی تەماشاکردنێکی یەکلاییکەرەوە بووە: لەوانەیە بەڵگەی ئەو چەپێنراوەی ناو ناخی بێتو ویستبێتی خۆی لەو ئافرەتە ڕزگاربکات کە خۆشیویستووە، یان بە پێچەوانەوە نەیتوانیوە جیهانەکەی دیکە بەبێ تەماشاکردنی خۆشەویستەکەی بەجێبێڵێت. ئیدی تەماشای کردووەو ئەویش مردووە. مرۆڤ لە ڕاڤەکردنی ئەم تەماشاکردنە سەری لێتێکدەچێت. لەناو ئەم ئەفسانەیەدا، ڕوداوێک هەیە گوزارشت لەو جیهانە دەکات کە تێیدا دەژیم: تا ڕادەی مردن خۆشمدەوێتو تاڕادەی خۆشەویستیش تێیدا دەمرم. تەماشاکردنەکەی «ئۆرفیۆس» گوزارشت لە بارودۆخی من دەکات لەبەرامبەر جیهانی عەرەبی، لەبەرامبەر شارستانیەتی عەرەبیو کەلتوری عەرەبی. ڕەنگە ئەم ڕەمزییەتە قوڵترین شتێک بێت لێیەوە گوزارشت لە هەڵوێستی خۆم بکەم: مردن تا ڕادەی خۆشەویستی، خۆشەویستی تا ڕادەی مردن.

* ئەمە ڕەمزییەتێکی زۆر بەهێزە، ئایا هەست بەوە دەکەیت کە تۆ بە دروستی لە شارستانیەتی عەرەبیو کەلتوری عەرەبی جیابویتەتەوە؟ من لێرەدا گوزارشتی (ئەدۆنیسی یاخی– ادونیس المنشق) بەکاردەهێنم، ئەو گوزارشتە ناونیشانی وتارێکی دوور درێژە لە ڕۆژنامەی (لۆمۆند)ی فەرەنسی، بە بۆنەی دەرچونی کتێبی (تەماشاکردنەکەی ئۆرفیۆس)ەوە، لەسەر تۆ بڵاوبووەتەوە؟

–بەدڵنیاییەوە من لە باوو (سائد) یاخیم. لە دەزگای باوو، لە سیاسەتی کۆمەڵایەتی باوو، لە ڕۆشنبیری باو یاخیم، چونکە دەزگای باو ڕۆشنبیری باو بەرهەمدەهێنێت، بەم مانایە من یاخیم. وەلێ من لەو حەقیقەتە بنەڕەتییە یاخی نیم کە لە پشتی ئەم دەزگاو ئەم ڕۆشنبیرییەوە وەستاوە، چونکە ناکرێت کۆمەڵگا وەک یەکەیەکی گشتگیر وەربگریت، یەکەیەک کە جیاناکرێتەوە. کۆمەڵگا لە چەند چینێک پێکهاتووە، چینێکیان چینێکی قووڵی ناو کۆمەڵگایەو من سەر بەو چینەم، ئەویش ئەو چینەیە کە لە مێژووی عەرەبیدا پشتگوێخراوە یاخود نەفرەتی لێکراوە یان ڕێزی لێنەگیراوە، لە

ئەساسدا ئەو چینە ڕۆشنبیریو کەلتوری عەرەبیو مێژووی عەرەبی دروستکردووە.

* مەبەستت لەوە چینی داهێنەرانە؟

-چینـــی داهێنەران لە هەموو بوارەکانـــدا، کە هەر هەموویان لەلایەن دەزگای باوو ڕۆشـــنبیرییو کەلتـــوری بـــاوەوە ڕەتکراونەتەوە. ئـــەم دەزگایانە متەســـەوفەکانیان ڕەتکردەوە، فەیلەســـوفانیان ڕەتکـــردەوە، ئەو زانایانەیـــان ڕەتکردەوە کە لە هەموو مەیدانەکاندا داهێنەربوون، شـــاعیرە گەورەو مەزنەکانیان ڕەتکردەوە، لە نمونەی «ئەبو عەلای موعەری»و «موتەنەبی...»

* بـــەڵام موتەنەبی، با ناوی کەســـی دیکە نەهێنین، پەیوەندییەکی باشـــی لەگەڵ حاکمەکاندا هەبوو، لێرەوە لەگەڵ دەزگا باوەکاندا پەیوەندییەکی باشی هەبووە؟

-ڕاســـتە، بەڵام گەر بە شێوەیەکی قووڵ لێکدانەوە بۆ شیعرەکانی «موتەنەبی» بکەین، دەبینین ئەو شیعری بۆ خزمەتی حاکم تەرخان نەکردووە، بەڵکو حاکمەکەی بۆ خزمەتی شیعر تەرخانکردووە، لەم حاڵەتەشدا جیاوازیەکە گەورەیە. ئەو هەموو شتێکی لەپێناو شیعرەکانیدا بەکاردەهێنا.

* ئەمە بلیمەتی موتەنەبییە، بەڵام ئەو لە دەسەڵاتدار جیانەبوەوە؟

-لەگەڵ باودا جیانەبوەوە، بێگومان باویش دەســـەڵاتدارە. جارێکیان پرسیارم لە «جان جینیە» کـــردو پێم وت: (جان، تۆ بەپێی ژیانی تایبەتی خۆتو ئەزمونت، پێویســـتە لە بەرەی «ســـیلین» بویتایە، واتە لەبەرەی ئەو کەســـانە بیت بە زمانێک دەنوســـن کە نزیکە لە خەڵکی ســـادەوە، ئەمە بۆ ئەوەی نەڵێم نزیکە لە زمانی باوەوە، وەک ئەو زمانەی «ســـیلین» پێیدەنوســـی. بەڵام تۆ تەواو پێچەوانەیت، تۆ بە ڕاقیترین زمان دەنوسیت کە فەرەنسییەکان پێی دەنوسن، زمانی مالارمێ. چۆن تۆ لە بەرەی «مالارمێ»یتو لەبەرەی خەڵکانی ســـادەو ســـاکار نیت، کەچی باس لەو ژیانە دەکەیت کە تێیدا ژیاویت. وەڵامیدامەوە: ئەمە خاڵێکی گرنگە، من بەدەســـتی ئەنقەســـت بە زمانی مالارمێ دەنوســـم، چونکە زمانی مالارمێ ئەو چینە لێی تێدەگات کە دەمەوێ بیرووخێنم. من بۆیە بەو زمانە نوسیومە، چونکە ویستومە بۆرجوازیەتی فەرەنسی بڕوخێنم، بەڵام گەر بە زمانی سیلین بمنوسیایە، ئەوا پەراوێزیان دەخستمو نەفرەتیان لێدەکردم).

* لـــە دواهەمین شـــیعرتدا (بنەچەی سەوســـەن) دەڵێیت: بۆ ئەوەی هەڵەبجـــە بژی، ئەوەندە بەس نییە شـــیعر لەسەر کاغەزەکان بێت، بەڵکو دەبێ شیعر لە ناوچاوانی جیهان بدرێت. هەروەها دەپرسیت: کورد لەوی دیکەدا پەرتو بڵاوبوەتەوە، بەڵام ئایا ڕەتکردنەوەی ئەوی دیکە، ڕەتکردنەوەی خود نییە؟ ئایا ئەم ڕەتکردنەوەیە شـــێوەیەکی دیکەی مردن نییە؟ لە جیهانی عەرەبیدا ســـەبارەت بە لێکبوردەییو قبوڵکردنی ئەوی دیکە قســـەیەکی زۆر دەکرێت، ئێمە لە پەیوەندیدا بەوی دیکەوە لەکوێداین؟

-لای عـــەرەب دیاردەیەک بەرامبەر ئەوی دیکە هەیە، بریتییە لەوەی ئەوی دیکە بونی نییە، ئەمە مێژوو ســـەلماندویەتی، تەنها لە دوو حاڵەتدا نەبێت: یا ئەوەتا لەناو کۆمەڵگادا دەبێت بە عەرەب،

یاخود کۆنترۆڵی دەکەیـــنو وەک ئەوی دیکەیەکی کافر مامەڵەی لەگەڵ دەکەین. بە درێژایی مێژوو ئەمەمان کردووە، دەمانەوێ مەسیحیو کوردو هەموو کەمایەتیەکانی دیکەو لەسەر هەموو ئاستەکان، بکەین بە عەرەب. تەعریبکردن تەنها لەسەر ئاستی زمان نییە، دەمانەوێ فیکریان تەعریب بکەین تا وەک فیکری خۆمانی لێبێت. دەمانەوێ عەقیدەی لەگەڵ عەقیدەی خۆماندا یەکبگرێت، بە شێوەیەک هیـــچ ئازادییەکی عەقیدەی بـــۆ جێناهێڵین. گەر ئازادی عەقیدە بونـــی نەبێت، ئیدی چۆن ئازادی قسەکردن بە زمانێکی جیاواز بوونی دەبێت. یان چۆن ئازادی دامەزراندنی دەزگایەک بونی دەبێت کە پێداویستییەکانی تاکێک دابین بکات، تاکێک کە سەر بە نەژادو ڕەچەڵەکێکی مێژوویی ناعەرەبییە. ئێمە ئەم مەیلە یەکگرتووەمان هەیە، مەیلی تواندنەوە، تواندنەوەی ئەوی دیکە بەشـــێوەیەک لەناو عوروبەدا بتوێتەوە.

* بەڵام پێویســـتە ئەوەمان لەبیرنەچێت کە شارستانیەتی عەرەبی-ئیسلامی، لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئەوی دیکە ســـەرکەوتوبووە، بە درێژایی مێژوو لە مامەڵەکردنی لەگەڵ شارستانیەتو زمانە جۆراوجۆرەکانی دیکەدا سەرکەوتو بووە؟

-نمونە بێنەرەوە.

* بۆ نمونە شارستانیەتی فارسی، شارستانیەتی بێزەنتینیو ئەوانی دیکە. ئەم شارستانیەتانە، بە شێوەیەک لە شێوەکان، لە شارستانیەتی عەرەبیدا ئامادەییان هەیە؟

-ڕاســـتە، ئەوە کاتێک بووە سیاســـەت بێ گرفت بووەو خەلیفە تێڕوانینێکـــی فراوانی هەبووەو بەســـەر ئەوی دیکەدا کراوەبووە. مەســـەلەکە مەســـەلەی کەســـەکان بووە، مەســـەلەکە مەسەلەی سیاســـەتێکی گشتی نەبووە لەسەر کۆمەڵێ پرنسیپ ڕاوەستابێت کە لە قوڵایی تێڕوانینی سیاسی عەرەبیدا ئامادەبێت. لەبەر ئەوە بینیمان، لە هەندێ کاتدا فارســـەکان بەو پێودانگەی (شـــعوبیین) چەوســـێنراونەتەوەو لـــە هەندێ کاتـــی دیکەدا دژایەتی فەلســـەفە کراوە بـــەو پێودانگەی یۆنانیو ناعەرەبییە. هەندێ کاتی دیکە هەبووە عەرەب ســـودی لە شـــتە هەبووەکان وەرگرتووە، وەک ئەوەی «معاویـــە» لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەمەوی، ســـودی لە کەلتـــوری بێزەنتینی وەرگرتووە. کەواتە مەسەلەکە مەسەلەی کەســـەکانە، دەوڵەت سیاسەتێکی بەردەوامی نەبووە لەسەر مەعریفەو ئازادی بنیادنرابێت، وەک ئەو حاڵەتەی لای «مەئمون» هەبووە. «مەئمون» فەرمانی بە تەرجەمەکردن دا، بەڵام ئەوانی تر دژایەتی وەرگێڕانی فیکری ئەوانی دیکەیان دەکرد.

* شارستانیەتی ڕۆژئاواش بەدەست ئەم لایەنەوە گرفتار بوو، ڕۆژئاواییەکان تا دوێنێیەکی نزیک، ڕەتیاندەکردەوە یان دانیان بە بوونی بەشـــداریکردنی شارستانیەتی عەرەبی لە شارستانیەتەکەیاندا نەدەنا؟

-لەو بروایەدام لە ڕۆژئاوا داننان بە بەشداریکردنی شارستانیەتی عەرەبی، بووەتە مەسەلەیەکی واقیعی. هەموویان دان بە «ئیبن ســـینا، ئیبن هەیسەم، ئیبن ڕوشد، «دا دەنێن. «ئیبن ڕوشد» لە ڕۆژئاوا زیاتر زیندوترە تا لەلای عەرەب. لەلای عەرەب خوێندنی «ئیبن خەلدون» قەدەغەبوو. کاتێ

ڕۆژئاواییەکان گرنگیو بایەخیان دا بە «ئیبن خەلدون»و لەسەریان نوسی، شەرم دایگرتینو ئیدی ئێمەش بایەخمان پێداو قسەمان لەبارەیەوە کرد.

ئەوەی گرنگە لە پەیوەندی بەوی دیکەو لە پەیوەندی بە کەلتوری دیکەوە، ئەوەیە دەوڵەت بەو سیفەتەی دەوڵەتەو بەدەر لە تێڕوانینی حاکم، سیاسەتێکی ڕونو ئاشکرای هەبێت. پێویستە کەلتورو، پەیوەندی بەوی دیکەوە، بە ئەخلاقیاتی حاکمو کەسێتییەکەیەوە نەبەسترێتەوە، بە شێوەیەک ئەم حاکمە حاکمێکی کراوەیەو حەزی لە حیکمەتو وەرگێڕانە وەک «مەئمون»، یان ئەو حاکمەی دیکە بیانییەکانی خۆشناوێتو حەزی لە وەرگێڕان نییە.. ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە.

* لەگەڵ «تاهیر بن جەلونو مەحمود حسێنو ئەمین مەعلوف»، بەشداریت کرد لە نوسینی وتارێک یان لە ڕاگەیاندنی هەڵوێستێک لە ڕۆژنامەی لۆمۆند، تێدا گەشبین بوون بەو وتارەی سەرۆکی ئەمریکا «ئۆباما» کە ئاراستەی موسڵمانەکانی کردو پێتان وابوو ئەوە دەنگێکی دەگمەنو چاوەڕواننەکراو بوو؟

–ئەوەمان لەسەر ئەساسی ئەوە کرد کە عەرەب ئاستێکی گفتوگۆو مشتومڕی هەبێت لەنێوان خۆیانو لەنێوان ئۆبامادا، نەک لەناو خۆیاندا ناکۆکو جیاوازبن. کێشەی فەلەستین کێشەیەکی عەرەبییە، لێرەوە پێویستە دەنگی عەرەبی دەنگێکی یەکگرتوو بێت. لەبەر ئەوە ئێمە هەوڵمان دا دەنگێکی یەکگرتویی عەرەبی، لە بەرامبەر دەنگی ئەمریکیو لە بەرامبەر دەنگی ئیسرائیلیدا هەبێت. گەر دەنگێکی عەرەبی هەبوو، مانای وایە گفتوگۆیەک هەیە، گفتوگۆش مانای ڕازیبونو ملکەچکردنو پاڕانەوە نییە. پێویستە عەرەب هەڵوێستێک وەربگرێت، پێویستە لە بەرامبەر ئیسرائیلدا، چاوێک بە سیاسەتیاندا بخشێننەوە، چاوێک بە هەڵوێستیان سەبارەت بە ئاشتی بخشێننەوە.. گرنگ ئەوەیە چاوەڕێ نەکەن لە «ئۆباما» کێشەکان چارەسەر بکات. «ئۆباما» بە تەنها ناتوانێت کێشەکان چارەسەربکات. ڕەنگە «ئۆباما» بتوانێت کێشەکان لەسەر ئەساسی گفتوگۆ لەنێوان هەردو لایەندا چارەسەر بکات. گرنگ ئەوەیە عەرەب ئامادەییان هەبێتو ئەم ئامادەییەیان، لانی کەم بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیان بەکاربێنن کە ڕۆژانە دەیانکوژێت. زیاد لە نیو سەدەیە کێشەی فەلەستین جەستەی عەرەبی داڕزاندووەو لەسەر هەموو ئاستەکان وێرانی کردووە. لەبەرئەوە، لانی کەم، پێویستە دەرک بەوە بکەن کە کێشەی فەلەستین تەنها تایبەت نییە بە ڕژێمێک، بەڵکو ئەوە کێشەیەکی عەرەبییە بە مانای کەلتوریو مێژوییو کۆمەڵایەتیو ڕژێمەکان تێدەپەڕێنێت. بۆیە پێویستە ئەم ڕژێمانە تێڕوانینێکی مێژووییانەیان هەبێتو سنوری تەسکی خۆیان وەک ڕژێم تێپەڕێنن.

* دەڵێیت کێشەی فەلەستین کێشەیەکی عەرەبییە بە مانای کەلتوری، مەبەستت لەوە چییە؟

–مەسەلەی کەلتور مەسەلەیەکی تاکەکەسی نییە، بەڵکو مەسەلەی ڕوئیایە. سیاسی بەشێکە لە کەلتور، نەک بە پێچەوانەوە. عەرەب لەسەر بنەمای ئەوەی سیاسی هەموو شتێکە هەڵسوکەوت دەکەن، عەرەب پێیوایە کەلتورو هونەرو زانستو سوپا پاشکۆی سیاسین. ئەمەش یەکێکە لە هەڵە گەورەکان، ئەم هەڵەیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕژێمی عەرەبی لە دەرەوەی بەرژەوەندی

خۆی، لە دەرەوەی سنوری مانەوەی خۆی لەسەر حوکم، گەرچی ئەو مانەوەیە بەهەر نرخێک بێت، خاوەنی ڕوئیا نییە. ئەمەیە وادەکات بوترێت کەلتوری عەرەبی باوو، دیاردەیەک نییە بۆ توێژینەوەو پرسیارکردنو ڕەخنەگرتن، هێندەی دیاردەیەکی سایکۆلۆژییە. ئەمەش قسەیەکی دوورودرێژ هەڵدەگرێت.

* بەم مانایە دەتەوێت بڵێیت سیاسەت بەشێکە لە کەلتور؟

– پێویستە بەشێک بێت لە کەلتور. پێویستە لەسەر ئێمە، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بین قەناعەت بە عەرەب بکەین کە گۆڕان لە ڕژێمەکاندا، وەک پێویست نابێتە گۆڕانی کۆمەڵگاکان. گۆڕانی کۆمەڵگا پێویستی بە گۆڕانی بونیاتی پەروەردەییو سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتییە، بەپێچەوانەی ئەوەوە هەرگیز هیچ گۆڕانێک ڕونادات. بەڵگەش بۆ ئەوە، ئەوەیە پەنجا ساڵە رژێمەکانی لای ئێمە دەگۆڕدرێن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخەکە تابێت خراپتر دەبێت. هەژاری زیادی کردووە، نەزانین زیادی کردووە، دواکەوتویمان زیادی کردووە، قەیرانە ئابورییەکانمان زیادی کردووە. هەموو ئەوانەش لەژێر سایەی کۆمەڵێ ڕژێمدا ڕویداوە لافی ئەوەیان لێدەدا گوایە لەو ڕژێمانەی کە شۆڕشیان بەسەرا بەرپاکرد، پێشکەوتوترو ڕزگاریخوازترن. ئەمە بۆچی وا کەوتەوە؟ چونکە هەمان بونیاد وەک خۆی مایەوەو نەگۆڕا.

* لەم ڕوانگەیەوە، چۆن دەڕوانیتە ڕۆڵی ڕۆشنبیر؟

–ڕۆڵی ڕۆشنبیر ئەوەیە ئەم قسانە بڵێت (واتە ئەو قسانەی سەرەوە–و–)و بەردەوام ئەو قسانە قوڵتر بکاتەوەو ڕێگە بەخۆی نەدات ببێت بە فەرمانبەر لەلای سیاسی. نابێت ڕۆشنبیر بایکۆتی دەزگا ڕۆشنبیرییەکان بکات، ڕۆشنبیر لە بواری ڕۆژنامەوانیو پەروەردەو خوێندنو فەرمانگەکانی دەوڵەتدا کاردەکات، ئەوەش مافی خۆیەتی. بەڵام مافی خۆی نییە فیکرو بیروباوەڕی لەپێناو خزمەتکردنی ڕژێم بخاتەگەڕ. لێرەداو لەم چوارچێوەیەدا، ڕۆڵی ڕۆشنبیر بریتییە لە پێداچوونەوەو ڕەخنەگرتن، بەشێوەیەک سیاسەت ببێتە بەشێک لە کەلتور، نەک بە پێچەوانەوە.

* تۆ زۆرجار ڕەخنە لەوانە دەگریت کە بە (ڕۆشنبیرانی فیکری حازربەدەستو موعەلەب) ناویاندەنێیت، تا چ ئاستێک ڕۆشنبیری عەرەبی بەو ڕۆڵە هەڵدەستێت کە تۆ قسەی لەبارەوە دەکەیت؟

–ڕۆشنبیری عەرەبی هەڵناستێت بە ڕۆڵی ڕەخنەگرێکی لەبارو گونجاو، رۆشنبیری عەرەبی ڕەگەزێکی (پەردەپۆشکەرە–تمویهی)، بۆ هەموو ئەو شتە بنەڕەتیانەی لەناو کۆمەڵگای عەرەبیدایە. مەسەلەی ئاین پەردەپۆشدەکات، مەسەلەی سێکس پەردەپۆشدەکات، مەسەلەی سیاسەت پەردەپۆش دەکات.

* بەو مانایەی ملکەچی شتە قەدەغەکراوەکانە؟

–ملکەچی ئەو سیاسەتەیە کە هەموو شتێک بە پاشکۆی سیاسی دەزانێت، هەموو شتێک دەکاتە

بەشـــێک لە سیاســـی. ئەمەیە وایکردووە زۆربەی عەرەب ڕۆشنبیری فەرمانبەربن، ئەمە لەلایەکەوە. لەلایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی ڕۆشنبیر ڕۆڵی لە کۆمەڵگادا هەبێت، پێویستە خودی کۆمەڵگاش باوەڕی بەوەبێت ڕۆشنبیریی بەشێکی ئۆرگانیو بنەڕەتییە لە ژیانیدا. بەجۆرێک لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی، ڕۆشـــنبیرانی ناکۆک بەیەکو دژ بەیەکو جیاواز لـــە بیروڕایاندا، یەکەیەکی یەکگرتوو پێکبهێنن کە پارچە پارچە نەکرێت. بەو مانایەی ئەو ڕۆشنبیرە ناکۆکو جیاوازانە سەر بە یەکەیەکی کۆمەڵایەتین، گەرچـــی لە بیروڕایاندا جیاوازیش بـــنو هەمان مافیان هەیە لە دەربڕینی بیروڕاو گوزارشـــتکردنو دەرکەوتن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە. زیاد لە ٩٥٪ فەرەنسییەکان دژ بە «جان ماری لۆبان»ن کە سیاســـییەکی ڕاســـتڕەوی تونـــدڕەوە، بەڵام ئەمە ڕێگـــە لەوە ناگرێت کە «لۆبـــان» لە میانەی هەڵمەتی هەڵبژاردندا، هەمان ئەو مافانەی نەبێت کە هەر سیاســـییەکی دیکەی فەرەنســـا هەیەتی. ئەم مەســـەلەیەیە پێویســـتە لەلای ئێمەش ڕوبدات، نەک ئەوەی ئێستا ڕودەدا. ئەوەی ئێستا لەلای ئێمـــە ڕودەدات ئەوەیە دەوڵەت هەمووی بە موڵکی ڕژێم دادەنرێت، گەر لەگەڵ ڕژێمدا نەبویت، ئەوا هیچ مافێکت نییە.

* ئەمـــە بەبـــێ ئەوەی ئەزمونـــی دیموکراتی سەرنجڕاکێشـــی کوێتو لوبنـــان لەبیربکەین، کە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە هەڵبژاردنی ئەم دوایەی پەرلەماندا دەرکەوت؟

–لوبنـــان حاڵەتێکی ئاوارتەیەو ڕەتی قاعیدەکە ناکاتەوە، بەڵام ئـــەو حاڵەتەی لوبنان مانایەکی نێگەتیڤی هەیە نەک پۆزەتیڤ، چونکە ئەوە مەسەلە خراپەکەی تایفەگەرییە ئەو حاڵەتە تەندروستەی هێناوەتە ئاراوە، بەپێوانە لەگەڵ ئەو پەتایەی هەیمەنەی بەسەر عەرەبدا گرتووە.

* لە سەردانەکەتدا بۆ کوردستان کۆمەڵێ قسەت کرد، لە جیهانی عەرەبیدا زۆر کەسی وروژاند. بەتایبەتی ئەو قســـانەت لەسەر (لەناوچونی شارســـتانیەتی عەرەبی). گەرچی تۆ هەڵوێستی خۆت ڕوون کردەوەو وتت مەبەستت لە وشەی (لەناوچون)، لەناوچونی عەرەب نییە وەک ژمارەی مرۆڤەکان، بەڵکو مەبەســـتت لەناوچونی عەرەبە وەک ئەو وزەیەی لە کاروانی داهێنانی مرۆڤایەتیدا ڕێدەکات. ڕەنگە هەندێک کەس تەبابن لەگەڵ ئەو بۆچونەی کە دەڵێیت عەرەب بەدەست دواکەوتنێکی گەورەی شارستانیەتەوە دەناڵێنێت، بەڵام دژ بەو شێوازی ئیستیفزاز کردنەتن کە لەبەرامبەر ئەوانی دیکەدا دەیگریتەبەر؟

–باشە، کەواتە مەسەلەکە مەسەلەیەکی ئیستیفزازییەو مەسەلەیەکی ڕۆشنبیریی نییە. مەسەلەی هەواوهەوەســـە، ئەوان بە ئارەزووی خۆیان پێیان وایە ئەو قســـانەی من ئیستیفزازییە، مەسەلەکە مەســـەلەی شێوازە، ئەوان گەر لەســـەر ناوەڕۆکەکەی ڕازین، ئەوا قەیدی نییە با ئیستیفزازبن. بەڵام من لەو بڕوایەدام هیچ کەســـێک نییە بتوانێت، مشـــتومڕ لەســـەر ئەوە بکات عەرەب، وەک وزەیەکی داهێنەرانە، لەسەر نەخشەی جیهان بونیان هەیە.

* سەبارەت بەم مەسەلەیە تاڕادەیەکی زۆر کۆدەنگییەک لەلای ڕۆشنبیرانی عەرەب هەیە؟

–من ئەمەم بەســـە، دەکرێ من لەم شـــێوازەی خۆم پاشەکشـــە بکەم یاخـــود داوای لێبوردن لە

مەسەلەی ئیستیفزاکردن بکەم، ئەمە مەسەلە گرنگو بایەخدارەکە نییە.

* هەرچۆنێک بێت ئەوانەی پێیان ناخۆش بوو یان ئەوانەی ئیستیفزازبوون، سڵیان لەوە نەکردەوە بە شێوەیەکی توند وەڵامت بدەنەوە. تۆ لەلای هەندێک غەربزەدەیت، فەرەنسیخوازیت، ڕەگەزپەرستیت، دژ بە شارستانیەتی عەرەبیت، لەسەر لێواری ئەم شارستانیەتە دەژیت. هەندێکی دیکە بە (جامباز) وەسفت دەکات؟

–جامباز بەسەرهاتێکی دیکەیە، «سەعدی یوسف»ی شاعیر پێیوابوو من لە دوبەی کۆنگرەیەکم بەستووەو ئەوم بانگ نەکردووە بەشداری تێدا بکات. ئەمە بەبێ ئەوەی من خۆم بەشداریم لەو کۆنگرەیەدا کردبێتو ئەو کۆنگرەیە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبووە. دواتر داوای لێبوردنێکی نوسی، من تێناگەم ئەو بۆچی لەوە تورە بووە کە بۆ ئەو کۆنگرەیە بانگ نەکراوە. ئەو پێشتر قسەی سوکی پێ وتون، قسەی سوکیان پێدەڵێتو دەیەوێت بانگهێشتی بکەن!

* تۆ بە توندی ڕەخنە لە بونیادی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری عەرەبی دەگریت، لەگەڵ ئەوەشدا دەڕۆیت بۆ هەموو شوێنەکان؟

–بێگومان، دەڕۆم تاکو لە کۆڕو سیمیناڕو شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە، بیروڕای خۆمیان پێڕاگەیەنمو گوێیان لێمبێت. من لە هەموو شوێنێکدا بە بەردەوامی گوزارشت لە بیروڕاکانم دەکەم. تەحەدای هەر کەسێک دەکەم پێم بڵێت بۆ ساتێک یاخود بۆ تەنها ڕۆژێک، لەلای هەر دەوڵەتێکی عەرەبی یاخود ڕژێمێکی عەرەبی دامەزرابم. من بۆیە دەڕۆم بۆ دەوڵەتە عەرەبییەکان، تاکو ئەو بیروڕایانەی خۆمیان پێڕاگەیەنم کە لێرە، لە پاریس دەریاندەبڕم. من سورم لەسەر ئەوەی بڕۆمو لە ماڵەکانی خۆیاندا بیروڕاکانی خۆمیان پێ بڵێم. گەر پێشوازییان لێنەکردم، ئەوا من دوڕاو نیم. قسەکانی خۆت بکە، وەلێ نەکەی هەرگیز وات لێبکەن داتمەزرێنن!

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، 16/7/2009

# گفتوگۆ لەگەڵ "محەمەد شوکری"

سازدانی: مەروان عەلی
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

* ئایا (نانی ڕوت) چاکترین شتێکە نوسی بێتت؟

– بەرهەمە ئەدەبیەکانی من، بەدحاڵی بون و درۆ و دەلەسەو بیروبۆچونێکی دژبەیەکی سەیر دەوری داون. هەیە پێیان شاگەشکە دەبێت و هەشە چاوی پێیان هەڵنایەت. پێموانیە (نانی ڕوت) چاکترین شتێک بێت نوسی بێتم. هەوڵەدەم ئەم کتێبە بکوژم. من زۆر تێکستی جوانتر و چاکترم لەم کتێبە نوسیووە، کتێبێک کە وێرانی کردم. ئەوەش بڵێم: (من نەمدەویست ئەم کتێبە بەو شێوەیە بنوسم، وەک ئەوەی لەو ساڵە پڕ ئێش و ئازارانەی پێشودا نوسیم).

* بیرۆکەی (نانی ڕوت) چۆن هات و چۆن چۆنی دەستت بە نوسینی کرد؟

– سەرەتای ژیانی ئەدەبیم بە نوسینی کورتە چیرۆک و هەندێ وتارو لێکۆڵینەوە دەست پێکرد کە لە ڕۆژنامەکانی مەغریب و لوبناندا بڵاومکردنەوە. ڕۆژێکیان «بترووین»کە کابرایەکی دزە، هات بۆ تەنجە. پێموابێت ساڵانە شەست هەزار دۆلاری وەردەگرت و ژیاننامەی «عەرەبی عەیاشی» بڵاوکردبووەوە بەڵام بەناوێکی خوازراوەوە. «عەیاشی» سەربوردەی ژیانی خۆی بۆ گێڕابووەوە، لەبەرئەوەی نەخوێندەوار بوو نەیدەتوانی بنوسێت. ئەم کتێبە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو وەرگێڕدرایە سەر چەندین زمان. هاوکات «بترووین» دیوانە شیعری (الحب من اجل حضنة من الشعر)ی بۆ «محەمەد مرابط» بڵاوکردەوە، ئەم دیوانە «بۆڵ

بۆڵز» وەریگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی کە هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی «بترووین»ە. پاشان لە هەوڵی ئەوەدابوو نێچێری سێیەمی دەست کەوێت و منیش ئەو نێچیرە بووم.

* کەواتە «بترووین» هانی دایت، ژیاننامەی خۆت لە (نانی ڕوت)دا بنوسیتەوە؟

– ئێوارەیەکیان لە ماڵی «بۆڵ بۆڵز»بوم، چەند چیرۆکێکمی کردبوو بە ئینگلیزی. من تێکستەکانم بە زمانی ئیسپانی بۆ دەخوێندەوە، چونکە ئەو یەک وشەی عەرەبی نەدەزانی. «بترووین» ئەو دزە گەورەو خوێن مژە، لە نێچیرێکی تازە دەگەڕا. لێی پرسیم: (چی تازە هەیە لە تەنجە؟ کەس هەیە بتوانێت ژیاننامەی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە؟). «بۆڵ بۆڵز» پێی وت: (ڕەنگە محەمەد شوکری بتوانێت. من هەندێ لە چیرۆکەکانیم بۆ وەرگێڕاوە، لەوانەیە ژیاننامەی هەبێت).

«بترووین» لێی پرسیم: (شتێکی وات هەیە لە ژیاننامەی خۆت بچێت؟)، منیش لە وەڵامدا وتم: (بەڵێ، بەڵام لە ماڵەوەیە و کاتی خۆی شتێکی وام نوسیوەوە، کەچی شوێنێک نەبوو بۆم بڵاوبکاتەوە). ئاوا وەڵامم دایەوە و وەک کەسێکی عەجول و فێڵباز و دەست بڕ قسەم دەکرد. هەڵیدایەوەو وتی: (کەواتە ژیاننامەکەت لە ماڵەوەیە؟). وتم: (بەڵێ). بۆندێکی سەرەتاییمان مۆرکرد، بەبێ گوێدانە ئەو ڕێسا نێودەوڵەتیانەی پەیوەندییان بە چاپ و بڵاوکردنەوەوە هەیە. من دەمویست یەکەمین کتێبم چاپ بکەم، تا خۆم نەدەمە دەست گۆڤار و ڕۆژنامە ئاست نزمەکان.

پێی وتم: (کەی لە نوسینی ژیاننامەکەت بویتەوەو کرا بە ئینگلیزی، بڕی سەد لیرە ئیستەرلینیت دەدەمێ). ئەم بڕە پارەیە بۆمن سەروەتێکی گەورە بوو، بەڵام وەک نوسەرێک مافی کتێبەکە لە دەستی مندا نەما. ئەو ئێوارەیە گیرفانم خاڵی و پولێکم شک نەدەبرد. داوام لە «بۆڵ بۆڵز» کرد (پیاوێکی ڕژد و دەست نوقاو بوو)، پەنجا درهەمم بە قەرز بداتێ. بەو پارەیە چوم بۆ گازینۆی (ڕۆکسی) و لە قاتی یەکەمی ئەو گازینۆیەدا و هەر ئەو ئێوارەیە، نەسکی یەکەمی (نانی ڕوت)م نوسی.

* کەواتە تا ئەو وەختە، (نانی ڕوتت) نەنوسیبوو؟

– بێگومان، سەروەختێک کە ئەچوم بۆ ماڵی «پۆڵ پۆڵز» تا شتەکانی بۆ بخوێنمەوە، نەیدەزانی من ژیاننامەی خۆمم نەنوسیوەو باوەڕی پێکردم. بەڵام من وەک گوند نشینێک(خۆشم لادێیم) تەکانم بەرخۆمدا و سەرکەوتوو بوم لە کارەکەمدا. چەند لاپەڕەیەکم بۆ «بۆڵ بۆڵز» دەخوێندەوەو ئەویش بە ئیسپانی دەینوسیەوەو پاشان ڕێکی دەخستەوەو فۆرمێکی ئەدەبی پێدەبەخسی. هەندێ جار خۆم ئەدزیەوەو درۆیەکم ڕێکدەخست و دەمووت: (بۆیە نەهاتم، چونکە نەخۆش بوم). بەمجۆرە (نانی ڕوت)م تەواوکرد. کاتێک کۆتایم پێهێنا، پێموت: (ئەزانی من پێشتر ئەو کتێبەم نەنوسی بوو). وەک ئەمریکاییەکی پراگماتی پێیوتم: (ئەی چۆن بۆندم لەگەڵ مۆردەکەیت بۆ کتێبێک کە هێشتا نەنوسراوە؟). وەڵامم دایەوە کە ئەوە تاقیکردنەوەیەک بوو، کردم و سەرکەوتوش بووم تێیدا.

* جارێکیان وتت کە ڕێکەوت کار ئاسانی کرد بۆ ئەوەی (نانی ڕوت) بکرێتە فەرەنسی، ئەمە چۆن بوو؟

- ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت لەبەردەم ساڵۆنەکەی خاتوو «بۆرس»دا، «تاهیر بن جەلۆن»م بینی و (نانی ڕوت)م پێ بوو، دەمویست پێشکەشی «سامولێل بیکێت»ی بکەم. «بن جەلۆن» پێیوتم: (دەبێت ئەم کتێبە بکرێتە عەرەبی و فەرەنسی). وەڵاممدایەوە کە (کتێبەکە بە عەرەبی هەیە). لێرەدا «محەمەد بەڕادە» هەڵیدایە و پێی وت: (دەقەکە ئامادەیە و ئەگەر ویستت وەریبگێڕیت دانەیەکت بۆ دێنم، گەر پێویستیشت بە یارمەتی هەبوو، ئامادەم هاوکاریت بکەم). «تاهیر بن جەلۆن» هەستا بە وەرگێڕانی کتێبەکە بۆ سەر زمانی فەرەنسی و سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا.

ئەم سەرکەوتنە جۆرە دەرچونێک بوو لە تەڵەزگەو نەهامەتی. کاتێک (نانی ڕوت) بە فەرەنسی بڵاوبووەوە، چەند تێکستێکی دیکەم نوسی بوو، بەڵام نە لە مەغریب و نە لە وڵاتانی دیکەی عەرەبی دەزگایەکم چنگ نەکەوت تا بۆم چاپ بکەن. ئیتر کتێبم بیرچووەوەو وازم لە نوسین هێنا و خومدایە خواردنەوە. کە چاپی فەرەنسیەکەی (نانی ڕوت) بڵاوبووەوە، هەرچیم کۆکردبووە دام بە هەقی چاپکردنی نوسینەکانم و لەسەر گیرفانی خۆم بڵاوم کردنەوە. (نانی ڕوت) دیکۆمێنتێکی کۆمەڵایەتیە و پێموانیە ڕەگەزی ئەدەبی زۆری تێدا بێت.

* تۆ لە کاتی نوسیندا، گرنگی بەچی دەدەیت: ڕۆمان، کورتە چیرۆک، بایۆگرافیا؟

- من گوێ بەو شتانە نادەم و کارم بەسەریانەوە نییە. ئەو ناونان و پۆلێنکردنانە شتێکی زۆرر ئەکادیمین. بە بۆچونی من نوسین هەیە، ئەم نوسینەش یان چاکە یان خراپە. هەرچی ڕەگەزی ئەدەبیشە، ئەو گرنگیەی نییە. من ڕۆمانم گۆڕیوە بە بایۆگرافیا و بایۆگرافیاشم کردووە بە ڕۆمان، واتە هەردووکیانم تێکەڵ بە یەکتر کردووە، بەڵام دواجار هەر نوسینە.

لە دوا تێکستمدا کە نوسیومە، شیعر و گێڕانەوەی ڕۆمانئامێز و بایۆگرافیا هەیە. پێویستە بەپێی پلەبەندی زەمەنی ڕوداوەکان، لە بایۆگرافیا دورکەوینەوە. بۆنمونە ئێمە «هنری میللەر»مان هەیە، دەتوانین چۆن پۆلێنی بکەین؟ «میللەر» نوسەرە، نوسەرەو هیچی تر...

**سەرچاوە:**

الحياة - بەرواری 20 - 1 - 2001.

# بەندكردنی پەلكە زێڕینە

غادە ئەلسەمان
لە عەرەبییەوە: سەروەر عومەر

غادە ئەلسەمان ژنە شاعیرو چیرۆكنووسی هاوچەرخی عەرەب ساڵی ١٩٤٢ لە دیمەشـــقو لە دایكو باوكێكی ســـوری لەدایک بووە. یەكەم كۆمەڵە شیعری بە ناوی «چاوەكانت چارەنووســـی منن» لە ساڵی ١٩٦٣دا بڵاوبۆتەوە. شیعرەكانی بە سادەیی‌و رەوانی‌و شـــێوازی تایبەت بەخۆ ئەناسرێنەوە. لە چیرۆكەكانیشیدا باس لە رەنجو ئازارەكانی خەڵكی لوبنان ئەكات. رۆمانی (كابوســـەكانی بەیروت) لەلایەن زانكۆی ئاركانزاسی ئەمریكییەوە خەڵاتی ئەدەبی پێبەخشراوە، رۆمانێكی دیكەی بەناوی «بەیروتی ٧٥» بە زمانی ئیسپانی ساڵی ١٩٩٩ خەڵاتی نەتەوەیی ئیســـپانیای بەدەســـتهێناوە. لە بەرهەمەكانی دیكەی دەكرێت ئاماژە بكرێت بە « چاوەكانت چارەنووســـی منن، خۆشەویســـتیت بۆ رائەگەیەنم، گەواهی ئەدەم بەپێچەوانەی باوە، بەندكردنی چركەساتێكی هەڵاتوو، خۆشەویستی لە نووكی پێ تا تەوقی ســـەر، شەوی بێگانان، لە بەیروت دەریایەک نییە، و خەمنامەیەک بۆ یاسەمینەكان‌و... تاد» بەرهەمەكانی بۆ ١٥ زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون. رەخنەگرانی رۆژئاوایی غادە ئەلســـەمان بە ڤێرجینا وۆڵف ئەچوێنن، تەنانەت لە توێژینـــەوە كرداریییەكاندا ئەو لەگەڵ دۆریس لیســـینگ، كیت شـــۆپن و ئیتالۆ كالڤینۆ ئەژمار ئەكەن! هەرچەندە ئەلسەمان لەو باوەڕەدایە:

«هەر نووسەرێک كوڕی كاتو ژینگەكەی خۆیەتی‌و تەنانەت پاڵەوانەكانیشی هەروان، بەڵام دواجاریش لە قوڵاییدا بەشـــێوەیەک لەیەک ئەچن. شاعیرێكی وەک

من هەوڵ ئەدات ســـەبارەت بە راستییە هاوبەشەکانی وەک ئازار، عەشق‌و مەرگ بنووسێت لەبەرئەوە لەگەڵ نووسەرانی دیکە وەک یەک دێمە بەرچاو».

غادە لە شـــیعری عەرەبیـــدا رووداوێکی چاوەڕوان نەکراوەو یەکێکە لـــەو ژنانەی زۆر بە جوانی‌و راستگۆیانە هەستە ژنانەکانی خۆی ئەنووسێتەوە.

## نەوڕەسەکانی پەڕەیەکی سپی

کاتێک ئەتهێنمە بەرچاوو سەبارەت بە تۆ ئەنووسم
قەڵەم لە دەستمدا ئەبێتە گوڵێکی سوور،
ژنێکی شێتی وەک من ناتوانێ
هێوریەکەی بە هەموو شیک پۆشیەکەوە لەبەر بکات
دوگمە مرواریەکانی کراسی ویقارە ساردەکەی
لەبەردەم کچە قەرەجێکی پێ پەتیدا دابخات
لە توانای ژنێکی گەوجی وەک مندا نەبوو،
بێجگە لە شاعیرێکی داهێنەرو کێوی وەک تۆی خۆش بوێ!
شاعیرێک پڕ لە خۆپەرستی منداڵانە، ناپاکی‌و درۆی زۆر...!
کاتێک ناوەکەت ئەنووسم،
پەڕەکانی ژێردەستم غافڵگیرم ئەکەن‌و
ئاوی زەریایان لێئەڕژێ
نەورەسە سپییەکان بەسەریدا ئەفڕن...
کاتێک سەبارەت بە تۆ ئەنووسم
ئاگر لە خەتکوژێنەوەکەم بەردەبێ و بەسەر مێزەکەمدا باران ئەباری...
لە سەبەتەی کاغەزە فڕێدراوەکانمدا گوڵەبەهارییەکان ئەپشکوێن‌و
چۆلەکەو پەپوولە ڕەنگاوڕەنگەکان لێوەی هەڵدەفڕن...
کاتێک ئەوەی نووسیومە ئەیدڕێنم
پارچە کاغەزو پاشماوەی پەڕەکانم
دەبنە لەتە ئاوێنەی زیوین،
وەک مانگێک کەوتبێتە خوارەوەو بەسەر مێزەکەمدا شکابێ...
فێرم کە چۆن بۆت بنووسم
یان، چۆن لەبیر خۆمت بەرمەوە...!

## نامەی مەڕەکانی تاراوگە

بەرلە خەوتن، مەڕەکان ناژمێرم..
بەڵکو ئەو خۆشەویستانە ئەژمێرم کە جێم هێشتوون..
روخسار لەدوای روخسار بازئەدەن،
لە لەوەڕگاکانەوە بەرەو تاراوگەکان
بەهەموو ئاڕاستەکاندا بڵاوئەبنەوە
زام بە زام ئەیانژمێرمو، ناخەوم
پاشماوەی شەوەکە بە ویردی «ڤالیۆم» بەسەرئەبەم
لەگەڵ ژەهرە ڕەنگاوڕەنگە خەوهێنەرەکانی دیکەدا
دەپرسم چۆن خۆشەویستانی دوێنێ بوونە ڕانەمەڕی وێڵگەی تاراوگە؟
کاتێک چاو دائەخەم،
دەیانبینم چاوەڕێمن لەو بەرەوە،
بەردەوام ئەبم لەسەر ژماردنی روخساریان،
تا بەڵکو لە خەودا خەوم لێبکەوێ!

## عاشقی خەتکوژێنەرەوە

شەو بە نووسینی نامەی خۆشەویستی تۆ رۆژ ئەکەمەوە
بەیانیەکەیشی بە سڕینەوەی یەک بە یەکی وشەکان دەسڕمەوە...
چاوەکانت دوو قیبلەنومای زێڕینن
بەردەوام دەریاکانی جودایی... پیشان ئەدەن!

## جودایی لە نووکی پێ تا تەوقی سەر

من لەگەڵ تۆ بمو تۆ لەگەڵ من
پێکیشەوە نەبین،
جودایی ئەمەیە!
ژوورێک لە خۆیمان بگرێتو
لە ئەستێرەیەکدا جێگامان نەبێتەوە،
جودایی ئەمەیە!
دڵم ژوورێک بێت دیوارەکانی بەربەستی دەنگ بنو

تۆ بەوە نەزانی
جودایی ئەمەیە!
لە ناو جەستەتدا بەدواتا بگەڕێم،
لە ناو وشەکانتا بەدوای دەنگتا بگەڕێم،
لە شووشەی چاوەکانتا بەدوای نیگاتا بگەڕێم،
لەناو دەستا بەدوای ترپەی دڵتا بگەڕێم،
جودایی ئەمەیە!

## جودابیت بزمارێکە لە دڵما

بەبێ تۆ ژیانم ژانەو
هەر ژانیش ئەبێت ژیانم، بەڵێ...
تەنیا هیوایەکم هەیە
پەیوەستە بەو خەتکوژێنە جادوییەوە
کە ناوی کاتە
هەموو شوێن پەنجەو زامەکان
لەسەر دڵ ئەسڕێتەوە
بە خەمێکی قووڵەوە
یادی یەکەمجاری لەئامێزگرتنی تۆ ئەکەمەوە
من وەک دزێکی برسی هەڵئەلەرزیم
کە یەکدیمان لە ئامێزگرت
وەک نوێژبکەین
لەسەر زەوی کڕنووشمان برد
بەڵێ! نوێژمان ئەکرد
بە خەمێکی قووڵەوە
یادی ئەو رۆژە ئەکەمەوە کە قیژاندت بەسەرما:
چۆن هاتیتە نێو ژیانی منەوە؟
ئاه... غەریبەکە
هەر لە سەرەتاوە ئەمزانی
من کچە رێبوارێکی سەر رێگای تەمەنی تۆمو
هیچم نیە
جگە لە دەرچوون لە بەهەشتەکانت
تاهەتایە لە نێو دەممدا

تامی سێوەکەتو یادەوەرییەکەی هەڵئەگرم
بە خەمێکی قووڵەوە
یادی ئەوە ئەکەمەوە
کە من لەسەرو تواناى باوەڕی تۆوە خۆشمویستیو
کاتێکیش بەجێمهێشتی
(ئاخ چۆن توانیم بەجێتبهێڵم!)
دڵخۆشبووم چونکە تۆ هەرگیز بە سنووری
خۆشەویستیمت نەزانی
هەروەها تۆ چیدی ئازار ناچێژیو
هیچکات نازانی لە کام ئەستێرەی پڕ ترپەی خۆشەویستی
دابڕای..!
جودابیت بزمارێکە لە دڵماو
ناوەکەت لێدانی دەمارەکانمەو
یادەوەریت خوێنبەربوونی نهێنی ناوەوەمە
ئەوا من لە دەستت ئەدەمو
تامی فرمێسکە نهێنییەکانم ئەچێژم
لە شەوێکی سوێری نەبڕاوەدا
چیدی جودایی ترسناک نییە
کاتێک ژوان هێندە بە ئازارە...
هەروەها ئازار ئەچێژم
بۆئەوەی بەرامبەر تۆ کردم
دوای ئەوەی ناچارت کردم بیکەم
هیوا مرد
بۆیە شتەکان یەکسان بوون...
دیدارو جودایی
هەردووکیان ئازارنو
(دوو شتن شیرینترینیان تاڵە)...

## یادەوەرییەکی ئایدۆلۆژی

دیموکراتی؟ بەڵێ بێگومان
بەڵام تۆ چی لە شێتێکی وەک من دەکەیت
کە بەردەوام دەنگ بە دیکتاتۆرییەتی عەشقی تۆ ئەدات؟!

## هاوارێک

ئەی غەریبەکە
کاتێک بیر لە هەموو ئەو شتانەی نێوانمان ئەکەمەوە
تیائەمێنم،
ئایا ئەبێ سوپاست بکەم
یان لێتخۆشبم؟

## خۆشم ئەوێی زیاتر لە ...گوناهەکانم

لێوەکانت بە شادی ئەڵێن: ببە ئەبێ!..
دڵم جریوەجریویەتی
بە نێوان تیشکی رۆژدا ئەفڕێ
باڵندەیەک لە ئاگر
ناترسێ لە سووتان لە کورەی شادیدا
کاتێک دەستت بەرم کەوت
وەک دەستی پەیامبەرێک
ناخم لە ژێرزەمینو رێڕەوە نهێنییەکانی ئازارەوە
– کە پربوون لەو تارماییانەی ددانو نینۆکەکانیان بە دیواری ناشیرینی رابردوودا ئەهێنا–
گۆڕا بۆ پەنجەرەیەک کە پەردەکانی پەلکەزێڕینە بوو
ئاوەڵا بۆ ئاسۆو باو بارانو رووداوی کتوپڕو
گۆرانیی پەرییە ئەویندارەکانی شەو!
کاتێک رووخسارت دێ بۆلام
ناسک ئەبمەوە
وەک خۆڵی کەنار دەریایەک کە گەردیلەکانی ترپەیانە
لە ژێر جەستەی شەوێکی هاوینی پێنەگەیشتووداو
تەپڵ لێدانەکانی شەپۆلو
مۆسیقای کزی ئەستێرەکان...
ئەدرەوشێمەوە بۆ هەموو شتێکی باشو جوامێر
لە گەردوونی تەلیسماویتا
بەسەر رۆژەکانما ئەبارێ

بارانێکی درەوشاوە
بە شادومانی ئەمشوا
نەمئەزانی کات ئەو هەموو شادییەی بۆ هەڵگرتووم
ناشمەوێت باوەڕ بکەم
کە شادومانی هەنووکەیم لەگەڵتا
چەشی سەر قولاپی مەینەتی ئایندەیە
هەموو ئەو خۆشەویستییەی دامئەپۆشی پێی
بە تامەزرۆیی خۆڵێکی وشک هەڵیئەمژم
بێ پارێزکردن...
زۆرم خۆش ئەوێی
زیاتر لە گەرمیی گڕکانە زیندووەکان
دوورتر لە رێگەی هەسارەکان
فراوانتر لە خەیاڵەکانی زیندانییەک
زۆرم خۆش ئەوێی...
خۆشم ئەوێی تەنانەت زیاتر لە ژمارەی گوناهەکانم!..
هەرکاتێک زەردەخەنە ئەکەی نامۆکە
پڕئەبم لە شادی
لەبەرئەوەی ئەزانم کاتێک زەردەخەنە ئەکەی
گوڵەکان ئەپشکوێن
لە دڵی تاشەبەردی چیاکاندا
کاتێک زەردەخەنە ئەکەی
ماسییە رەنگاڵەییەکانی شەوق زاووزێ ئەکەنو
لە نێو دەمارەکانمدا مەلە ئەکەن...
کاتێک زەردەخەنە ئەکەی
کێڵگەی یاسەمینە دیمەشقییەکان گەشە ئەکات
لەسەر رۆژەکانزاییە ژەنگاوییەکانمو
شان بە سپێدەوە ئەدەم
کە بە دڵنیاییەوە هەڵدێت
چاوەڕێت ئەکەم
کاتێک پیامدا تێدەپەڕیت
دەریاکانم لەگەڵ کەشتییەکەتدا بەبێ پەشیمانی کۆچ ئەکەن
بەبێ پەشیمانی
ئەی چارەنووسم؟
دەستمت بۆ ئەکەمەوە

بۆئەوەنا بیخوێنیتەوە
بەڵکو بۆ ئەوەی هەرچییەکت ویست لەسەر لەپم بینووسیت
لە پێشبینیو وشەکان
چۆنت پێخۆشە وێنەی تیدا بکێشی
لە هێڵو ڕێگاو سیمبولەکان
بە گوڵەکەت
یان بە چەقۆکەت!

## خۆشم ئەوێی

ناتوانم پێت بڵێم:
«خۆشم ئەوێی»
ئەم وشەیەم بینی
لەسەر شۆستەکان وەک سەرگەردانەکان دوای ئەکەون
لە گۆڕەپانە گشتییەکاندا قامچی لێئەدرێ، وەک سۆزانییەکان...
لە شارەکان دەرئەکرێ
وەک نەخۆشە گولەکان
ناتوانم پێت بڵێم:
«خۆشم ئەوێی»
بیستم ئەم وشەیە لە بارەکاندا ئەوترێ
لە گەڵ وڕێنەی سەرخۆشەکاندا
کاتێکیش وشەی «خۆشم ئەوێی» بۆسەر شەقامەکان هەڵدێت
خەڵکی دوای ئەکەونو بەردەبارانی ئەکەن
پاشان ئەیبەن بۆ نەخۆشخانەی دەروونی
ناتوانم پێت بڵێم:
«خۆشم ئەوێی»
ئەو وشەیەی لە نێوان لێوەکانمدا بۆم هەڵگرتووی
پاکو روونە
وەک پەپوولەیەک لە روناکی
هەرهێندەی لێوم جێبهێڵێ
دەفرێت بەرەو کێڵگەکانی بێدەنگی...
ناتوانم پێت بڵێم:
«خۆشم ئەوێی»

بۆئەوەی هاوڕێ دوژمنەکانمان بە نوکتەو گاڵتەکانیان پیسی نەکەن
کاتێک لە رێگادایە بەرەو لای تۆ
ناتوانم پێت بڵێم:
«خۆشم ئەوێی»
بەڵام من ئەتوانم ئەم وشەیە بە لێوەکانم بنووسم
لەسەر نێوچەوانت، بە بێدەنگی
کاتێک تۆ خەوتویت...
بۆئەوەی پەنجەی خەونەکانت بیچنێتەوە!..

## بەندکردنی وشەیەک کە بەباشی نەیخوێندەوە

با دەمارەکان هەمیشە لێبدەن
هەڵواسراو لە نێوان ئامادەیی‌و نائامادەییدا
لەسەر دیوارەکانی شەوو چاوەڕوانی

***

با خەون هەمیشە دوورەدەست بێت
وەک باریزنی بەفر بەسەر لووتکەدا
تا پێی پیسی واقیعی رۆژانە
لەکەداری نەکا

***

عەشقم ناوێ
خەونم ئەوێ...
جەستەم ناوێ
سێبەرم ئەوێ...
ئایا هیچ لەم زمانە تێئەگەی...!
یان تۆش وەک هەمووان
ئەیخوێنیتەوە بێئەوەی بمخوێنیتەوە؟!

* * * * *

## بەندکردنی ماسیەکی دڵدار

ماسییەکی بەبەردبووی چل ملیۆن ساڵەت پێشکەش کردم‌و
پێت وتم: ئەمە تەنها ماسییەک بوو
کە زەریا عاشقی بوو و
نەمری کرد.

***

ئایا لەگەڵ مندا نابینیت
زەریا هەر لەو ساتەدا کە ماسی لە عەشقی خۆیدا بەند کرد
کوشتیشی...؟!

***

تەنها هونەرە
ئەتوانێ چرکەساتێکی هەڵاتوو بەند بکات
بێئەوەی بیکوژێت
یان بە مردنی ئەو بمرێت!

***

## بەندکردنی نیشانەی پرسیار

ئەی نامۆ
گۆرانییەکان بۆ کوێ ئەڕۆن
دوای ئەوەی دەیانبیستین؟

***

وشەکانی خۆشەویستی بۆکوێ ئەچن
دوای ئەوەی ئەیانڵێین؟

***

چرکەساتە خۆشەکان بۆکوێ کۆچ ئەکەن
دوای ئەوەی تیایاندا ئەژین؟

***

گڕی مۆم بۆکوێ ئەڕوا

دوای سووتانی؟

***

دەستلێدانەکانت بۆکوێ سەرهەڵئەگرن
دوای ئەوەی دەستت ئەڕوا؟

***

بروسکە بۆ کوێ ئەڕوا
دوای کوژانەوەی؟
یان باهۆزەکانی دارستان دوای کۆچکردنیان؟
یان تیرەئەستێرەکان دوای سووتانیان؟
پێمبڵێ بۆ کوێ
بۆئەوەی لەوێ چاوەڕێت کەم خۆشەویستەکەم.

## بەند کردنی پەلکەزێڕینە

خۆشم ئەوێی
بەڵام پێم ناخۆشە بەندم بکەی
وەک چۆن رووبار ڕقی لێیە
رێڕەوەکەی بەندی بکات لە خاڵێکدا
ببە بە تاڤگە یان دەریاچەیەک
ببە بە هەور یان بەربەستێک
ئاوەکانم بەسەر تاشە بەردی تاڤگەتا دەڕژێت
پاشان ڕێڕەوی خۆی ئەگرێو
لە نێو دەریاچەکەتا کۆئەبێتەوە
پاشان درێژە بە هەڵقوڵینی خۆی ئەداو
لە کاتێکی دیدا بەنداوەکەت بەندی ئەکات
بەڵام ئەو ئەڕژێت یان ئەتەقێتەوە...
پاشان ئەبێتە هەڵمو هەور بەندی ئەکات
بەڵام دەبێتەوە بە بارانو بە سەربەستی ئەگەڕێتەوە
لە ڕێگەی یەکەم سەرچاوەکانیەوە
خۆشم ئەوێی
بەڵام ناتوانی بەندم بکەی
وەک شکستی تاڤگە لە بەندکردنی رووباردا
دەریاچەو هەوریش شکست ئەهێنن

لەگەڵ بەربەستدا
منت خۆشبوێ وەک چرکەساتێکی هەڵاتوو
پێشوازیم لێبکە وەک خۆم
ببە بە زەریایەک
بەرین وەک زەریا
قووڵ وەک زەریا
بۆئەوەی برژێمە ناوتەوە!!
ئەڵێ من وەک جیوە وام
هێندە سەرکێشە ناتوانرێ بەندبکرێ
جیوە بەرلەوەی وای لێبێ
نیگای درەوشاوەی خۆشەویستی بوو
لە چاوانی یارێکدا
ئەویندارە زاناکەی لە کیمیادا ویستی
نیگاکانی بەند بکاتو لە کانزایەکی رەقدا وشکی بکات
ئیدی بوو بە جیوە!!
***
نابینی خۆشەویستەکەم کە مێوژ
هەوڵدانێکی بێهوودەیە بۆ بەندکردنی
ناوکی ترێیەکی هەڵاتوو؟
***
خۆشت بوێم وەک خۆم
هەوڵ مەدە نیگاو رۆحم بەند بکەی
پێشوازیم لێبکە وەک خۆم
وەک چۆن زەریا
پێشوازی لە تەواوی ئەو رووبارانە ئەکات کە ئەڕژێنە ناوییەوەو
تاهەتایە رائەکا بۆی
سەرەڕای تاڤگەو بەربەستو دەریاچەکانو
ئەزانێ چۆن رێگای خۆی بدۆزێتەوە
بەرەو پێشوازی بێکۆتایی...

## خوێندنەوە بە شێوازی برایل*

لە یادەوەریما چاوەکانت ئەخوێنمەوە.
دەفتەری روخسارت ئەخوێنمەوە.
جووڵەی دەماریی پەنجەکانت ئەخوێنمەوە.
دووکەڵی جگەرەکەتو هێڵەکانی لەپی دەستت ئەخوێنمەوە.
پەڕە، پەڕە بێدەنگیت ئەخوێنمەوە،
دەفتەری چرپەکانت هەڵئەدەمەوە.
زیاتر لە بەشی خۆم بە رێگاکاندا کۆچم کردووە
زیاتر لە بەشی خۆم لە سەرەڕۆییدا خۆشەویستیم کردووە
بەڵام من هێشتا کتێبی خاکی بوونت ئەخوێنمەوە
بۆئەوەی فێری ئەلفبێی خۆشەویستی بم.
لەگەڵ دەشتەکییەکی جوانی وەک تۆدا،
رۆژ وشەکانی شەو ناسڕێتەوە!

* ئەو شێوازەی نابیناکان بەهۆیەوە نوسراوەکان ئەخوێننەوە.

## سەرچاوەکان:


١-سایتی ایران صدا. شعر و زندگی غادە السمان شاعرە معاصر سوری.
٢- اعلنت علیک الحب، غادة السمان الطبعة الاولی: اذار ١٩٧٦ بیروت — لبنان.
٣-اعتقال لحظة هاربة، غادة السمان الاعمال غیر کاملة ٥ ، الطبعة الاولی: ایلول- ١٩٧٩ بیروت — لبنان.
٤-الحب من الورید الی الورید.
٥-سایتی www.geocities.com/ghada_samman

* کاتێک فەلسەفە دادەبەزێتە سەر شەقامەکان

مستەفا زێن

لەعەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

* پیرەمێرد و زەریا

لاس

* جیهانە سەیرو سەمەرەکەی «فرانز کافکا»

ناهد باشطح

لە عەرەبییەوە: سەردەم

* باخچەیەک لە شیعری فەرەنسی

سەردەم

* ژیان و کەسایەتی کافکا

لاس

* چیرۆکی ژیانی نوسەری (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)دا

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

# کاتێك فەلسەفە دادەبەزێتە سەر شەقامەکان

مستەفا زێن
لە عەرەبییەوە:
شوان ئەحمەد



ئێستا چل ساڵ بەسەر شۆڕشی خوێندکارانی فەرەنسادا تێدەپەڕێت (ئایاری ١٩٦٨). شۆڕشێک دژ بە دنیای سیاسەت و خێزان و بەرنامەکاڵوکرچەکانی خوێندن. ئەم شۆڕشە نەک هەر فەرەنسا، بەڵکو وڵاتانی دیکەی جیهانیشی گرتەوە. خوێندکاران دروشم گەلێکیان بەرز کردبووەوە کە داوای گۆڕینی بەرنامەکانیان دەکرد (بەرنامەی خوێندن و ژیان)، لەگەڵ دابینکردنی داهاتوو بۆیان. لەم سەروبەندەدا

کرێکارانیش داوایاندەکـرد موچەکانیان بۆ زیاد بکرێت، خوێندکاران خۆیـان تێکەڵ بەوانکرد و دروشمی (موچەیەکی کەم و بچوک، لە بەرامبەر تانکی قورس و گرانـدا) بەرزکردەوە. هەندێ لە کرێکاران دەستیان بەسەر چەند کارگەیەکدا گرت، تا خۆیان سەرپەرشـتی بکەن و بەڕێوەی بەرن. هەندێ لـە خوێندکارانیش چەنـد زانکۆیەکیان کۆنترۆڵکـرد. جموجۆڵەکانی خۆ پیشـاندەران، هەر ڕستێک خواست و داواکاری نەبوو. سیاسەت تێکەڵ بـە ئایدیۆلۆژیا بوو. ئـەوەی دنەی خۆ پیشاندانەکانی پاریسـی دەدا و مانگرتنەکانی ئەوێی گەرمتر دەکرد، ئەو خۆپیشاندانە گەورە و بەرفراوانانەی ئەمریکا بوو دژی جەنگی ڤێتنام. خۆپیشاندەران بەهێزەکانی ئاسایشدا هەڵپژان و هەندێ خوێن ڕژا. سەدان هەزار کەس ڕژانە سەر شەقامەکان. حکومەت ناچار بوو وادەی هەڵبژاردن دیـاری بکات و دیگۆلیەکان تیایدا سـەرکەوتن، بەڵام «دیگۆل» دەستی لەکار کێشایەوە. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، دەسەڵات ناچار بوو واز لە لوت بەرزی بهێنێ. لە ژێر فشاری شەقامدا سـەرۆک «لیندۆن جۆنسۆن» ڕایگەیاند، ڕازییە بە ئەنجامدانی دانوستاندن لەگەڵ سەرکردەکانی ڤێتنامی باکوردا.

لە ئایـاری ١٩٦٨ دا فەلسـەفە دابەزیە ناو شەقامەکانی پاریس. لەوێدا «جان پۆل سارتەر و ڕۆلان پارت و میشـال فۆکۆ و لوی ئاڵتۆسـێر و لیڤی شـتراوس»، تێکەڵ بـە خوێندکاران و کرێکاران بـوون. هەموان لـە دژی دام و دەزگا موحافیزکارەکان وەستانەوە، بە دام و دەزگاکانی پارتی کۆمۆنسـتی فەرەنسیشـەوە، چونکە ئەو پارتە هەڵوێستی دژ بە جموجۆڵی خوێندکارانی وەرگرت و هاوکات پشـتیوانی خـۆی لە هێرش و پەلامارەکانـی یەکیەتی سـۆڤیەت بۆ سـەر چیکۆسـلۆڤاکیا ڕاگەیاند. حیزبی کۆمۆنیسـت بە حیزبێکی کۆنەپەرسـت ئەژمار کرا، کە تەنها خواسـتی گەیشتبوو بە دەسەڵات، لە ڕێی گەمە تەقلیدی و سواوەکەی دیموکراسیەوە. لای خۆیەوە فەلسەفەش شۆڕشێکی بەخۆیەوە بینی کە بووە مایەی سەرهەڵدانی ژمارەیەک فەیلەسوفی نوێ، دیارترینیـان بریتی بوون لـە: «جاک دێریدا و بێرنارد هنـری لیڤی». بەشـێکی زۆری گەورە فەیلەسـوفانیش ڕویان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریـکا کـرد، کارێک کە بـووە مایەی ئەوەی کاریگەریەکـی زۆر لەسـەر زانکۆکانـی ئەوێ جێبهێڵێـت، هەندێکی لـە کارو بەرهەمەکانی «ئیـدوارد سـەعید»دا هەسـت پێدەکەین، بە تایبەت لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا.

هاوکات لە وڵاتانی ئێمەشـدا سـاڵی ١٩٦٨، خوێندکاران کەوتنە خۆیان و ڕاپەڕین، بەتایبەت لە بەیروت و قاهیرە. خوێندکاران کاتێک کەوتنە ئەو جموجۆڵە، هێشـتا ساڵێک بەسەر شکستی حوزەیرانـی ١٩٦٧ تێنەپـەڕی بـوو. ڕاپەڕینی خوێنـدکاران لای ئێمـە هۆکارەکەی خواسـتی خوێندکاریانە نەبوو، هیچ یەک لەوانە داوای یان پێشنیاری بەرنامەیەکی ئەکادیمی جیاوازتریان نەدەکرد و کارەکەیان دژی ترادسـیۆنی زانکۆیی نەبوو، چونکە ئێمە تـا هەنوکەش خاوەنی ئەو جۆرە لە ترادسـیۆنی زانکۆیی نین. هۆکاری ئەو ڕاپەڕینانە سیاسـی بـوو. ناڕەزایەتی بوو دژی شکسـت. سـەرکوتکردن لای ئێمـە زۆر لەوەی فەرەنسا سـەختتربوو. خوێندکارانی ئێمە بوون بە خێڵ: خێڵی ڕاسـتڕەوەکان لـە دژی خێڵی چەپڕەوەکان. پێکدادان و ئامبازبونی یەکتری لە نێوان ئەو دوو خێڵەدا، بوو بەشتێکی ڕۆتینی و ئاسایی. گۆڕانیەکانی «شێخ ئیمام» وشیعرەکانی «ئەحمـەد فوئـاد نەجم» لە میسـر، ترۆپکی بیرکردنەوەی فەلسـەفی ڕادیکالانەبوو. هەندێک لەوانـەی دروشـمی خوێندکارانی فەرەنسـایان

هەڵگرتبوو، بە چاوێکی سەیر تەماشا دەکران و نەشاز بوون. بە کورتیەکەی لای ئێمە دەرەنجامی ئەو خۆپیشاندانانە، بە شکستی زانکۆکان و خوێندکاران و پاشە کشەکردنیان کۆتایی هات.

هیچ کەس لەو سەردەمەدا دیقەتی ئەوەی نەدا کە شۆڕشێکی پێچەوانە بەڕێوەیە، ئەویش بە بڕیار و بە پاڵپشتیکردنی فەرمی دەوڵەت. کاریگەریەکانی ئەم شۆڕشە پێچەوانەیەش لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی ڕابردودا بەدەرکەوت و هەتا ئێستاش کاری خۆی دەکات. شۆڕشێک کە هەموو چەمکە غەیبانی و سروتئامێز و مەزهەبیەکانی گەڕاندەوە ناو زانکۆکان.

لە فەرەنسا ڕاپەڕین و شۆڕشی خوێندکاران، فەلسەفەی نوێی بەرهەم هێنا، بەڵام لە وڵاتانی ئێمە فەلسەفە هەڵهات.. فەیلەسوفەکان ئاوابون و هۆڵەکانی خوێندنیش بۆ «بن لادن» و «زەواهیری» و «زەرقاوی» و هێزە ئاینی و مەزهەبیەکان چۆڵ بوون. بەڵام بابزانین دوای چل ساڵ لە شۆڕشی خوێندکارانی ١٩٦٨، ئەمڕۆ چ باسە؟

دوای چل ساڵ، گەنجانی دوێنێ بونەتە کەسانی پیرو پەککەوتە. هەندێکیان لەناوەندی دەسەلاتدان و بەرپرسیارێتی سیاسیان لە ئەستۆیە (وەک: دانیال کوهین بندت. و: کوردی)، یان بەرپرسی ئەو زانکۆیانەن کە لە دژی ڕاپەڕین و بەگژ سستمی خوێندنەکەیدا چونەوە. هەندێکی دیکەیان (کە نمونەی ئەمانە لە وڵاتانی ئێمەدا زۆرە)، لەوپەڕی چەپەوە گواستیانەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست. لە تیۆریزەکردنی تێزە و تیورەکانی «ماوتسی تۆنگ و چی گیڤارا» و شۆڕشی بەردەوام وازیان هێنا، بۆ لایەنگیری «جۆرج وکەر بۆش». پێش چل ساڵ لەمەوبەر فەلسەفە لە زانکۆکانی پاریسەوە دابەزیە سەر شەقامەکانی فەرەنسا، بۆ ئەوەی ئایدیا و بیرو بۆچونی تازە بخولقێنێ. لای ئێمەش کاتێک ئایدیالە نمونەییەکان دابەزینە ناو زانکۆکان، زانکۆکانیان کرد بە شەقامگەلێکی دواکەوتوو.

### سەرچاوە:

الحياة، ٦/ ٥/ ٢٠٠٨.

# پیرەمێرد و زەریا




لاس

بە درێژایی مێژوو کێشەو ململانێی مرۆڤ و سروشت، بابەتێکی گەرمی چیرۆک و ئەفسانە و حەکایەتەکانی بەرئاگردان بووە، لەگەڵ سەردەمی مۆدێرن و شۆڕشی بۆرژوازیشدا، سەروەختێک ڕۆمان دەبێتە داستانی ئەو قۆناغە تازەیە، ئیتر ئەو بابەت و کێشانەی پێشتر لە فۆرم و چوارچێوەی تردا تەعبیریان لێدەکرا، لە ناو ڕۆمان و چیرۆک و نۆڤلێتدا باس دەکرێن.

(پیرەمێرد و زەریا) شاکارێکی ئەدیبی گەورەی ئەمریکایی «ئەرنست هەمنگوای»یە، کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا نوسیویەتی و باس لە ململانێی نێوان مرۆڤ و سروشت دەکات. «هەمەنگوای» یەکێکە لە ڕۆماننوسە ناودارەکانی سەدەی بیستەم. ڕۆژی ٢١ی تەموزی ١٨٩٩ لە

شاری (ئۆک پارک)ی سەر بە ویلایەتی (ئەلینۆی) هاتۆتە دنیاوەو لە دووی تەمموزی ١٩٦١ خۆی دەکوژێت و کۆتایی بە ژیانی دێنێت.

«هەمەنگوای» خاوەن خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵە و چەندین شاکاری ئەدەبی (وەک چیرۆک و ڕۆمان)، پێشکەش بە خوێنەران کردووە. نموونەکانیان: (پیرەمێرد و زەریا، زەنگەکان بۆ کێ لێدەدرێن و ماڵئاوا لە چەک و... هتد). بەناوبانگترین کاری ئەدەبی ئەو، ڕۆمانی (پیرەمێرد و زەریایە). هەر لەبەر ئەم کارەشیەتی کە لە ساڵی ١٩٥٤ دا خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵی دەدرێتێ.

لەم کارەیدا «هەمنگوای» مەبەستیەتی ئەوە پیشانبدات کە ڕەنگە مرۆڤ لە ململانێکانی لەگەڵ سروشتدا تێکبشکێت، بەڵام هەرگیز نادۆڕێت. ئەو دەیەوێت ئیرادەو هێز و توانای مرۆڤ بەرز بنرخێنێت. مرۆڤ وەک کائینێکی بزێو و بە توانا ڕەسم بکات. ئەو لەم ڕۆمانەیدا زیاتر لە دیدگای «نیچە» و فەلسەفەی «نیچە»وە نزیکە و دەیەوێت مرۆڤ وەک بونەوەرێکی گەورە نیشان بدات.

پاڵەوان و کارەکتەری سەرەکی ئەم ڕۆمانە، پیرەمێردێکی بەساڵاچووە بەناوی «سانتیاگۆ»ەوە. ئەم پیاوە پیشەی ڕاوەماسیە و سەرو سەودای لەگەڵ دەریادایە. ڕۆژانە بۆ بژێوی ژیانی ڕوو لە دەریا دەکات و لەسەرپشتی بەلەمە چکۆلانەکەی بەدوای نێچیردا دەگەڕێت. وەلێ سەروەختێک دێتە پێش، چل دانە ڕۆژ هیچی دەسگیر نابێت و نائومێدانە دەگەڕێتەوە. ئەو چل ڕۆژە مێرد منداڵێکی لەگەڵدا دەبێت، بەڵام کەس و کاری منداڵەکە دەزانن هەموو ڕۆژ «سانتیاگۆ» بە دەست بەتاڵی دێتەوە، کوڕەکەیان دەگوازنەوە لای چەند ڕاوچیەکی دی. پاشان ئەوەی زۆر ئەو منداڵە زویر دەکات، دیمەنی گەڕانەوەی ئێوارانی پیرەمێردە بە دەست بەتاڵی و بێ ڕاو، بەڵام ڕۆژێکیان ماسیەکی گەورە بە داوەکەیەوە دەبێت و پیرە بۆ چەند شەو و ڕۆژێک دەکەوێتە ململانێ لەگەڵیدا و کۆڵی لێنادات، تا دەیهێنێتەوە کەنار دەریاکە. وانەی ئەم ڕۆمانە وانەی ئیرادەگەرێتیە، نیشاندانی شکۆمەندی و مەزنی مرۆڤە لە بەرامبەر هێزە سروشتیەکاندا. (پیرەمێرد و زەریا) لەو ڕۆمانانەیە کە بیر ناچنەوە.

# جیهانە سەیرو سەمەرەکەی "فرانز کافکا"



ناهد باشطح
لە عەرەبییەوە: سەردەم

چی وا لــە «فرانز کافکا» دەکات، تا لە ڕۆمانی (بەدگۆڕان) دا ئەو دیدگا ڕەشــبینە لەســەر مرۆڤی هاوچەرخ پێشــکەش بــکات. «گریگــۆری» فەرمانبەرێکە، ڕۆتینی کاری ڕۆژانەی فەرمانگەکــەی و فشــاری زۆری پێداویستی خانەوادەکەی کە لە دایک و بــاوک و خوشــکێکی پێکهاتــووە، ماندوی دەکەن و بڕستی لەبەردەبڕن. تا وایلێدێــت بەیانیەک بەخەبەر دێت و دەبینێــت بۆتە دەعبایەکی گەورە و لەبری ئەوەی سەرچاوەی بەختەوەری بێــت، دەبێتــە مایەی سەرئێشــە و وەڕسی بۆ خێزانەکەی.

کاتێک ئەو دەعبایە دەمرێت، کەس و کارەکەی ئاهێکی خۆشی هەڵدەکێشن و پشــوو دەدەن، وەک ئەوەی ڕایەڵی مرۆڤ بە خانەوادەکەیەوە پێداویستی مادی بێت، گەر توانای دەستەبەرکردنی ئەوەی نەبوو، کەسوکاری دەستبەرداری دەبــن و دەکەونە بەگژاچونەوەی، وەک چــۆن بەگژ هــەر دەعبایەکی پیس و

درندەدا دەچنەوە!! چی وا لەم ئەدیبە دەکات لە یەکێک لە ڕۆمانەکانیدا پاڵەوانەکەی ڕاپێچی هۆڵی دادگا بکات، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی کردبێت. ڕێوڕەسمی دادگایکردنەکەشمان بەشێوازێکی زۆر ترسناک نیشان دەدات. دادگایکردنەکە لە ژێر سەقفێکی نزمدا بەڕێوەدەچێت، لەبەرئەوەش بەدرێژایی کاتی دادگاییەکە ئامادەبوان سەریان شۆڕ کردۆتەوەو خۆیان چەماندۆتەوە، سەرەنجامیش پاڵەوانەکە وەک ئاژەڵێکی ڕاپێچی مردن دەکرێت؟!

بۆچی «کافکا» چێژ لەو کۆتاییە تاڵ و ترسناکانە دەبینێت؟ پاڵەوانەکانی ئەو بەردەوام دەمرن، ئەوەی هەیە جیاوازی مردنەکانیانە. پاڵەوانی ڕۆمانی (کۆشک) دەکوژرێت، پاڵەوانی (دادگا) لەسێدارە دەدرێت. «گریگۆری سامسا»ی پاڵەوانی (بەدگۆڕان) وەک دەعبایەکی دزێوو دەعەجان دەمرێت. لە چیرۆکی (چەقەڵ و عەرەب)یشدا، لاکی ئەو حوشترە دەبێتە ئاگر و دوکەڵ و برین و چڵپاو!!

چی وا دەکات یەکێک لە گۆڤارەکانی فەرەنسا داوای سوتاندنی نوسینەکانی «کافکا» بکات، لەبەرئەوەی بانگەشە بۆ نائومێدی و وێرانکردن دەکات؟!! یان چی وا دەکات «کافکا» خۆی داوا لە «ماکس برود»ی هاوڕێی بکات، بەر لەوەی بمرێت هەرچی هەیە بیسوتێنێت؟!!

ئەمانە هەمووی پرسیارگەلێکن، تەنها وەڵامێکیش بۆیان ئەو جیهانە سەیر و سەمەرەیەیە کە «کافکا» تێیدا ژیاوە.. تەمەنێکی کورت ئەگەر بە ساڵ ئەژماری بکەین، لێوان لێو لە ئازار و ژان کە وایلێدەکەن بەو ڕەشبینیە بنوسێت و بیربکاتەوە. سەرباری ئەوەشی کۆلێژی مافی تەواو کردبوو، بەڵام وەک پارێزەر و یاسا ناسێک کاری نەکرد، بەڵکو بە وەزیفەیەکی ئاسایی لە فەرمانگەی قەرەبوکردنەوەی کرێکاران ڕازی بوو. هاوکات ڕێگەی نەدەدا ئەوەی دەینوسی بڵاوبکرێتەوە. سەرەڕای ئەوەش لە سەرەتای تەمەنیدا دوچاری نەخۆشی سیل بوو. لە دنیاداو لەڕێی هیچ شتێکەوە هەستی بە خۆی نەدەکرد. تەنانەت ئەوکاتەشی خەریکی خوێندنی یاسا بوو، پەیوەندی بەم خوێندنەوە زۆر پاسیڤ بوو، تا ئەو ڕادەیەی ئەم قۆناغەی ژیانی بە قۆناغی مێشک سوتان و وێرانبون ناودەبات.

سەروەختێکیش بیر لە قوتابخانە و سەرەتای تەمەنی منداڵی دەکاتەوە، خۆشیی پێنایەت و نایبزوێنن. وەک ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان حەزی بە چونە قوتابخانە و یاریکردن بە قەڵەم و کاغەز نەکردبێت، وەکو هەموو منداڵانی ئەم دنیایە.

«کافکا» هەمیشە قوتابخانە و خێزانەکەی سەرکۆنە دەکرد و پێیوابوو بەرپرسیارن لە کوشتنی هەموو ئەو بەهرە و تایبەتمەندیانەی تێیدا هەبوون. هەر کاتێکیش باس لە باوکی دەکات، هەستدەکەیت سۆزی باوکایەتی وێنەیەکی جوانی لە ناخی ئەودا نەبووە. دژی ئەو شێوازی مامەڵەکردنەی باوکی بووە کە وەک بازرگانێک و خاوەن کارێک، لەگەڵ چواردەورەکەیدا کردویەتی. ڕەنگە ئەم پەیوەندیە پاسیڤە یارمەتیدەرمان بێت بۆ ڕونکردنەوەی ئەو وێنە پڕ نیگەرانیەی لە ئەدەبی «کافکا»دا هەیە. ئەوە ئەوە کە دەڵێت: (بە دەستی خۆم، خۆم وێرانکرد).

ئەم ئەدیبە لە ناو بازنەیەکی بەرتەسکی ڕەشبین و دڵەڕاوکێدا ژیاو ئەمەش گیانی هیواو ئومێدی لە ناخیدا خنکان، سەروەختێکیش ویستی نوسین بکاتە دەرەتانێک، وشە و پیتی نوسینەکانی زیاتر ڕۆحیان ئەتاساند.

**سەرچاوە:**

المستقبل — ١١/ ٢/ ٢٠٠٥.

# باخچەیەك لە شیعری فەرەنسی




سەردەم

ئەگەر لـــە خۆرئـــاوادا و لە بواری فەلسەفەدا پێشڕەوی و پێشدەستی بۆ ئەڵەمانەکان بێت، ئەوا لە کایەی شیعرو ئەدەبیاتدا، ئەو جێگەیە فەرەنسیەکان داگیری دەکەن. لە ســـەردەمی تازەدا یان بڵێین لە ڕۆژگاری مۆدێرنەدا ئەوە ئەدیبانی فەرەنســاییین کە تازەگەری دێننـــە بـــواری شـــیعر و چیـــرۆک و ڕۆمانەوە. هەر لە «شارل بۆدلێر»ەوە تا «ئارســـەر ڕامبـــۆ» و «بەلزاک» و «ڤیکتۆر هۆگـــۆ» و «ئەمیل زۆلا» و «ملارمێ»، تا دەگاتە «ڕینێیە شار» و «ئیڤ بۆنڤوا».

کتێبـــی (باخچەیـــەک شـــیعری فەرەنسی)، هەوڵێکە بۆ نزیکردنەوەی خوێنەری کورد لە دنیا هەمە ڕەنگەکەی شیعری فەرەنسی لە «بۆدلێر»ەوە تا سوریالیەکان.

گەر حەز دەکەیت بەختەوەربیت،
ئەو گوڵە مەچنە کە دێتە سەر ڕێت و
خۆی پێشکەشی دەستت دەکا.
گوڵ هەر کە پشکوت، پەژموردەیە
با لە جەستەیدا
خوێنێکی خودایی قوڵپ بدا!

ئەم کتێبـــە ئەگەرچی بە قەوارەش گەورە نییە، بـــەڵام دەتوانێت هەندێ

خەسڵەتەکانی ناسـنامەی شیعری فەرەنسیمان پێ بناسـێنێ، لە سـەردەمی «بۆدلێرەوە» تا سوریالیستەکان. واتە ئەو قۆناغەمان پێ ئاشنا دەکات کە بە (گوڵە بەدەکان) دەست پێدەکات و بەسەر کێشیە شیعری و هونەریەکانی «ئەندرێ بریتۆن» و هاوڕێکانی کۆتایی دێت. ئەم کتێبە جگـە لە کرۆنۆلۆژیایەکی ناسـاندنی شـیعری فەرەنسی، ناساندنێکی خێرای شاعیرانی قۆناغە جیاجیاکانی شیعری فەرەنسـی تێدایە، لەگەڵ چەند پارچە شیعرێکیاندا.

لە ڕاسـتیدا بۆ ئەمڕۆ هەر بە تەنها فەرەنسی و فەرەنسـی زمانەکان مەعنی نین بە شـیعر و ئەدەبیاتی وڵاتی فەرەنسا، لەبەرئەوەی کاریگەری و شـوێن پەنجەی ئـەو ئەدەبە قەشـەنگە بە دوورترین شـوێنی دنیـا گەیشـتووە. ئەمڕۆ ڕۆشـنبیریەکی دنیـا نییـە، لە کایەیـەک لە کایەکانیدا، کاریگەری هونەر و ئەدەبی فەرەنسی لەسـەر نەبێت. ئـەم کاریگەریە بە ئاشـکرا لە شیعری عەرەبی و فارسی و تەنانەت کورردیشدا دەبینرێت. شوێن دەستی شیعرەکانی «ڕامبۆ» و «بۆدلێر» و «مالارمێ» و «سان جۆن پێرس»، بە ئاشکرا بەکار و بەرهەمی زۆرێک لە شاعیرانی دنیاوە دیارە.

پرۆژەی گۆڤاری شیعری (الشعر)ی لوبنانی و (الکلمـة)ی عێراقی و بزوتنـەوەی ڕوانگەی ئەدەبی کوردی، کەم تا زۆر کاریگەری ئەدەبیاتی خۆرئاوایی بە گشـتی و فەرەنسـایی بەتایبەتی پێوە دیارە. خوێندنەوەی شـیعری شـاعیرانی فەرەنسی قۆناغە جیاجیاکانیش بە زمانی کوردی، ئەو چاوەمان دەداتێ تابتوانین جۆری کاریگەری ئەو شاعیرانە لەسەر ئەدەبیاتی کوردی و وڵاتانی دراوسێ ببینین. خوێندنەوەی ئەم کتێبەش جگە لە چێژ بینین لە سـتاتیکا و فەزای شـیعر ئەو شاعیرانە، بۆ ئاشـکرا کردنی جۆر و ڕادەی ئەو کاریگەریانەش گرنگە.

# ژیان و کەسایەتی کافکا

لاس




بەبێ تێگەیشتن لە «فرانز کافکا» و ئەدەبی ئەو، تێگەیشتن لە سەدەی بیستەم کارێکی قورس و گران دەبێت. لە ڕاستیدا ئەدەبی ئەو، چاوێکی ترمان دەداتێ بۆ تێگەیشتن لە ماجەرای ئەو شتانەی لەو سەدەیەدا ڕوویاندا، سەدەی گەشەی خێرای تەکنۆلۆژیا و سەدەی جەنگە گەورەکان و سەدەی پلیشانەوەی مرۆڤ، لە ژێر زەبری دەسەڵاتێکی کۆنترۆڵکاردا. ئەم کتێبە یەکێکە لە سەدان ئەو کتێبانەی، بە درێژایی سەدەی ڕابردوو لەسەر ئەدەب و ژیان و کەسایەتی «فرانز کافکا» نوسراون. ئەم پیاوە ئەگەرچی

تەمەنێکی زۆر کەم ژیا و ئەدەبێکی کەمیشـــی نوســـی، کەچی وەکو ئەوەی ژیان و کەســـایەتی و ئەدەبەکەی تەلیســـمێک بن، تاکو ئێســـتاش هەر لە بارەیانەوە دەنوســـرێت و دەنوســـرێت و دەنوسرێت.

ئەو کاروانـــی ژیانی خۆی، زۆر بە تەنیایی و گۆشـــەگیری و بێدەنگی بە ڕێکرد. وەلێ لەو بێ دەنگی و گۆشەگیریەدا، ئەدەبێکی مەزنی خولْقاند، کـــە تا ئەمڕۆش دەیان و ســـەدان چیرۆکنوس و ڕۆماننوســـی گەورە لەسەری دەڕۆن. ڕۆماننوسی گـــەورەی کۆلۆمبیایی و خاوەنـــی خەلاتی نۆبڵ «گابریل گارســـیا مارکیز»، دەرهەق بە گەورەیی و کاریگـــەری ئەدەبی ئەو دەنوســـێت و دەڵێت: (ئەوە کافکا بوو فێری کردم بە چەشنێکی تریش دەکرێت بنوسین). کەسانی دیکەی خاوەن ناوبانگ و شۆرەتی دنیای ئەدەب، وەک «میلان کۆندێرا» و «کۆیتزی» و «خۆرخـــە لویس بۆرخیس» و «هارۆکی مۆراکامی» و... هتد، ئیلهام لە دنیای نوســـینی «کافکا» وە وەردەگرن. شایەنی باسە هەموو ئەو شاکارە بەرزانەی «کافکا» نوسیونی و ئەمڕۆ دەیـــان بینین، لـــە دوای مەرگی خۆی چاپکـــراون و بلاوکراونەتەوە. ئەو بەو دیدە ڕەش بیـــن و بێهودەییەوە، نەک لەگـــەڵ بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانیدا نەبووە، بەڵکو لەسەرە مەرگیشدا وەســـیەت بۆ «ماکس برود»ی هاوڕێی دەکات، تـــا هەرچیەکی نوســـیووە گـــڕی تێبەربدات و بیانسوتێنێت. «ماکس برود» ئەوە چاک دەکات کـــە ئەو کارە ناکات و ئەو داواکاریەی هاوڕێکەی بـــەدی ناهێنێـــت، گەر نا ئەوا ئێمـــە لە یەکێک لە بەهرەمەندەکانی ســـەدەی بیســـتەم مەحروم دەبووین. سەدەی بیستەمیش بەبێ «کافکا» و ئەدەبی ئەو، لە شتێکی گەورەی کەم دەبوو.

خوێنـــەری کورد زمانی ئێمـــە، لە زۆرێک لە شـــاکارە ئەدەبیەکانی دنیا بێ بەشـــە، لە ڕیزی پێشەوەشیان شـــاکارە ئەدەبیەکانی «کافکا». سەدەی بیســـتەم کۆتایی هات و تێپەڕی، بەبێ ئەوەی کتێبخانەی کوردی بەشـــێکی بە ئەدەبی نـــاوازەی «کافکا» ئاوەدان بێتەوە، کەواتە با لە سەدەی بیســـت و یەکدا ئەو کارە بکەین. ئەگەر کتێبی (ژیان و کەســـایەتی کافکا) سەرەتایەک بێت، ئەوا دەکرێـــت وەرگێڕانی چیرۆک و ڕۆمان و نامەکانـــی، هەنـــگاوی دووهەم بێـــت. چونکە ناســـینی ئەو و ئەدەبی ئەو ناسینی سەدەیەکی جەنجاڵ و پڕ ئاشوبە.

# چیرۆکی ژیانی نوسەری
# (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)دا

لە عەرەبییەوە:
شوان ئەحمەد



Beckett
Lawrence graver
Cambridge university press, 2004.
p.128

نوسەری ئەم کتێبە «لۆرنس گرینەر»ی ڕەخنەگرە کە پسپۆڕە لە بواری ئەدەبی نوێدا. لەم کتێبەدا باس لە یەکێک لە کارەکتەرە هونەری و ئەدەبیە گرنگەکانی سەدەی بیستەم دەکات، ئەویش «ساموئیل بیکێت»ە. وەکی دەزانرێت «بیکێت» ساڵی ١٩٠٦ لە بنەماڵەیەکی پرۆتستانت مەزهەب لە دبڵنی پایتەختی ئیرلەندا هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی ئامادەیی و زانکۆی لە وڵاتەکەی خۆیدا خوێندووە. لە ساڵی ١٩٢٨ لە پەیمانگای باڵای مامۆستایان لە پاریس وەک مامۆستای زمانی ئینگلیزی دەست بەکار دەبێت. دوای ئەوەی لە نێوان ساڵانی ١٩٣١-١٩٣٧ چەند جارێک سەردانی ئینگلتەرا و ئەڵەمانیا و ئیرلەندا دەکات، ساڵی ١٩٣٨ بە یەکجاری لە پاریس نیشتەجێ دەبێت. سەروەختێکیش جەنگی دووەمی جیهانی دەست پێدەکات، دەچێتە ڕیزی پارتیزانە فەرەنسیەکان لە دژی نازیستە داگیرکارەکان. هەرچەندە فەرەنسیش نەبوو، بەڵام چالاکانە ئەرکی خۆی بەجێ دێنێت. پاشان لە ساڵی ١٩٤٢ ڕودەکاتە ناوچە شاخاویەکان، لە ترسی ئەوەی نەک پۆلیسی نهێنی ئەڵەمانی (گستاپۆ) دەسگیری بکەن. لەو ماوەیەدا هەم بۆ خۆشاردنەوەو هەم بۆ نان پەیدا کردن، کاری جوتیاری دەکرد. نوسەری ئەم کتێبە لە بەشێکی دیکەی چیرۆکی ژیانی «ساموئیل بیکیت»دا دەڵێت: (دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٤ پاریس لە چنگی نازیەکان ئازاد کرا، بیکیت دەگەڕێتەوە بۆ شارەکە و لەوێدا دەست بە نوسینی زۆربەی بەرهەمەکانی دەکات و بە شێوازی تایبەتی خۆشی بەشداری ژیانی ئەدەبی فەرەنسی دەکات. لە ١٩٤٦ بەدواوە بە فەرەنسی دەنوسێت، بەڵام دەستبەرداری زمانی ئینگلیزیش نابێت). ساڵی ١٩٦٩ خەڵاتی نۆبڵ لە بواری ئەدەبدا وەردەگرێت، لەو کاتەشدا لە لوتکەی شۆرەت و شکۆمەندیدا بوو.

یەکێک لە شاکارە مەزنەکانی «بیکیت» شانۆنامەی (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)یە کە باس لە ژیانی دوو کەسایەتی دەکات بە ناوی «فلادیمێر» و «ئیستراگۆن» و لە چاوەڕوانی کەسێکدان بە ناوی «گۆدۆ»وە. دیمەنی یەکەمی ئەم بەرهەمە ئەوەیە دوو کەس دەبینین کە لە قەراغ ڕێیەکدا و لە تەنیشت درەختێکی ڕوتەنداو لە بیابانێکی چۆڵ و هۆڵدا، وەستاون و چاوەڕێن. بەڵام «گۆدۆ» نایەت، ناچار ڕۆژێکی دیکە چاوەڕێی دەکەن، بەڵام هەر دیار نابێت، لە بری «گۆدۆ» دوو کارەکتەری لێبوک دێن، ئەم دوانەش بەوانە دەچن کە لە سێرکدا کاردەکەن و ناویان «بوزۆ» و «لیکی»یە.

یەکەمیان دووەمیانی وەک سەگ پەتکردووەو بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشێت، وا دێتە پێش چاو کە کۆیلە و خزمەتکاری بێت. بەمجۆرە ڕۆژان دێت و دەڕوات، بە بێ ئەوەی «گۆدۆ» بێت. دواجار پەردە بەسەر دیمەنی «فلادیمێر» و «ئیستراگۆن»دا دادەدرێتەوەو هەردووکیان پیرو کەنفت بوون، لە چاوەڕوانی کەسێکی سەیر و سەمەرەدا کە هەرگیز نایەت، سەرەڕای چاوەڕوانی زۆری ئەوانیش بۆی. لە کۆتایدا هەردوکیان لە ڕێی خۆخنکاندنەوە هەوڵی کوشتنی خۆیان دەدەن.

شانۆگەری (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)دا، بە پێچەوانەی شانۆی کلاسیکیەوە، هیچ گرێیەکی تێدانییە و نەڕوداوی تێدایە و نە هیچ شتێکی لۆژیکی، بەڵکو تەعبیرە لە پوچێتی ژیان و بوون. ئێمە هەمیشە چاوەڕێی شتێک دەکەین، بەڵام ئەو شتە هەرگیز نایەت و ڕونادات. تەنانەت گەر بێتیش، ئەوا چاوەڕێی شتی دیکە دەکەین و.. هتد. لێرەوە ژیانمان پڕ دەکەین لە قسە و قسەڵۆکی پووچ و بێ مانا، بەڵام گرنگە بۆ کات

بەسەربردن. ئێمە دواجار چاوەڕێی مردن دەکەین کـــە بە دڵنیاییەوە دێت، بە پێچەوانەی «گۆدۆ» وە کە هەرگیز نایەت.

نوسەری ئەم کتێبە « لورنس گرینەر» پێیوایە شـــانۆگەری (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)دا لە ســـاڵی ١٩٤٨ نوســـراوە، بەڵام تا ساڵی ١٩٥٢ نەخراوەتە ســـەر تەختەی شـــانۆ. ئێمە بۆ ئەوەی بە باشی لەم دەقە تێ بگەین، پێویســـتە بگەڕێینەوە بۆ بارودۆخی ئەو ســـەردەمە. هەرچەندە «بیکێت» لە سیاسەتەوە دوور بوو، بەڵام وەکی کەسانی دی ئەو شـــتانەی لە چواردەوریدا ڕویان دەدا کاریان تێدەکرد. وەک نوســـەرانی دیکە تێکەڵبونی شتە تایبەتیەکانی خۆی لەگەڵ شـــتە گشـــتیەکاندا، دەســـتیان لە دروســـتکردنی تێڕوانینی ئەو بۆ دنیادا هەبوو.

وەک باسمان کرد « بیکێت» سەرەتای ژیانی بە وێڵگەردی لە نێوان چەند وڵاتێکی ئەوروپیدا دەســـتپێکرد کـــە ئەمانـــە بـــوون: (ئێرلەندا، ئنگلتەرا، فەرەنسـا، ئەڵەمانیـا)، بەڵام دواجار لە فەرەنسا گیرســـایەوەو لەوێدا نیشتەجێ بوو. ساڵی ١٩٣٧ لە پاریس توشی ڕوداوێکی سەیر و ناخـــۆش دەبێت، کاتێـــک زەلامێک بێ هیچ و لە خۆڕا پەلاماری دەدات و بەر چەقۆی دەدات. ڕەنگە ئەمە کاریگەری هەبووبێت لەسەر دروستکردنی ئـــەو جیهانبینیە پوچگەراییەی ئـــەو بۆ ژیان. وەکو دەزانین ئەو یەکێکە لە ڕێبەرانی شـــانۆی ئەبسۆرد.

گومانی تێـــدا نییە کە ژیانـــی وێڵگەردانەی دەســـتی هەبوو لە دروســـتکردنی تێڕوانینی بۆ دنیا و تانە گەیشـــتە تەمەنی پەنجا ساڵی ئارام نەبووەوەو سەقامگیر نەبوو. لەو کاتەدا چاوەڕێی ئەوەی دەکرد دەروویەکی لێ بکرێتەوە، بەڵام بێ ئەنجام، تەواو وەک «گۆدۆ»ی پاڵەوانی شانۆگەریە بەناوبانگەکەی. ســـەرباری ئـــەوەش ڕوداوەکانی دووەم جەنگی جیهانی و کارەســـاتەکانی و ئەو ملیۆنەها مرۆڤەی لەو شەڕەدا تیا چوون، هەموو ئەوانە بەشـــدار بوون لە دروستکردنی ئەو دیدگا ڕەشبینەی بۆ جیهان، لەبەرئەوە «بیکێت» ژیانی بە جدی نەگـــرت، چونکە ڕەنگە لە هەر کاتێکدا بێت نا ئومێدمان بکات و شت گەلێکمان نیشان بدات کە هەرگیز چاوەڕێی نەبوین.

ڕەنگە بە درێژایی چەندین ساڵ و مانگ ڕەنج بدەیـــن و خۆمان ماندوکەین بۆ ئـــەوەی بگەینە ئاکامێـــک، بـــەڵام دەبینین جگە لـــە نائومێدی دەســـتمان بە هیچ ناگات، لەوانەشـــە کەسێکی دی بگاتە ئەو ئامانجـــە و بەرهەمەکەی بخوات! کەواتە ئەم هەموو ڕەنج و دەردەســـەریە بۆچی؟ ئایا ژیان پوچ و بێ مانا نییە یاخود کۆمیدیایەک نییە کە کارەکتەرێکی گەمژە دەیگێڕێتەوە وەکی «شکسپیر» دەڵێت؟

ئەم هەســـتکردنە بەو بۆشـــاییە ڕوحیە و بە پوچێتی ژیـــان، « بیکێت» یان تـــەوق دابوو. بەو پێیەشـــی ڕاســـتگۆ بوو، نەشیدەویست درۆ لەگەڵ کەسانی دیدا بکات، بۆیە بەو پەڕی سەر ڕاســـتیەوە باســـی لە ناخی خۆی و ئەو شتانە دەکرد کە لە دڵیدا بوو.

نوســـەر لە بەشـــێکی دیکەی ئەم کتێبەیدا باس لەوە دەکات کە: (بیکێت لە ژێر کاریگەری ســـوریالیزم و ئەنـــدرێ بریتۆندا بـــووە). وەکی ئاشـــکرایە «بریتۆن»یش دوای جەنگی یەکەمی جیهانـــی باســـی لە پوچێتـــی ژیان کـــردووە. «بیکێت»یش بەهەمان شـــێوە، بـــەڵام لە دوای دووەم جەنگی جیهانیەوە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا دەبوو جەنگێکی ماڵوێرانکەری نێو دەوڵەتی ڕوی بدایە و ملیۆنەهـــا مرۆڤیش بوونایەتە قوربانی، بۆ ئەوەی ئەدەبێکی پوچ و یاخی و دژ بە هەموو مانا پێدانێک بە ژیان بێتە ئارا.

شـــایەنی باســـە زۆرێک لـــەو مەنەلۆگەی لە

شـــانۆگەریەکەی «بیکیـــت»دا هاتـــووە، هیچ مانایەکـــی نییە و بـــەو نوســـینە ئۆتۆماتیکیە دەچێت کە «ئەندرێ بریتۆن» باســـی دەکات و لە مانیفێستی سوریالیزمدا تیۆریزەی بۆ دەکات. ئەوەی ڕاســـتی بێـــت (لە چاوەڕوانـــی گۆدۆ)ی «بیکێـــت»دا، تەعبیـــرە لە مرۆڤـــی دادڕاو لەم جیهانەدا. مرۆڤ کەرتبووە و لە ناخەوە بریندارەو ئەم برینەش بێچارەیە.

ڕەنگـــە ئێمە لە نـــاکاو ڕووبـــەڕوی مەرگی نزیکترین هاوڕێ و خۆشەویســـترین کەســـمان ببینەوە، لە بەرامبەریشـــدا هیچمان پێنەکرێت، بەمجۆرە وێران دەبین و بەدیار ئەو ئازیزانەی لە دەستمان داون حەسرەت دەکێشین، ئیتر ئەبێت ئەم ژیانە چ مانایەکی هەبێت تۆ بڵێیت شایەنی ئەوە بێت بیگوزەرێنین؟

لەبەرئەوەیە هەردوو پاڵەوانی شانۆنامەکە لە دواجاردا بڕیـــار دەدەن خۆیان بکوژن، بەو پێیە تاکە چارەسەرێکە لەبەردەستدا بێت.

بەڵام هەندێ لە ڕەخنەگـــران مانایەکی تر لە شـــانۆگەریەکەی «بیکێت»دا دەبینن. «گۆدۆ- godot" بە زمانی ئینگلیزی وشـــەی (god) واتە یەزدانمان بە بیردێنێتەوە. لێرەوە پێدەچێت دواجار ماناکەی بەمجـــۆرە بێت: لە چاوەڕوانی یەزداندا، یان لە چاوەڕوانی فریـــاد ڕەس و ڕزگارکەرێکدا. بـــەڵام لە کۆتایـــدا ئەم فریاد ڕەســـە هەرنایەت. ئەمەش بەڵگـــەی ئەوەیەکە ئومێد لەم جیهانەدا مەحاڵـــە، نا ئومێدی گەورەش لێرەدایە. چەمکی یـــەزدان لەو کاتـــەوەی ئایین لـــە کۆمەڵگاکانی خۆرئاوادا پاشەکشـــەی کرد لـــە کاڵبونەوەدایە، ڕەنگە «بیکێت»یش ویســـتبێتی گوزارشت لەوە بکات و دۆخی شارســـتانیەتێک نیشان بدات کە بـــە تاڵە لە هەموو ئیمـــان و ئومێدێک، ئەمەش مانـــای ئەوەیە کە چاوەڕوانی کردنی «گۆدۆ» بێ هودەییە و هەرگیز نایەت.

لێـــرەوە دیارە کـــە شـــانۆگەریەکە ڕەهەندی میتافیزیکـــی تێدایـــە و مانایەکـــی قوڵ لە خۆ دەگرێت، ئەو مانایەش گوزارشتە لە قەیرانی ژیاری خۆرئاوا. ئەم شارستانیەتە سەرکەوتنی بەرچاوی لەســـەر هەموو ئاســـتە مادی و تەکنۆلۆژیەکان بەدەســـتهێناوە، بـــەڵام بەهەمان ســـەرکەوتنی لەسەر ئاســـتی ڕوحی و ئەخلاقی نەگەیشتووە. گـــەر ئەمـــە بـــەدی بهاتبایە جەنگـــی جیهانی یەکـــەم و دووەم ڕویان نـــەدەدا و ئەو ملیۆنەها مرۆڤـــەش تیانەدەچوون. لێرەوە تێدەگەین مرۆڤ چەند گەوجە و چۆن دەتوانێت لە چرکەساتێکی تورەیدا هەموو ئەو شـــتانە وێـــران بکات کە بە درێژایی چەندین ســـاڵ دروستی کردووە، مانای پوچـــی و ناماقوڵـــی لێـــرەوە بەرهـــەم دێت کە شارســـتانیەت ناتوانێت ڕێگا لەســـەر هەڵدان و ڕودانـــی کار و کردەوەی بەربـــەری و دڕندەیەتی بگرێت. گەر وانەبێت چ مانایەکی هەیە کە نەتەوە زۆر شارستانی و پێشکەوتووەکانی جیهان، وەک نەتەوەکانی فەرەنسا و ئەڵەمانیا و ئینگلتەرا، لە دوو جەنگی جیهانـــی خوێناویەوە بگلێن کە لە مێژوودا بێ وێنەیە.

ئەم شێتی و دێوانەییە چیە باڵی بەسەر ئەم شارستانیەتەدا کێشا و وایلێکرد بە دەستی خۆی خـــۆی وێران بکات؟ ئایا ئەڵەمانیا یەکێک نەبوو لە نەتەوە هەرە شارســـتانیەتەکانی دنیا، کاتێک چارەنوسی خۆی دایە دەست پیاوێکی نەخۆشی وەک «ئەدۆڵف هتلەر»؟ ئەمە چۆن ڕویدا؟ وەکی ئاشکرایە نازیزم لە هەمان ئەو وڵاتەدا تەشەنەی ســـەند کە ڕابەرانـــی ئەقڵانیەتی وەک: «کانت و هیگڵ» و کەســـانی دیکەی وەک ئەوانی بەرهەم هێنا.

فاشیزم سەروەختێک لە ئەوروپادا تەشەنەی ســـەند کە پێشـــتر ئەقڵانیەت و ڕۆشنگەری باڵا دەســـت بوون، لەم ناکۆکیە گەورەشەوە شانۆی

ئەپسـوٚرد و هەروەهـا ڕۆمانی نوێش لەسـەر دەسـتی «ئالان ڕوب گریێ» و «میشێل بوتۆر» و «ناتالی سـاروٚت» هاتنە ئارا. تێکڕای ئەدەبی مۆدێرن، ئەو ئەدەبەی لێوان لێوە بە نیگەرانی و نائومێدی، بەرهەمی ئەو ڕوداوە مێژووییانەیە کە ئەوروپا لە نیوەی یەکەمی سـەدەی بیسـتەمدا بەخۆیەوە بینی.

هـەر لە درێژەی باسـەکەیدا نوسـەری ئەم کتێبە دەڵێت: (ڕاسـتە نیگەرانی وجودی وەکی دیاردەیـەک کۆنـە و دەتوانیـن بیگەڕێنینەوە بـۆ کێرکیـگارد لە سـەدەی نـۆزدە، هەروەها بیگەڕێنینەوە بۆ کافکا کە ساموئیل بیکێت زۆر لە ژێر کاریگەری ئەودا بوو، بەڵام نەگەیشتبووە ئاسـتی پوچگەرایی و نامەعقولیەتێکی پڕاوپڕ، وەکی ئەوەی لە دوایدا لەسەر دەستی یۆنسکۆ و ئەدامۆف و خودی بیکێت خۆشی ڕویدا). ئەوەی تۆقێنـەرە لەمجۆرە ئەدەبـەدا ئەوەیەکە هەموو دەرگا و پەنجەرەیەکـت بـە ڕودا دادەخا و هیچ دەرفەتێکت بۆ دەربازبوون بۆ ناهێڵێتەوە! واتە ئەمجۆرە ئەدەبە گوزارشـتە لە نائومێدیەک کە لە هەمـوو لایەکەوە تەوقی مرۆڤ دەدات، ڕەنگە لەو سـاتەوەختە مێژووییەدا ئەم شتە پاساوی خۆی هەبووبێت، بەڵام لە ئێستادا ئەو پاساوانە هیـچ ڕەوایەتیەکیان نەماوە، دوای ئەوەی مرۆڤی ئەوروپی سـەرپێی خۆی کەوتەوەو ئومێدی بە ژیان پەیدا کردەوە سەرباری هەموو ئەو شتانەی رویانـدا. بەمجـۆرە ئەوروپا توانـی نائومێدی «بیکێـت» و جیهانە تاریـک و تۆقێنەرەکەی تێپەڕێنێـت. وەکـی ئاشـکرایە «بیکێت» لەو شـانۆگەریە بەناوبانگەیدا دەڵێت: (هەموومان بەشـێتی لە دایک دەبین و هەندێک تا دەمردن هەر لە سەر ئەو حاڵە دەمێننەوە)، ئەمەش وەک ئاماژە کردنێک بۆ خۆی و هەندێ لە بلیمەتەکانی دیکە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا «بیکێت» دەتوانێت هەندێک جار ئیجابیش بێت، بۆ نمونە لە یەکێک لە ڕۆمانەکانیدا دەڵێت: (مادامەکی ژیان هەیە، دەبێت ئومێد و هیواش هەبێت!)، هاوکات دەشی وت: (تـۆ دەژیت و و زیندەگـی دەتبات، بەڵام دواجار هەر مەرگ دێت). مەرگ چاوی لەسەرمانە و لە بۆسـەدایە بۆمان، دواجار هەرچیەکمان لەم ژیانـەدا بونیادنـاوە بادەیبـات و کۆتایی دێت. کەواتە دوا قسە هەر بۆ نامەعقول و پوچگەراییەو هیچی تر.

### سەرچاوە:

بیان الكتب، ٢٠٠٥/٢/٢١.

# بڵاوکراوەکانی
# دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لە ماوەی دوو مانگی پێشودا، دەزگای سەردەم کۆمەڵێ کتێبی دانسقەو نایابی خستە کتێبخانەی کوردییەوە، کۆمەڵێک کتێب کە بۆ ئەمڕۆی کتێبخانەی کوردیو خوێنەری کورد، تابڵێی گرنگو بایەخدارە، لەوانە کتێبی (چیرۆکی ئاینەکان)و کتێبی (ئاین چییە؟). ئەم دوو کتێبە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، کە تەنها مانگێک بوو کەوتبونە بازاڕەوە، فرۆشرانو داواکاری زۆریشی لەسەر بوو، ئەمە وایکرد دەزگای سەردەم سەرلەنوێ چاپیانبکاتەوە.

ئاشکرایە فرۆشتنی ئەو دوو کتێبە لەو ماوە کورتەداو چاپکردنەوەیان بۆ جاری دووەم، ئەوە دەردەخات لەمڕۆدا خوێنەرێک هەیە بەشوێن کتێبی باشو دانسقەدا دەگەڕێتو گەرچی کەمەکێکیش گرانبێـــت، دەیکڕێتو دەیخاتە کتێبخانەکەیەوە. ئەوە دەردەخات خوێنەری ئەمڕۆ تامـــەزرۆی ئەو کتێبانەیە کە باس لە کێشـــە هەنوکەییەکانی دەکات، بەتایبەتی کێشـــەی ئاینو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا. بێگومان لە ئێســـتادا پرســـی ئاین، کە لەلایەن چەندین پارتو ڕێکخراوی ئیســـلامیی جۆراو جۆرەوە، بۆ مەبەستو بەرژەوەندی تایبەتو مەرامی سیاســـی بەکاردەهێنرێت، بووەتە پرســـێکی سەرەکیو تەواوی جیهانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە. ئاین لەمڕۆدا لەوە دەرچووە تەنها تایبەت بێت بە نەتەوەیەکو وڵاتێکو شوناســـێکی دیاریکراو، بەڵکو ئاین بووەتـــە دیاردەیەکی جیهانیو ئامادەییەکی بەرچاوی لە ژیانی مرۆڤەکاندا هەیە. بەڵام بەداخەوە لەسەر دەستی هەندێ گروپو پارتی توندڕەوی دەمارگیر، ئاین خەریکە پەیامە پاکو جوانەکەی خۆی لەدەستدەداتو دەبێتە چەکێک بۆ وێرانکردنو کوشتنی بەناحەقی مرۆڤەکان.

ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین ئەو دوو کتێبەی ســـەرەوە بە خوێنەر بناسێنینو گەشتێکی خێـــرا بە نێو لاپەڕەکانی هەردوکیاندا دەکەین، بەو هیوایەی بتوانین هێڵە گشـــتییەکانی ئەو دوو کتێبە دەستنیشـــان بکەینو تاڕادەیەکی سنوردار خوێنەر ئاشنابکەین بە جیهانە پانو بەرینو ناکۆتاکەی ئاین.

## چیرۆکی ئاینەکان




ئەم کتێبە سەفەرێکی دووردرێژە بەناو بەشی هەرە زۆری ئاینەکانی سەر گۆی زەوی، لە ڕۆژگارە هەرە دێرینەکانەوە دەستپێدەکات تادەگاتە سەر هاتنی ئاینی ئیسلام‌و کۆچی دوایی پێغەمەرەکەی. لە بیروباوەڕەکانی میسری کۆن‌و ڕۆژهەڵاتی کۆنەوە دەستپێدەکات‌و بە دەستەو تاقمە نەیارەکانی ناو ئیسلام کۆتایی پێدێت. خوێنەر لەم سەفەرەدا، ئاشانی چۆنیەتی بیرکردنەوەی مرۆڤی سەرەتایی دەبێت‌و دەبینێت ئەو مرۆڤانە سەرەتا چۆن دەیان گیانەوەرو دیاردەی سروشتییان پەرستووە، تێدەگات مرۆڤەکانی سەرەتا، بۆ ئەوەی خۆیان لە مەترسی گیانلەبەری دڕندەو خۆیان لە کارەساتە سروشتییەکان بپارێزن، سوجدەیان بۆ بردون‌و پەرستویانن. ئەوان هەر دیاردەیەکی سروشتی لە چەشنی، لافاو، هەورەبروسکە، بومەلەرزە، ڕەهێڵەو شەستە بارانیان... هتد ببینایە، لەبەرئەوەی بەلایانەوە دیاردەیەکی سەیر بووەو لێیتێنەگەیشتوون، ئەوا بە ناچاری‌و بۆ ئەوەی دوور بن لە زەرەرو زیانەکانی، پەرستویانە.

کتێبەکە چیرۆکو بەسەرهاتی باوەڕی ئاینیمان بۆ دەگێڕێتەوە، لە ساتە هەرە سادەکانیدا تادەگات بەو ساتانەی ئاین دەبێتە خاوەنی کتێب‌و دەقی نوسراو. بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن ئاین لە ئاینێکی بێ تێکستەوە دەبێت بە ئاینێکی تێکستدار. چۆن لە کۆمەڵێ سروت‌و ڕێوڕەسمی خۆڕسکی مرۆڤەکانەوە، دەبێتە کۆمەڵێ سروت‌و ڕێوڕەسمی ناو دەقە ئاسمانییەکان. چۆن



لە کۆمەڵێ جووڵەو هەستانو هەڵسوکەوتەوە کە بەشی هەرە زۆری ترس سەرچاوەکەی بووە، دەبێتە کۆمەڵێ جووڵەو هەڵسوکەوت کە سەرچاوەکەی کتێبو هەزاران فەرمودەیە. هەر لێرەدا دەبینین خوداوەندەکان لەپاڵ مرۆڤەکاندا دێنو دەچنو مرۆڤەکان هەستیان پێدەکەنو دەستیانلێدەدەنو دەیانبینن، ڕۆژانە لەگەڵیاندا دەژینو لە نزیکەوە تەماشایان دەکەن، کەچی دواتر خوداوەندەکان زەوی بەجێدەهێڵنو دەڕۆن لە ئاسمانە دوورەکانو لەپاڵ مانگو ئەستێرەکاندا دادەنیشنو لەوێوە پەیمانی خۆیان دەنێرن. کاتێ کتێبەکە چیرۆکی ئاینمان بۆ دەگێڕێتەوە، تێدەگەین سەرەتا مرۆڤەکان بۆخۆیان خواوەندەکانی خۆیان دروستکردووەو پەرستویانن، بۆ خۆیانو بە ئارەزوی خۆیان خوداوەندی جیاواز جیاوازیان، لە تەختەو دارو بەردو قوڕ دروستکردووەو لە پاکترینو خاوێنترین بەشی دەوارو کەپرو تاقەکاندا دایانناون، تا دەگات بەو ڕۆژەی مرۆڤەکان بەناچاری خوداوەندەکانی خۆیان لە تاقەکاندا دەهێننە خوارەوەو دەیانشکێنن، چونکە چیتر خوداوەندەکان لەسەر زەوی ناژین، چیتر یەزدانەکان لە مرۆڤەکان جیادەبنەوەو دەبنە بونەوەری بان مرۆڤو لە شوێنە نەبینراو و دوورە دەستەکاندا دەژین، واتە لە ئاسمان. گواستنەوەی ماڵی خوداوەند لەناو تاقو میحرابەکانەوە، بۆ ناو کەشکەلانی فەلەک، ئەو هەنگاوەیە کە وادەکات ئاین لە کۆمەڵێ ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خۆڕسکیانەی تاکە کەسییەوە ببێت بە کۆمەڵێ ڕەفتارو هەڵسوکەوتی دەستەجەمی کە لە ئاسمانەوە دێتەخوارێو لەسەر هەموان پێویستە جێبەجێی بکەن.

ئەو گواستنەوەیە وادەکات ئیدی بۆ ئەوەی لە ئاین بگەیت، پێویستە گوێ بۆ ئەوانە بگریت کە خۆیان بە نوێنەری نێوان ئادەمیزادەکانو یەزدانەکان دادەنێن، خۆیان بە میراتگری ئاین دەزاننو لێکدانەوەو ڕاڤەکردنەکانیان بۆ ئاین، بە تەنها لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی ڕاستو دروست دەزانن.

بە مانایەکی تر لەو چرکەساتەوە، خەڵکی بۆئەوەی لە ئاینو پەیامەکەی بگات، ناتوانێت وەک جاران پشت بە لێکدانەوەو دیدگاکانی خۆی ببەستێت، چونکە چیتر خواوەندەکان لەبەردەستیدا نینو خۆی دروستی نەکردوون، ڕۆژانە نایانبینێتو ئاگاداریان نییە. ئەو لەمەولا بۆ ئەوەی لە ئاین بگات، بۆ ئەوەی هەواڵی خواوەندەکان بزانێت کە لەبەرچاویدا نەماون، پێویستە هانا بۆ ئەو کەسانە بەرێت کە لەلایەن خواوەندەکانەوە نێردراونو پەیامە یەزدانییەکانیان پێیە. دەبێت چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرانە بێت کە ئەرکی گەیاندنو بڵاوکردنەوەی کتێبە پیرۆزەکانیان لە ئەستۆدایە، ئەو کتێبانەی هەم هەواڵی

خوداکانیان تێدایەو هەم مرۆڤەکان دەگەیەنێتەوە بە خوداکان، ئەویش لە ڕێگەی جێبەجێکردنی ئەرکو فەرمایشتەکان.

خاڵێکی گرنگی دیکەی ئەم کتێبە، بریتییە لە گێڕانەوەی چیرۆکی هەرسێ ئاینە یەکتاپەرستییەکە، واتە ئاینی جولەکەو مەسیحیو ئیسلام. لەم گێڕانەوەیەدا، بەوردی ئاشنای چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو سێ ئاینە دەبینو زۆر لە نزیکەوە ئاشنای ژیانی هەرسێ پێغەمبەرەکە، موسا، عیسا، محەمەد دەبین. دانەری کتێبەکە «سلێمان مەزهەر» کە نوسەرێکی عەرەبە، لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی ناو ئەم کتێبەیدا، نەهاتووە لایەنگری خۆی بۆ یەکێکیان لەسەر حسابی ئەوی دیکەیان دەربڕێت. نەهاتووە فەزڵی ئاینێک بەسەر ئاینێکی دیکەدا بدات، یاخود پێغەمبەرێک لەوانی دیکە بە باشتر بزانێت. ئەو بە زمانێک باس لەو سێ ئاینەو لەو سێ کەسایەتییە مێژووییە گرنگانە دەکات کە هیچ جۆرە تەرەفگیرییەکی پێوە دیار نییە، چیرۆکەکان چۆن ڕوویانداوە، ئاوا بەوپەڕی ئەمانەتەوە گواستونیەتەوەو سەربەخۆیی خۆی پاراستووە. ئەمەش خاڵێکی جوانی کتێبەکەیەو وایکردووە کتێبەکە سەنگو قورساییەکی زیاتری هەبێت. جگە لەوە نوسەر بۆ نوسینی ئەم کتێبە دانسقەو نایابە، سەردانی بەشی هەرە زۆری ئەو وڵاتو مەملەکەتو سەرزەمینانەی کردووە، کە تێیاندا ئاینەکان بۆ یەکەمجار دەرکەوتون. ئەو وەک خۆی لە پێشەکی کتێبەکەدا دەڵێ سەردانی، هیندستان، مالیزیا، سەنگافورا، فلیپین، چین، ڤێتنامو گەلێ شوێنی دیکەی کردووە. هەروەها تێکەڵ بە هیندییە سورەکانو بوزییەکانو کۆنفۆشیۆسەکانو بتپەرستەکانیش بووە. هەموو ئەم سەردانو تێکەڵبونانە، وایانکردووە نوسەر لە نزیکەوە سروتو ڕێوڕەسمی ئاینە جیاواز جیاوازەکان بە چاوی خۆی ببینێتو لە نوسینەوەی ئەم کتێبەدا سودێکی زۆریان لێوەربگرێت.

دواجار پێویستە سوپاسی بەڕێز «لوقمان حاجی قادر» کە کاری وەرگێڕانی کتێبەکەی ئەنجامداوە بکەین، بەوەی توانیویەتی کتێبێکی ئاوا گەورەو بایەخدار، بە زمانێکی کوردی پاراو جوان وەربگێڕێت، زمانێک زۆر بە ئاسانی خوێنەر لە ڕستەو پەرەگرافەکانی تێدەگاتو هیچ کێشەیەکی لەگەڵدا نابێت. تیراژی ئەم کتێبە بە هەردوو چاپەکەی ٢٥٠٠ دانەیەو نرخەکەی ٧٥٠٠دینارەو ژمارەی لاپەڕەکانی ٥٩١ لاپەڕەی گەورەیە.



## ئاین چییە؟

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە زۆر دەگمەنانەی کە بە زمانی کوردیو بەشێوەیەکی زانستیو ئەکادیمی باس لە چییەتی ئاین دەکات. باس لەوە دەکات قوتابخانە سۆسیۆلۆژییەکانی رۆژئاوا چۆنو بە چ شێوەیەک باس لە مەسەلەی ئاین دەکەن. بێگومان ئەو قوتابخانە فیکریانەی لەم کتێبەدا خراونەتەڕوو، لە فیکری رۆژئاوادا کاریگەری بەرچاویان هەیەو سەبارەت بە مەلەسەی ئاین، خاوەنی دیدگاو تێروانینی ئەکادیمیانەی خۆیانن. ئەوەی جێگای خۆشحاڵییە ئەوەیە ئەم کتێبە، یەکەم کتێبی ئەو حەڤدە کتێبەیە کە وەرگێڕی کتێبەکە بەڕێز «عادل باخەوان» بەنیازە لەگەڵ دەزگای سەردەم، لە بواری تێگەیشتن لە ئاین، ئەنجامیبدات. واتە ئەم کتێبە دەستپێکی ئەو پرۆژەیەیە کە ناوبراو لەگەڵ سەردەمدا لەژێر ناونیشانی (پرۆژەی تێگەیشتنو ڕاڤەکردنی ئایین)، ئەنجامیدەدەن. بێگومان ئەمەش دەبێتە پرۆژەیەکی گەورە




بۆ تێگەشتنێکی زانستیانەی ورد لەسەر ئاین. لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین بەڕێز وەرگێڕی کتێبەکە بۆ خۆی یەکێکە لەو کەسە ئەکادیمیانەی، لە ماوەی پێشوداو لە میانەی نوسینی چەندین ستونو لێکۆڵینەوەدا، بەشێوەیەکی زانستیو ئەکادیمیانە قسەی لەسەر ئاینو تیرۆرو ئیسلامی سیاسی، چ لە جیهانو چ لە کوردستاندا، کردووەو لەو پێناوەشدا کتێبە بەپێزەکەی شایەنی دەستخۆشیو ئافەرینە.

ئەو فەیلەسوفو زاناو سۆسیۆلۆگانەی لەم کتێبەدا (ئاین چییە؟)، دەربارەی ئاین لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا قسەدەکەن، بریتین لەو مرۆڤە خوێندەوارو مەزنانەی، لە ساتێک لە ساتەکاندا، جیهانیان بەخۆیانەوە سەرقاڵ کردبوو. بریتین لەو بیرمەندانەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ناوێکی گرنگو پڕ بایەخنو لە بواری بەرهەمهێنانی مەعریفەدا، جێگای تایبەتی خۆیان هەیە، وەک «کارل مارکس»و «ئەنگڵسی» هاوڕێی، «دۆرکایم»و «پیەر بۆردیۆ».. هتد.



خاڵی هەرە سەرەکی لەم کتێبەدا ئەوەیە، خوێنەر ئاشنادەبێت بە دیدگای ئەو بیرمەندو فەیلەسوفانە لەمەڕ ئاین، ئاشنادەبێت بە جۆرێک لە قسەکردن لەسەر ئاین کە ڕەنگە پێشتر بەو شێوە زانستییە گوێی لێ نەبوبێت. بێگومان قسەکردنی فەیلەسوفێک یان بیریارێک لەسەر ئاین، تەواو جیاوازە لە قسەکردنی مەلایەک یان فەقێیەک. جیهانبینیو دیدگای ئەو دوو توێژە لەسەر ئاین، لەیەکناچنو تاڕادەیەکی زۆریش ناکۆکو دژ بەیەکن. یەکەمیان بۆ تێگەشتن لە ئاین، پشت بە زانستو مەعریفەو لێکۆڵینەوە دەبەستێتو تێکستە ئاینییەکان دەخاتە ناو سیاقی مێژوویی خۆیانەوە. دووەمیان بۆ تێگەشتن لە ئاین، پشت بە ڕیوایەتو گێڕانەوەو وەعز دەبەستێتو هەرگیز تێکستە ئاینییەکان ناخاتەوە ناو سیاقی مێژوویی خۆیان، بەڵکو لەو سیاقانە دەریاندەهێنێتو لەمڕۆدا نیشتەجێیان دەکات، باز بەسەر زیاد لە هەزار ساڵ تەمەنی ئەو تێکستانەدا دەداتو لەمڕۆدا زیندویان دەکاتەوەو گەر بە زۆریش بێت، گەر لە ڕێگەی توندوتیژیو ڕشتنی خوێنیشەوە بێت، دەیانسەپێنێتو جێگیریان دەکات. لە سەردەمانی هەرە کۆنەوە دەیانگوێزێتەوە بۆ سەردەمی ئێستا. لەم گواستنەوەیەشدا ڕەچاوی گۆڕانکاریو پێشکەوتنەکانو زانستە تازەکان ناکات، بەڵکو بێ پەروا هەوڵدەدات سەرجەم ئەو گۆڕانکاریو پێشکەوتنانە لەگەڵ تێکستە ئاینییەکاندا بگونجێنێت. نەک تێکستەکان لەگەڵ ئەواندا بگونجێنێت. بەلای توێژی دووەمەوە کە توێژێکی بەربڵاوەو لە بەشی هەرە زۆری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو دنیای عەرەبیو ئیسلامیدا، بە کوردستانی خۆشمانەوە باڵادەستە. تێکستەکان نابێت بە هیچ جۆرێک دەستکاری بکرێن، بەڵکو ئەوەی دەبێت دەستکاری بکرێتو لەگەڵ تێکستەکاندا بگونجێندرێت، سەرجەم بوارەکانی ژیانو پێشکەوتنو زانستە. ئەوەی وەک خۆی دەمێنێتەوەو دەستکاریکردنی حەرامو ناڕەوایە، تێکستە ئاینییەکانو ئەو فەرمودانەن کە دەماوەدەم گواستراونەتەوە. دروست کێشەی تێنەگەیشتن لە ئاین لەو خاڵەدا کۆدەبێتەوە.

لە لاپەڕە ١٩ هەڵەیەکی بچوک سەبارەت بە ساڵی لەدایکبونی «فردریک ئینگلس» کراوەو نوسراوە ١٩٢٠، بەڵام ئەو ساڵە هەڵەیەو ساڵی ١٨٢٠ تەواوە، ئەگەرچی لە دەستپێکی بەشی یەکەمی کتێبەکەدا، ساڵی لەدایکبونی «مارکس»و «ئینگلس» بەڕاستی نوسراون.

دواجار پێویستە ئەوەش بڵێین، ئەم کتێبە لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر چەمکو زاراوەی تێدابەکارهاتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەکوردیکردنەکەی لە ئاستێکی بەرزو باڵادایە، ئەو زمانە کوردییەی کتێبەکەی پێ نوسراوەتەوە، زمانێکی ئەکادیمی جوانەو خوێنەر بێ تاقەت ناکات. لە خوێندنەوەی کتێبەکەوە دەگەیتە ئەو بڕوایەی زمانی کوردی، دەتوانێت کتێبی فیکریو فەلسەفیی پێ وەربگێڕدرێتو خوێنەریش بە ئاسانی لێی تێبگات. هەڵبەتە ئەوەش بۆ سەلیقەییو شارەزایی وەرگێڕەکەی دەگەڕێتەوە.

## کوا دەستەکانت فەریبا؟
## لە پەراوێزی کتێبی" بەرەو کەناری شپرزەیی" دا

**ڕانانی: مەنسوور تەیفووری**

یەکەم گێڕانەوەکانی مرۆڤ بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی سەفەرەوە دەستپێدەکەن، لە سەفەری ئەفسانەیی گلگامشەوە تاکوو سەفەری بێبڕانەوەی خزر بەدوای ئاوی حەیاتدا، تا دەگاتە سەفەری یەکەمینی ئۆدیسۆسی یۆنانی بەدوای شوناسی راستەقینەی خۆیدا؛ هەمیشەش ئەم سەفەرانە ئەنجامی بەدینەکراویان بەدواداهاتوە و کەسانی نیشتەجێش هەمیشە چاوەڕێی ئەوەیان کردوە کە ئەوەی لە سەفەر دێتەوە دیارییەکیان بۆ بێنێت، دیاریی هەواڵی شوێنی دوورەدەست و نەبینراو و پوختەی ئەزموونی کردەوەیی ژیان و جیهان و شوێنی دیکە، واتە هەر ئەو حیکمەتەی ڕێبواران لەگەڵ خۆیان شار بە شار دەیانگێڕا و دڵی نیشتەجێبوانیان پێ خۆش دەکردو یارمەتییان دەدان لە خۆیان و ژیانیان و پەیوەندییان بە ژیان و جیهانەکانی دیکەوە باشتر تێبگەن. ئەم حیکمەتە لەگەڵ سەردەمی مۆدێرندا، هاوکاتی وازهێنانی مرۆڤ لە پێویستی بۆ راوێژ و راگۆڕینەوە کاڵبۆوە و رووی لە نەمان کرد. چما بنیامین وتەنی "ئێمە توانای گۆڕینەوەی ئەزموونمان دۆڕاندوە" و وادەزانین چیدی پێویستمان بە راوێژی هیچ ئەستێرە و ئاسمان و کەسێک نیە.




ئارەزوو و توانای گۆڕینەوەی ئەزموون ئەو وزە شاراوە بوو کە هەموو گێڕانەوە گەورەکانی مرۆڤ، لە ئۆدیسۆسەوە تاکوو رۆمانی مۆدێرن، لەسەری دامەزرابوو، ئەو توانای کە هێرشی میدیاکان دژ و بەرامبەری و رووی لە کاڵکرنەوەیەتی؛ هەر ئەمەشە ژوورنالیستەکان، بگێڕانی میدیا جەماوەرییە زانیارییپەرستەکان، بەرامبەر بە حیکمەتی ناخی گێڕانەوە، بەردەوام باسی نەمانی



پێویســتی بۆ رۆمــان و کۆتایی گێڕانەوەیەک دەکەن کە بیەوێت جگە لــە زانیاریی رووت و تێپەڕ شــتێکی دیکــەی هەڵگرتبێت: توانای گۆڕینەوەی ئەزموون.

بەڵام گێڕانــەوە بەردەوامە و دژی لۆژیکــی رۆژنامە و میدیای جەماوەری کە بۆ نەمان و فەوتان و بەرخۆریی یەکچرکەیی بەرهەم دەهێنــن، هێشــتا دەگێڕێتەوە و لــە ناخی خۆیــدا تۆخمێک لە هیوا بۆ مرۆڤی گیرۆدەی زانیاری هەڵدەگرێت؛ با ئەم کارە شێوەی جۆراوجــۆری وەک ژانری رۆمان، چیرۆک، شانۆنامە یان سەفەرنامە وەربگرێت.

سەفەرنامە یەکێکە لە یەکەم و باوتریــن ژانرەکانی گێڕانەوەو رەنگە ســەرچاوەکەی بۆ یەکەم رێبوارەکانی نێو ئەفســانەکان و مێژووی مرۆڤایەتــی بگەڕێتەوە، چەشــنێکی ئەدەبــی کــە رێگە بــە کەســانی دەدات رێبــوار و حەکایەتخــوان ببینن و هەســت بکەن و ببیســتن و لەدواییدا ئەو ئەزموونەی بیستوویانە بگوڕن بۆ ئەزموونــی خۆیــان و بیگێڕنەوە و لێرەوەش ناڕاســتەوخۆ توانا و ئارەزووی گۆڕینەوەی ئەزموون و راوێژ زیندوو ڕابگرن و بیپارێزن: واتــە ئــەو ئایدیای کــە رەنگە مەبەســتی ناخەکــی نادیــاری هەناوی زمان خۆیەتی.

ئامادەیی ژانری سەفەرنامە لە ئەدەبی کوردیدا، سەرەڕای ئەوەی مێژوویەکی درێژی ئاوارەیی، زۆر کــەم و دەگمەنە و بە ئاســتەم دەبینیــن کەســان بیــرەوەری بەریەککەوتنــی خۆیان و جیهان و ژیانــی دیکەیــان گێڕابێتەوە، چما گێڕانــەوە دەتوانێت لەولای دەســەڵاتی گێــڕەرەوەوە زۆر کەموکــوڕی و لایەنــی شــاراوە ئاشکرا بکات.

ســەفەرنامەکەی رەووف بێگەرد، یەکێکە لەو سەفەرنامانەی بێ ئەوەی نووســەرەکەی ئاگای لێبێت، خاڵێکی نهێنی ئاشــکرا دەکات: جیاوازیــی دوو ترپــە و ریتمــی ژیان لە دوو شــوێن و جیهانی جیــاواز، ئەوروپا و دوو وڵاتی بەر شەڕکەوتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ژیانی تا پێش یەکەم فڕۆکەخانــە لە تــاران و ژیانی پاش یەکــەم دابەزین لە ئەوروپا و لەگەڵیانــدا بەریەککەوتنی دوو ریتمی جیــاواز، ریتمی دینامیک و بگۆڕی ژیان و جیهانی یەکەم، بەرامبەر بە ریتمی ڕاســتەهێڵ و دووپاتەکیی ژیانی کۆمەڵگایەکی پیشەســازی و سیستماتیک. ئەو بەریەککەوتنی ریتمانەی دەتوانێت شتی تازە لە سەر ژیان و مرۆڤ ئاشکرا بکات و یارمەتیمان بدات لەگــەڵ ســەربازێکی بریندارى ئاویلکــە، گومان لــە جەنگەکان بکەیــن و لەگەڵــی هــاوار بــۆ کچێکی نەناســراو بکەیــن و لە بیرەوەریەکانی کۆنە سەربازیکی لاق پەڕیو و گومانەکانیدا جارێکی تر چاو بــە جەنگەکاندا بگێڕین؛ دوو ریتم کــە جیاوازیەکانی دوو جیهان ئاشــکرا و تەنانەت چێژی خوێندنەوە و گێڕانەوەش جیاواز دەکەن، دوو ژیان کە گێڕانەوەی جیاوازیش دەخەنەوە. هیچ نەبێت گوێگرتن لە دەرکەوتنی نائاشکرای ئەم دوو ریتمە، ئەم سەفەرنامەیە دەبەســتێتەوە بە سەرچاوەکانی ئەم ژانرەوە و دەیکاتە شــیاوی خوێندنەوە.

# SARDAM

Foreign Culture Magazine

**No. 60**
**Vol. 11**
**Sep. 2009**

Sardam Printing & Publishing House